# جیهانی دوای ئەمریکا

**نووسینی: فەرید زەکەریا**

نووسەری کتێبی ((ئایندەی ئازادی)) کە ناوبانگێکی مەزنی وەدەستهێنا

**وەرگێرانی:**

**سەلاح سەعدی**

ئیمەیل: salah_sana1974@ yahoo.com

مۆبایل: ٠٧٥٠٣١٠٧٩٨٢

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە:




# جیهانی دوای ئەمریکا

**نووسینی : فەرید زەکەریا**

**وەرگێڕانی : سەلاح سەعدی**

دیزاینی ناوەوە: خلیل هیدایەت مام شێخ

بەرگ: ئاکار جلیل کاکەوەیس

چاپی یەکەم: ٢٠١٧

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەلات / هەولێر

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: (٨٥٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی ( ٢١ )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە.

## فەرید زەکەریا کێیە؟

ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکیی بەڕەگەز موسڵمانی هیندییە و لە ساڵی ١٩٦٤ دا لە مۆمبای لە دایکبووە. لە ئەمریکا بە یەکێك لە بەرجەستەترین و بەناوبانگترین ڕۆژنامەنووس دادەندرێ. لەگەڵ تیمە مەزنەکانی گۆڤارە بەناوبانگەکانی ئەمریکیی وەك " کاروباری دەرەوە" و " نیوزویك" و " تایم" کاری کردووە. هەروەها لە پرسەکانی سیاسەتەکانی دەرەوەی ئەمریکا و پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتیدا پسپۆڕە.

ناوبراو لەنێو خانەوادەیەکدا لەدایکبووە کەوا دایبابی موسڵمان بوون و پەیوەندییان بە جیهانی سیاسەت و ڕۆژنامەنووسییەوە هەبووە، باوکی ئەندامی پارتی کۆنگرەی نیشتمانیی هیندی بووە، دایکیشی لە ڕۆژنامەیەکی هیندیدا نووسەر بووە. ژنی هێناوە و کوڕێك و دوو کچی هەیە.

فەرید زەکەریا لە منداڵیدا چووەتە خوێندنگەی جۆن کۆنن لە مۆمبای، دواتر بەرەو ئەمریکا چووە و لەوێدا لە زانکۆی ییلی (ویلایەتی کونیتیکت) باوەڕنامەی موڵەتی لە هونەر وەدەستهێناوە، هەر لەو زانکۆیەدا سەرۆکایەتیی یەکیەتیی سیاسیانەی خوێندکارانی کردووە و دواتر چووەتە زانکۆی هارفارد و لەوێدا پلەی دکتۆرای لە زانستەکانی سیاسیدا وەدەستهێناوە.

فەرید زەکەریا خۆی وەك ڕاگەیاندنکارێکی لیبراڵی لە ئەمریکا و کەسێکی نزیکی دیموکراتەکانی نێو ئیدارەی ئەمریکی دەناسێنێ، هەروەها زۆر گرنگی بە تاوتوێکردنی پرسەکانی جیهانی ئیسلامی دەدات. لە ساڵی ٢٠١٠دا خەڵاتی (هیوبرت هێمفریی بۆ ئازادییەکان) ڕەتکردەوە کەوا ڕێکخراوێکی ئەمریکی – جوولەکە پێی بەخشیبوو، چوونکە ئەو ڕێکخراوە نەیهێشتبوو مزگەوتێك و سەنتەرێکی ڕۆشنبیریی ئیسلامی لە نیویۆرك و لە نزیك شوێنی هێرشەکانی یانزەی سێپتێمبەری ٢٠٠١دا بونیاد بنرێ.

فەرید زەکەریا لەسەرەتای ژیانە پیشەییەکەی خۆیدا بەڕێوبەرایەتیی پرۆژەیەکی توێژینەوەی زانکۆی هارفاردی کردووە کە سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی بووە، دواتر بۆ ماوەی هەشت ساڵ سەرنووسەری گۆڤاری " کاروباری دەرەوە" بووە. لە زانکۆیەکانی هارفارد و کۆڵۆمبیا و کایس ویسترندا وانەکانی پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتی و فەلسەفەی سیاسیی گوتووەتەوە.

گرنگی بە پرسەکانی لیبراڵیزمی دیموکراسی و ئیسلامی سیاسی داوە، بەڵام پێی وایە کە پاڵپشتیی ئەمریکا و خۆرئاوا بۆ پیادەکردنی لیبرالیزمی دەستووری لە لایەن دەستەڵاتەکانی نێو جیهانی عەرەبی بەبێ فشار خستنە سەریان بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن، دەرئەنجامی باشتری دەبێت لەوەی هانیان بدات هەڵبژاردنی وەها بەڕێوەبەن کە لەوانەیە ئەو کەسانە تیایدا سەرکەوتوو بن کە " سەرکوتکار و تاکڕەون و زیاتر لەگەڵ خۆرئاوا و بەهایەکانی خۆرئاوا دووچاری بەریەککەوتن دەبنەوە"، ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ ڕەوتەکانی ئیسلامی.

فەرید زەکەریا هێرشەکانی ١١ی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١ی بە دەرئەنجامی " تووڕەییەکی گەورە دڵنا، هەروەها وەهای لە قەڵەم دا کە کارێکی کوێرانەی

تیرۆرستی نەبووە کە لەپێناو تیرۆر و تۆقاندن ئەنجام درابێ، بەڵکو کاردانەوە و سزایەك بوو کەوا بەسەر سیاسەتی ئەمریکیدا پیادە کرا".

ناوبراو لە نێوەڕۆکی ئەم کتێبەدا دان بەوەدا دەنێت کە لە پشتگیریکردنی هێرشەکەی ئەمریکای ساڵی ۲۰۰۲ بۆ سەر عێراق هەڵە بووە، هەروەها دانی بە شکستی ئەو هێرشەدا ناوە و ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە هێرشەکە بووەتە هۆی پاشاگەردانییەکی جیۆسیاسی و مەرگەساتی مەزنی نێو خۆرهەڵاتی نێوەڕاست. هەر لەبەر ئەمەیش بووە دژی دەستوەردانی ئەمریکا بوو لە سووریا و ئەوەشی خستە ڕوو کە هەڵوێستەکانی ئەمریکا و خۆرئاوا لەهەمبەر ئەم دۆسیەیەدا سەرلێشێوانیان پێوە دیارە.

فەرید زەکەریا چووەتە نێو تیمی گۆڤاری " نیوزویك" و ماوەی دە ساڵ وەك پسپۆڕێك لە پرسەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی کاری کرد، ئەو ستوونانەی کەوا لەم گۆڤارەدا دەینووسین چەندان خەڵاتیان وەدەستهێنا. هەروەها مانشێتی سەر بەرگی گۆڤارەکە کەوا لە ئۆکتۆبەری ۲۰۰۱دا بەناونیشانی " بۆچی ڕقیان لە ئەمریکا دەبێتەوە؟" بڵاوبوویەوە، بووە جێگەی سەرنج و خوێندنەوە و ناوتوێکردنی زۆرێك لە سیاسیەکانی ئەو کاتی ئەمریکی.

لە ساڵی ۲۰۱۰دا لە گۆڤاری " تایم" کاری دەکرد و گوتارەکانی لە چەند ڕۆژنامەیەکی پڕ تیراژی ئەمریکی بڵاوبوونەوە، هەر لە ساڵی ۲۰۰۸یشەوە لە کەناڵی سی ئێن ئێنی ئەمریکی بەرنامەیەك بەناوی " فەرید زەکەریا گی پی ئێس" پێشکەش دەکات و لە بەرنامەکەدا میوانداری لە کەسییەتییە جیهانییەکانی بواری سیاسی دەکات.

فەرید زەکەریا چەندان کتێبی نووسیوە، یەکەمین کتێبی لە ساڵی ٢٠٠٣دا بەناونیشانی " ئایندەی ئازادی" چاپ و بڵاوکرایەوە. هەروەها چەند کتێبێکی دیکەشی چاپ و بڵاوکردووەتەوە لەوانە: " لە سامانەوە بۆ دەسەڵات: بنەما نائاساییەکانی ڕۆڵی ئەمریکی" و "بەرگرییەك لە لیبرالیزمی پەروەردەیی" و "جیهانی دوای ئەمریکا" کە ئێستە لەبەردەستاندایە. هەروەها لە نووسینی کتێبی " ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمریکی) شدا بەشداری کردووە.

فەرید زەکەریا چەندان خەڵاتی پێ بەخشراوە، لەوانە:" خەڵاتی گۆڤاری نیشتمانی" لە ساڵی ٢٠١٠دا، هەروەها خەڵاتی " بادما بۆشان" کە لە ساڵی ٢٠١٠دا لەلایەن حکومەتی هیندی وەك سوپاس و پێزانینێك لەهەمبەر هەوڵوکۆششەکانی فەرید زەکەریا لە بواری ڕۆژنامەنووسی، پێی بەخشراوە. هەروەها خەڵاتی "بیبۆدی"ش بەخشرایە بەرنامەیە تەلەفزیۆنییەکەی واتا بەرنامەی " فەرید زەکەریا گی بی ئێس".

گۆڤاری " فۆرین پۆلیسی" لە ساڵی ٢٠١٠ لە ڕیزی گرنگترین بیرمەندانی جیهانی داناوە. هەروەها گۆڤاری " فۆربس"ی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠٠٨دا لە ڕیزی ئەو ٢٥ ڕاگەیاندنکارانەی داناوە کەوا لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکیدا زۆرترین کاریگەرییان هەیە. هەروەها لە چەندان زانکۆی ئەمریکیدا پلەی فەخریی وەرگرتووە

# پێشەکی

## خێراترین ئوتومبێلی پێشبڕکێ لە جیهاندا

گشت سەردەم و چاخێکی زێڕین کۆتایی خۆی هەیە. ئەوجا هەرچەندە سەردەمەکەش بریسکانەوە و درەوشانەوەی زیاتر بێت، کۆتاییەکەی خێراتر گڕ دەگرێ. ئەو داڕووخانەی کە لە ساڵی ٢٠٠٨ دا ڕووی دا، لە ساڵی ١٩٢٩ تا ئێستە بە خراپترین داڕووخانی دارایی دادەندرێ کە بووە هۆی خراپترین خاوبوونەوەی ئابووری، هەر لە بێبازارییە (الکساد) گەورەکەوە تا دەگاتە ئێستە. تەنانەت کێ ئەو ڕووداوانەی کەوا لە ساڵی ڕابردوودا ڕوویان دا چاوەڕوانکرلو نەبوون؟ لەنێوچوونی نزیکەی ٤٠ تریلیۆن دۆلار لە بەهای پشکەکانی ئابووریی جیهانی؟ و خۆماڵیکردنی گەورەترین دەستگەکانی بارمتە (الرهن) لە ئەمریکا؟ زەبەلاحترین مایەپووچبوون لە مێژوو (لیمان برزرز) و؟ نەمانی بانکی وەبەرهێنان و؟پلانەکانی ڕزگارکردن و هاندانی دارایی لە هەموو جیهاندا بەهایەکەی چەندان تریلیۆن دۆلار بوو. ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کەوا وەك چیرۆك بۆ نەوەکانی داهاتوو دەگێڕدرێتەوە و چەندان شرۆڤەی لەبارەوە دەکرێ.

چۆن گەیشتینە ئەم دۆخەی ئێستە؟ من دەڵێم هۆیە سەرەکی و کرۆکییەکەی ئەم داڕووخانە- وەك گاڵتەیەکی قەدەرەکان- سەرکەوتن بوو. چاریەکی کۆتایی

سەدەی ڕابردوو گەشەكردنێكی دەرهاوێشتە و ناباوی بەخۆیەوە بینی كە تیایدا قەبارەی ئابووریی جیهانی هەر دە ساڵ جارێك دوو هێندە دەبوویەوە، لە ٣١ تریلیۆن دۆلاری ساڵی ١٩٩٩ گەیشتە ٦٢ تریلیۆن دۆلاری ساڵی ٢٠٠٨، لە كاتێكدا هەڵئاوسان بەشێوەیەكی زۆر سەرسوڕهێنەر هەر لە ئاستێكی زۆر نزمدا مایەوە. هەروەها گەشەكردنەكە گەیشتە چەند ناوچەیەكی نوێش. چوونكە لەو كاتەی خانەوادە خۆرئاواییەكان چوونە نێو ماڵ و خانووی گەورەتر و لاپتۆپ و مۆبایلیان دەكڕی، ئەوا جووتیارە هەژارەكان لە ئاسیا و ئەمریكای لاتینیدا كار و پیشەی نوێیان لەو شارانەدا دەدۆزییەوە كەوا زۆر بەخێرایی گەشەیان دەكرد. تەنانەت لە ئەفریقیاشدا خەڵك بۆ فرۆشتنی كاڵاكانیان دەیانتوانی سوود لە بازاری جیهانی وەربگرن. لە گشت شوێنێكدا، نرخی كاڵاكان دادەبەزین و بەهای سامانەكانیش– نرخی پشك و قەواڵەكان و زەویوزار– دەفڕییە ئاسمان، هەروەها سیگنەڵە تێكڕاییەكانی ئابووریشدا زۆر بەسادەیی كۆی ئەم شتانەیان ڕاڤە دەكرد: ساڵەكانی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧– دوو ساڵ بوون كەوا بە تروپكی چاخی زێڕین دەژمێردران– ١٢٤ ولات (دوو سێیەكی – ثلثین- ولاتانی جیهان) گەشەكردنێكی ساڵانەیان وەدەستهێنا كە ڕێژەكەی گەیشتە ٤٪.

چ شتێك بووە هۆی ئەم گەشەكردنە جیهانییە؟ لە ڕاستیدا، مۆنتاج و زنجیرەیەك هێزی سیاسی و ئابووری و تەكنۆلۆژی بوو كە دواتر لەم كتێبەدا بەدرێژی باسی دەكەم.

لە سیاسەتدا، ساڵەكانی دوای ڕووخانی یەكێتیی سۆڤییەت سەقامگیرییەكی ڕێژەیی سیاسی هێنایە ئاراوە. چوونكە لە كاتی جەنگی ساردا، دەیان جەنگی ئەهلی و ناوخۆیی هەڵگیرسان كە یەكێتیی سۆڤییەت پارەی لە زۆربەی بزاڤەكانی یاخیبوون و میلیشیا بچووكەكاندا خەرجكرد، لە زۆربەی

دۆخەکانیشدا، خۆرئاواش پارەی بەخشییە هاوپەیمانەکانی. بە نەمانی کێبڕکێی نێوان ئەو دوو زلهێزە، ژمارەی جەنگەکانی نێوخۆیی کەمبوونەوە، ئەوانەی کەوا هەڵیش دەگیرسان لە سنوور و چوارچێوەیەکی تەسك و زۆر دیاریکراودا بوون. بێگومان، لەمەدا دۆخی دەرهاوێشتەییش هەبوون، وەك جەنگە دڕندانە ناوخۆییەکەی کۆنگۆ لە نەوەدەکان و ئەو تیرۆر و تۆقاندنەی کەوا ئەلقاعیدە جڵەوی بۆ بەردابوو. بەڵام، بەشێوەیەکی گشتی، جیهان لە قۆناغ و ماوەیەکی سەقامگیری و ئاشتیی ئەوتۆدا ژیا کە پێشتر هەرگیز بەخۆیەوەی نەبینیبوو. ژمارەی قوربانیانی توندوتیژیی سیاسیش لە نزمبوونەوەی بەردەوامدا بوو.

لە لایەنی ئابووریدا، لەگەڵ داڕووخانی کۆمۆنیزم سەرمایەداریی بازاڕەکانی ئازاد تاکە ڕێگەی کردارییانەی بەڕێوەبردنی ئابووری بوو، ئەمەیش حکومەتەکانی زۆربەی وڵاتانی هان دا بینە بەشێك لە سیستمی ئابووریی نێودەوڵەتی. هەروەها ڕێککەوتنامەکان و ڕێکخراوەکانی نوێ- وەك ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی- کاری بۆ کەمکردنەوەی بەربەستەکانی بازرگانی و یەکخستنی جیهان کرد، جا وڵاتانێکی زۆر لە ڤێتنامەوە بگرە هەتا دەگاتە کۆلۆمبیا، درکیان بەوە کرد کە ناتوانن بەرگەی ئەوە بگرن لە هەنگاوهەڵێنانیان بەرەو گەشەکردن لە دەرەوەی ئەم کێبڕکێیە جیهانییەدا بن، بۆیێ چەند سیاسەتێکی دانایانەیان گرتەبەر کەوا کاری بۆ دابەزاندنی ئاستی قەرز و کۆتاییهێنان بە قەرزە مەرجدارەکان دەرکرد؛ نەك لەبەرئەوەی کەسانی وەك بۆب ڕۆبن یان هانك بۆلسۆن و هتد ناچاریان کردبن ئەو کارانە بکەن، بەڵکو لەبەرئەوەی توانیان سوودی هەنگاونان بەرەو ئەو ئاراستەیە و (هەروەها ئاقیبەتە خراپەکەی ئەنجامنەدانی ئەمە ببینن). ئەم ڕیفۆرمانە وەبەرهێنانە بیانییەکانی هان دا و دەرفەتی نوێی کاری ڕەخساند.

لە هەمان کاتیشدا، بانکەکانی مەرکەزی وردەوردە فێری ئەوە دەبوون چۆن بەسەر توندیی خولی بازرگانیدا زاڵبن و کەمتری بکەنەوە، ڕێگەی لێ بگرن بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ڕوودانی وەرچەرخانی کتوپڕ و کاروپیشە و پارە پاشەکەوتەکان وێران بکات و ببێتە هۆی ناسەقامگیری و شۆڕش. با وەك نموونە باسی ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا بکەین: لە ماوەی نێوان سالی ١٨٥٤ و ١٩١٩ دا چەقبەستن (الركود) هەر چوار ساڵێك ڕووی دەدا و لە هەر جارێکیشدا دوو ساڵی تەواو بەردەوام دەبوو. بەڵام لە دوو دەیەی کۆتاییدا، ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا لەنێوان ماوەکانی ئەو چەقبەستنەی کەوا تەنیا بۆ ماوەی هەشت مانگ لە هەر جارێکدا بەردەوام دەبوو، هەشت ساڵ گەشەکردنی بەردەوام و پێ بەپێی بەخۆیەوە بینی. ئەو قۆناغەی سەقامگیری دەرئەنجامی چەندان دەیەی بەگژداچوونەوە و بەرەنگاربوونەوەی هەڵئاوسان بوو. بانکەکانی مەڵبەندی لە پۆل فۆلکرەوە لە هەشتەکان جەنگێکیان بەدژی هەڵئاوسان هەڵگیرساند و تیایدا ئامرازی زۆر توندوتیژانەیان لە سیاسەتی دراویدا بەکارهێنا، ئەوەش لەپێناو ئەوەبوو کە نرخی کاڵاکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی بە سەقامگیری بمێنێتەوە. ئەو تەکتیکانەی کەوا لەو جەنگەدا چاککران یەکێك بوون لە گرنگترین هەناردەکراوەکانی ئەمریکا. چوونکە لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٠٧دا تەنیا بیست و سێ دەوڵەت تێکڕای هەڵئاوسانیان لە سەدا دە بوو، لە کاتێکدا تەنیا یەك وڵات – زیمبابۆی– دووچاری هەڵئاوسانێکی زۆر و زێدەڕۆ ببوویەوە.

لە بواری تەکنۆلۆژیادا، شۆڕشی زانیاریی کرداری لەدایکبوونی یەك جۆرە ئابووریی جیهانی خێراتر کرد. چوونکە تێچووی پەیوەندییەکان دابەزی و زانیارییەکان لە گشت شوێنێکدا بەردەست و ئاسان بوون، ئەمەیش کردەی یەکبوونەکەی ئاسانکرد. بەشێوەیە زۆر بەکتوپڕی مارکێتێکی فرۆشتنی

کەرەستەی وەرزشی لە نیبراسکا دەیتوانی کەرەستەکانی خۆی لە ولاتی چیندا هاوردە بکات و بیفرۆشێتە ئەورووپا و پەراوەکانی حیساباتەکانی لە بانگالۆردا بەراورد و هاوسەنگ بکات.

بەلأم کاریگەرییە لاوەکییە سەرەکییەکانی کۆی ئەم سەرکەوتنانە-هەلئاوسانێکی بەرێژە کەم و گەشەکردنی جیهانی و پێشکەوتنی خێرای تەکنۆلۆژی- خۆی لە کۆتایی مەترسییەکەدا دەبینییەوە. لە نەوەدەکاندا، پیاوانی کار زۆر بە تەقییە و خۆپارێزییەوە خۆیان لە مەترسییەکانی سیاسی بەدووردەگرت؛ واتا مەترسی سەر گەشەکردنی ئابووری لە کودەتایەکان و هێرشە تیرۆرستییەکان و شلەژانەکانی کۆمەلأیەتی. بەلأم مەترسییەکە زۆر کەم بوو. چوونکە ئەگەر کودەتایەکیش ڕووی بدابووایە، ئەوا سیستمە نوێیەکە ڕووبەڕووی هەمان کۆتوبەندەکان و دەرفەتەکانی ئابووریی جیهانی دەبوویەوە. هەرچەندە تیرۆر و تراژیدیایەکانی جۆراوجۆر هەبوون، بەلأم لەگەلّ ئەمەیشدا سەقامگیرییە بونیادییە سیاسییەکە بەردەوام بوو کەوا جیهانی دوای جەنگی سارد پێی دەناسرایەوە.

بەلأم ئەم پیاوانەی کار گرنگییەکی هاوشێوەیان بە گرفتە زۆر بارەکەی خۆیان نەدا کە ئەویش بریتی بوو لە مەترسیی ئابووریی. ئەوان وەها شیمانەیان کرد-کەسانی وەك گرینسپان- گەشەکردنی بەرهەمەکانی ئالۆزی دارایی لە میانی دابەشکردنی بەگشت ئاراستەکاندا، بەشێوەیەکی کرداری مەترسییەکەیان کەمکردووەتەوە. ئەوان پێیان وابوو کە ئاستەکانی قەرز کە پێشتر بە مەترسی دادەندرا، ئێستە زۆر بەسانایی چارە دەکرێ؛ ئەمەیش بەپێی ئەو هەلومەرجەی کەوا بەشێوەیەکی بەردەوام گۆڕاوە (وەك خۆیان شیمانەیان کرد). لە ئەنجامی ئەمەدا، وەبەرهێنەرەکان ئامادەبوون دەرامەت و قازانجێکی بەرێژە کەمیان

دەستکەوێ لە بەرانبەر ئەوشتانەی کە –لە هەلومەرجی سروشتیدا– بە وەبەرهێنانی مەترسیداریان دەزانی. جیاوازییە (الائتمانییەکان)ی– جیاوازییان لە قازانجی نێوان قەواڵەکانی خەزێنەی ئەمریکی وەدەستهێنا (U.S treasury bond) کەوا لەجیهاندا بە سەلامەتترین دادەندرێ، هەروەها لەنێوان قەواڵەی ئەو کۆمپانیایانەی کەوا دۆسییەی کار و دەستکەوتەکانی پێشوویان دیاریکراو بوو– واتا لە ڕووی مێژووییەوە بە نزمترین ئاست دادەندرا. بۆیێ وڵاتانی ناسەقامگیری وەك ئیکوادۆر و کۆمپانیا لەرزۆکەکانی وەك گرایسلەر توانیان بەهەمان نرخی هەرزان قەرز بکەن کەوا حکوومەتی ئەمریکی بەهۆیەوە قەرزی دەکرد.(بێگومان لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٠٩ دا ئیکوادۆر لە دانەوەی قەرزەکانی دواکەوت، هەروەها کرایسلەر تەنیا بەهۆی دەستی یارمەتیی لەلایەن حکوومەتەوە ئەویش لە دوا ساتدا توانی خۆی ڕزگار بکات). جا لەگەڵ ئەوەی سوو (قازانج) ی قەرزەکە زۆر کەم و نزمبوو، ئەوا وەبەرهێنەران و خاوەن خانووەکان بەشێوەیەکی زۆر زێدەڕۆیانە دەرفەتیان لێی وەرگرت، بەشێوەیەك ئەوان لە توانای خۆیان زیاتریان خەرجکرد، ئەوەی کە دڵنیایی دەبەخشییە بانکەکان و وەبەرهێنەکانیش کەوا گشت داراییەکی هەرزانیان پێدەدرا (واتا سووی کەم) خەزێنە پەنناوەکانی کۆمپانیاکان بوو– لەگەڵ قازانجێك کەوا بەرێژە دوو ژمارەی دەبی بۆ ماوەی هەژدە چارەگی بەدوا یەکداهاتوو – لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٢ و ٢٠٠٦دا– و دابەزینی تێکڕایەکانی مایەپووچبوون لەژێر ئاستی ئاساییدا. کاتەکان هێندە دڵخۆشکەرانە دەهاتنە بەرچاو وەك بڵێی هەرگیز کۆتاییان نەیەت.

دەکرێ ئابووریی جیهانی بە ئۆتۆمبێلێکی گرانبەهای زۆر خێرا بچوێنین کەوا توانای سەرسوڕهێنەر و توانای کارکردی وەهای هەیە کە سەری مرۆڤ

دەسوڕمێنێ. لە میانی دەیەی ڕابردوودا، هەمووان ئەو ئۆتۆمبێلەیان هاژووا، ڕژانی مادەی ئەدرینالین بەنێو خوێندا و هەستکردن بە ئەشئەیان تاقیکردەوە. بەلام، گرفتێك هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە کەسێك بەتەواوەتی نەیدەزانی – هەر وەك دەرکەوت– چۆن ئۆتۆمبێلێکی لەمشێوە بهاژوات. ئابووریی جیهانی لە میانی دەیەی ڕابردوودا بووە شتێك کە هیچ کەسێك پێشتر نەیناسیوە و نەیبینیوە– سیستمێکی یەکگرتوو کە لە ١٢٥ ولات پێکهاتبوو، هەر هەمووان بەشدارییان تیایدا دەکرد و هەرهەموشیان بەخێراییەکی وەها ڕێگەیان دەبڕی کەوا پێشتر تاقییان نەکردبوویەوە– وەك ئەوەی ئەم ئۆتۆمبێلە لە لایەن ١٢٥ شوفێری جیاجیاوە بهاژووڕێت (بەبێ ئەوەی کەسێك بیر لەوە بکاتەوە دەبل و سپرینگی کەمکەرەوەی ئاسەکان بکرێت).

## گرفتی قەرز

لە ڕاستیدا، هەندێك هەبوون کە ویستیان دەبل و سپرینگی هێورکەرەوە و کەمکەرەوەی ئاسەکان بکرێن، بەلام لە سالەکانی خۆشگوزەرانی و گەشەکردندا وەك بەرهەلستکار داندران. ئەم بەرهەلستکارانە پرسیاریان لە هۆی پۆلینکردنی پارێزەری بارمتە نارەندییەکانی زەویوزارکرد بە هەمان ئاستی ئەو قەوالانەی کەوا لە کۆمپانیای جەنەڕال ئەلیکتریك دێن لە ڕووی سەلامەتییەوە. بەلام، گشت سالێك بە ڕاپۆرتێك کۆتایی دەهات کەوا لەهەمبەر قازانج و مووچەی ملیارێك دۆلار بۆ بەڕێوەبەری سندووقی دەستەبەرکردن (hedge fund) دلڕفێن و نەقلڕفێن بوو، ئەمەیش وایکرد دەنگی بەرهەلستکاران سال لە دوای سال نزمتر بێتەوە. جۆرە بژارکردنێکی سرووشتیی پێچەوانە لە وول ستریت هاتە ئاراوە، یان بە گوزارشتی بویکین کوری– کە بەڕێوەبەری کارگێڕیی کۆمپانیای ئێجل کاپیتال بوو – کە دەلێ لە ماوەی بیست سالی ڕابردوودا " ترشی نارەکیی گشت

دەستگەکانی دارایی بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار گۆڕاوە. هەموو جارێك کەوا یەکێك لە دانیشتووانی سەرمێز بۆ زیادکردنی بەرزکەرەوەی دارایی فشاری دروست دەکرد، ئەوا چەند ساڵێکی کەمی دواتر ئەوەی دەسەلماند کە ئەوان لەسەر هەقن. بۆیێ ئەو کەسانە زیاتر بوێرییان پەیدا دەکرد و و دەستپەلاتێکی زیاتر و زیاتریان بەسەر سەرمایەدا پەیدا دەکرد. لە کاتێکدا هەر کەسێکی بەرپرس ئەگەر ڕاراییەکی پیشان بدابووایە یان پاڵپشتیی پابەندبوونێکی تەقیەکارانەی کردبایە، ئەوا کات هەڵەکەی دەسەلماند. ئەوسا ئەو کەسە تەقیەکارانە زیاتر دەترسێندران و پلە و پۆستیان بەرز نەدەکرایەوە و کۆنترۆڵیان بەسەر سەرمایەدا نەدەما".

وارن بافیت دەڵێت کرۆکی گرفتەکە خۆی لە زیادبوونی بەردەوامی ئاستەکانی بەرزکەرەوەی داراییدا حەشارداوە (ئەم وشە بە بریفوباقەی کەوا وول ستریت بۆ وەسفکردنی قەرز بەکاری دەهێنێ): تاکە ڕێگەی شکستخواردنی کەسی زیرەکە. تۆ کاری زیرەکانە دەکەیت و لە کۆتاییدا زۆر دەوڵەمەند دەبیت. بەڵام ئەگەر کاری زیرەکانە بکەیت و بەرزکەرەوەکە بەکاربێنیت و لە ڕەوتەکەدا یەك هەڵە بکەیت، ئەوا دەبێتە هۆی لەنێوبردنت، چوونکە هەر شتێك جارانی سفر بکرێت هەر سفر دەردەچێت. بەڵام، کاتێك گشت کەسانی دەوروبەرت کارەکانیان بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەنجام دەدەن و تۆیش کارەکانت بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەنجام دەدەیت، ئەوا مەسەلەکە زیاتر بە چیرۆکەکەی سەندرێلا دەچێت لە ئاهەنگی سەماکردندا. گەنج و تولازەکان لە باشترین دۆخدان، مۆزیکەکەش لە باشترین دۆخدایە، چێژ وەرگرتن زیاتر و زیاتر دەبێت، لە مێشکی خۆتدا بیر دەکەیتەوە و دەڵێیت: " بۆچی دەبێ چارەگە سەعاتێك پێش

هاتنی دوانزەی نیوەشەو برۆم". ئەمە بەکورتی و بەچەند وشەیەکی زۆر کەم، چیرۆکی گەیشتنمانە بە تراژیدیای ساڵی ۲۰۰۸.

بەپێی یەکێك لە ئاستەکان، قەرز تەوەری تەواوی چیرۆکەکەیە. هەر لە سەرەتای هەشتایەکانەوە ئەمریکییەکان هێندەی حەزی بەکاربردنیان هەیە هێندە بەرهەم ناهێنن؛ جیاوازییەکەش بە قەرزکردن قەرەبوو دەکەنەوە. ئەمە لە گشت ئاستەکانی حۆاکەکەیاندا بەڕێوە دەچوو، چوونکە ڕێژەی قەرزی خانەوادەیی لە ٦٨٠ ملیار دۆلاری ساڵی ١٩٧٤ بۆ ١٤ تریلیۆن دۆلاری ساڵی ۲۰۰۸ بەرزبوویەوە (تەنیا لە ماوەی حەوت ساڵی دواییدا دوو هێندە بوویەوە). خانەوادەیەکی مامناوەندی لە ئێستەدا ١٣ کرێیتد کارتی هەیە و ڕێژەی 120,000 دۆلار لەسەر شێوەی بارمتەی بواری زەویوزار (العقاری) قەرزارە. لەگەڵ ئەمەیشدا، خانەوادەکان پێشتر بەپێی هەندێك پێوەر بە لووتکەی دەستپێوەگرتن و پاشکەوتکردن دادەندران. سیاسییەکان لەسەر ئاستی ویلایەتەکان و لۆکاڵیدا-پەرۆشی ئەوەن باریگە نوێیەکانی تۆپی سەبەتە و ڕێگەکانی خێرای هەشت ئاراستەیی ببەخشنە ئەو کەسانەی هەڵیاندەبژێرن بەبێ ئەوەی باج (زەرائیبەکان بەرزبکەنەوە- ئەوانیش بەرۆڵی خۆیان دەستیان بە قەرزکردن کردووە. جا لەپێناو ئەمەدا چەند قەوالە (سندەکان) بەخشینێکی پڕۆژە تایبەتەکانیان دەرکردووە، یان ئەو قەوالانەی پشت بە باجە ئایندەییەکان دەبەستێ یان ئەو قازانجانەی لە یانسیبەکانەوە دەستدەکەون. بەڵام تەنانەت خودی ئەو سیاسییانە بەبەراورد لەگەڵ مولکی قەرز وەرگرەکان: حکوومەتی فیدراڵی شتێکی ئەوتۆ نەبوون. چوونکە لە ساڵی ۱۹۹۰دا ڕێژەی قەرزی نیشتمانی گەیشتە ۳ تریلیۆن دۆلار. دواتر و لەگەڵ کۆتاییهاتنی ساڵی ۲۰۰۸ گەیشتە سەرووی ١٠ تریلیۆن دۆلار (ئێستەیش – واتا لەکاتی نووسینی ئەم چەند دێرە–

گەیشتووەتە 10,9 تریلیۆن دۆلار). لە کاتژمێرە بەناوبانگە نیشتمانییەکەی قەرزدا کەوا کەوتووەتە شاری نیویۆرک شوێنێك نەماوە بۆ ئەوەی هەموو خانەکان پیشان بدات، ئێستە خاوەنەکانی پلان بۆ ئەوە دادەڕێژن لەمساڵدا یەکێکی نوێتری فراوانتر دابنێن.

بە واتایەکی دیکە، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بووەتە گەلێکی قەرزدار، گرفتەکەش لە خودی خۆیدا قەرز نییە: چوونکە قەرز و بەرزکەرەوەکانی دارایی، ئەگەر بە داناییەوە بەکارمانهێنان، ئەوا دوو هێزی جوولێنەری ئابووریی هاوچەرخن، بەڵام گەیشتنی (واتا قەرز) بەم ئاستە نەخۆشییەکی کوشندەیە. بۆیێ دەبێ هەردوو لای هاوکێشەکە هاوسەنگ بکرێ؛ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا نەدەگەیشتە ئەم دۆخە ئەگەر چەندان دەوڵەت نەبووان قەرزی پێبدەن. لێرەوە متمانەی سیاسی و ئابووریی بۆ جیهانی تازە گەشەکردوو هات- بووژانەوە و گەشەکردنی ئەوانی دیکە هەروەك چۆن من ناوی دەبەم- باشترین بەرجەستەکاری ئەم دۆخەش گەشەکردن و ڕابوونی وڵاتی چینە.

هەرچەندە چەند ساڵێکی گەشەکردن هەبوون کەوا دڵخۆشکەربوون، بەڵام خانەوادە و کۆمپانیاکانی چین زۆر بەئاگایی و تەقیەوە مامەڵە دەکەن. چین نیوەی دەستکەوت و دەرامەتەکانی بۆ ڕۆژی ڕەش پاشەکەوت دەکات. ئەم پاشەکەوتە زیاد لە ئەندازەیە و هەروەها ئەو گەشەکردنە مەزنە، بوونە هۆی کەڵەکەبوونی سەرمایەیەکی زەبەلاح لە چیندا. بەڵام ئەم مەسەلەیە هیچ پەیوەندییەکی بە کەلتووری کۆنفۆشیوسییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە سیاسەتی حکوومییەوە هەیە کەوا ئامۆژگاریی خەڵکی کردووە پارە خەرج نەکەن و بەشێوەیەکی بەشەکیش هانی پاشەکەوتیشی داوە بۆئەوەی دەستەبەری ئەوە بکات ڕێژەی هەڵئاوسان بە نزمی و دراوەکەی بەهەرزان بهێڵێتەوە: ئەمەش

وایکردووە کاڵای چینی نرخی کەم بێت و بۆ بەکاربەری خۆرئاوایی سەرنجڕاکێش بێت. جگە لەمانەیش، وڵاتانی وەك چین بەهۆی قەیرانی ساڵی ١٩٩٦ی ئاسیاوە زۆر بێزاربوون کاتێك ئابووریی ئاسیایی داڕما و کەسانی بانکیی خۆرئاوایی بەهانایەوە هاتن، بەڵام بە مەرجی زۆر قورس. لەبەر ئەم هۆیە، حکومەتەکانی ئاسیایی و (حکوومەتەکانی دیکەی دەرەوەی ئاسیاش) دوای گەڕانەوەی تەندروستیی ئابوورییەکەیان، بڕیاریان دا یەدەگە تایبەتەکانی خۆیان کەڵەکە بکەن بۆ ئەوەی ناچار نەبن جارێکی دیکە پشت بە بەزەیی و لوتفی کەسانی بێگانە ببەستن.

بەمشێوەیە، لەجیات سەرلەنوێ وەبەرهێنانەوە لە پاشەکەوتە زۆرەکانی نێو ئابووریی نیشتمانی، ئەوا دەستهەڵاتەکانی چین کاریان بۆ پاشەکەوتکردنی کرد. بەڵام، حکوومەت چۆن پارە و داراییەکانی عەنبار دەکات؟ بە کڕینی ئەو شتانەی کە لەو کاتیدا و تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت—بە سەلامەتترین وەبەرهێنان دادەندرێ لەجیهاندا: قەواڵەکانی خەزێنەی ئەمریکی. جا لە میانی کەڵەکەکردنی ڕێژەیەکی زەبەلاحی قەرزی ئەمریکی، مەسەلەکە لەلای چینییەکان وەها کۆتایی هات پاڵپشتیی ئەو ڕەفتارە بکەن کە بووە هۆی ئەمە، ئەویش لایەنی بەکاربردنی ئەمریکییە. چوونکە ئەوان پاڵپشتیی ئەو زێدەڕۆییەی ئێمەیان کرد کە لە خەرجکردندا دەیگرینەبەر، پاڵشتییەکەش بەبەخشینی قەرز بوو بە ئێمە، بەمەیش عەنبارکراوێکی فراوانیی قەواڵەکانی قەرزیان بە دۆلار کەڵەکەکرد.

چین تاکە قەرزدەر نەبوو، چوونکە هەشت وڵاتی دیکەی بازاڕی تازەگەشەسەندوو بۆ دابینکردنی خەرجییەکانی جەنگ دەستیان بە کۆکردنەوەی سەد ملیار دۆلار یان زیاتر کرد کە بەشی هەرە زۆری بە دۆلار بوو. بەڵام چین جارێکی دیکە بەتەنیا سەرلیستی یەدەگی دراوی بیانی بوو کە بریتیبوو لە دوو

تریلیۆن دۆلار! و زۆربەی بە دۆلار بوو. لە ئەیلوولی رابردوودا، چین بووە گەورەترین قەرزدەری بیانی کە قەرزی بە ئەمریکا بەخشیبێت، لەمەیشدا یابانیشی تێپەراند کە ئیدی چیتر رێژەیەکی گەورەی قەوالەی خەزێنەی ئەمریکی نەدەکری. (بە وەدەستهێنانی مافی رەفتارکردن (الحیازە) لەسەر ١٠ لەسەدای قەوالەکانی خەزێنەی ئەمریکی کە تا ئێستە نەدراوەتەوە، چین بە مەزنترین قەرزدەر دادەندرێ بۆ ئەمریکا، ئەمە راستە، بەلام خەزێنەی ئەمریکی بەدوای قەرزکارانی ناوخۆییدا ناگەرێ).

بەلام زێدەرۆییکردن لە پاشکەوتدا لەسەر ئاستی جیهانیدا، ئەوەی سەلماند کە گرفتێکە و هیچی کەمتر نییە لەو زێدەرۆییەی کەوا لە بەکاربردندا پیادە دەکرێ. چوونکە ئابووریزانێکی زانکۆی هارفارد بەناوی دانی رۆدریک ئەوە دەخەملێنێ کە ناردنی رێژەیەکی زۆری پارە و دارایی بۆ دەرەوە لەجیات وەبەرهێنان و سوود لێوەرگرتنی بەشێوەیەکی بەرهەمهێنەرانە، خالّی سەدی لەسەر چین دەسەپێنێ لە کۆی بەرهەمە لۆکالّییەکانی سالّێکدا، یانیش زیاتر لە ٤٠ ملیار دۆلاری سالانەی تێدەچێ. هەروەها قەرزی چینی بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا زیاتر بەبەرنامەیەکی زەبەلاحی هاندان دەچێت، چوونکە تێکرای سوودەکانی لە نزمی هێشتەوە، ئەمەیش هانی کەسانی خاوەن خانوو و مالّی دا دەستکاریی قەرزەکانیان بکەنەوە، هەروەها پالّی بە بەرێوەبەری سندووقەکانەوە نا لە زیادکردنی بەرزکەرەوە داراییەکەیاندا کردەی پارێزسازی (hedging) بکەن، هەروەها هانی بانکەکانی وەبەرهێنانیشی دا گوژمەکانیان فراوان بکەن. هەر سەبارەت بەم مەسەلەیە، نووسەرێکی رۆژنامەی فاینێنشال تایمز بەنێوی مارتن وولف دەلێ:" قەرز وەرگرتن لە چین پارەی کەمبەهای

بەرهـــەمهێنا، " پـــارەی كەمبـــەهاش چ لـــەڕووی قـــەرزكردن و چ لـــەڕووی خەرجكردنەوە تەوژمێكی بەهێزی داهێنانی دارایی دروستكرد".

هـەروەها وولـف دەڵـێ: " ئیـدی وەك جـاران ناتوانـدرێ بچینەوە سـەر كـار". واپێدەچی وەك شتێكی قەدەری بەسەرماندا سەپێندرابێ كە ئەم دۆخەی ئێستە بـۆ ماوەیـەكی زۆر درێـژە بكێشـێ. چـوونكە پـێش ماوەیـەكی كـەم لـە دەستبەكاربوونی باراك ئۆباما هۆشداری دا كە ئەگەری ڕوودانی" كورتهێنانێك لە ساڵی ئایندەدا هەیە كـە بەهایەكـەی تریلیۆنێك دۆلارە "، لـەو كاتـەی ئیدارەی نـاوبراو مەسـەلەی دەسـتكاریكردنی قـەبارەی خەرجییـەكانی خسـتووەتە بەرنامەوە)، ئەوا بەسەر گشت شتێكدا پیادەی دەكات؛ لە تەكنۆلۆژیای سەوزە وە بگـرە تـا دەگاتـە چـاودێریكردنی تەندروسـتی و دووبـارە بونیادنانـەوەی ئابووریيە و فشۆڵەكە، ئێمەیش ناچار دەبین زۆربـەی ئـەم پارەوپوولـە لـە چین قـەرز بكـەین. بـەلام چـینییەكانیش بەدەسـت گرفتـە تایبەتـە ئابوورییـەكانی خۆیانـەوە دەنـاڵێنن و ئێسـتە ٦٠٠ ملیـۆن دۆلار (واتـا ١٥٪ تێكـڕای داهـاتی لۆكاڵییـان) لـەپێناو چارەسـەركردنیدا خـەرج دەكـەن. واتـا ئێمـە داوا لـە چین دەكەین كە لە یەك كاتدا پارە بۆ دوو لە گەورەترین فراوانبـوونی دارایـی تـەرخان بكات كە بۆ یەكەم جارە مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوەی بینیوە واتا فراوانبوونی خۆمان و ئەوانیش. ئەمریكا گشت ئـەو هۆیانـەی هەیە كـەوا پـاڵی پێوە دەنێت دەسـتبلاوی لـە قەواڵـەكانی خەزێنەكەیدا بكـات. جـا بـەبێ ئـەم دەسـتبلاوییە هەناردەكانی چین دووچاری گرفت و نەخۆشـی دەبێتـەوە و تێكڕایـە بـەرزەكانی گەشەكردنی بەرەو سفر دادەبەزێ.

بەلام چینییەكان هێشتا چەند بژاریكیان لەبەردەستدا ماوە. بەپێی ڕا و بۆچوونی جۆزیف ستیگلیتزی خاوەن خەلاتی نۆبڵ لە ئابووریدا، " چینییەكان لـە هـەوڵی

خۆیان بەردەوام دەبن بۆ ئەوەی بەردەوامی ببەخشنە لایەنی بەکاربردنی ئەمریکی، بەلام ئەگەر ئەوەیان بۆ ڕوونبوویەوە ئەمە شتێکی بەرهەمدار نییە، ئەوا بێگومان پلانی جێگرەوەیان هەیە". پلانە جێگرەوەکەش بریتییە لە پتەوکردن و پالپشتیکردنی لایەنی بەکاربردنی چینی ئەویش لە میانی خەرجکردنی حکومییانە و زیاتر پشتبەستن بە گەلەکەی خۆی. لەمبارەیەوە نیال فێرگیسۆنی مێژوونووس دەڵێ" : پرسیارە گەورەکە لە ئێستەدا ئەوەیە ئاخۆ چین–ئەمریکا (چین و ئەمریکا) بەیەکەوە دەمێننەوە یان بەهۆی ئەم قەیرانەوە ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە. ئەگەر لەگەڵ یەکتری مانەوە، ئەوا ڕێگەی دەربازبوون لە دارستانەکەدا دەدۆزیتەوە. بەلام ئەگەر لەیەکتری جیابوونەوە، ئەوا ماڵئاوایی لە جیهانگەرایی بکە".

باشترین سیناریۆ ئەوەیە چین و ئەمریکا لەپێناو پچڕاندنی ئەو کەلەپچە خۆکوژییەدا بەیەکەوە کاربکەن کەوا هەردووکیانی بەیەکەوە بەستووەتەوە. چین بەهەبوونی پارەیەکی زۆر سوودێکی زۆر گەورە دەبینێ بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لە ئابوورییە نێوخۆییەکەیدا وەبەری بهێنێ، هەروەها ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایش سوودمەند دەبێت، ئەویش لە میانی ناچارکردنی بۆ دەرکردن و پیادەکردنی چەند بڕیارێکی دژوار کەوا لە کۆتاییەکەیدا بارودۆخەکەی بەرەو باشتر دەبات. چوونکە بەلای کەمەوە لە هەشتاکانەوە ئەمریکا درکی بەوە کردووە کە دەتوانێ بە دەستبلاوییەوە خەرج بکات، کاتی دانەوەکەشی بۆ کاتێکی نادیار دواخستووە. ئەمەیش بۆ سیاسەتی دەرەوە و ناوخۆییشی کارێکی باش نەبوو، چوونکە ئەمە وایکرد واشنتۆن لووتبەرز و تەنبەڵ و گوێپێنەدەر بێت، بەلام ئەم خووڵ و گەشتە بەخێراییە گەیشتە کۆتاییەکەی.

## گوڕوتاو بەرەو جیهانی دوای ئەمریکا

هەرچەندە ئاست و مەودای ئەم قەیرانە داراییە لە هەموو ئەو شتانە گەورەترە کەو بتوانین لە یادگەی دووەمەودادا بیپارێزین، بەلآم ڕووداوێکی نائاسایی و دەگمەن نییە. چوونکە هۆڵەندییەکان بەهۆی گوڵەکانی توليبەوە لە سەرەتایەکانی سەدەی حەڤدەیەمدا بەتەواوی شێتبوون؛ هەروەها لە چلەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا شەیدایی بۆ هێڵی ئاسنین دووچاری بریتانییەکان بوو. تەنانەت لە چەند دەیەیەکی ڕابردوودا، ترازیدیایەکی دارایی لە مەکسیک و ئەرژەنتین و بەرازیل و گشت ولآتانی ئەمریکای لاتینیدا دروستبوو. لە نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا ڕووسیا و هەموو ئەوانەی لە تەوەرەی ئەودابوون، مایەپووچ و قەلۆش بوون. دواتر لە کۆتایی ئەو دەیەیەدا پەتایەکە ئاسیاشی گرتەوە. هەروەها ڕووخانی بەڕێوەبەرایەتیی سەرمایە بۆ دووەمەودا Long-Term Capital Management– یەکێك لە گەورەترین سندووقی پارێزسازی(hedging) لە جیهاندا لە سالّی ١٩٩٨ هێندە تۆقێنەربوو کە بانکی یەدەگی فیدراڵی بۆ ڕێگەگرتن لە داڕووخانی سیستم هەڵمەتێکی ڕزگارکردنی دەستپێکرد.

ئەوەی قەیرانی سالّی ٢٠٠٨ بەوردی جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە لە ناوچەیەکی دواکەوتووی جیهانی تازەگەشەسەندوودا ڕووی نەداوە، بەڵکو لەنێو جەرگەی سەرمایەداریی جیهانیدا– ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا– ڕووی دا و دواتر بەنێو شادەماری سیستمی دارایی نێودەوڵەتیدا ڕێگەی خۆی بەرەو شوێنی دیکەش بڕی، گەرچی هۆشداری لە کۆتاییهاتنی سەرمایەداری نادات– وەك هەندێك شارەزا بۆی دەچن– بەلآم تا ئاستێکی زۆر بەرز بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا واتای کۆتاییهاتنی جۆرێکی دیاریکراوی هەژموونی جیهانی دەگەیەنێ. هەڵچوون و تەوژمی ئابووریی هەنووکەیی هەنگاوی چوونە نێو

جیهانی دوای ئەمریکا خێراتر دەکات. چوونکە ئەگەر جەنگی عێراق و سیاسەتی دەرەوەی جۆرج دەبلیو بۆش بوونە هۆی لادانی سیفەتی ڕەوایی (شەرعی) لە دەستهەلاتی سیاسیی- سەربازیی ئەمریکا لە چاوی جیهاندا، ئەوا قەیرانی دارایی دەبێتە هۆی لادانی ڕەوایی لە دەستهەلاتە ئابوورییەکەی.

ڕا و بۆچوونی خەڵك سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی هەرچۆنێك بێت، ئەوا هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ئابوورییەکی نوێگەراتر و پێشکەوتووتر و بەرهەمدارتری هەیە لە جیهاندا؛ بازاڕە داراییەکەیشی هەروایە. لە ئەنجامی ئەمەدا، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا هەر تەنیا لە بواری هێزی سەربازی و دیبلۆماسیدا هەژموونی بەسەر جیهاندا پەیدا نەکرد، بەڵکو لە بواری هزریشەوە هەژموونداره. باشترین بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە ئەوەیە کە بەڕێوەبەرانی بانکەکانی نێوەندی و وەزیرانی دارایی لە هەموو جیهاندا بنەمایەکانی پیشەکەی خۆیان لە قوتابخانەکانی ئەمریکادا خوێندووە، هەروەها سیاسییەکانیش ئابووریی خۆیان بە پێرەوکردنی ئەو ئامۆژگارییانە پێشخست کە لە لایەن کۆڕایی واشنتۆنە پێشکەش کرابوو، داهێنانەکانی سیلیکۆن فالی جێگەی ئیرەیی پێبردنی هەموو جیهان بوو. بازاڕە قازانجکار و قووڵەکانی نیویۆرك لە لایەن گشت کیشوەرەکانەوە لاسایيان کرایەوە تەنیا جەمسەری بەستووی باشوور نەبێت.

جیهانگەرایی دوای جەنگی دووەمی جیهانی، بەپێی گوزارشتی براد سێتسەری (ئەندامی ئەنجومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە) تا ئاستێکی زۆر هاوواتا و هاوتای بە ئەمریکیکردن بوو. هەروەها دەڵێ: " قەرزکارانی بەرنامەی بیانی بۆ کۆکردنەوەی پارە حەزیان بە دەرکردنی ئەو ئەوالانە دەکرد کەوا بە دۆلار ناسێندرابوو، هەروەها یاسای نیویۆرکیان بەکاردەهێنا و لە هەمبەر دۆزینەوە و

ئاشکراکردنیدا پابەندی پێوەرەکانی لیژنەی کاغەزەکانی دارایی بوون ". لایەنی بەکێشکردنی هێزەکان و دەستگەکانی ئەمریکی بەهۆی سەرکەوتنی ئابووریی وڵاتەکەوە پاڵپشتیی لێ دەکرا.

داڕووخانی وول ستریت میراتی ئەم سەرکەوتنە زۆر لاواز دەکات، ئابووریی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠٠٩دا دەپووکێتەوە یان خاو دەبێتەوە، ئەگەری ئەوەش هەیە ساڵەکانی دوای ئەم ساڵەش بەهۆی قەرزەوە بەهێواشی گەشە بکات، لەمەیشدا زۆربەی وڵاتانی ئەورووپی لەگەڵ ئەمریکا لەسەر هەمان کەشتیدا دەبن. زۆر سروشتییە کەوا چالاکیی ئابووریی شوێنە جیاجیاکانی جیهان بەهۆی ڕووخانی جیهانی یەکەمەوە کاریگەر ببن. گەرچی پارەدانەکە (التمویل) بەشێوەیەکی هەمەکی بەجیهانی کراوە، ئەوا بازاڕەکانی دراو و ئابووری لە گشت شوێنێکدا پێی کاریگەر بوون. بەڵام ئابوورییەکانی کرۆکی (الجوهریە) لە بازاڕە تازە گەشەکردووەکاندا– چین و هیند و بەرازیل– بەپێی پێویست گەورەن و چالاکییەکی تایبەت بەخۆیان هەیە (خواستی لۆکاڵی) کە پشت بە هەناردەکانی خۆیان بۆ خۆرئاوا نابەستن. لە ئەنجامی ئەمەدا، سندووقی دراوی نێودەوڵەتی وەهای دەخەملێنێ کە سەدا سەدی گەشەکردنی جیهانی لە ساڵی ٢٠٠٩دا لە بازاڕەکانی تازە گەشەسەندوودا دێتە ئاراوە. بەمشێوەیە بازاڕەکانی دراوی و ئابووریی ئەم وڵاتانە، هەرچەندە بە بازاڕەکانی ئابووری و دراوییی ئەمریکاوە بەستراون، بەڵام بۆ یەکەم جارە لە مێژووی خۆیاندا جۆرە سەربەخۆییەکیان وەدەستهێناوە.

هێزەکانی جیهانی لەسەرووی هەموو شتێکی وەك کۆنترۆڵکردنی هێزەکان و ئەجینداکان و شێوازە نموونییەکانن. توێژینەوەی زۆرێك لە داهێنانەکانی ئابووریی کەوا لە دەیەی ڕابردوودا بەرپابوون کەمێك زیاتر لە ماڵێکی کارتۆنیی

فشۆڵیان بەرهەم هێنا کە هێزی ئەمریکا لاواز بکات. لەسەر ئەم بنەمایەوە. فرۆشتنی هزرەکانی ئەمریکی بۆ وڵاتانی دیکەی جیهان لەمڕۆ بەدواوە هەوڵ و کۆششێکی زیاتری گەرەکە. وڵاتانی تازەگەشەکردوو بە متمانەبەخۆبوونێکی زۆرەوە چەند سیاسەتێکی نموونەیی ئابووریی بۆخۆیان هەڵدەبژێرن. یو یونگدینی ڕاوێژکاری پێشووی بانکی نێوەندیی چینی لە کۆتاییەکانی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠٨ دا گوتی:" وەها لە سیستەمی ئابووری و دارایی ئەمریکی دەڕوانرێ وەك ئەوەی نموونە و سەرمەشقێك بێت، ئێمەیش تا پێمان کرا بۆ لاساییکردنەوەی هەوڵی خۆمان دا. کتوپڕ بینیمان کە مامۆستایەکەمان ئەو کارامەییەی نییە کەوا پێشتر پێشبینیمان دەکرد. لەبەرئەوە، کاتێك لە جاری داهاتوودا پلان بۆ سیستەمی دارایی و ئابووریی خۆمان دادەڕێژین، زیاتر ئەقڵمان بەکار دەهێنین".

هەرچەندە کردەی ڕابوونی ئەوانی دیکە (البقیە) لە کرۆکدا دیاردەیەکی ئابوورییە، بەڵام ئەو وەرچەرخانەی ئەمڕۆ دەیبینین تەنیا چەند دۆلار و سەنتێك نییە، بەڵکو دەرئەنجامی سیاسی و سەربازی و ڕۆشنبیریی هەیە. لەو کاتەی کە وڵاتان هێز و دەوڵەمەندییان زیاتر دەبێت، هەروەها لەو کاتەی کەوا ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا کار بۆ ئەوەی دەکات متمانەی جیهان لەهەمبەر خۆیدا دروستبکاتەوە، لەوانەیە ئێمە زۆرێك لە بەرەنگاربوونەوە و تەگەرە و خۆسەلماندنی گەلانی تازە گەشەسەندوو ببینین کەوا وردەوردە ڕادەبن و بەرزتر دەبنەوە. لە ماوەی هاوینی ڕابردوودا لە مانگێکدا هیند ئامادەبوو لە گفتوگۆیەکانی بازرگانیی دەوحەدا ڕاستەوخۆ بەرەنگاری ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بێتەوە، هەروەها ڕووسیا هێرشی کردە جۆرجیا و چەند ناوچەیەکی لێ داگیرکرد، چینیش میوانداریی لەو گەمە ئۆلۆمپیانە کرد کە لە

مێژوودا سەرسوڕهێنەرترین و شکۆدارترین بوو (کە زیاتر لە ٤٠ ملیار دۆلاری تێچوو). لە کاتێکدا هەر یەکێك لەم سێ دەوڵەتە، پێش تەنیا دەیەیەك لەمەوبەر، هێز و متمانەیەکی ئەوتۆیان بەخۆیان نەبوو بەو شێوە ڕەفتار بکەن کە ئەوکات کردییان. تەنانەت ئەگەر تێکڕای گەشەکردنیشیان دابەزیبێت، کە بێگومان ئەمە ڕوودەدات، بەڵام ئەم دەوڵەتانە لەنێو سیستمی جیهانیدا بەئاسانی و هێمنی واز لە ڕۆڵی خۆیان ناهێنن.

چەند نموونەیەك دەهێنمەوە؛ لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەژموونی خۆی فراوانکرد بۆ ئەوەی بگاتە ئەو شوێن و پێگانەی کەوا بۆ ماوەی چەندان سەدە لەژێر هەژموونی ڕووسیادا بوو. لە قۆناغی هەژموونی ئەمریکی کە دوای جەنگی سارد هات، مۆسکۆ ملکەچیی نواند و پێویستی بە ئەمریکا بوو بۆ ئەوەی پارە و پاڵپشتی دابین بکات. بەڵام لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٠٨ دا هێزی خۆی وەدەستهێنایەوە. لە نیوەی مانگی شوباتی ساڵی ٢٠٠٩دا کۆماری قیرغیزیا گەیشتە ئەو بڕیارەی کەوا بنکەی ئاسمانیی ماناج دابخات، – ئەم بنکەیە بنکەیەکی ئاسمانیی ئەمریکییە کەوا پاڵپشتییەکی زۆر زیندووی ئاسمانی بۆ کردەکانی سەربازیی ئەمریکا لە ئەفغانستان دابین دەکات، بەتایبەت دوای داخستنی بنکەی ئاسمانی لە ئۆزباکستان لە ساڵی ٢٠٠٥ – پاڵنەری ئەم داخستنەش پارە بوو، چوونکە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ساڵانە ٥٥ ملیۆن دۆلاری بۆ بەکرێگرتنی بنکەکە دەبەخشی و ئامادەشی بەوەکرد کە ئامادەیە ڕێژەی پارەکە بۆ سەد ملیۆن دۆلار لە ساڵێکدا بەرز بکاتەوە. بەڵام حکوومەتی ڕووسیی بیرۆکەی هەبوونی نیمچە بەردەوامی سەربازیی ئەمریکی لە باغچەکەی پشت ماڵی بەباش نەدەزانی، کردەی یارمەتیدانەکەی بۆ ٢.٣ ملیار دۆلار بەرزکردەوە و لەو قەرزەش خۆشبوو کە

بەهایەکەی ۱۸۰ ملیۆن دۆلار بوو، هەروەها چەند پارمەتییەکی دیکەی کرد کە بەهایەکەی ۱۵۰ ملیۆن دۆلاربوو، داوای قەرزێکیشی لە ئەمریکا کرد کەوا بەهایەکەی دوو ملیار دۆلار بۆ ئەوەی بونیادنانی وێستگەیەکی وزەی هایدرۆکارەبایی تەواو بکات. ئەم پرۆژە هاوبەشەی وزە بە ڕێژەی ٤٠٪ پاڵپشتیی لە بەرهەمی وزەی کۆماری قیرغیزیا دەکات و ڕێژەی هەناردەکردنی وزەی بۆ بەرزترین ئاستی ڕێتێچوو بەرز دەکاتەوە. ڕووسیاش تەنانەت لەگەڵ دابەزینی نرخی نەوت بۆ ٤٠ دۆلار -بۆ بەرمیلێك- لە هەمان ئەو ڕێگەیەکدا دەمێنێتەوە کە ڕێگەی بۆ خۆش دەکات سیاسەتێکی ئازادانەتری دەرەکی بگرێتەبەر.

تەنانەت هیند- هاوپەیمانە نوێیەکەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا- دەیەوێ لەهەمبەر ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا ئازادیی خۆی بپارێزێ. گەرچی هیند لە هەمبەر ئەمریکادا هەست بە سوپاس و پێزانینێکی زۆر دەکات چوونکە لە بەشەرعی ناساندنی هیند وەك هێزێکی سروشتیی ناوەکی پشتگیریی لێی کردووە، بەلام تاکو ئێستەیش لە کاردانەوەی لە هەمبەر ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا سەبارەت بە پرسەکانی سەرەکیی ئاسایش خۆی دەگنجێنێ، بۆنموونە: هەرچەندە ئەمریکا سەبارەت بە ئێران فشارێکی زۆری خستە سەر هیند، بەلام هیند زۆر بەسادەیی ئێران بەو هەڕەشەیە نازانێ کەوا واشنتۆن بۆی چووە. ڕاستە کە جارێك ڕازی بووە لەسەر ئەوەی لەگەڵ ئەمریکادا لە ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی دەنگ بدات، بەلام لە پەیوەندییە فراوانەکانی لەگەڵ ئێراندا بەردەوامە بە ئەنجامدانی مانۆڕی هاوبەشی دەریاییشەوە. هیند ئێران بە هاوبەشێکی بازرگانیی خۆی دەزانێ، بەهەموو شێوەیەك ئەوە ڕەت دەکاتەوە ئێران دابپڕێندرێ. لە نیسانی ساڵی ۲۰۰۸دا،

فرۆکەوانەکانی سەرۆک ئەحمەدی نەژاد لەکاتی گەڕانەوەی سەرۆکی ئێرانی لە سەفەرەکەی سیریلانکای بەرەو وڵاتی خۆی دلوایان کرد لەپێناو بەنزین وەرگرتن لە نیودەلهی بنیشنەوە، حکوومەتی هیندیش یەکسەر بانگهێشتێکی فەرمی دەرکرد و وەستانە کاتییەکە بووە سەردانێکی نێو دەوڵەتی.

هەروەها ئەم دۆخەی ئێستە وانەیەکی گرنگ و بەسوود بە سندووقی دراوی نێو دەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی دەدات. چوونکە بەردەوام ئەو دوو دەسگەیە وەها تەماشایان دەکرا کە پڕن لە هێز و پارە و دارایی ئەمریکی و وەک دوو ئامرازی هەژموونی ئەمریکی لێکدەدرانەوە، بەلام ئێستە بەپێی بۆچوونی براد سبستێر " ئابوورییە گەشەسەندووەکانی وەک چین و ڕووسیا و هیند و کۆریا و تەنانەت بەرازیل، نەک هەر تەنیا پێویستیان بە سندووقی دراوی نێودەوڵەتی نییە، بەڵکو لەگەڵیدا لە پێگەی کێبڕکێشدان، بۆنموونە: فەنزوێلا پارمەتیی ئەرژەنتینی دا بۆ ئەوەی پابەندییەکانی خۆی لەهەمبەر سندووقی دراوی نێودەوڵەتی جێبەجێ بکات. هەروەها بانکی بەخشینی گەشەپێدانی چینیش ئەلتەرناتیڤی قەرزەکانی بانکی نێودەوڵەتی دەبەخشێت".

ئەگەر سەبارەت بە قووڵایی ئەو گۆڕانکارییانە نموونەیەکی باشترت دەوێت کەوا بەهۆی ڕابوونی ئەوانی دیکەوە دێنە ئاراوە، دووبارە ڕووماڵەکەی لووتکەی ئەو بیست دەوڵەتە بخوێنەوە کەوا لە تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ دا لە واشنتۆنی پایتەختدا بەڕێوەچوو. کۆی قەیرانەکانی دارایی پێشوو یان لە لایەن سندووقی دراوی نێو دەوڵەتییەوە یانیش بانکی نێودەوڵەتی یان کۆمەڵەی حەوت وڵاتە گەورەکە (دواتریش هەشت وڵاتەکە) چارەسەر دەکران. لە قەیرانەکانی پێشوودا خۆرئاوا ڕۆڵی مامۆستایەکی توندوتیژی خوێندنگەی دەبینی کەوا سەرکۆنەی خوێندکارانی نارێکی پۆلێک دەکات، بۆنموونە: لە میانی قەیرانی ئاسیاییدا

ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا و دەوڵەتانی دیکەی خۆرئاوایی، داوایان کرد کە وڵاتانی ئاسایی سێ هەنگاو هەڵێنن؛ لێبگەڕێ بانکەکانی شکستخواردوو بەتەواوی دابڕووخێن و کۆنترۆڵی خەرجییەکانیان بکەن، ڕێژەی سوود و سوودەکانیش بەرز بکەنەوە. بەڵام خۆرئاوا لە هەرسێ لایەن و سەنگەردا لە قەیرانە تایبەتەکەی خۆیدا تەواو پێچەوانەی ئەم داواکارییەی ئەنجام دا.

هەرچۆنێك بێت، خۆرئاوا بەتەنیا نەیتوانی ڕووبەڕووی ئەم قەیرانە ببێتەوە و بەرپەرچی بداتەوە. چوونکە لە ئابووریی جیهانیی زۆر وابەستە بەیەکتر و پەیوەندداردا، هەر کاردانەوەیەك پێویستی بە بەشداریی گشت یاریزانەکانی گۆڕەپانەکە هەیە؛ بە ئابووریيە گەورە تازە گەشەسەندووەکانیشەوە. چوونکە سەبارەت بە دابینکردنی دارایی، بوونی چین و سعوودیيە گرنگییەکی سەرەکیی هەبوو. هەروەها سەبارەت بە شەرعییەتیش یانە کۆن و بابردەڵەکانی خۆرئاوایی – پاشماوەی جیهانی ڕابردوو– نەیانتوانی بەتەنیا چارەسەرێکی جیهانی بسەپێنن. دوای ڕوونبوونەوەی ڕوخسار و لایەنەکانی قەیرانەکەی، ئەنانەت خودی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ئیدی نەیدەتوانی بەشێوەیەکی سەربەخۆیانە ڕەفتار بکات. لەبەر ئەم هۆیانە بەیەکەوە، بۆ یەکەمین جار کۆبوونەوەی سەرانی حکوومەتی بیست وڵاتی گەورە کۆبوونەوە؛ بە هەشت وڵاتەکە و دەوڵەتانی تازەگەشەسەندوو سەرەکییەکانیشەوە.

بێگومان، هەموو شتێك نەگۆڕا، چوونکە کۆبوونەوەی بیست دەوڵەتەکە لە واشنتۆن بەڕێوەچوو، جۆرج دەبلیو بۆشی سەرۆکیش لە دانانی خشتەی کارەکانی کۆبوونەوەکەدا ڕۆڵێکی سەرەکیی گێڕا. ڕاستە جیهانێکی نوێیە، بەڵام ئەو جیهانەش نییە کەوا تیایدا ئەمریکا لە دەستەڵاتەکانی داماڵدرابێ. چوونکە تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت ئەمریکا وڵاتێکە لە هەموو وڵاتانی دیکە گرنگترە،

هەروەها دەتوانێ هەزموونی خۆی لە گشت بوارەکان و گشت کیشوەرەکاندا بەشێوەیەك بەکاربێنێ کە ولاتانی دیکە و هێزی دیکەی سەرەکی هەرگیز ناتوانن. بەپێی گوزارشتی جۆزیف جۆفی نووسەری ئەڵمانی هێشتا " زلهێزە شیمانەکراوەکەیە". لەگەڵ ئەمەیشدا، ئێمە لە ئێستەدا لە جیهانێکدا دەژین کە تیایدا کاری بەکۆمەڵ و هاوبەش نەك هەر گرنگە، بەڵکو پێویستیشە.

## هاوکاریی یەکتر بکەن

هاوکاریی نێودەوڵەتی بە گیاندارێك دەچێت کە بەزەحمەت ساڵی دەکرێت. تەنانەت لەو کاتەی کە ویستیش هەیە، زۆربەی جار ڕێگە لێڵ و نەزاندراوە، بۆ نموونە: ئەفغانستان نموونەی هاوکارییەکی سەرکەوتووانەی نێودەوڵەتی بوو؛ بەلای کەمەوە بەشێوەیەکی تیۆری. ئەو هێرشەی کرایە سەر ئەفغانستان پشتگیریی نەتەوەکانی یەکگرتوو و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی وەدەستهێنا، کردە سەربازییەکانیش- هەرچەندە حەوت ساڵی خایاندووە- سەربازی بریتانی و کەنەدی و پۆڵەندی و تەنانەت فەرەنساشی لە خۆی گرتووە. بانکی نێودەوڵەتی و ئاژانسی ئەمریکی بۆ گەشەپێدانی نێو دەوڵەتی USAID و حکوومەتەکانی نیشتمانی، ملیارەها دۆلاریان لەپێناو دووبارە بونیادنانەوەی ژێرخانی ئەفغانستاندا پێشکەش کردووە. لەگەڵ ئەمەیشدا تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت جەنگەکە زیاتر لە شکست و دۆڕان نزیك دەبێتەوە نەك سەرکەوتن. حکوومەتی حەمید کەرزای کۆنترۆڵی بەسەر کەمتر لە سێیەکی ولاتدا هەیە، میرانی جەنگیش لە دەرەوەی کابوولدا سەرچاوەی ڕەهای دەسەلاتن، بزووتنەوەی تالیبانیش، هەرچەندە لاواز بووە، بەلام بەشێوەیەك خۆڕاگرە کە جێگەی نیگەرانییە. ئەفیونی هاوردەکراو بووەتە هەناردە سەرەکییەکەی ئەو ولاتە. زۆربەی ولاتانیش- لە ولاتانی هاوسێی وەك پاکستانەوە تا دەگاتە هاوبەشانی ئەورووپیی

وەك ئەڵمانیا- زیاتر حەز دەکەن خۆیان لە پابەندییەکانیان بدزنەوە لەوەی کە حەز بە بینینی بکات بێتەدی. زۆربەی جار بەرژەوەندییەکانی تەسکی نەتەوەیی بەسەر هاوکارییەکی ڕۆشنانەی نێودەوڵەتیدا زاڵ دەبێت.

پەند و عیبرەتەکەی ئەفغانستان ئەوەمان پێ دەڵێ کە هاوکاریی نێودەوڵەتی شتێکی سانا نییە، بەڕاستیش بەردەوام نییە. بەلام هەوڵەکەی نێو ئەفغانستان ڕووچاری کەم گرنگیدان بوویەوە، چوونکە ئیدارەی بۆش سەرقاڵی ڕیکلامکردن و ڕەواجپێدان و دواتریش سەرقاڵی هێرشکردنە سەر عێراق بوو، لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا دەتواندرێ ڕزگار بکرێ. جگە لەمانەیش، گرفتەکانی ئەم ڕۆژگارە پێویستیان بە چارەسەرێکی هاوبەشی هاوکارانە هەیە ئەوجا ئەگەر وەدیهێنانیشی زۆر دژوار بێت. تەماشای کۆی ئەو گرفتانە بکە کە ئێستە ڕووبەڕوویان دەبینەوە- تیرۆر، پەتای دارایی، نەخۆشییەکانی گوازراوە، وزە، ئاسایش- کۆی ئەم گرفت و بەرەنگارییانە پێویستیان بە چارەسەری هەماهەنگ و ڕێکوپێك هەیە، لە هەندێك دۆخیشدا چەند دەستگەیەك هەن کەوا دەتوانن ئەم چارەسەرانە پیادە بکەن.

با وەك نموونە دۆخی نەخۆشییەکی گوزاروە وەربگرین؛ هەر نەخۆشییەك لەمڕۆدا بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان بڵاو دەبێتەوە. ئەمەیش مانای ئەوەیە کە ئێمە هەموومان ئەو پاڵنەرەمان هەیە هۆی نەخۆشییەکە بە خێراترین کات دیاری بکەین و قوربانییەکان دابڕین و کار بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بکەین. بەدڵنیاییەوە ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی دەتوانێ بێتە نێو پرسەکە و داوا بکات چەند نموونەیەکی ڤایرۆسەکەی بۆ بنێرن و دوا دەستنیشانکردنیش دیاری بکات و ئەو ڕێکارانەش دەستنیشان بکات کەوا پێویستە پێڕەو بکرێن. بەلام بۆ بەدبەختی، گۆژمە و پارەی پێویستی لەبەر دەستدا نییە و بەدەست کەمیی

کادیرەوە دەنالێنێ، هەروەها ئەو دەستنهەلاتەشی نییە سەرپشکی بکات بۆ ئەوەی چەند بنەمایەك دابنێت کەوا لەسەر هەمووان پێویستە پێڕەوی بکەن. چین لە نێو چوارچێوەی سنووری خۆیدا و بەچەند هەفتەیەك پێش ئەوەی جیهان پێی بزانێ، نەخۆشیی ئەنفلەوەنزای باڵندەی شاردەوە. لە یەکێك لە قۆناغەکاندا، ئەندۆنیسیا ئەوەی ڕەتکردەوە چەند نموونەیەکی ئەنفلەوەنزایەکە ڕادەست بکات، چوونکە دەترسا لەپێناو دروستکردنی دەرزی و پێکوتەی نقد گرانیەها بەکاربێت کە وڵاتەکە ناتوانێ بەرگەی خەرجییەکانی بگرێ.

ئەمە ئەو جیهانەیە کەوا ڕووبەڕووی سەرۆك باراك ئۆباما بووەتەوە: جیهانێکی پڕ لە هەڕاوزەنا و گێروگرفت، لەگەڵ کەمە وەلامێکی ئاسان. بەلام لەگەڵ کۆی گرفتەکانیشیدا، بەشێوەیەکی نائاسایی هەر بە جیهانێکی ئاشتیخوازانە دەمێنێتەوە. بەلای کەمەوە، بەرپابوونی جەنگێك لەنێوان زلهێزەکاندا پرسێکی شیمانە نەکراوە. جا ئەگەر مەسەلەکەمان بۆ هەندێك پێوەری وەك هێمەکانی مەدەنیی نزیککردەوە، ئەوا دەبینین لە زەمەنێکدا دەژین کە لە هەموو زەمەنەکانی دیکە دروستتر و ساغترە. هەروەها ڕێکخراوی ئەلقاعیدە کە یەکەم هەڕەشەی مەزنی سەدەی بیست و یەك بوو، ئێستە بێ ڕەگوڕیشە بووە و چووەتە نێو دۆخی بەرگری لەخۆکردن، چوونکە موسڵمانانی جیهان لە هەمبەر شکۆدارکردنی توندوتیژی و ئامادەییە فراوانەکەی بۆ کوشتنی مەدەنییەکان ڕقیان لێی هەڵسا، چوونکە ڕێکخراوی ناوبراو سڵی لە کوشتن و تۆقاندنی مەدەنییەکانی موسڵمانیش نەدەکردەوە. هەڵبژاردنی سەرۆك ئۆباما- ئەو کەسە ئەمریکییەکەی نەژادێکی تێکەڵی هەیە و لە باوکێکی موسڵمانە بەناوی حوسێن- ئەوا کۆمەڵە تیرۆرستەکەی دووچاری سەرسوڕمان کرد. لە کاسێتێکی ڤیدیۆییدا کە بەمدواییانە بەدیارکەوت، سەرکردەکانی ئەلقاعیدە دژ بە سەرۆکە نوێیەکە

پەنایان بردە بەر هێرشی زۆر لاوازی کەسی و بە (کەسی زنجییان ناوبرد). لە ڕاستیشدا پاڵنەری نیگەرانییەکەشیان پاساوی خۆی هەیە، چوونکە هەڵبژاردنی ئۆباما سیمبولی هیوایە بۆ جیهان، هەروەها بۆ سەر قاعیدە و ئەیدۆلۆژیایەکەی- کەوا لەسەر ڕقوکینە بونیادنراوە- بە هەڕەشەیەکی مەزن دادەندرێ.

بێگومان نیگەرانییەکی کۆن هەیە، ئێستەیش بوونی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە کاتەکانی ڕاگوزەرییدا بەزۆری ئاشتی وەردەچەرخێ. هەر لەو کاتەوەی کە مێژوونووسی یۆنانی سیۆسیدیدس تێبینیی ئەوەی کردووە کە هۆی سەرەکیی وەرچەرخانی دەستەڵات لە سپارتەوە بۆ ئەسینا بەرپابوونی جەنگی پیلۆپۆنیسوس بوو، لێکۆڵەران بە جۆرە نیگەرانییەکەوە چاوەنواڕی ئەو ساتانە بوون. بەڵام ئەمجارە پێویست بەوە ناکات ڕابوونی ئەوانی دیکە، ئەگەر بەشێوەیەکی گونجاو بەڕێوەببرێ، ببێتە هۆکارێك بۆ تێکدان و لەرزاندنی سەقامگیری. چوونکە ئەمریکا بەخێرایی گرۆلەی ناکەوێتە لێژییەوە، هەروەها لەسەر لێواری ئەوەشدا نییە ببێتە دەوڵەتێکی دیکە و بگۆڕێت. هەروەها قەیرانەکەش بەهەمان پلەی یەکسان کاریگەریی بەسەر هەمووانەدا هەیە. جگە لەمانەیش، ئەمڕۆ وڵاتانی دیکە دەتوانن بۆ پاراستنی سەقامگیری ڕۆڵی سەرەکی بگێڕن، ئەویش نەك تەنیا لە بواری ئابووریدا بەتەنیا. چوونکە لە ماوەی ململانێی نێوان ڕووسیا و جۆرجیادا، سەرۆك نیکۆلا سارکۆزی چووە مۆسکۆ نەك بۆش. هەروەها کاتێك لە هاوینی ڕابردوودا ئیسرائیل و سووریا چوونە نێو دانوستانەوە، تورکیا ڕۆڵی نێوەندکاری نێوانیانی گێڕا نەك واشنتۆن. کاتێك حزبەکانی لوبنان لە ئایاری ڕابردوودا بۆ جارێکی دیکە بەچەك لەیەکتریان دا و شەڕ لەنێوانیاندا پەیدابوو، میری قەتەر ئاکە کەسێك بوو کەوا توانی بیانهێنێتە سەر مێزی گفتوگۆ. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە هیچ یەکێك لەم

ڕووداوانەدا نەبوو. ئەم مەسەلەیە پێش دەیەیەك لەمەوبەر تەنانەت هەر نەدەتوانرا بیریشی لێ بکرێتەوە، بەلام هەنووکە بووەتە شتێکی ئاسایی. ڕاستە بوونی جیهانێك کە چەندان پاریزانی بەهێز و پشتبەخۆبەستووی هەبێت واتا چەندان ڕکابەر و دیماگۆجیی هەیە، بەلام لەهەمان کاتدا واتای بوونی زۆرێك لە دانوستانکار و سەرکردەی هەرێمیش دەگەیەنێ کە بەرژەوەندییان لە پاراستنی ئاشتیدا هەیە. جا ئەگەر توانرا ئەم پالنەرە ڕێکبخرێت و هانبدرێ، ئەوا بێگومان جیهان دەبێتە شوێنێکی باشتر.

زۆربەی زلهێزەکان هەمان بەرژەوەندیی هاوبەش و نموونەکانی باڵای ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایان هەیە. دەبێ ئەم پالنەرە هاوبەشانەش جوولەی جیهان بەرەو زۆرێك لە سەقامگیری و گەشەکردن بپارێزێ. بەلام، مەترسییەکی ڕاستەقینە هەر دەمێنێ، ئەویش ئەوەیە کە واشنتۆن بە مەبەست هەوڵی شلکردنەوەی مشتی دەستهەلات و هەژموونی خۆی بدات، چوونکە ئەمە دەبێتە هۆی هەراوزەنا و ناسەقامگیری، خۆ ئەگەر لە بەکارهێنانی هێزیشیدا زێدەڕۆیی بکات هەر مەترسیدارە، چوونکە وادەکات وڵاتانی دیکە ڕقیان لێی بێتەوە، ئەو وڵاتانەش هان دەدات تەنیا گرنگیی بە کاروباری تایبەتیی خۆیان بدەن. ئیدارەدانی هێزی سیاسی و سەربازیی ئەمریکا بۆ سەقامگیریی جیهانی هەر بە گرنگتر دەمێنێتەوە. لەسەر ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا پێویستە چەند بنەما و دەستکە و خزمەتگوزارییەك پێشکەش بکات کەوا یارمەتیدەری چارەسەرکردنی گرفتەکانی سەرەکیی جیهان دەبن، هەروەها پێویستە لە هەمان کاتیشدا پشکێك لە سیستم و دەستهەلات ببەخشێتە وڵاتانی دیکە، بەتایبەتیش ئەو وڵاتانەی کەوا تازە گەشەیان کردووە.

ڕاستە کە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە چەند دەیەیەکی دواییدا ئەمجۆرە سەرکردایەتییەی لەخۆی پیشان نەدا، بەڵام ئەم مەسەلەیە بەسەر پاریس و لەندەن و مۆسکۆ و پەکین و نیودەلهیشدا پیادە دەبێت. ئەورووپا حەز و گوڕوتاوێکی وەهای نەبوو بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندیی سندووقی دراوی نێو دەوڵەتی و ئەنجوومەن و بانەکانی دیکە واز لە دەستهەڵات بێنێت، زۆرێکیش لەو وڵاتانەی کەوا بازاڕەکانیان تازە گەشەیان سەندووە، بەهەمان ئیرەیی و سووربوونی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە هەمبەر سەروەریی خۆی، ئەوانیش لەسەر سەروەریی خۆیان پێداگرن، هەندێك جاریش ئەو ئیرەییەیان لە هی ئەمریکایش زۆرترە. جا ئەگەر بۆ فراوانکردن و پتەوکردنی بنەما و دەستگە جیهانییەکانی هاوکاریکردن چەند ڕێگەیەك نەدۆزینەوە - سەبارەت بە ئابووری و وزە و گۆڕانی ژینگەیی و نەخۆشییەکان و مادەکانی هۆشبەر و پەناهەندەیی و چەندان پرسی گەورەی دیکە- ئەوا جیهان چەندەها قەیرانی دیکە بەخۆیەوە دەبینێ و کاردانەوەی حکوومەتەکانیش خێرا و کورت دەبن و تایبەت دەبن بە گرفتە تەسك و تایبەتەکانی خۆیانەوە. ئەمەیش توانامان پێنابەخشێ بەهێزەوە لە قەیرانی هەنووکە دەربچین ئەگەر بێت و وڵاتە مەزنەکانی جیهان بەیەکەوە و لە سنوورێکی زۆر فراواندا بەردەوام کار لەگەڵ یەکتریدا نەکەن.

لە بەرانبەریشدا، ئەگەر بەیەکەوە کۆببینەوە و ڕووبەڕووی گرفتەکانی گشتیی مرۆڤایەتی ببینەوە، ئەو دەرفەتانە بێننە بەرچاونان کەوا دەکرێ بۆ هەمووانی برەخسێنین. وەها بێننە بەرچاوتان ئەگەر ئێمە توانیمان چەند بنەمایەکی نوێ بدۆزینەوە کەوا دەرفەت بۆ گردەی جیهانگەرایی و گەشەکردنێکی مەزن خۆش بکات کە بتوانن خۆڕاگر ببن و لە گشت توێژەکانی نێو جڤاکدا بڵاوببنەوە و ئاستەکانی گوزەران و چاودێریی تەندروستی بۆ خەڵکانی زۆر هەزار دەستەبەر

دەکات و ڕێگە بۆ ژمارەیەکی یەکجار زۆری خەڵک خۆش دەکات توانا و کارامەییەکانیان پێشبخەن.

ئەگەر بەیەکەوە کاربکەین و ئەم قەیرانە تێپەڕێنین، ئەوا دەرفەتەکان بەشێوەیەکی بێسنوور دێنەپێشێ. ئابووریی جیهانی هیوای ژیانێکی سەربەرزانە بۆ خەلکی گشت شوێنێکی سەر گۆی زەوی دەرەخسێنێ. هەروەها ئامرازەکانی جۆرلوجۆری پەیوەندی ڕێگەمان بۆ خۆش دەکەن باشتر یەکتری بناسین و لەیەکتری فێرببین کە هەرگیز لە ڕابردوودا نموونەی نەبووە. هاوکاریی سیاسی دەتوانێ ئاگری کێبڕکێی نێوان زلهێزەکان دامرکێنێ. جا ئەگەر خەڵك لە گشت ڕۆژێکدا لە گشت شوێنێك کاری سەرسوڕهێنەرانە ئەنجام بدەن، ئیدی کاتی ئەوە هاتووە حکوومەتەکانیان بە داهێنانی تایبەت بەخۆیان پێ بەپێی ئەو ئافراندنانەی مرۆڤایەتی بڕۆن و چەندان جۆری هاوکاریی نێوانیان برەخسێنێ. بەرەنگاربوونەوە و کۆسپە گەورەکەی بەردەم باراك ئۆباما و سەرکردەکانی هاونەوەی، خۆی لەوەدا دەبینێتەوە سیستمێکی نوێی پەیوەندیی نێودەوڵەتی دابمەزرێنن؛ سیستمێك بێت هاوکارییەکی نێونەتەوەیی ڕاستین و کارا سەبارەت بەو پرسە مەزنە هاوبەشانە بەرهەمبێنێ کەوا هەموومانی شەکەت کردووە. ئەمە پرۆژەی مەزنی سەدەی بیست و یەکە: نموونەیەکی نوێ کەوا ئاشتی و گەشەکردن و ئازادیی بۆ هەموان دەستەبەر بکات.

## ١- ڕابوونی ئەوانی دیکە

ئەم کتێبە هێندە داڕووخان و لێژبوونەوەی ئەمریکا پیشان نادات هێندەی ڕابوونی گشت گەلانی دیکە پیشان دەدات. ئەم کتێبە تیشك دەخاتە سەر ئەو وەرچەرخانە مەزنەی کەوا لە ئێستەدا لە جیهاندا دەگوزەرێ؛ وەرچەرخانێکە و

هەرچەندە جێگەی گفتوگۆ و بیژبازییەکی زۆرە، بەڵام هێشتا بەشێوەیەکی باش تێنەگەیشتوون. لە راستیدا ئەمەیش شتێکی سروشتییە، چوونکە گۆڕانکارییەکان- تەنانەت ئەگەر لە دەریاکانیشدا روویدەن- بەشێوەیەکی پلەبەپلە بەرێوە دەڕۆن. جیهان وەك شتێکی ناسراو و باو دێتە پێش چاومان، هەرچەندە ئێمە لێرەدا باس لە قۆناغێکی نوێ دەکەین. بەڵام، لە راستیدا، جیهان تا ئاستێکی زۆر جیاوازە.

لە میانی پێنج سەدەکەی رابردوودا سێ وەرچەرخانی سەرەکی لە هێزدا هاتنە ئاراوە، گۆڕانکاریی کرۆکی لە دابەشکردنی هێزدا بووە هۆی ئەوەی ژیانی نێونەتەوەیی لە لایەنەکانی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیرییەوە سەرلەنوێ دابرێژرێتەوە. وەرچەرخانی یەکەم بە سەرهەڵدان و بەرجەستەبوونی جیهانی خۆرئاوایی دەستپێیکرد؛ ئەم کردەیە لە سەدەی پانزەیەمەوە دەستپێیکرد و لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمەدا بەخێرایی چووە پێش و ئەوەی لێ پەیدابوو کە ئێمە پێی دەڵێین نوێگەری: زانست و تەکنۆلۆژیا، بازرگانی و سەرمایەداری، هەروەها دوو شۆڕشی کشتوکاڵی و پیشەسازی. ئەوجا لە ئەنجامی ئەم گۆڕان و وەرچەرخانەدا هەژموونی دووروودرێژی سیاسیی گەلانی خۆرئاواشی لێ کەوتەوە.

وەرچەرخان و گۆڕانی دووەمیش، کەوا لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا هاتە ئاراوە، خۆی لە بەرجەستەبوون و زەقبوونەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا بینیەوە. چوونکە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دوای ماوەیەکی کەم لە وەرچەرخانە پیشەسازییەکەی بووە مەزنترین وڵاتی زلهێز لە جیهاندا کە لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانییەوە تا ئێستە وێنەی نەبووە، هەروەها لە هەر هاوپەیمانییەکی شیمانەبۆکراوی نێوان وڵاتانی دیکەدا بووە بەهێزترین و تاکە وڵاتی زلهێز. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە میانی زۆربەی ماوەکانی

سەدەی ڕابردوودا لە جیهاندا هەژموونی بەسەر بازرگانی و سیاسەت و زانست و ڕۆشنبیریدا پەیداکرد، ئەم هەژموونەش لە میانی بیست ساڵی ڕابردوودا کەس نەیتوانی کێبڕکێی لەگەڵدا بکات، واتا هیچ کێبڕکێکارێکی بۆ پەیدا نەبوو! ئەمەیش لە مێژووی نوێدا دیاردەیەکی دەگمەن و ناوازەیە.

ئێمە لە ئێستەدا لەنێو سێیەمین وەرچەرخانی مەزنی هێزی سەدەی نوێدا دەژین، دەشتوانین ناو لەم وەرچەرخانەش بنێین وەرچەرخان و گۆڕانی ئەوانی دیکە. چوونکە لە چەند دەیەیەکی کەمی ڕابردوودا، چەندان وڵات لە شوێنەکانی جۆراوجۆری جیهاندا تێکڕایەکانی گەشەکردنی ئابوورییان هێندە بەرزبوویەوە کە لە ڕابردوودا بە شتێکی ئەستەم دادەنرا. هەرچەندە ئەم وڵاتانە چەند قۆناغێکی بەرزبوونەوە و گەشەکردن و دواتریش لێژبوونەوەیان بەخۆیانەوە بینی، بەڵام ڕووگە و ئاراستەی گشتی بەبێ هیچ گومانێك بەرەو سەرەوە هەڵدەکشا. ئەم گەشەکردنەش لە ئاسیادا ڕوونتر بەدیاردەکەوت، بەڵام لە ڕاستیدا هەر تەنیا تایبەت نەبوو بە ئاسیا. لە هەردوو ساڵی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧دا، ١٢٤ دەوڵەت تێکڕایەکی گەشەکردنی وەهایان بەخۆیانەوە بینی کە ٤٪ و زیاتریش بوو، لەنێویاندا ٣٠ وڵاتی ئەفریقی هەبوو. ئەنتوان ڤانی بەڕێوەبەری دارایی کەوا زاراوەی بازاڕەکانی تازە گەشەکردووی داهێنا، دەستی بە پۆلینکردنی بیست و پێنج کۆمپانیا کرد بۆ ئەوەی لە قۆناغی داهاتوودا ببنە گەورە کۆمپانیای فرەڕەگەزی جیهانی، لیستەکەی چوار کۆمپانیای لەخۆگرتبوو کە لە بەرازیل و مەکسیك و کۆریای باشوور و تایوان و سێ کۆمپانیای هیندی و دوو کۆمپانیای چینی و یەك کۆمپانیا لە هەر یەکە لە ئەرژەنتین و چیلی و مالیزیا و باشووری ئەفریقیا پێکهاتبوون.

تەماشای چوار دەوری خۆت بکە. درێژترین تەلار لە جیهاندا لەمڕۆدا دەکەوێتە تایپی، هێندەشی پێناچێت تەلارێکی دیکە لە دوبەی دروستدەکرێ کە زۆر لەو سەرکەوتووتر و بەرزترە. هەروەها دەوڵەمەندترین پیاو لە جیهاندا مەکسیکییە و گەورەترین کۆمپانیایەکانی جیهان لە ڕووی فرۆشتنەوە چینییە و زەبەلاحترین فرۆکە لە جیهاندا ئێستە لە ڕووسیا و ئۆکراین دروست دەکرێت، گەورەترین پاڵیوگەش لە جیهاندا ئێستە لە هیند بونیاد دەنرێ. ئێستە سیمبوڵەکانی بەناوبانگی ئەمریکی بوونەتە موڵکی بێگانەکان. گەورەترین یەکەی کاتبەسەربردن لە جیهاندا لە سەنگافوورەیە، هەروەها یەکەم گازینۆ لە جیهاندا لە لاس فیگاسدا نییە، بەڵکو لە ماکاودایە کە لەبواری داهاتی قومار و پۆکەرەوە ساڵانە زۆر لە فیگاس زیاتری دەست دەکەوێ. هەروەها مەزنترین سینەما لە جیهاندا- تایبەت بە ژمارەی فیلمەکانی بەرهەمهاتوو و ژمارەی پلیتەکانی فرۆشراو- بۆلیۆدە نەك هۆلیۆد. تەنانەت بازاڕکردنیش (التسوق) - یەکەم چالاکی لە ئەمریکادا- ئێستە بەشێوەیەکی جیهانی و لەنێو دە مەڵبەندی بازاڕکردن لە جیهاندا، یەك مەڵبەندیان دەکەونە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا و مەزنترینیان دەکەوێتە پەکینەوە. لە ڕاستیدا، ئەم لیستانە هەڕەمەکین، بەلام ئەوەی لە مەسەلەکەدا سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە کە تەنیا پێش دە ساڵ لەمەوبەر ئەگەر ئەمریکا لە هەمووشیاندا پلە و پێگەی یەکەمی داگیر نەکردبێ، ئەوا لە زۆربەیاندا سەرلیست و پێشکاروان بووە.

لەوانەیە بە شتێکی سەیرو نامۆ بێتە بەرچاو کە جەخت لەسەر خۆشگوزەرانییەکی تازە گەشەسەندوو بکەینەوە لە کاتێکدا هێشتاکە سەدان ملیۆن مرۆڤ لە هەژارییەکی کوشندەدا دەژیەن. بەلام ئەگەر لە گۆشەیەکی دیکەوە بنوارینە مەسەلەکە، دەبینین ڕێژەی ئەو کەسانەی ڕۆژانە بە یەك دۆلار

یان کەمتر دەژیەن لە ٤٠٪ی سالی ١٩٨١دا بۆ ١٨٪ سالی ٢٠٠٤دابەزیوە. پێشبینیش دەکرێ لەگەڵ هاتنی سالی ٢٠١٥دا بۆ ١٢٪ دابەزێت. گەشەکردنی چین بەتەنیا زیاتر لە ٤٠٠ ملیۆن مرۆڤی لە دۆخی هەژاری دەرباز کردووە و لەو وڵاتانەی کەوا ٨٠٪ دانیشتووانی جیهان لەخۆیان دەگرن پاشەکشەی کردووە. ئەوە ڕاستە کە پەنجا دەوڵەتەکەی کە بەدەست گرفتە زۆر خراپەکانی ئابوورییەوە دەناڵێنن و هەژارترین مرۆڤی جیهان لەخۆیان دەگرن، پێویستیان بە چاودێری و گرنگیپێدانێکی بەپەلە هەیە، بەڵام، لە ١٤٢ وڵاتی دیکەدا- بە چین و هیند و بەرازیل و ڕووسیا و تورکیا و ئەندونیسیا و کینیا و باشووری ئەفریقیاشەوە- وردە وردە هەژاران لە ئابوورییەکی گەشەکردوو و بەرهەمهێندا لەخۆ دەگیرێن. ئێمە بۆ یەکەم جارە لە مێژوودا گەشەکردنێکی ڕاستینی جیهانی دەبینین، ئەمەیش سیستمێکی نێونەتەوەیی بەرهەمدەهێنێ کە لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا هەر تەنیا ئامانج و چاودێر نین بەڵکو یاریزانی سەربەخۆن. بەکورتی لەدایکبوونی سیستمێکی ڕاستینی جیهانییە.

ڕووخسار و ڕەهەندێکی دیکە هەیە کەوا پەیوەندیی بەو قۆناغە نوێیەوە هەیە، ئەویش ڕۆیشتن و گوازرانەوەی هێزە لە چەند وڵاتێکەوە بۆ چەند یاریزانێکی دیکە. ئەوانی دیکەی ڕابوو لە ئێستەدا یاریزانی ناحکوومی و ڕێکخراو و تاکەکەسی وەها لەخۆیان دەگرن کەوا لەسەر حیسابی لاوازکردنی پلەبەندی و مەرکەزییەت و کۆنترۆڵکردنی جیهان هێزیان وەدەستهێناوە. ئەو چالاکی و ئەرکانەی کەوا ڕۆژێك لە ڕۆژان لەژێر کۆنترۆڵی حکوومەتەکاندا بوو، ئێستە بە بەشداریی دەستە و دامەزراوەکانی نێونەتەوەیی وەك ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی و یەکێتیی ئەورووپییەوە بەڕێوەدەچێ. هەندێك کۆمپانیا و سەرمایە هەن لە شوێنێکەوە دەچنە شوێنێکی دیکە و بۆ ئەنجامدانی پرۆژەکانیان بەدوای

گونجاوترین شوێنندا دەگەڕێن، جا لەمەدا پاداشتی هەندێك حكومەت دەكات و هەندێكیشیان سزا دەدات. هەروەها تیرۆرست و بازرگانانی مادەكانی هۆشبەر و یاخیبووەكان و میلیشیایەكان بە گشت جۆر و چەشنەكانیانەوە، لە گۆشە و بۆشایی و خاڵەكانی لاوازی سیستەمی جیهانیدا پانتاییەك بۆ ئەنجامدانی چالاكییەكانیان دەبینن. هێز لە گشت وڵاتانەوە دەگوازرێتەوە و دەچێتە گشت لایەن و ئاراستەیەكەوە. جا لە كەشێكی وەهادا، زاراوە و بەكارهێنانە تەقلیدییەكانی وەك هێزی نیشتمانی – ئابووری و سەربازی بەیەكەوە- كاریگەرییان كەمتر بووەتەوە.

لەوانەیە كە سیستەمە گەشەسەندووە نێونەتەوەییەكە لە سیستەمەكانی پێش خۆی تەواو جیاواز بێت. چوونكە سەد ساڵ دەبێت سیستەمێكی فرە جەمسەر هەبوو كەوا لەگەڵ گۆڕانی بەردەوامیش لە هاوپەیمانییەكان و كێبڕكێیەكان و حیساباتە نادروستەكان و جەنگەكاندا كۆمەڵێك حكوومەتی ئەورووپی بەڕێوەیان دەبرد و ئاراستەیان دەكرد. دواتر سیستەمی جەنگی سارد هات كە دوو جەمسەری سەرەكیی هەبوو؛ لە زۆربەی لایەنەكاندا سەقامگیرییەكی پتری هەبوو، بەڵام بەهۆی زێدەڕۆییكردنی هەردوو زلهێزەكە لە كاردانەوەی هەمبەر گشت هەنگاوێكی جەمسەری بەرانبەریاندا لە ساڵی ۲۰۰۱ وە لەژێر هەژموونی ڕەهای ئەمریكادا ژیاین، جیهانێكی یەكجەمسەر و زۆر بێهاوتا بوو كە تیایدا ئابووریی كراوەی جیهانی بەشێوەیەكی زۆر درامانیكی فراوان بوو و هەنگاوەكانی زۆر خێرابوون. ئەم فراوانبوونەش لە ئێستە لە سروشتی سیستەمی نێودەوڵەتیدا بەرەو گۆڕانێكی دواتر دەچێت.

لەسەر ئاستی سەربازی – سیاسیدا ئێمە هێشتا لە جیهانێكی یەكهێزیدا دەژین. بەڵام هێزەكە لە گشت ئاستەكانی دیكەی – پیشەسازی، دارایی، فێركردن،

کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیریدا- دابەش دەبێت و دوور لە ئەزموونی ئەمریکی دەگۆڕێت و وەردەچەرخێ. ئەمەیش مانای ئەوە نییە ئێمە دەچینە نێو جیهانێکی دژ بە ئەمریکا، بەڵام دەچینە جیهانی دوای ئەمریکا؛ جیهانێک کە زۆرێک لە کەسەکان و لەزۆر شوێنی جیاجیادا ئاراستە و نەخشە ڕێگەکانی دەکێشن و نەخشەکانی بۆ دادەڕێژنەوە.

ئەو دەرفەت و تەگەرانە چین کەوا ئەم گۆڕانکارییانە پێشکەشیان دەکات؟ ئایا ئەو گۆڕانکارییانە چ شتێکیان بۆ ئەمریکا هەڵگرتووە؟ ئەدی ئەم قۆناغە نوێیە سەبارەت بە جەنگ و ئاشتی و ئابووری و کار و هونەر و ڕۆشنبیرییەکان چۆن دێتە بەرچاو؟ بەکورتی، مانای ئەو ڕستەیە چییە کە ئێمە لە جیهانێکی دوای ئەمریکا دەژین؟

## ٢-تۆپی کریستاڵی پێشبینیکردن

وەهای دابنێ تۆ لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٠دا دەژیت و پرسیارت لە دانایەك کردووە بۆ ئەوەی پێشبینیی ئەوەت بۆ بکات کە لەماوەی ساڵانی داهاتوودا چ شتێك بەسەر ئابووریی جیهانیدا دێت. با وەهای دابنێین تۆ هەندێك بەڵگە و ئاماژەت پێداوە بۆ ئەوەی لەکاتی نواڕینی لە تۆپە کریستاڵییەکە یارمەتیی بدەبێت. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دووچاری مەترسیدارترین هێرشی تیرۆرستی دەبێتەوە لە مێژوودا- تۆ وەهای پێ دەڵێیت- ئەویش سەبارەت بە دوو جەنگ وەڵامت دەداتەوە کە لە یەکێکیاندا زۆر بەخراپی تێکدەشکێت و عێراق بەجێدەهێڵێ- ئەو وڵاتەی کەوا لە یەدەگی نەوتیدا پلەی سێیەمی هەیە- بۆ ماوەی چەندان ساڵ لە هەراوزەناو پاشاگەردانیدا دەسووڕێ دەکەوێ، هەروەها ئێرانیش لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا دەبێتە دەوڵەتێکی بەهێز و بەرەو

وەدەستهێنانی توانا و هێزی نەتۆمی دەچێت، هەروەها کۆریای باکوور ڕێگەیەکی زۆر دەبڕێت کە زۆر زیاترە لە ڕاگەیاندنی خۆی وەك هەشتەم هێزی خاوەن چەکی ئەتۆمی لە جیهاندا، ڕووسیاش وەردەچەرخێت و دەگۆڕێت و زۆر دوژمنکارانە و لووتبەرزانە ڕەفتار لەگەڵ هاوسێیەکان و خۆرئاواشدا دەکات. لە ئەمریکای لاتینیشدا هۆگۆ چافیزی سەرۆکی فەنزویلا هەڵمەتێکی دژ بە خۆرئاوا رادەگەیەنێ کە توندوتیژترینە، زۆرێکیش لە هاوپەیمان و سەرسامان بۆخۆی رادەکێشێت، ئیسرائیل و حیزبوڵلاش لە باشووری لوبناندا جەنگێك بەرپا دەکەن کە دەبێتە هۆی لەرزاندنی حکوومەتە فشۆڵەکەی بەیرووت و تێوەگلانی ئێران و سووریا، تۆقین دەخاتە نێو دڵی ئیسرائیلییەکان، غەززەش دەبێتە دەوڵەتێکی شکستخواردوو کەوا حەماس حوکمی دەکات، گفتوگۆیەکانی ئاشتیی نێوان ئیسرائیلی و فەلەستینییەکانیش دەگاتە بنبەست. دواتر بە دانایەکە دەڵێت: : بە پشتبەستن بەم هەموو ڕووداوە، ئابووریی جیهانی لەماوەی شەش ساڵی داهاتوودا چۆن دەبێت؟"

ئەمە بەتەواوی شیمانە نییە– لەراستیدا– چوونکە ئێمە پێشبینیی وەهامان لەبەردەستە کەوا لەلایەن چەند کەسێکی شارەزاوە لەو ساڵانەدا دەرچووە. بەڵام هەموویان ڕاست نەبوون. دەبوولیە پێشبینییە دروستەکە ئەمە بێت: لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٠و ٢٠٠٧ دا ئابووریی جیهانی بەبەراورد لەگەڵ دە دەیە زۆر بەخێرایی گەشە دەکات، دەرامەتی تاکیش لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا بەخێراییەکی وەها بەرز دەبێتەوە کە لەمێژوودا وێنەی نەبووە (٣.٢ لەسەدا).

ئێمە هەر لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگی ساردا لە دژبوونێکدا دەژین، دۆخێکە و گشت بەیانییەك کاتێك ڕۆژنامەکان دەخوێنینەوە دووچاری دەبینەوە. چوونکە وەها پێدەچێ سیاسەتی جیهانی وەك بڵێی لە دەریایەکی زۆر شەپۆلاویدا

کەشتیوانی بکات، لەگەڵ ئەو راپۆرتە رۆژانەییانەی کەوا باس لە تەقینەوە و کودەتایەکانی تیرۆرستی و دەوڵەتانی هەڵگەڕاوە و تێکۆشانی مەدەنی دەکات دەریایەکە مەنگتر دەبێت. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئابووریی جیهانی پێشکەوتنێکی جێگیر بەخۆیەوە دەبینێ، راستە کە پچڕان و قەیرانی مەترسیدار رووبەڕووی دەبێتەوە، بەڵام رەوتە گشتییەکەی زۆر بەخێرایی بەرەو هەڵکشان دەچێت. هەرچەندە بازاڕەکان دووچاری تۆقین دەبنەوە، بەڵام ئەمە رەنگدانەوە و پێشاندەری هەواڵی ئابوورییە نەك سیاسی. بە واتایەکی دیکە، هەردەڵێی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکان تەواو لە بەشی ئابووری دابڕاون.

ئەو گفتوگۆییەی خۆمم بیردێتەوە کە لەگەڵ ئەندامێکی پایەبەرزی حکوومەتی ئیسرائیلی ئەنجامم دا، گفتوگۆیەکەش دوای چەند رۆژێکی کەم لە هەڵگیرسانی جەنگیی ساڵی ٢٠٠٦ ی نێوان ئیسرائیل و حیزبوڵلا بەڕێوەچوو. بەڕاستی ئەو ئەندامە لە هەمبەر ئاسایشی ولاتەکەی زۆر نیگەران بوو، چوونکە رۆکێتەکانی حیزبوڵلا لەوە زۆر دوورتری بڕی کە خەڵکی ئیسرائیل پێشبینییان کردبوو، وەڵامدانەوەی سەربازیی ئیسرائیلیش هەرگیز متمانەی دروست نەکرد. دوای ئەمە، سەبارەت بە ئابووری – بواری پسپۆڕییەکەی خۆی– پرسیارم لێی کرد، ئەویش گوتی:" ئەمە هەموومانی سەرسوڕماو کردووە. بازاڕی دارایی و پارە لە رۆژی یەکەمی دەستپێکردنی جەنگەکە بەرزتربوو بە بەراورد لەگەڵ رۆژی کۆتاییهاتنی جەنگەکە! ئەمە بەسەر شێکڵیشدا (دراوی ئیسرائیلی) دا پیادە دەبێت. حکوومەت لەهەمبەر جەنگەکەدا تۆقیبوو، بەڵام بازاڕ وەها نەبوو.

با ئاوڕێك لە جەنگی عێراقیش بدەینەوە کە لەو ولاتەدا بووە هۆی هەرلوزەنا و پاشاگەردانییەکی قووڵ و دووروودرێژ و زیاتر لە دوو ملیۆن پەنابەر بەرەو ولاتانی دراوسێ کۆچیان کرد. وەها دێتە بەرچاو کە ئەو جۆرە قەیرانە سیاسییانە بڵێیت

و نەڵێت کاریگەریی لە چوار دەوری خۆیان دەکەن، وەك ئەو جامەی کەوا دەخولێتەوە و کەسانی چوار دەوری تەڕ دەکات. بەڵام ئەگەر لە ساڵانی رابردوودا لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا سووڕابێتیەوە، لەهەمبەر کەمیی کاریگەریی گرفتەکانی عێراق لەسەر سەقامگیریی ناوچەکە هێندە لێت دەدات. بێگومان، بچیتە هەر شوێنێ دەبینی خەڵك لەهەمبەر سیاسەتی ئەمریکی ناڕەزایی و بێزاریی خۆیان دەردەبڕن. بەڵام، کوا بەڵگە ڕاستەقینەکانی ناسەقامگیری لە ناوچەکەدا؟ لە ڕاستیدا، زۆربەی وڵاتانی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست- میسر، سعوودیە، ئوردن - بووژانەوەیەکی ڕاستین بەخۆیانەوە دەبینن. هەروەها تورکیا کەوا سنووری هاوبەشی لەگەڵ عێراقدا هەیە گەشەکردنێکی ساڵانە بەخۆیەوە دەبینی کەوا لە کاتی جەنگەکەوە لە ٧٪ زیاترە. هەروەها ئەبوزەبی و دوبەی کە بە فڕۆکە یەك کاتژمێر لە بەغداوە دوورن، هێشتاکە هەر لە دروستکردنی هەوربڕی وەها بەردەوامن کە چاوەکان ئەبڵەق دەکەن، وەك بڵێی ئەوان لە هەسارەیەکی دیکەدا بژیەن. بەڵام سەبارەت بەو دوو دەوڵەتەی کە خۆیان هاوبەشنە نێو تەڵەی عێراق- سووریا و ئێران- ئەوا تا ئاستێکی زۆر لە دەرەوەی بازنەی ئابووریی جیهانیدا کار دەکەن، لەبەرئەوە ئەوان شتێکی هێندە زۆریان نییە کە بە دروستکردنی گرفت لەدەستی بدەن.

کەواتە، چ شتێك لێکدانەوە بۆ ئەم دژبوونەی نێوان دابەزینی هەڵەزۆنییانەی سیاسەتی جیهانی و بەرزبوونەوەی جێگیری ئابووری دەکات؟ یەکەم، ئێمە ئەوەندە کە بە وردییەکی زیاترەوە تەماشای هاتنی لافاوی هەواڵەکانی خراپەکان بکەین، چوونکە وەها دێتە پێش چاومان وەك بڵێی لە قۆناغێکی هێندە توندوتیژدا دەژین کە گەیشتووەتە ئاستی شێتی؛ بەڵام، باوەڕ بە کۆی ئەو شتانە مەکە کە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆندا دەیانبینیت، چوونکە ئەو

بۆچوونەی لەلای ئێمەدا دروست دەبێت لەهەمبەر ئەو شتانەی دەیانبینین و گوێمان لێیان دەبێت تەواو نادروست و ناڕاستن. لە ڕاستیدا، جەنگ و توندوتیژیی سیستماتیک لە ماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا زۆر دابەزیون. ئەمەیش ئەو شتەیەکە تید ڕۆبێرت و تیمی شرۆڤەکارانی مەڵبەندی گەشەپێدانی نێودەوڵەتی و بەڕێوەبردنی کێشە لە زانکۆی مێریلاند جەختی لەسەر دەکەنەوە، ئەوانە کاریان بۆ ئەوە کردووە زۆر بەوردی بەدوای زانیارییەکاندا بچن، لە دوا وێستگەدا گەیشتوونەتە ئەو دەرئەنجام و بۆچوونە: " قەبارەی گشتیی کێشمەکێشەکان لە جیهاندا لە نێوەڕاستی هەشتایەکانەوە بە ڕێژەی سەدا ٦٠ زیاتر دابەزیوە، هەروەها لە کۆتایی پەنجایەکانەوە تا هاتنی ساڵی ٢٠٠٤ گەیشتە نزمترین ئاستی خۆی ". لە میانی قۆناغەکانی جەنگی ساردەوە، بەشێوەیەکی بەردەوام زیادی کرد- کە زیادبوونەکەی شەش هێندەی ماوەکانی نێوان پەنجایەکان و سەرەتای شێستەکانە- هەروەها پێش ماوەیەکی کەم لە ڕووخانی یەکییەتیی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١ دا گەیشتە تروپك، دواتر لە دەیەی یەکەمی دوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد، پلەی ململانێی نێوان وڵاتان و نێو وڵاتەکانیشدا بەڕێژەی نیوە دابەزی ". ستیڤن بینکەری پرۆفیسۆری زۆر ئاگادار لە زانکۆی هارفارد سەبارەت بەمە گوزارشتێکی زۆر جوانی هەیە و دەڵێ" لەوانەیە ئێمە لە ئێستەدا لە قۆناغێکدا بژین کە لە هەموو قۆناغەکانی دیکەی مێژووی مرۆڤ هێمنترە".

لەوانەیە یەکێك لە هۆیەکانی نێوان واقیع و هەستکردنمان بە واقیعەکە ئەوە بێت کە ئێمە لە ماوەی هەمان ئەم دوو دەیەدا، شۆڕشێکمان لە تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان بینیبێت کەوا ئێستە هەواڵی گشت ناوچەکانی جیهانمان بەشێوەیەکی هەنووکەیی و زیندوو و بەردەوام بۆ دەگوازێتەوە. لەوانەیە

هەنووکەییبوونی وێنەکان و چڕیی ماوەی ئەو هەواڵانەی کەوا بەدرێژایی کاتژمێرەکان ناوەستن، یارمەتیدەر بن بۆ ئەوەی لە دەروونماندا بۆچوونێکی زێدەڕۆیانە و بەردەوام دروست بکەن. چوونکە هەر جۆرە تێکچوونێکی کەشوهەوا دەبێتە باوبۆرانی سەدە. هەر بۆمبێك بتەقێ دەبێتە هەواڵێکی بەپەلە. زۆر زەحمەتە بۆ ئێمە لەو هەموو شتانە تێبگەین، چوونکە مێشتاکە شۆڕشی زانیارییەکان بۆ ئێمە نوێیە. ئێمە وێنە و دیمەنە جەرگبڕەکانی مەرگەساتی نزیکەی دوو ملیۆن کەسمان نەکەوتووەتە بەرچاو کەوا لە حەفتایەکاندا لە کێڵگەکانی کوشتن لە کەمبۆدیا ڕۆژانە ڕوویان دەدا و تیایاندا هەزارن مرۆڤ کۆمەڵکوژ دەکران، هەروەها وێنە و هەواڵی یەك ملیۆن کەسیشمان نەبینیوە کەوا لە جەنگەکانی نێوان عێراق و ئێراندا لە هەشتایەکاندا ڕوویان دا. تەنانەت زۆربەی ئەو وێنەی ئەو جەنگانەشمان نەبینیوە کەوا لە نەوەدەکاندا لە کۆنگۆ هەڵگیرسان و بوونە هۆی کوشتنی چەندان ملیۆن کەس. بەڵام ئێستە بەشێوەیەکی ڕۆژانە و بە پەخشێکی زیندوو و ڕاستەوخۆ، کاریگەریی ئامرازە داهێنەرەکانی تەقینەوە IED و ئۆتومبێلەکانی بۆمبڕێژکراو و ڕۆکێتەکان دەبینین؛ ڕاستە کە ئەم ڕووداوانە زۆر تراژیدین، بەڵام ڕێژەی کوژراو و قوربانییەکانیان بەزۆری و لە زۆربەی کاتەکاندا ناگاتە دە کەس. ئەوەی نیگەرانییەکەشمان زیاد دەکات هەرەمەکیبوونی توندوتیژیی تیرۆرستیانە و بەئامانجگرتنی خەڵکی سڤیل و خێرا ڕووخاندنی دیوارە پارێزەرەکانی جڤاکە نوێیەکانە، بۆنموونە خەڵك دوای هەر ڕووداوێکی تیرۆرستییانە دەڵێن: " لەوانەبوو من بەرکەوتبمایە و هێندەی نەمابوو منیش ببمە قوربانی".

ئەم جیهانەی ئێستە زۆر بە مەترسیدار دێتە پێشچاو، بەڵام لە ڕاستیدا وەها نییە. شێمانەکانی مردنت بەهۆی توندوتیژییەکی تیرۆرستییەوە جا هەر جۆرێك

بێت زۆر کەمە و ڕۆژانەش کەمتر دەبێتەوە. هەروەها دراو و داتایەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە ئاراستەیەکی فراوان بۆ خۆ دوورگرتن لە هەڵگیرساندنی جەنگە گەورەکانی نێوان وڵاتانی زلهێز هەیە، مەبەست ئەو ململانێیانەیە کەوا ژمارە و ڕێژەیەکی زەبەلاحی قوربانی و زیانی لێ دەکەوێتەوە.

بێگومان، من پێم وانییە کە جەنگ بووەتە شتێکی کۆنی بابردەڵە و ڕابردوو، چوونکە سروشتی مرۆڤ هەر وەك خۆیەتی و نەگۆڕاوە، هەروەها سیاسەتی نێودەوڵەتیش چ گۆڕانێکی وەهای بەسەردا نەهاتووە، سیاسەتی نێودەوڵەتیش هەروایە. جیهان پێش ماوەیەك لەمەوبەر ماوەماوە هێمنیی بەخۆیەوە دەبینی دواتریش خوێنڕێژییەکی نائاسایی بەدوادا دەهات. ژمارەکانیش تاکە سبگنەڵی پیشاندانی بەدخوازی نین، چوونکە لە سەرەتای نەوەدەکاندا سروشتی جەنگ و کوشتن لە یوگسلاڤیای پێشوو بە ئەنقەست بوو، لە هەمان کاتیشدا پاڵنەری ئاینی و سیستمانیکی لەپشتەوە بوو، ئەو جەنگانەش زیاتر لە ٢٠٠.٠٠٠ قوربانی -بە کوژراو و بریندار- لێ کەوتەوە و بە چەپەڵییەکی ئاکاری هێندە نەگریس دانرا کەوا دەبێ لەسەر هەر پێوەرێکدا بەرزترین پلەی شەرمەزاری داگیر بکات.

لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەگەر بمانەوێ ئەو سەردەمە بناسین کەوا تیایدا دەژین، دەبێ یەکەم جار زۆر بەوردی وەسفی بکەین. ئەویش لە سات و کاتی هەنووکەییدا- لە ڕەوتی مێژووییدا – بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی هێمن و بەسرەوتە.

## هەڕەشەی ئیسلامییانە

ڕاستە کە ئەوەی بە تیرۆر و تۆقاندنی ئیسلامگەرایانە وەسف دەکرێت و مانشێتی زۆربەی ڕۆژنامە و سەردێڕی هەواڵەکانی ڕۆژانەی بۆ تەرخان دەکرێ،

گرفتێکی گەورە و درێژە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا تەواوی ئیسلامییەکان وەهانین، بەڵکو ژمارەیەکی زۆرکەمی دەمارگیرەکان دەگرێتەوە. ئەمەیش خۆراکی خۆی لە دەستەپاچەیی و هەستکردن بە داگیرکراوی و سەرشۆڕی (ڕاستین یان خەیاڵاویی) بەردەستی خۆرئاواییەکان و ئاسانیی دەستڕاگەیشتن بە تەکنیکەکانی توندوتیژییەوە وەردەگرێ. بەڵام ئاخۆ ئەمە بە هەڕەشەیەکی مەترسیدار دەزاندرێ ئەگەر هاتوو دیاردەی ئیسلامگەرایی توندوتیژ بە هەوڵی ئەڵمانیا بۆ هەژموون پەیداکردن بەسەر جیهان بەراورد بکرێ کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەبیندرا؟ یان لەگەڵ فراوانبوونی سۆڤییەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا؟ یان هەوڵەکانی ماو بۆ چاندنی تۆوەکانی جەنگ و شۆڕش لە وڵاتانی جیهانی سێیەم لە پەنجاکان و شێستەکاندا؟ کۆی ئەوانەی لەسەرەوە باسمان کردن بەرەنگاربوونەوە و گرفتی وەها بوون کەوا وڵاتانی گەورە- و بەزۆریش لەگەڵ هاوپەیمانانی گرنگ- و چەند ئایدۆلۆژیایەك لە پشتیانەوە بوون کە بۆ دیموکراسییەتی لیبراڵی بە ئەلتەرناتیڤێکی لۆژیکی دادەندران. هەر بۆ بەراوردکاری، بەوردی لە هەڕەشەی جیهادییانە بنواڕە. پێش پانزەی ئەیلول، کاتێك گرووپەکانی وەك ئەلقاعیدە لەبەرچاوی خەڵك چالاکییەکانی خۆیان ئەنجام دەدا، حکوومەتەکان وەك سەرچاوەی هەراسانییەکی کەمبایەخ لێیان دەنواڕی، ئەمەیش وایکرد زۆر بە ئازادی بجووڵێن و هەندێك هێز بۆ خۆیان بونیادبنێن و بەزۆری لە هەندێك ئامانجی ڕەمزیی- سەربازی بدەن و ببنە هۆی کوشتنی ژمارەیەك ئەمریکی و خەڵکانی دیکەی بیانی. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەو زیانەی کە لەو هێرش و بەئامانجگرتنانەدا پەیدابوون بەجۆرێك لە جۆرەکان زۆر دیاریکراو بوو. لە ۱۱/۹ بەدواوە حکوومەتەکان وەخۆ کەوتن بۆ ئەوەی تۆڕەکانی تیرۆرستی دەستگیر بکەن و دەست بەسەر سەرچاوەی داهات و لایەنی داراییاندا بگرن و تاقیبی

ئەندامەکانیان بکەن، لەمەیشدا زۆربەی جار دەرئەنجامی ڕاستەوخۆیان وەدەست دەهێنا، بۆ نموونە لە ئەندونیسیادا کە گەورەترین دەوڵەتی ئیسلامییە لە جیهاندا، حکوومەت ڕابەری کۆمەڵەی ئیسلامی و سەرکردە سەربازییەکەی هەمان کۆمەڵەی جیهادییان دەستگیرکرد کە لە وڵاتەکەدا خوێنڕێژترین کۆمەڵە بوون و هەر ئەوانیش بوون کە تەقینەوەکانی ساڵی ٢٠٠٢ی بالییان ئەنجام دا. هەروەها بە یارمەتیی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا، سوپای فلیپین هێرشی زۆر کەمەرشکێنی کردە سەر کۆمەڵەی ئەبو سەییاف کەوا زۆر هاوشێوەی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە بوون. لە کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٧دا ڕابەری کۆمەڵەکە لە لایەن سەربازانی فلیپینی کوژرا و ژمارەی ئەندامەکانی بەشێوەیەکی بەرچاو کەمبوونەوە، پێشتر و لە ماوەی شەش ساڵدا ژمارەیان نزیکەی دوو هەزار چەکداربوو، کەچی ئێستە لە چەند سەد کەسێك تێناپەڕن. هەروەها لە میسر و سعوودیەشدا خانە و ڕێکخستنەکانی ئەلقاعیدە دەستگیرکران و ئەوانەش کە دەستگیر نەکران، توانای خۆیان لەدەستدا و ماوەی سێ ساڵە نەیانتوانیوە هیچ هێرشێکی دیکەی نوێ ئەنجام بدەن. وەزارەتەکانی دارایی و ئابووری – بەتایبەتیش وەزارەتی دارایی ئەمریکا– ئابڵۆقەی لەسەر تیرۆرستەکان زۆر توند کرد، ئەم ئابلۆقەیە وەهای کرد کە ئەنجامدانی چالاکییەکانیان زۆر دژوار بێت. ڕێکخراوەکانی جیهانی ناتوانن گەشە بکەن ئەگەر نەتوانن پارەوپوولەکانیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بگوازنەوە. لەسەر ئەم بنەمایەوە، هەرچەندە ئاشکراکردن و بەئامانجگرتنی سەرچاوەی داهاتەکانی تیرۆرستەکان زیاتر بێت، زیاتر ناچار دەبن پەنا ببەنە بەر کردە هەرەمەکی و خێرا و بێ بەرنامەکان کە لە سنووری زۆر تەنگەبەردایە و دیاریکراوە. بێگومان ئەم ململانێیەی نێوان حکوومەتەکان و تیرۆرستەکان بەردەوام دەبێت، بەڵام ئەوە حکوومەتەکانن کە تیایدا شتەکان یەکلا دەکەنەوە و دەستی بالایان هەیە.

لە عێراقدا، ئاڵۆزییەکی دیکە سەربهەڵدا کە پەیوەندیی بە دوژمنایەتیی دێرینی نێوان سوننی – شیعییەوە هەیە، ئەمەیش بووە هۆی لاوازکردنی ئەلقاعیدە و ڕەنگدانەوەی لەسەر دابەزینی ئاست و ڕێژەی هێرشەکانی تیرۆرستیدا هەبوو. ئەلقاعیدە لە فەتوا و ڕاگەیەندراوەکانی سەرەتاییدا، باسی شیعەی نەدەکرد، بەڵکو هەر تەنیا هێرشی دەکردە سەر خاچپەرستان و جوولەکەکان. بەڵام عێراق ئەم ئاراستەگرییەی گۆڕی. ئەلقاعیدە لەپێناو بەکێشکردنی پاڵپشتیی سوونییەکان، بوونە کۆمەڵەیەکی دژ بە شیعە، لەمەیشدا پێڕەوی ڕا و بۆچوونێکی سوونننیانەی بنەوانگریان (اصولی) کرد بۆ ژیان. ئەبو موسعەبی زەرقاوی، ڕابەری ڕێکخستنی ئەلقاعیدە لە وڵاتی نێوان دوو ڕووباردا، بەردی بناغەی ئەو ڕەوتە نوێیە بوو، چوونکە زۆر ڕقی لە شیعەکان دەبوویەوە. زەرقاوی لە نامەیەکدا کە لە شوباتی ساڵی ٢٠٠٤ دا بۆ ئوسامە بن لادنی ناردووە ئەم ڕقوکینەیە بەدیاردەخات.

لە ڕاستیدا، دابەشبوونی نێوان سووننە و شیعە تەنیا یەکێکە لەو دابەشبوونە ئەزەلییەوەندانەی کەوا لە جیهانی ئیسلامیدا ڕوویان داوە. دابەشبوونەکان زۆرن؛ وەك دابەشبوونی شیعە و سووننە، فارس و عەرەب، خۆرهەڵاتی ئاسیایی و خۆرهەڵاتی نیوەڕاستی، لە هەموو ئەمانەش گرنگتر میانەڕەو و توندڕەوکان. هەر وەك چۆن هەمەڕەنگی و هەمەجۆری لەنێو جیهانی کۆمنیزمیدا لە کۆتاییەکەیدا بووە هۆی لاوازکردنی، ئەوا ئەو هەموو هەمەجۆرییەش لەنێو ئیسلامدا توانای ساربێژکردنەوە و یەکگرتنیان لاواز دەکات و نایەڵێ ببنە ڕکابەرێکی زەبەلاح. ڕابەران و سەرکردەکانی خۆرئاوا باس لە یەك بزاڤی جیهانیی ئیسلامی دەکەن؛ لەمەیشدا بەشێوەیەکی دژ بە لۆژیك و واقیع، لۆژیکی سەربەخۆخوازانەی چیچان لە ڕووسیا و ئەو چەکدارانایەن کۆکردووەتەوە کە لەهیندستاندا لە لایەن

پاکستانەوە پشتگیری و پاڵپشتییان لێ دەکرێ، هەروەها ڕێکخراوەکانی شیعییەکانی لوبنان و جیهادییەکانی سوننیی میسر. بەڵام هەر کەسێکی ستراتیژستی ئاگادار ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە هەر یەکە لەو کۆمەڵانە بەتەواوی لەوانی دیکە جیاوازە، چوونکە هەر یەکێکیان پرۆژ و دوژمن و دۆستی جیاوازیان هەیە. ئەم مەسەلەیەش بانگەشەی ئەو کۆمەڵانە ڕەتدەکاتەوە کەوا نوێنەرایەتی ئیسلام دەکەن، هەروەک چۆن لە ڕاستیدا هەن ئاوایان وەسف دەکات: ئەوانە چەند دەستە و تاقمێکی بچووکی لۆکاڵین و لە چەند کەسێك پێکهاتوون کە نەیانتوانییوە تەڵی جڤاکەکانیان ببن و هیوای ئەوە دەخوازن بەهۆی ڕەتکردنەوەی واقیع و ئەنجامدانی کار و ڕەفتارەکانی بەربەرییەوە سەرنجان بۆخۆیان ڕابکێشن.

ڕاستە کە ململانێیی تایبەت بە کۆمەڵەکانی ڕادیکاڵی ئیسلامییەکان بەردەوامە، بەڵام زیاتر پەیوەندیی بە هەلومەرجە دیاریکراوەکانی لۆکاڵییەوە هەیە نەك پەیوەندیی بە هیواخوازی و بەرنامایی جیهانییەوە هەبێت، بۆنموونە: لە باشووری ئەفریقیا کەوا تیرۆر و تۆقینێکی بەردەوامی بەخۆیەوە بینی، بەتایبەت لە جەزائیر، دەبینین کۆمەڵەی سەرەکی لەوێدا – کۆمەڵەی سەلەفییە بۆ بانگخوازی و جیهاد کە لە فەڕەنسا بەGSPC ناسراوە– بەشێکە لە جەنگێکی دوورودرێژی نێوان حکوومەتی جەزائیری و هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی، هەرگیز ناکرێ تەنیا لە ڕوانگەی ئەلقاعیدە یان جیهاد بە دژی ئەمریکا لێی بنواڕدرێ. ئەم مەسەلەیە بەسەر ئەو ناوچەیەشدا ڕاست دەردەچێ کەوا زیادبوونێکی مەترسیداری هێزی ئەلقاعیدەی تیادا دەبینرێ، واتا سنووری نێوان ئەفغانستان - پاکستان کەوا سەرکردایەتیی ئەلقاعیدەی پەنا داوە، ئەوجا ئەگەر قەوارەیەکی وەهاش لەوێدا بوونی هەبێت. بەڵام ئەم کۆمەڵەیە توانیویەتی

بوونی خۆی بپارێزی – هەرچەندە ناتۆ هەوڵی بێوچانی داوە– چوونکە لە ماوەی جەنگی دژ بە یەکییەتیی سۆڤییەت ڕەگی خۆی لەوێدا باش داکوتاوە، هەروەها هاوپەیمانەکەشی – بزووتنەوەی لۆکاڵییانەی تاڵیبان– لە لایەن بەشێك لە هۆزەکانی پەشتۆن پاڵپشتیی لێ دەکرێ، پاشتوّن کۆمەڵەیەکی نەژادین و لە ئەفغانستان و پاکستاندا هەژمووندارن.

بەکورتی، سەرکردایەتیی ئەلقاعیدە– ئەو کۆمەڵەیەی کەوا ئوسامە بن لادن و ئەیمەن زەواهیری ڕێبەراتییان دەکەن– لەو شەش ساڵەی کە لە دوای هێرشەکانی یانزەی ئەیلول هاتن نەیتوانیوە لە گشت شوێنەکانی دونیادا هیچ هێرشێکی گەورە بکات. لە ڕێکخراوێکی تیرۆرستییەوە بووە کۆمپانیایەکی پەیوەندیکردن، لەجیات ئەوەی کاری ڕاستینی تیرۆرستی ئەنجام بدەن تەنیا کاروپیشەیان بەرهەمهێنانی چەند ڤیدیۆیەك بوو کە ماوەماوە پەخشیان دەکردن. ڕاستە کە جیهادەکە بەردەوامە، بەڵام جیهادییەکان ناچاربوون پەرتەی لێ بکەن و بە ئامانجە بچووکەکان ڕازی بن و لەسەر ئاستی لۆکاڵیدا کار بکەن؛ بەزۆری لە میانی چەند کۆمەڵەیەك کە بەهیچ شێوەیەك هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان بە ئەلقاعیدەوە نییە. ئەم ستراتیژە پەرتەوازە و هەرەمەکییە خاڵێکی زۆر لاوازی هەیە: ئەوان دانیشتووانی نێوخۆیی دەکوژن، بەمەیش ڕقی موسڵمانانی ئاسایی هەڵدەستێنن؛ کردەیەکی کردارییە و بەگرنگیدانێکی بەکرێتمییەوە لە وڵاتانی جۆربەجۆری وەك ئەندونیسیا و عێراقدا بەڕێوەدەبرێن. لە ماوەی شەش ساڵی ڕابردوودا، پاڵپشتیکردن و لایەنگریی بۆ ئوسامە بن لادن و ئامانجەکانی بەشێوەیەکی بەردەوام لە گشت شوێنەکانی جیهانی ئیسلامیدا کەمبووەتەوە، هەروەها لەنێوان ساڵانی ۲۰۰۲–۲۰۰۷دا لایەنگریکردنی تەقینەوەکانی خۆکوژی وەك تەکتیك لە زۆربەی ئەو وڵاتە ئیسلامییانەی کەوا

راپرسییان تیادا كراوە بەرێژەی ٥٠٪ دابەزیوە و ڕێژەكەش بەردەوام لە كەمیی داوە. ئەو فەتوایانەش لە هەموو كاتێكی دیكەدا زۆر زیادیانكرد كەوا توندوتیژی و بن لادن شەرمەزار دەكەن. ڕاستە هێشتا كارێكی زۆر ماوە كە دەبێ لەپێناو نوێكردنەوەی جیهانی ئیسلامیدا بكرێ، ئەمەیش وەهای كردووە نوێخوازەكان بەلای كەمەوە نەترسێن. ئەوان دركیان بەوە كردووە كە چەند كەسێكی بە ژمارە كەم دەیانەوێ لەژێر سایەی فەتوایەكانی ئەلقاعیدەدا بژیەن. تەنانەت ئەوانەی لە ڕابردوودا پێڕەوی ئەلقاعیدە و فەتوایەكانیان كردووە، ئێستە بوونەتە دوژمنی هەرە سەرسەختیان. بە بەراورد لەگەڵ كۆمۆنیزمی سۆڤییەتی و تەنانەت فاشیزم لە سییەكانی سەدەی ڕابردوودا، هیچ جیاكێك نییە بەچاوی خۆشەویستی و سەرسامبوونەوە بنوارێتە دیاردە و نموونەی بنەولنگری (الاصولییە) یان حەز بە پێڕەوكردنی بكات. لەسەر ئاستی ئایدۆلۆژییەوە ناتوانێ كێبڕێی نموونە نوێگەرییەكەی خۆرئاوا بكات كەوا ئێستە ولأتان لە گشت شوێنێكی جیهاندا پێڕەویی لێ دەكەن.

لە یانزەی سێپتێمبەرەوە پیشەسازییەكی لۆكاڵی بۆ ڕەوجدان و ڕیكلامكردن لە خۆرئاوادا و بەتایبەت لە ویلایەتەكانی یەكگرتوودا پێشكەوتووە و سەری هەڵداوە و شارەزایان تیایدا گشت ئەو ئاراستەگری و خولیایانە قەبە دەكەنەوە كەوا حەزی پێناكەن، لەمەیشدا پێشدەستییان بە هەر توێژینەوەیەكی جیدی زانیارییەكان و داتەیەكانی بەردەستدا كردووە. زۆربەی چاودێران و وتەبێژانی موحافەزەكار باسیان لە بەئیسلامكردنێكی وەكاتانەی (الیقینیە) ئەوروپا كردووە و (ناویان لێی ناوە ئەوروپای عەرەبی، ئەمەیش بۆ ئەوەیە نیگەرانییەكەت زیاتر بكەن)، هەرچەندە خەملاندن و مەزەندەكردنەكانی هەرە بەرزی ئاژانسەكانی هەواڵگریی ئەمریكی ئاماژە بەوە دەكەن كە موسڵمانان سەدا سێی ژمارەی

دانیشتووانی ئەورووپا پێکدەهێنن و لەگەڵ هاتنی ساڵی ۲۰۲۵دا ڕێژەکەیان دەگاتە ٥ تا ٨ لەسەدا، دواتر دەچنە نێو قۆناغێکی جێگرییەوە، چوونکە زیادبوونی ژمارەیان دەبێتە شتێکی پەراوێزی. چاودێران چاودێریی سەرجەم قسە بێمانا و خەیاڵپلاوەکانی گشت ئیمامێکی خەیاڵاوی دەکەن، هەروەها لە ئەرشیفدا بەدوای هەر ئامارەیەکدا دەگەڕێن کە باس لە کۆتاییهاتنی جیهان بکات و گشت هزر و بۆچوونەکانی ئەو کەسانە لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆنیدا تۆمار و بڵاو دەکەنەوە کەوا ڕیکلام بۆ خۆ شەهیدکردن دەکەن، کاتێکیش سۆماڵییەکی شوفێری تاکسی لە شوێنێکدا ئەوە ڕەتدەکاتەوە سندووقێك شەراب لە ئوتومبێلەکەی بار بکات، وەك گای هار تووڕە دەبن و ئەمە بە سەرەتای پیادەکردنی شەریعەت لە خۆرئاوا لە قەڵەم دەدەن. بەڵام کۆی ئەم ڕووداوانە لە واقیعدا ڕەنگدانەوە و نمایشکاری ئاراستەگری و خولیاکانی سەرەکیی نێو جیهانی ئیسلامی نین، ئەو جیهانەی بەرەو پێشکەوتن دەچێت- هەرچەندە پێشکەوتنەکەی لە وڵاتانی دیکە هێواشترە. ڕاستە کۆنەپەرستەکانی نێو جیهانی ئیسلامی ژمارەیان زۆرترە و لە هەر کەسێکی نێو کەلتووری دیکە توندڕەوترن، بەڵام لەنێو ئەو موسڵمانانەی جیهاندا کە ژمارەیان لە ملیارێك دانیشتووان زیاترە، هەر بە کەمینە دەمێننەوە. پشتگوێخستنی ئەو هەلومەرجە ئاڵۆزانەی کەوا تیایدا هەندێك لەو داتا ساختە ئاینییانەی تیادا دروست دەکرێت- وەك ململانێی نێوخۆیی ئێران لەنێوان پیاوانی ئاینی و عیلمانییەکان بۆ وەرگرتنی دەستهەڵات - دەبێتە هۆی پەیدابوونی پێشبینیی زۆر پووچ، هەرچەندە جێگەی تۆقینە، هەر لەمبارەیەوە بێرنارد لویس بانگەشەیەکی کردووە و پێی وایە مەحموود ئەحمەدی نەژاد پیلانی داناوە بۆ ئەوەی ڕۆژێکی گرنگ لە ساڵنامەی ئیسلامی (۲۲ی ئابی ساڵی ۲۰۰٦) بکاتە وادەی کۆتاییهاتنی جیهان. (بەڵێ، بەڕاستی ئەمەی نووسیوە).

چاودێرەکانی بواری ئایدۆلۆژی زۆرێک لە کاتەکانی خۆیان بە تاوتوێکردن و شەنوکەوکردنی بەڵگەنامەکانی جیهادی بە فیڕۆداوە، ئەمەیش وەهای کردووە نەتوانن ڕاستیی جڤاکەکانی ئیسلامی ببینن. ئەگەر ئەوان سەریان بەرزکردابایەوە و بەجوانی بیانئنواڕیبایە، ڕق و تووڕەیی و بێزاریی خەڵکیان لە هەمبەر بنەوانگرەکاندا دەبینی. هەروەها حەزی نوێکردنەوەشیان بەرچاو دەکەوت (هەرچەندە بەڕاستی لەهەمبەر کەلتووری خۆیاندا هەست بەشانازی دەکەن)، هەروەها پەرۆشیی خەڵکانی موسڵمانیان بۆ چارەسەری کرداریانە دەبینی. کاتێک موسڵمانەکان سەفەر دەکەن، ئەوا بەملیۆنانیان دەچنە شاری سەرسوڕهێنەری دوبەی نەک بچنە بازنەکانی ئاینیی ئێران. ڕاستە ئەو کەمینەیە ڕاستەقینەن کەوا حەز بە جیهاد دەکەن، بەڵام کاری ئەو کەمینەیە دەکەوێتە نێو چەند جڤاکێکەوە کەوا تیایدا جەماوەریبوونی ئەو جۆرە چالاکیانە ڕۆژ بەڕۆژ لە کەمبوونەوەدایە.

لە خۆرئاوادا، کاریگەرییەکانی تیرۆر و تۆقاندن دوای هەر هێرشێکی نوێ کەمتر دەبوورەیەوە. دوای ۱۱/۹، بازاڕەکانی دراوی و دارایی داڕووخان و تەنیا دوو مانگ دوای بەرواری۹/۱۰ ئەوجا گەیشتنەوە ئاستی پێشوو. لە دوای تەقینەوەکانی ساڵی ۲۰۰٤ی مەدریدیش، بازاڕەکانی ئیسپانیا پێویستیان بە مانگێک بوو بۆ ئەوەی چاکببنەوە و وەک جارانیان لێ بێتەوە. بەڵام لە زنجیرە تەقینەوەی تەمووزی ساڵی ۲۰۰٥ی لەندەن پشکەکانی بریتانی لەماوەی بیست و چوار کاتژمێردا گەیشتنەوە هەمان ئاستی پێش تەقینەوەکان. ئەم مەسەلەیە بەسەر وێنە گەورەکەی ئابووریشدا پیادە دەبێت. چوونکە دوای ۱۱/۹، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە چەند چالاکییەکی جۆربەجۆری ئابووریدا سەدان ملیار دۆلاری لەدەست دا. هەروەها سەبارەت بە دووەم هێرشی هەرە گەورە–

تەقاندنەوەی یانەیەکی شەوانە لە بالی لە سالی ۲۰۰۲دا- کاریگەرییەکی نەرێنیی زۆر زەبەلاحی لە ئابووریی ئەندۆنیسیا کرد، چوونکە گشت چالاکییەکانی گەشتیاری چەقیان بەست و بۆ چەند مانگێکیش کارەکانی بازرگانی و وەبەرهێنان راوەستان. بەلام، دوای سالێك لە تەقینەوەیەکی دیکەی نێو ئەندۆنیسیادا- ئەوجارە لە هوتێلی ماریۆت لە جاکارتا- بازاڕ تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم کاریگەر بوو، زیانەکەشی بۆ سەر ئابووریی ئەندۆنیسیا زۆر کەم بوو. هەروەها لەو تەقینەوانەی کەوا لە مەغریب و تورکیادا لە سالی ۲۰۰۲دا ڕوویان دا، کاریگەرییان زۆر کەم بوو. هەروەها ئەو تەقینەوانەی لە سالی ۲۰۰٤دا لە ئیسپانیا و ئەوانەی لە سالی ۲۰۰٥دا لە بریتانیادا ڕوویان دا، لە وەستاندنی ڕێژەکانی گەشەکردنی ئەو ولاتانە سەرکەوتنیان وەدەستنەهێنا.

بێگومان، مەسەلەکە زۆر جیاواز دەبوو ئەگەر ڕێکخراوێکی مەزنی تیرۆرستی چەکی کۆکوژی دەستبکەوتبایە، چوونکە هێرشی ئەتۆمی دەبێتە خۆی تۆقینێکی گەورە و تێکدان و ڕووخاندنی فراوانتر. بەلام ئەو چەکانە هێندە بە ئاسانی ناکەونە بەردەستی تیرۆرستەکان هەر وەك زۆربەی خەلك پێیان وایە، دەستڕاگەیشتن بە هەر ڕێژەیەکی ئەو چەکانە بەتەواوی ئەستەم دەبێت ئەگەر واشنتۆن بۆ ڕێگەگرتن لەمە هەولی خۆی بخاتە گەڕ. لەوانەیە تیرۆر و تۆقاندن و هێرشی بایۆلۆژییانە زیاتر جێگەی نیگەرانی بێت، چوونکە مادەکانی بایۆلۆژی بەئاسانی دەستدەکەون، بەلام دابەشکردنی ئەو جۆرە چەکانە قورسترە، هەروەها لەوانەیە دەرئەنجامەکانی لەو ئاستە کەمتر ترازیدی بێت کەوا تیرۆرستەکان بۆی پەرۆشن. من لە گرێی ئەم قسانەی لەسەرەوە باسمکردن مەبەستم ئەوە نییە بلێم کە بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر پێویست نییە، بەلکو دەلێم

پێڕەوکردنـــی سیاســـەتی ئاگـــاداری و ورد و زیرەکانـــە دەرئـــەنجامی زۆر سەرکەوتووانەی دەبێت.

خەڵك بەشێوەیەکی باس نەکراو و ڕانەگەیەندراو پێیان وایە کە باشترین سیاسەت بـۆ بەرەنگاربوونـەوەی تـیرۆر نەرمییـە (توانـای چـاکبوونەوە لـە نسـکۆیەکان بەشـێوەیەکی خێـرا). تـیرۆر و تۆقانـدن ڕەفتـارێکی نائاسـاییە، بـەو واتایـەی کاردانـەوەی بینـەران دەستنیشـانی سەرکەوتنی هـەر تـەکتیکێکی سـەربازی دەکات. ئەگەر نەتۆقین، ئەوا مانـای ئەوەیـە تـیرۆر لە هەوڵەکانیـدا سـەرکەوتوو نەبووە. خەڵك، لە نیویۆرك و لەندەنەوە تا دەگاتە مۆمبـای و جاکارتـا، لـەمیانی ئەزموونـەوە درك بـەو ڕاسـتییە دەکـەن، هـەروەها لـەنێو دۆخێکـی زۆر نادڵنیاییشـەوە بـەردەوامی بـە ژیـانی ڕۆژانـەیان دەدەن. ڕاسـتە کـە زنجیرەیـەك هێرشـی تیرۆرسـتی بـە ئۆتـۆمبێلی بۆمبڕێـژکراو و پشـتێنی بۆمبڕێـژکراو لـە ویلایەتەکانی یەکگرتوودا دەبێتە هۆی دروستکردنی شۆك و هێدمە، بەڵام دوای دوو هەفتـە کارێگـەری و شـوێنەوارەکانی نامێنێـت، هـەروەها ئاقیبەتـە دوورمەودایەکانیشی زۆر کەم دەبێت. لە چاکەکانی گەورە و بەهێز و ئاڵۆزدا (لـە ئێستەدا قەبارەی ئـابووریی ئـەمریکی بـە نزیکـەی ١٣ تریلیـۆن دۆلار دادەنـدرێ) گرفتی چەند شوێنێك بەئاسانی کـار لـە شوێنەکانی دیکـەی ناکـات. چاکـەکانی پێشکەوتوو زۆر لەوە بەهێزترن کەوا ئێمە باوەڕمان وایە.

هـەروەها ئـەو ئەگـەرە و بەرەنگارییانـەی کـەوا وڵاتـانی هەڵگـەڕاوە و قینلـەدڵ دەیانسەپێنن ڕاستەقینەن، بەڵام لەسەرمان پێویستە لـەمیانی ڕەوت و ڕێـڕەوی گشتییەوە لێی بنواڕین. تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی ئێران Gross Domestic Product دەگاتە ١/٦٨ تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی ویلایەتـەکانی یـەکگرتووی ئـەمریکا و خـەرجیی سەربازیشـی ١/١١٠ لـە بەرانبـەر ئـەو خەرجییەیـە کـەوا

پەنتاگۆن خەرجی دەکات[1]. جا ئەگەر ئێمە وەها شیمانەی بکەین کەوا لە ساڵی ۱۹۳۸دا دەژین- هەروەك چۆن زۆربەی موحافیزەکارەکان بێژبازیی لەسەر دەکەن- ئەوا مانای ئەوەیە کە ئێران هاوتای ڕۆمانیایە نەك ئەڵمانیا. کۆریای باکووریش لە ئێران مایەپووچتر و کورتهێنەرترە. هەروەها ئەو مەترسییە سەرەکییەکەی کەوا دروستی دەکات- ئەوەی کە لێناگەڕێ حکومەتی چینی خەو بچێتە چاوی- ئەوەیە کەوا لە نێوەخۆدا بتەقێتەوە و ناوچەکە پڕبکات لە پەنابەر. لەوانەیە ئەم وڵاتانە بتوانن گرفت بۆ چوار دەوری خۆیان دروستبکەن و

---

[1]) تێبینییەك سەبارەت زاراوەکانی تایبەت: سەبارەت بەو بڕۆکە سادەیە، تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی بە پێوەرێکی ئاڵۆز دادەندرێ کە سەر دەسوڕمێنێ. هەرچەندە مادەکانی بازرگانیی وەك iPods و پۆشاکەکانی وەرزشیی وەك Nike تێچوورەکەی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکەی هاوسێی جیاوازییەکی هێندە گەورەی نییە، بەڵام هەندێك لەو کاڵایانەی کە ناتواندرێ لە ڕێگەی سنوورەکانەوە بگوازرێنەوە، ئەوا لە وڵاتانی تازە گەشەسەندوودا تێچووەکەیان کەمترە. لەبەرئەوە هەمان دەرامەت لە هیند زیاتر دەمێنێتەوە ئەگەر بە بریتانیا بەراورد بکرێ. لەبەر ئەم هۆیە زۆرێك لە ئابووریزانان یەکێك لە پێوەرەکانی تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی بەکاردەهێنن کە پێی دەگوترێ هاوکێشەی هێزی کڕین PPP کە بە ئاستێکی زۆر گەورە دەرامەتی وڵاتانی گەشەسەندوو قەبە دەکات. لایەنگرانی ئەم بڕۆکەیە دەڵێن کە ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی باشتر جۆری ژیان پیشان دەدات. بەڵام، کاتێك مەسەلەکە پەیوەندیی بە هێزی خاوی نەتەوەییەوە هەیە، ئەوا پێوانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی تێکڕایەکان ( المعدلات)ی خەرجکردنی دراو لە بازاڕدا ئەندروستترە. چونکە تۆ ناتوانیت هەڵگری فڕۆکەکان بکڕیت یان پارە بۆ هەڵمەتێکی پاراستنی ئاشتیی سەر بە نەتەوەکانی یەکگرتوو خەرج بکەیت، یان قازانجەکانی کۆمپانیایەك رابگەیەنیت، یان بە دۆلار چەند کۆمەکێکی دەرەکی بکەیت کەوا بە پێوەری هاوکێشەی هێزی کڕین بپێودرێ. لەبەر ئەم هۆیە لەم کتێبەدا -بەشێوەیەکی گشتی- تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی تەنیا بە بەکارهێنانی تێکڕایەکانی خەرجکردن لە بازاڕ حیساب دەکەم، کاتێکیش هاوکێشەی هێزی کڕین زیاتر گونجاو بێت یان کاتێك ژمارەکانی بەردەست تەنیا بەم پێوەرە هەبن، تێبینییەکی سەبارەت دەنووسم.

دەبێ چاودێرییان بکرێت و بەرزەفت بکرێن، بەڵام لەسەرمان پێویستە ئەوە لە مێشکی خۆماندا بهێڵینەوە کە ئەمە لەم جیهانەدا بەشێکی بەرێژە بچووک پێکدێنێت. تەماشای ئەمریکای لاتینی بکە! فەنزوێلا دەوڵەتێکە و گرفت دروست دەکات، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەمە چ واتایەك دەگەیەنێ لەسەر زەمویدا؟ ئاراستەی گشتی لە ناوچەکەدا- ئەو شتەی کە سیاسەتەکانی وڵاتانی گەورەی وەك بەرازیل و مەکسیك و چیلی بەرجەستەی دەکەن- بەرەو ئاراستەی بازاڕی ئازاد و بازرگانی و دەستهەڵاتی دیموکراسی و کرانەوە بە ڕووی دەرەوە هەنگاو دەنێت. ئەم ئاراستەیەشە کەوا نوێنەرایەتیی ئاراستەگریی مێژوو دەکات، نەك قیژە و هاوارەکانی چافیزە شێت.

## فراوانبوونە مەزنەکە

ئەو هێمنییە ڕێژەییەی کەوا ئێستە تیایدا دەژین بنەمایەکی بونیادیی پتەو و قووڵی هەیە کەوا لە گشت شوێنێکی سەر ئەم گۆی زەوییدا هۆیەکەی بۆ زاڵبوون و سەرکەوتنی ئابووری بەسەر سیاسەتدا دەگەڕێتەوە. ئەوەی شرۆڤەکارانی وۆڵ ستریت بە مەترسیی سیاسی ناوی دەبەن، هەر ئەوەتە دەتوانین هەست بەبوونی بکەین. جەنگ و کودەتا و تیرۆر، زۆرێك لە توانای خۆیان بۆ پەکخستنی بازاڕ لە دەستداوە، ئەمەیش ماوەیەکی زیاتر لە کەمە. بێگومان – لەوانەیە جارێکی دیکە- ئەم دۆخە بەردەوام نەبێت (لە ڕووی مێژوویشەوە زۆری نەخایاندووە)، بەڵام جیهانێکە کەوا بەلای کەمەوە ماوەی دەبەیەکە تیایدا دەژین.

ئەمە یەکەمجار نییە کەوا شڵەژان و تێکچوونی سیاسی و گەشەکردنی ئابووری هاوکات لەگەڵ یەکتری بێن. دوو قۆناغی پێشووتر هەن کە زۆر بەو قۆناغە دەچن: ئەو ڕابوون و گەشەکردن و پێشکەوتنە ئابوورییەی کەوا لە میانی نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەیەم و دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هاتە ئاراوە، هەروەها ئەو پێشکەوتن و گەشەکردنەی لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی و بەدیاریکراوی لە پەنجایەکان و سەرەتای شێستەکاندا هاتە ئاراوە، لە هەردوو قۆناغدا سیاسەت شڵەژان و لەرزینێکی ڕەشەباییانەی بەخۆیەوە بینی، بەڵام لایەنی ئابووری لە دۆخێکی زۆر بەهێز و تەندروستدا دەژیا. ئەم دوو قۆناغەش تایبەتمەندییەکی هاوبەشیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە وڵاتەکانی مەزن دەچوونە نێو ئابووریی جیهانییەوە، ئەمەیش بووە هۆی زیادبوونی قەبارەکەی و گۆڕانی شێوەکەی، فراوانبوونی بابۆڵەکەش (الشطيرة) زۆر گەورە بووە بە پلەیەک کە بەسەر شڵەژان و تێکچوونەکانی ڕۆژانەدا زاڵبوو.

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ترسی بەردەوام لە هەڵگیرسانی جەنگی نێوان زلهێزەکانی ئەورووپا هەبوو، هۆیەکەشی - ئەو ترسە - سەرچاوەکەی لەو قەیرانانەوە گرتبوو کەوا دووچاری بەڵقان و باکووری ئەفریقیا و چەند شوێنێکی دیکەی گەرم و پڕ لە کێشەبوو. لەگەڵ ئەمەیشدا هەرچەندە شوێنەکان پەنماو و گڕگرتوو بوون و کێبڕکێی خۆپڕچەککردن زۆر بوو، بەڵام ئابووریی جیهانی لە دۆخی هەڵکشان و گەشەکردن و ڕابووندا بوو. ئەو ماوەیە یەکەمین جوولەی مەزنی سەرمایە بوو کە لە ئەورووپاوە بەرەو جیهانی نوێ دەچوو. ئەوجا لەو قۆناغەدا، ئەڵمانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا وەرچەرخانێکی خێرای پیشەسازییان

بەخۆیانەوە بینی کە لەنێو سێ لە مەزنترین ئابوورییەکانی جیهاندا پێگە و شوێنێکی بۆ دابینکردن.

قۆناغی پەنجایەکان و سەرەتای شێستەکان هەندێکجار بە قۆناغێکی هێمن باس دەکرێن، بەڵام لە راستیدا قۆناغێکی پڕ لە گرژی بوو، چوونکە لەو کاتیدا جەنگی سارد ماوەی چەند ساڵێك بوو بەرپابوو، هەروەها ترس لە ڕوودانی ململانێی نێوان یەکێتیی سۆڤیەت و چین و هەڵگیرسانی جەنگێکی ڕاستین لە کۆریا هەبوو. هەروەها چەند قەیرانێکی قۆناغیی ڕاگوزەریی بەخۆیەوە بینی کە زۆربەیان بوونە جەنگ؛ گەرووی تایوان، کۆنگۆ و کەناڵی سوێس و کەنداوی بەرازان و ڤێتنام. لەگەڵ ئەمەیشدا، سیستەمە ئابوورییە پیشەسازییەکان زۆر بەهێز و گوڕوتاوەوە لە ڕێگەبڕینی خۆیاندا بەردەوام بوون. ئەمە دووەم مەزنە قۆناغی جوولەی سەرمایە بوو، چوونکە پارە لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاوە بەرەو ئەوروپا و خۆرهەڵاتی ئاسیا دەچوو. لە ئەنجامی ئەمەدا ئەوروپای خۆرئاوایی سەرلەنوێ لەنێو خۆڵەمێشی جەنگی دووەمی جیهانیدا خۆی بونیادنایەوە، هەروەها یابان- کە یەکەم گەلی ناخۆرئاوایی بوو بۆ ماوەی بیست لە گەشەکردنێکدا کە بە ڕێژەی زیاتر لە ٩٪ دەخەملێندرا- وەرچەرخانی پیشەسازی بەسەرکەوتوویی پیادە دەکرد.

لە هەردوو ماوە و قۆناغدا، ئەم هێدمە ئەرێنییەی خستنەڕوو- زاراوەیەکە کە بەهۆیەوە شارەزایانی ئابووری ئاماژە بە زیادبوونی درێژمەودای بەرهەم دەکەن - بووە هۆی گەشەکردن و پێشکەوتنێکی جێگیر و دوورمەودا و نرخی نزم دابەزیو و ڕێژە نزمەکانی سوودەکان و بەرهەمێکی هەڵکشاو لە بازاڕە گەشەسەندووەکانی ئەو کات (ئەڵمانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا و یابان). جا بەهۆی سایلۆیەکانی دانەوێڵەی ئەمریکییەوە، لە ماوەیەکی

دیاریکراوی سەدەی بیستدا نرخی گەنم لە ئەورووپادا بەرێژەی ۲۰ بۆ ۲۵ لەسەدا دابەزی هەرچەندە داواکارییەکی زۆریشی لەسەربوو. (بەهەمانشێوە، لە ئێستەدا نرخی کاڵایەکان بەهۆی تێچووە نزمەکەوە لە ئاسیا دادەبەزێ، هەرچەندە خواستیش لەسەری زۆر زیاد دەبێت). لە هەردوو ماوە و قۆناغدا، چەند پاریکەرێکی نوێ لە میانی هەناردەکردنەوە گەشەیان کرد، گەرچی هاوردەکردنیش زیادی کردووە. چوونکە لە ماوەی نێوان ساڵانی ۱۸٦۰ و ۱۹۱٤دا، هاوردەکراوەکانی ئەمریکا پێنج هێندە زیادی کردووە لە کاتێکدا هەناردەکانی حەوت هێندە زیادی کردووە.

ئێمە لە ئێستەدا لەنێو قۆناغی سێیەمین فراوانبوونی ئابووریی جیهانیدا دەژین کە لە هەمان کاتدا لە هەمووشیان مەزنتر. لە ماوەی دوو دەیەی دواییدا، نزیکەی دوو ملیار مرۆڤ هاتوونەتە نێو جیهانی بازاڕ و بازرگانییەوە[٤] ئەمەیش جیهانێکە و پێش ماوەیەکی کورت لەمەوبەر تەنیا لە لایەن یانەیەك قۆرغ کرابوو کە لەچەند وڵاتێکی خۆرئاوایی پێکهاتبوو[٢]. ڕۆیشتنی سەرمایەی خۆرئاوایی بەرەو ئاسیا لە نێوان ساڵانی ۱۹۹۰ و ۲۰۰۷دا لە ۲۲.۸ تریلیۆن دۆلارەوە بووە ۵۳.۲ تریلیۆن دۆلار، هەروەها بازرگانیی جیهانی بەرێژەی ۱۳۳٪ زیادی کرد. ئەوەی بە بازارەکانی گەشەسەندوو ناودەبرێ بەرپرسی زیاتر لەنیوەی ئەم گەشەکردنە جیهانییەیە و لە ئێستەشدا هۆی زیاتر لە ٤۰٪ی ئابووریی جیهانە کە بەپێوەری هاوکێشەی هێزی کڕین پێوراوە (واتا زیاتر لە ۳۰٪ بەپێی تێکڕایەکانی خەرجکردن لە بازاڕدا). هەروەها پشتبەستنی گەشەکردنی هاتووە نوێیەکان بۆ

---

٢) دەڵێم دوو ملیار، چوونکە هەزارانی گوندنشین لە باشووری ئاسیا و چین و ئەفریقیا بە پلەیەکی گرنگ بەشداری لە ئابووریی جیهانیدا ناکەن. بەڵام لە گشت ساڵێکدا بە ملیۆنانیان دەگوازنەوە شارەکان.

نێــو بازارەکــانی تایبــەت بــەخۆیان لــە زیادبووندایــە، ئــەویش نــەك تــەنیا لــە هاوردەکانیــان بــۆ خۆرئــاوا، ئەمــەیش ئــەو واتایــە دەگەیــەنێ کــە ئــەم دیاردەیــە تیژتێپەڕ نییە.

هەندێك کەس گرنگیی بەو دیاردانە نادەن و ئاماژە بە ڕابوون و گەشەکردنەکەی هەشتایەکانی یابان دەکەن، کاتێـك خۆرئاواییـەکان لـەوە دەترسـان یابانییـەکان هــەژموون و دەســتهەلأت بەســەر ئــابووریی جیهانیــدا پەیــدا بکــەن. بــەلأم ئــەوە ڕوونبوویەوە کە ترسێکی وەهمییە، چوونکە لە ڕاستیدا یابان کەوتە نێـو قۆنـاغی چەقبەســتن و قــەیرانێکی ئابوورییــەوە کــەوا پــانزە ســاڵی خایانــد. بــەلأم ئــەم وێکچوواندنە ڕاستی دەشـێوێنێ، چـوونکە یابـان پێشـتریش و لـە سـاڵی ١٩٨٥دا دووەم گەورە ئابووریی جیهانی بوو، زۆربەی شارەزایانیش باوەڕیان وەهابوو کـە یابان لـە ڕێگەدایـە بۆتـەوەی پێگـەی ئەمریکا وەك گـەورەترین لایـەنی ئـابووری داگیربکــات، بــەلأم نــەیتوانی ئــەم دوا قەڵــەمبازەی خــۆی بهــاوێ، چــوونکە ئابوورییەکــەی و دەســتگەکانی و ژیانــە سیاســییەکەی هێشــتا بەتــەولوی نــوێ نەکرابوویــەوە. وەلێ لــە بەرانبــەردا وڵاتــی چــین هێشــتا هــەر وڵاتێکــی هــەژارە، چوونکە تێکڕای بەرهەمە نێوەخۆییەکەی لە بەرانبەر هەر کەسێك ٢.٥٠٠ دۆلارە. کاتێك دەبێتە یەکێك لە وڵاتانی جیهانی یەکەم، بەدڵنیاییەوە ڕووبەڕووی گرفتـی زۆر دەبێتــەوە. بــەلأم لــە ئایندەیــەکی چــاوەنوارکراودا، بێگومــان لــە چــەند هێندەکردنــەوەی ئابوورییەکــەی ســەرکەوتن وەدەســتدەهێنێ، ئەمــەیش تــەنیا بەهۆی بەردەوامبوونیەتی لە دروستکردنی بووکڵە و کراسی نیو قۆڵ و مۆبایلدا. هیندیش کە لە دەرامەتێکی نزمتر لە دەرامەتی چین دەستپێدەکات- دەتوانێ بۆ مـاوەی چـەندان دەیـە گەشـەبکات پـێش ئـەوەی ڕووبەڕووی چەندەها ئەگـەرە ببێتەوە کەوا پێشتر ڕووبەڕووی یابـان ببوویـەوە. تەنانـەت ئەگـەر چـین و هینـد

پێگەی دەرامەتی ناوەندیش تێنەپەڕێنن، ئەوا وەک دیارە لە زۆربەی قۆناغەکانی سەدەی بیست و یەکدا دەبنە دووەم و سێیەم گەورەترین ئابووری لە جیهاندا.

ڕێکەوتێکی مێژووییە کەوا ئەو وڵاتانەی لە جیهاندا دەوڵەمەندترن، لە میانی چەند سەدەیەکی نزیکی بەر لە ئێستە، ژمارەی دانیشتووانیان کەم بێت. بێگومان ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بە جیاوازییەکی زۆر گەورەتر بوو، ئەمەیش ئەو هۆیە بوو کەوا ئەمریکای کردە ئەو یاریزانەی کۆنترۆڵی جیهانی کرد. بەڵام، ئەم هەژموون و کۆنترۆڵە کردەیی نەدەبوو تەنیا لەو جیهانەدا نەبێت کەوا وڵاتانی دیکەی مەزن بەڕاستی کەوتبوونە نێو زەلکاوی هەژارییەوە و نەیاندەتوانی یان حەزیان نەدەکرد سیاسەتی وەها پێڕەو بکەن کە بۆ گەشەکردنیان یارمەتیدەر بێت. بەڵام ئێستە، وڵاتانی مەزن و زەبەلاح دەستیان بە جوولە کردووە، شتێکی سروشتیشە – بەهۆی قەبارەکەیانەوە- جێپەنجەیەکی مەزن لەسەر نەخشەدا دابنێن. جا ئەگەر کەسی ئاسایی لەو وڵاتانەدا بەپێی پێوەری خۆرئاوایی بە هەژار بێنە بەرچاو، بەڵام تێکڕای سامان و سەرچاوەکانیان زەبەلاح دەبێت. یان با بەشێوەیەکی بیرکارییانە بیرۆکەکە ڕوون بکەینەوە: هەر ژمارەیەک، هەرچەندە بچووکیش بێت، ئەگەر جارانی ٢.٥ ملیار بکرێت (ژمارەی نزیک لە دانیشتووانی چین و هیند بەیەکەوە) ئەوا دەبێتە ژمارەیەکی زەبەلاح. ئەم دوو هۆکارە- خاڵێکی نزمی دەستپێک و ژمارەیەکی زەبەلاحی دانیشتووان- دوو هۆکاران کەوا قەبارە و بەردەوامیی وەرچەرخانی هێز لە جیهاندا دەستەبەر دەکەن.

## هەرسێ هێزەکە: سیاسی، ئابووری، تەکنۆلۆژی

ئەو هەموو شتانە چۆن ڕوویان دا؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە لەسەرمان پێویستە چەند دەیەیەك بگەڕێینەوە دواوە- بۆ حەفتایەکان- و ئەو ڕێگەیە وەبیری خۆمان بهێنینەوە کەوا زۆربەی وڵاتان لەو کاتیدا ئابووریی خۆیانیان پێ بەڕێوەبردووە. من ئەو کەشەم بەشێوەیەکی ڕوون بیردێتەوە، چوونکە لەو کاتیدا لە هیند دەژیام، ئەو وڵاتەی کەس باوەڕی وەها نەبوو هەمان ڕۆڵ لە هەمان ئەو شانۆیەدا بگێڕێت کەوا ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەیگێڕا. لەو کاتیدا دەستەبژێری سیاسی و ڕۆشنبیریی هیندی باوەڕیان وەهابوو کە نموونەیەکی سەرمایەداری هەیە و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە جەمسەرێکدا ڕۆڵی تیادا دەگێڕێت، لە جەمسەرەکەی دیکەشدا نموونەیەکی سۆسیالیزمی هەیە کەوا یەکێتیی سۆڤییەت بەڕێوەی دەبات. نیودەلهیش دەیویست لە نێوان هەردووکیاندا ڕێگەیەکی مامناوەندی بگرێ. خۆ لەمەشدا بەتەنیا نەبوو، چوونکە بەرازیل و میسر و ئەندۆنیسیا — لە ڕاستیدا زۆرینەی وڵاتانی دونیا- لەسەر ئەو ڕێگە مامناوەندییە دەڕۆیشتن. بەڵام، دواتر ئەوە ڕوونبوویەوە کە ڕێگەیەکە و داخراوە و مرۆڤ ناگەیەنێتە هیچ شوێنێك، ئەم مەسەلەیە لەگەڵ هاتنی کۆتاییەکانی حەفتایەکان بۆ زۆربەی خەڵکی ئەو وڵاتانە ڕوونبوویەوە. چوونکە لەو کاتەی ئەو وڵاتانە بەدەست چەقبەستەیی و قەیرانەوە دەیانناڵاند و هیچ جۆرە گەشەکردنێکیان وەدینەدەهێنا، ئەوا ئابووریی یابان و هەندێك وڵاتی خۆرهەڵاتی ئاسیا کە ڕێگەیەکی نیمچە سەرمایەدارییان بۆخۆیان هەڵبژاردبوو، سەرکەوتنی ڕوون و بەرچاویان وەدیدەهێنا، لەو ساتیدا پەند و عیبرەتەکە بۆ هەمووان ڕوونبوویەوە.

بەڵام ڕووخانی یەکێتیی سۆڤیەت لە کۆتاییەکانی هەشتایەکاندا بووە هۆی تێکدان و لەرزاندنی گشت شتێك. چوونکە لەگەڵ شێوان و زڕانی ناوبانگی پلانی

مەرکەزی و ڕووخانی یەکێك لە جەمسەرە سیاسییەکاندا سەرتاپای پرسەی گۆڕا. کتوپڕ هیچ شتێك نەمایەوە تەنیا یەك نزیککردنەوەی ڕێکخستنی ئابووریی وڵاتەکان نەبێت. لەبەر ئەم هۆیە ئالان گرینسپان ڕووخانی یەکیەتیی سۆڤییەتی بە ڕووداوە دانا کەوا کاریگەریی بەسەر زەمەنی ئێمەدا هەیە. لەو کاتەوە- لەگەڵ کۆی ئەو نیگەرانییانەی لەگەڵ ئەو پلانانەدا هاتن کەوا ئامانجیان ڕزگارکردنی ئابووری و ڕووکردنە ئابووریی بازاڕ بوو- ئاراستە گشتییەکە نەگۆڕا. یان بەپێی گوزارشتە بەناوبانگەکەی مارگرێت تاتشەر لەو ساڵانەی کەوا نیابدا دووبارە ئابووریی بریتانی چالاك دەکرایەوە: " هیچ بژاردەیەکی دیکە نییە".

لە ڕاستیدا، وەرچەرخانی ئایدۆلۆژی لە بواری ئابووریدا لە هەفتایەکان و هەشتایەکاندا و تا پێش ڕووخانی دیواری بەرلین پێشدەکەوت. ئاراستە باوەکەی ئابووریی ئەو کات کە لە لایەن دەستگەکانی وەك سندووقی دراوی نێو دەوڵەتی و بانکی نێونەتەوەییەوە نوێنەرایەتی دەکرا، زیاتر و زیاتر ڕەخنەی لەو ڕێگەیانە دەگرت کەوا هاوشێوەی سۆسیالزم بوون و وڵاتانی وەك هیند دەیانگرتەبەر. لەبەر ئەم مەبەستە، شارەزایانی ئەکادیمیی وەك جیفری ساکس بە وڵاتاندا دەگەڕان و ئامۆژگاریی حکومەتە جۆراوجۆرەکانیان بە لیبراڵیبوون، لیبراڵیبوون لیبراڵیبوون دەکرد. هەروەها دەرچووانی بەرنامەکانی ئابووریی خۆرئاوایی - وەك کوڕانی شیکاگۆ- لە چیلییەوە گەڕانەوە وڵاتەکانیان و سیاسەتە باو و پەسندکراو و ئاسانکەرەکانی بازاڕیان پیادەکرد. گەرچی هەندێك وڵاتی تازەگەشەسەندوو لە وەرچەرخان و گۆڕانیان بۆ وڵاتی چلێسی سەرمایەداری سیگەران بوون، بەڵام لە هەمان کاتدا ساکس پێیانی دەگوت کە لەسەریان پێویستە بەفوولی بیربکەنەوە و لەوەی ئاخۆ دەیانەوێ زیاتر بە سوید بچن یان فەرەنسا و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا. بەڵام لەو کاتیدا ئەوەشی پێیان

دەگوت کە پێویست ناکات لەهەمبەر ئەم بڕیارەدا نیگەران بن؛ چوونکە زۆربەیان زیاتر لە یەکیەتیی سۆڤیەت نزیکبوون.

ئەو هێزە داراییەی کەوا چاخی نوێ دەجوولێنێ سەربەستیی جوولەکردنی سەرمایەیە، ئەمەیش دیاردەیەکی بە ڕێژە نوێیە. قۆناغی دوای جەنگی دووەمی جیهانی بە تێکڕایەکی جێگیری ئالوێری دراوی دەناسرێتەوە، چوونکە زۆربەی ولاتانی خۆرئاوایی بە فەرەنسا و ئیتالیاشەوە، چەند ڕێکارێکی داراییان هەبە کەوا جوولەی ئەو دراوانە کۆتوبەند دەکەن کەوا دێنە نێو سنوورەکانیانەوە و لە سنوورەکانیشیانەوە دەچنە دەرەوە. دۆلاریش بە زێڕ بەستراببوویەوە. بەلام، لەگەڵ گەشەکردنی ئالوێری جیهانیدا، تێکڕا جێگیرەکانی ئالوێرەکان ئەو ناکۆکی و لاوازییەی لە کاراییدا دروستکرد و نەیهێشت سەرمایە بەشێوە هەرە باش و نموونەییەکەی بەکاربهێنرێ. لەبەرئەوە، زۆربەی ولاتانی خۆرئاوایی لە حەفتایەکان و هەشتایەکاندا ئەو کۆتوبەند و ڕێکارانەیان لابرد، دەرئەنجامەکەش: دەستگیرۆیی و کۆمەکێکی زەبەلاح و زۆری سەرمایەبوو لەگەڵ ئەگەری گواستنەوەی بەشێوەیەکی ئازادانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە. لە ئێستەشدا، کاتێک خەڵک بیر لە جیهانگەرایی دەکاتەوە، دەبینین بە ڕێژەیەکی زەبەلاحی دراوی دەبەستنەوە– بازرگانان ڕۆژانە نزیکەی دوو تریلیۆن دۆلار ئالوێر دەکەن– کە لە شوێنە جۆرلوجۆرەکانی جیهاندا پەرش دەبێت، ئەمەیش لەپێناو پاداشتکردنی هەندێك ولات و سزادانی هەندێکی دیکەیانە. ئەمە میکانیزمی جیهانگەراییە بۆ سەپاندنی ڕێککاری (الانضباط).

لەگەڵ خولانەوەی ئازادانەی سەرمایەدا شۆڕشێکی دیکە لە سیاسەتی ئابووریدا هاتەکایەوە، ئەویش پەیدابوونی بەربلاوی بانکە هەڵبەندییە سەربەخۆیەکان و جڵەوکردنی هەڵئاوسان بوو. هەڵئاوسانی زێدەڕۆیانە خراپترین نەخۆشیی

ئابوورییە کەوا ڕووبەڕووی هەر گەلێك دەبێتەوە. بەهای پارە و حیساباتەکانی پاشەکەوت و موڵکایەتییەکان و دواتریش کار دادەڕووخێنێ. تەنانەت لە ڕوودانی چەقبەستن(رکود) و قەیرانی قووڵیش مەترسیدارترە. چوونکە هەڵئاوسانی زێدەڕۆیانە لەو شتە بێبەشت دەکات کە ئێستە موڵکی تۆیە (پارەی پاشەکەوتکراو)، لە کاتێکدا چەقبەستن لەو شتانە بێبەشت دەکات کە لەوانەیە ببنە بەشی تۆ (واتا ئاستە بەرزەکانی بژێوی ئەگەر ئابووری گەشەکردنێکی بەخۆیەوە ببینێت). لەبەر ئەم هۆیە، هەڵئاوسانی زێدەڕۆیانە دەبێتە هۆی لادانی حکومەتەکان و بەرپابوونی شۆڕشەکان، بۆنموونە: بێبازارییە گەورەکە لە ئەڵمانیا نەبووە هۆی گەیاندنی نازییەکان بە دەستەڵات، بەڵکو هەڵئاوسانی زێدەڕۆیانەبوو کەوا چینی ناوەندی وێرانکرد، چوونکە پارەی پاشەکەوتکراوی لێیان بێبەهاکرد.

لە ڕاستیدا، زۆر بەدەگمەن ڕێکدەکەوێ کە جەنگێك ببینی کەوا لایەنێکی جەنگەکە بەشێوەیەکی تەولو تیایدا سەرکەوتوو بووبێت. لە کۆتاییەکانی هەشتایەکاندا، دەیان دەوڵەتی گەورە و گرنگ بەدەست هەڵئاوسانی زێدەڕۆیانە ناڵاندیان. لە ئەرژەنتیندا ڕێژەی هەڵئاوسان ٣.٥٠٠ لە سەدا بوو، لە بەرازیلدا ١.٢٠٠ لە سەدا بوو، لە پیرۆ ٢.٥٠٠ لەسەدابوو. لە نەوەدەکاندا هەریەك لەم دەوڵەتانە یەك لە دوای یەك بەشێوەیەکی واقیعی بەرەو ڕێککاری (الانضباطی) دراوی و داریی چوون. هەندێکیان بەوە ڕازی بوون کە دراوەکانیان تعویم بکرێ*،

---

*) مەبەست لە (التعویم) ئەوەیە بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی هەمەکی دەست لەسەر دراو لابدات و پەیوەندیی دراوەکە لەگەڵ هەر دراوێکی دیکە یان زێڕ بپچڕێنێت و وازلە دراوەکە بهێنێ بەپێی میکانیزمەکانی خواست و خستنەڕوو بەرز و نزم ببێتەوە، جا لەسەر ئەم بنەمایە نرخەکەی لە بازاڕی بانکەکانی نێو بازاڕی نێوەخۆیی دیاری دەکرێ. ئەم کردەیە بە هۆکارێکی سیاسەتی دراوی وڵاتان دادەنرێ.

بەڵام هەندێك وڵاتی دیکە دراوەکانیان بە یۆرۆ یانیش دۆلار بەستنایەوە. لە ئەنجامی ئەمەدا لە ئێستەدا تەنیا دوانزە دەوڵەت هەن کە ڕێژەی هەڵئاوسان تیایاندا لە سەدا پانزە تێدەپەڕێت، زۆربەشیان وڵاتی شکستخواردووی وەك هایتی و و زیمبابۆی بۆرمان. ئەم کەشە باوەی هەڵئاوسانە نزمە لە سەقامگیری سیاسی و ڕەخساندنی دەرفەتی باشی ئابووری بۆ وڵاتانی گەشەسەندوو هۆکارێکی یەکلاکەرەوە بوو.

لەگەڵ هەردوو هۆکاری ئابووری و سیاسیدا کەوا پاڵیان بە وڵاتانەوە نا بە ئاراستەی کۆبەندییەکی نوێ بچن، ئەوا زنجیرەیەك داهێنانی تەکنۆلۆژی هاتن بۆ ئەوەی بەهەمان ئاراستە پاڵیان پێوە بنێن. لە ئێستەدا بۆ ئێمە زۆر زەحمەتە ئەوە وەبیر خۆمان بهێنینەوە کەوا ژیان لە ڕۆژانی تاریکی حەفتایەکاندا چۆن بووە لەو کاتەی نەدەتواندرا هەواڵەکان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بگوازرێنەوە. بەڵام لەگەڵ هاتنی نەوەدەکاندا نرخەکان گۆڕان، چوونکە ڕووداوە هەنووکەییەکانی شوێنە جۆربەجۆرەکانی جیهان- ئەڵمانیای خۆرهەڵات، کوەیت، گۆڕەپانی تیانان مین- لەگەڵ ڕوودانیان بۆ گشت شوێنێك دەگوێزرانەوە. ئێمە وەها بیر دەکەینەوە کە هەواڵەکان بەشێوەیەکی سەرەکی سیاسین، بەڵام نرخەکانیش جۆرێکن لە هەواڵ، هەروەها توانای گواستنەوەی هەواڵی نرخەکان بەشێوەیەکی یەکسەر و بەپەلە و شەفافانە بۆ گشت شوێنەکانی جیهان، شۆڕشێکی دیکەی لە چالاکیدا بەرپاکرد.

ئێستەیش دەتوانین لە ماوەی خولەکێکدا بەهۆی ئینتەرنێتەوە بەئاسانی بەراوردی نێوان نرخەکانی بەرهەمهێندراوەکان بکەین. پێش بیست ساڵ لەمەوبەر، چالاکییەکی زەبەلاح لە بواری کڕین و فرۆشتنی هەنووکەیی

(arbitrage) هەبوو، چوونکە بەراوردکردنی خێرا لەنێوان نرخەکاندا زۆر زەحمەت بوو.

فراوانبوونی گەشەکردن و پەیوەندییەکان واتای ئەوەیە کە جیهان زۆر بەپتەوی و قووڵییەکی زیاتر لە جاران بەیەکترەوە بەستراوە و بەپێی گوزارشتە بەناوبانگەکەی تۆماس فریدمان بووەتە شتێکی تەخت و تاقران. مۆبایلە مەزرانەکان و توانای گواستنەوەی داتا و زانیاریی زەبەلاح بەخێراییەکی لە رادەبەدەر (بەهۆی broadband) ئەو توانایەی بە خەڵک بەخشیوە لە وڵاتێکدا کار بۆ وڵاتێکی دیکە بکەن و بەمەیش بەشی دووەمی چیرۆکی سەرمایەداری بەردەوامە. لە سەدەی پانزەیەمدا کاڵاکان لەگەڵ داهێنان و دروستکردنی کەشتیی زەبەلاحدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە گوازرانەوە. لە سەدەی حەڤدەیەمدا، سەرمایەگوزاری لەگەڵ سیستەمی نوێی بانکیدا گوازرایەوە. لە نەوەدەکانیشدا خودی کاریش گوزاریەوە، چوونکە ئیدی لەسەر خەڵک پێویست نەبوو بچنە ئەو شوێنەی کەوا کاری لێیە، لەبەرئەوەی ئەو توانایە پەیدابوو کار بێتە ئەو شوێنەی کەوا خەڵکی لێیە. تێچووی گواستنەوەی کاڵاکان و خزمەتگوزارییەکان ماوەی چەند سەدەیەکە کەم دەبێتەوە، بەڵام لەگەڵ داهێنانی broadband لە زۆربەی خزمەتگوزارییەکاندا دابەزییە ئاستی سفر. گەرچی ناکرێ لە گشت پیشەیەکدا سوود لە کرێکارانی بیانی ببیندرێ، بەڵام کاریگەریی دامەزراندنی دەرەکی outsourcing دەکرێ لە گشت شوێنێکدا هەستی پێبکرێ.

بە واتایەکی دیکە، کاری بازرگانی هەمیشە بەمشێوەیە بووە؛ بۆنموونە، لە سەرەتایەکانی سەدەی بیستەمدا کارگەکانی ڕستن و چنین لە بریتانیای مەزنەوە گواسترانەوە یابان. بەڵام پەیوەندییەکانی هەنووکەیی و بەردەوام واتای ئەوە

دەگەیەنێ کەوا کردەکە زۆر بەتوندی خێرا بووە. چوونکە ئێستە ئەو توانایە هەیە کارگەیەکی دروستکردنی پۆشاك لەتایلاند بەشێوەیەك بەڕێوەببرێ وەك ئەوەی لەنێو ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکایە. لەبەر ئەوە ئێمە تێبینی دەکەین کەوا لە ئێستەدا کۆمپانیایەکان دەیان دەوڵەت وەك ئەڵقەی زنجیرەیەك بەکاردێنن کەوا دەکڕن و دروست دەکەن و دەبەستنەوە و بازاڕکاری دەکەن و کاڵایەکان دەفرۆشن.

لە هەشتایەکانەوە ئەم سێ هۆکارە – سیاسی و ئابووری و تەکنۆلۆژی– بوونەتە پاڵنەرێك کە لەپێناو دۆزینەوەی کەشێکی نێونەتەوەیی کراوەتر و پەیوەندداتر و داواکارتردا یەك ئاراستەیان هەیە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا، دەرفەتی نوێی بە جۆرەها وڵاتی جیهان بەخشیوە بۆئەوەی بەسەر پەیڕەی گەشەکردن و پێشکەوتندا هەڵگەڕێن.

تۆ تەماشای ئەو گۆڕانە گەورەیە بکە کەوا بەسەر دوو دەوڵەتی نا ئاسایی – بەرازیل و تورکیادا– هاتووە. بیست ساڵ لەمەوبەر بەرازیل و تورکیا بە دوو دەوڵەتی گەشەسەندووی نموونەیی دادەندران: گەشەکردنێکی هێواش و هەڵئاوسانێکی خێرا و قەرزێك کە بەخێرایی لە هەڵکشاندا بوو، هەروەها کەرتی تایبەتیان لاواز بوو سیستمە سیاسییەکەشیان فشۆڵ بوو. بەڵام لە ئێستەدا بە بەڕێوەبردنێکی سەرکەوتووانە و هەڵئاوسانێکی نزم و تێکڕای زۆر بەرزی گەشەکردن و ئاستێکی نزمی قەرز و کەرتی تایبەتی گەشەکردوو و دەسگەی دیموکراسیی سەقامگیرتر دەناسرێنەوە. ڕاستە کە بەرازیل و تورکیا هێشتا بەدەست چەندان گرفتەوە دەناڵێنن– جا چ وڵاتێك بێ گرفتە؟ – بەڵام دوو دەوڵەتی گرنگن و زۆر بەهێزەوە گەشە دەکەن.

هەروەها بازاڕیش بۆچوونی خۆی لەهەمبەر ئەم دوو دەوڵەتدا گۆڕیوە. چوونکە ئیدی وەها لە قەرزەکانیان ناڕواندرێ وەك ئەوەی لە قەرزەکانی جیهانی یەکەم مەترسیدارترین. لە ڕاستیدا، زۆرێك لە بازاڕەکانی هەڵکشاوی گەشەسەندوو زێدەیەکی (الفائض) دارایی زەبەلاحیان کەڵکە کردووە، بە پلەکەیشی هێندە بەرزە کە ئێستە ٧٥٪ ی یەدەگی دراوی نێودەوڵەتیی جیهان پێکدەهێنن. چین بەتەنیا زیاتر لە ١.٥ تریلیۆن دۆلاری لە ئەکاونتەکانی خۆیدا هەیە. دەستگەی گۆڵدمان ساکس پێشبینیی ئەوەی کردووە کە پێنج دەوڵەت نوێنەرایەتیی ئەو بازاڕە هەڵکشاوە گەشەسەندووە دەکەن– چین و هیند و بەرازیل و ڕووسیا و مەکسیك – لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٤٠دا بەرهەم و داهاتێکی هێندە گەورەی ئابووریيان دەبێت کە لە کە لە بەرهەم و داهاتی وڵاتانی گەورەی کۆمەڵەی حەوت G-7 گەورەترە؛ حەوت وڵاتە خۆرئاواییەکەی کەوا چەندان سەدەیە کۆنترۆڵی کاروباری جیهانییان کردووە.

## گرفتەکانی زۆری و مشەیی (الوفرة)

لە ماوەی هەردوو دەیەی ڕابردوودا کات و وزە و بایەخێکی زۆرمان لە نیگەرانیی هەمبەر قەیرانەکان و داڕووخانی ئابووریی جیهانی و تیرۆر و هەڕەشەی ئەتۆمی و جەنگەکانی جیۆسیاسیدا بەفیڕۆدا. لە ڕاستیدا ئەمە شتێکی سروشتییە، چوونکە لەوانەیە خۆئامادەکردن بۆ خراپترین ئەگەر بۆ خۆ دوورگرتن لەو خراپترینانە یارمەتیدەر بێت. خۆ بەڕاستیش شتی خراپ ڕوویان دا؛ لە جەنگەکانی بەڵقان و ئەفریقیاوە تا دەگاتە تیرۆر لە گشت جیهاندا، هەروەها قەیرانەکانی ئابووریی خۆرهەڵاتی ئاسیا و ڕووسیا و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا، جا لەوەی کۆتاییدا قەیرانی ئابووریی لە هەموویان مەترسیدارتربوو. بەڵام جەختکردنەوە لەسەر ئەو ڤەمانەی کەوا دەبنە هۆی ڤەمۆکی نەیهێشت گرنگی بە زۆرێك لەو

گرفتە گەورانە بدەین کەوا لەمڕۆدا ڕووبەڕوویان بوونەتەوە: کە ئەوانیش لە ئەنجامی شکستەوە دروست نەبوون بەڵکو بەهۆی سەرکەوتنەوە هاتوونەتە کایەوە. ڕاستە کە شتێکی زۆرباشە ئێمە لە جیهانێکدا دەژین کەوا گەشەکردنێکی هاوکاتانەی جیهانی بەخۆیەوە دەبینێ، بەڵام ئەمەیش کۆمەڵێك گرفتی ئاڵۆز دەوروژێنێ کە لەوانەیە ببنە هۆی تراژیدیا و مەرگەساتی گەورە.

گەشەکردنی جیهانی لەم زەمەنەدا گەورەترین و بەرچەستەترین ڕوودلوە. لێکدانەوە بۆ زیادبوونی ڕێژەو یان ڕۆینەی دراویی (السیولە) – کەڵەکەکردنی پارە و دارایی دەکات کەوا بەردەوام لە زێدەبووندایە و بە گشت جیهاندا بڵاو دەبێتەوە- وایکردووە متمانە (الائتمان) هەرزان بێت و زەوی و زار و پشك و قەواڵەکانیش نرخیان بەرز بێت. لە هەمان کاتیشدا، گەشەکردنی ئەو وڵاتانەی کەوا کرێیان هەرزانە بەڕادەیەکی یەکجار زۆر نەیهێشتووە هەڵئاوسان زیاتر بێت. یەکێك لەو وەسف پێناسانەی کەوا دەکرێ بۆ چین و هیند بەکاری بهێنین ئەوەیە کە دوو ئامێری گەورەی کرژبوونەوەن (انکماش) لە جیهاندا، کەوا هەر یەکە لەم دوو وڵاتە یەکێکیان (چین) کاڵا دەڕژێنێتە نێو خۆرئاوا و ئەوی دیکەش (هیند) لە بەرانبەر بەشێکی بچووکی نێچووی بەرهەمەکانی خزمەتگوزاری پێشکەش دەکات. ئەمەیش یەکێکە لەو هۆیە سەرەکییانەی کەوای کردووە بانکەکانی نێوەندی سەبارەت بە هەڵئاوسان زۆر نیگەران نەبن و ئەو توانایەیان پێیان بەخشیوە سوودی بەرێژە نزم بۆ ماوەی دوو دەیە بپارێزێ، ئەمەیش بەشێوەیەکی نائاسایی ماوەیەکی دووردرێژە. بێگومان سوودە بەرێژە کەمەکان و قەرزەکانی هەرزان دەبنە هۆی ئەوەی پاڵ بە خەڵکەوە بنێن بە دەبەنگی و هەڵپەوە ڕەفتاربکەن، و چەندان بلۆق لە کاڵای تەکنۆلۆژیا و دانیشتواندا یانیش لە قەرزە مامناوەندییەکانی بواری عەقاریدا Subprime یان پشکە

قازانجییەکاندا equities دروست بکەن؛ چەند بلّقێکن و لە کۆتاییەکەدا هەر دەتەقنەوە. لەگەڵ زیادبوونی وابەستەیی و گرێدراویی جیهان و سەمەرەیی ئامرازەکانی دارایدا، زۆرێك لە چاودێران هەست بە نیگەرانی دەکەن لەوەی کە سووڕی گەشەکردن و متمانە ببێتە سووڕی تۆقین و بێهیوایی. بەلام هەمەجۆریی سەرچاوەکانی نوێی گەشەکردن و ڕێژە زەبەلاحە نوێیەکانی سەرمایەداری ئێستەشی لەگەڵدا بێت ڕێژەیەکی زۆری نەرمی دەبەخشێتە سیستمی ئابووریی جیهانی.

تۆ لە نرخەکانی نەوت ڕابمێنە. هێدمەی نەوتیی دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەك جیاوازە لە هێدمەکانی پێشوو. لە ڕابردوودا نرخەکان بۆیێ بەرز دەبوونەوە چوونکە وڵاتانی نەوتدار (ئۆپێك) بەئەنقەست بەرهەمی خۆیان کەم دەکردەوە، بەمەیش دەبوونە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی بەنزین. بەلام لە چەند ساڵی دواییدا نرخەکان بەهۆی داواکاریی چین و هیند و بازاڕە گەشەسەندووەکانی دیکە و داواکاریی زەبەلاح و بەردەوامی جیهانی پێشکەوتووەوەیە. جا ئەگەر نرخەکان بەهۆی گەشەکردنی ئابوورییەوە بەرز دەبنەوە، ئەمە مانای ئەوەیە کە ئابووری بۆ چارەسەرکردنی ئێچووەکان هێز و نەرمی هەیە، بێگومان ئەم توانایەش لە میانی چاکترکردنی بەرهەمەوە (بەپلەیەکی کەمتریش بەهۆی گواستنەوەیەتی بۆ بەکاربەران). لەبەر ئەم هۆیە، بەرزبوونەوەی نرخەکان لەم دەیەیەدا بە ئاسانییەکی گەورەتر لە جاران لەخۆگیران و ڕەفتاریان لەگەڵدا کرا. ئەگەر لە ساڵی ٢٠٠١دا داوامان لە دانایەکەمان کرد کاریگەریی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت بە چوار هێندە بخەملێنێ، ئەوا بێگومان پێشبینیی ڕوودانی پاشەکشەکردن و کزبوونێکی زەبەلاحی جیهانی دەکرد.

بەڵام نەوت تاکە کاڵا نییە کەوا نرخی بەرزبووبێتەوە. بەڵکو نرخی مادە خاوەکانی گشت جۆرێکیش بە بەشێوەیەکی بەردەوام زیاد دەکات. بەرهوومی کشتوکاڵی لە ئێستەدا نرخەکەی هێندە گرانە کە وڵاتانی تازەگەشەسەندووی دووچاری گرفتێکی سەرەکی کردووەتەوە و ڕۆژ بەڕۆژیش لە زیادبووندایە و پەیوەندیی بە چۆنییەتیی ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵئاوسانی نرخەکانی خۆراکەوە هەیە. هەروەها نرخی خانوو و ماڵ لە نیویۆرك و دوبەی و شنگهای زۆر گران بووە. تەنانەت گازی هیلیۆم کە تەنیا لە بالۆنی ئاهەنگەکاندا بەکار نایەت بەڵکو لە لەرینەوەی موگناتیسی MRI و کارگەی دیکەشدا بەکاردێ، بە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە جیهاندا هەیە، هەرچەندە لەنێو ڕیزی ئەو ڕەگەزانەی کەوا لە گەردووندا مشەن لە پلەی دووەمدا دێت. گومانی تیادا نییە کە ئەم فشارانە قۆناغی هەڵئاوسانی نزم بەکۆتا دێنی کەوا بە پاڵپشت و پایەی گەشەکردن و پێشکەوتنی جیهانی دانراوە.

لە هەمان کاتیشدا، گەشەکردنی بەهێز چەند شتێکی ناوازەی بەرهەمهێناوە. لەم جیهانە گلۆبالیزەکراوەی کە زۆر بەشێوەیەکی زیادەوە ڕێککخراوە و بەرزەفتکراوە، چەند وڵاتێکی دیاریکراو هەن- ئەوانەی سامانی سروشتییان هەیە، بەتایبەتیش نەوت و گازی سروشتی- بەشێوەیەکی بێ پارە و بەخۆڕایی سوود لە نرخی هەنووکەیی جیهان وەردەگرن. ئەو جۆرە وڵاتانە سواری شەپۆلی گەشەکردنی جیهانی دەبن و ڕۆژ بەڕۆژ دەوڵەمەندتر دەبن بەبێ ئەوەی ناچاربن خۆیان پابەندی زۆربەی ئەو یاسایانە بکەن کەوا حوکمی ئابووریی جیهان دەکەن. ئەم دیاردەیەش دەرئەنجامێکی ئاساوە، بەڵام بێگومان سەرکەوتنی هەموانە نەتیا ئەو جۆرە وڵاتانە نەبن، ئەوانە چەند مشەخۆرێکن کە سەر بە ئابووریی ئەو بازارە نین کەوا لە جیهانێکدایە و ئابووریی بازاڕ حوکمی دەکات.

تۆ بەوردی لە بەرەنگاربوونەوە و گرفتە سەرەکییەکانی سیاسی بنواڕە کەوا ڕووبەڕووی هێزەکانی ئەمریکی و خۆرئاوایی دەبێتەوە سەبارەت بەو شنانەی کەوا پەیوەندییان بە سیستەمی نێونەتەوەییەوە هەیە. لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستەوە لە ئێرانەوە وەك باهۆز هەڵدەکات، لە ئەمریکای لاتینیشەوە لە ڤەنزوێلاوە و لە ڕووسیاشدا لە ئۆراسیا هەڵدەکات. کۆی ئەو دەوڵەتانە هێزێکی نوێیان هەیە کەوا پشتی بە نەوت بەستووە. ئەگەر سوودان پەیدەگی نەوتیی نەبووایە زۆر زەحمەت دەبوو سەبارەت بە پرسی دارفور دژی جیهان بوەستێتەوە. نەوت ڕێژەیەکی زەبەلاحی پارە و دارایی ڕادەکێشێ. داهاتی ئێران لە نەوت لە ساڵی ٢٠٠٦دا نزیکەی ٥٠ ملیار دۆلار بوو؛ ئەم ڕێژە پارەیەش بەسە بۆ چاودێریکردن و گرنگیدان بەو کۆمەڵانەی کەوا لە بەرژەوەندیدا لەگەڵی یەکدەگرنەوە، هەروەها ئەم ڕێژە زۆرەی پارەوپووڵی ئێران کە لە نەوتدا وەدەستی هێناوە، بۆ بەرتیلدان بەسوپا و مانەوە لە دەستهەلات و بەکارهێنانی کەڵکەکانی دیکەی پارە بۆ دروستکردنی گرفت لە دەرەوەی ئەو وڵاتەدا، پاڵپشتی و زەمینەسازێکی گەورەیە. ئەگەری ئەوە نییە کە ئەم دۆخە بگۆڕێت، چوونکە وڵاتانی دەوڵەمەند بە سامانەکانی سروشتی گەشەدەکەن مادامەکێ ئەوانی دیکە — وڵاتانی دیکە گەشە دەکەن. ئەمە ئەلین و یانگ (نێر و مێ) ی جیهانگەرایی ئەمڕۆن.

بێگومان، گشت وڵاتێکی دەوڵەمەند بە سامانەکانی سروشتی وڵاتی هەلگەڕاوە و نەیارنین، چوونکە کەشوهەوای گونجاوی بەڕێوەبردنی ئابووری پاڵی بە هەندێکیانەوە ناوە بە دانایییەکی زۆرتر لەوەی ڕابردوو سامانەکانی خۆیان بەکاربێنن، بۆنموونە: تەماشای کەنەدا بکە وا خەریکە دەبێتە وڵاتێکی مەزن، بەلام لەگەڵ ئەمەیشدا بەشێوەیەکی زۆر بەرپرسانە ڕەفتار دەکات. هەروەها

کەنداوی عەرەبی کە داهاتێکی زۆری نەوتی بەسەردا دەڕژێ، زۆربەی قازانجەکانی لە ژێرخانی ئابووری و پیشەسازیدا وەبەردەهێنێ، نەك لە ئەکاونتە بانکییەکانی سویسری یان گازینۆیەکانی مۆنتی کارلۆ (هەرچەندە زۆرێك لە داهاتەکانیشی بەو ئاراستەیەدا دەڕوات). هەروەها دوبەی بووەتە مەڵبەندێکی ئازادی بازرگانی کەوا زۆر بە کارامەییەوە بەڕێوە دەبرێ؛ بەڕاستی سەنگافوورەی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستە. هەروەها چەند وڵاتێکی دیکەی کەنداو هەن- وەك سعوودیە- کە دەیانەوێ بگەنە هەمان پێشکەوتنی دوبەی، چوونکە ئێستە لە پرۆژەکانی پترۆکیمیایی نوێدا پلان بۆ وەبەرهێنانی ٧٠ ملیار دۆلار دەکات بۆئەوەی لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠١٥ دا ببێتە بەرهەمهێنەری سەرەکی پترۆکیمیایی. وڵاتانی کەنداو لە میانی پێنج ساڵی ڕابردوودا تریلیۆن دۆلاریان لە وەبەرهێنانەکانی داراییدا قازانج کرد، دەسنگەی ماکنزی ئاند کۆمپانی وەها مەزەندە دەکات کەوا کردەییە لە ماوەی دەیەی داهاتوودا دوو تریلیۆن دۆلار قازانج بکات. بێگومان، ئەم جۆرە سەرمایەدارییەی کە لە لایەن حکومەتەوە بەڕێوە دەبرێ وەك تێبینی دەکرێ پێشکەوتنێکی سنووردار وەدەستدەهێنێ؛ هەروەها ئەگەری ئەوەش نییە ببێتە گەشەکردنێك کە بەشێوەیەکی خۆکارانە و خودی توانای بەردەوامبوونی هەبێت (ئەگەرچی چەند ڕەگەزێکی بەهێز هەن کە بەشێوەیەکی حکومییانە لە سەرمایەداریی ئەورووپی و خۆرهەڵاتی ئاسیایشدا ئاراستەکراون). بەڵام هەر چۆنێك بێت زیاتر لە نموونە سەرمایەدارییەکانی جیهانی نزیکە نەك ئەو سیستمە ئابوورییانەی کەوا پێش ماوەیەك لەو وڵاتانەدا بەرقەراربوون.

بەڵام کاریگەریی گەشەکردنی جیهانی لە سەرچاوەکانی سروشتی و ژینگەییدا گەورەترین گرفتە کەوا لە مشەییەوە سەرچاوەی گرتووە. زێدەڕۆیی نییە ئەگەر

بڵێین جیهان بەدەست چۆرپڕبوونی هەوای پاك و ئاوی خواردنەوە و بەرهەمی کشتوکاڵی و زۆرێك لە کاڵای دیکەی زیندوو دەناڵێنێ. هەرچەندە هەندێك لەم گرفتانە دەکرێ چارەسەر بکرێن- بەهۆی چاکترکردنی کارایی و پێشخستنی سەرچاوە نوێیەکانی بەخشین و کۆمەکەوە- بەڵام پێشکەوتنەکە لەم بوارەدا زۆر خاوە، بۆنموونە: هەرچەندە بەرهەمی کشتوکاڵی زیاتر دەبێت، بەڵام خۆراك پەیداکردن بۆ دانیشتووانی سەرگۆی زەوی کە لەساڵی ٢٠٢٥ ژمارەیان دەگاتە هەشت ملیار، پێویستی بە بەروبوومێکی کشتوکاڵیی ئەوتۆ هەیە کە ڕێژەکەی چوار تۆنە لە یەك هێکتار زەویدا بەبەراورد لەگەڵ ئەو ژمارەیەی کەوا ئێستە وەدەستی دەهێنین کە بریتییە لە سێ تۆن بۆ هەر هێکتارێك. هەروەها بەهەمانشێوە، توانای ئیدارەدان و پاراستنی ئاو بەهەمان خێرایی بەکاربردنی ئاو گەشە ناکات. ژمارەی دانیشتووانی جیهانی سێیەم لە سەدەی بیستەمدا سێ هێندە زیادی کردووە، لە کاتێکدا بەکاربردنی ئاو شەش هێندە زیادبووە. ئەمریکییەکان بۆ خواردنەوە و چێشتلێنان و پاککردنەوە لە ڕۆژێکدا زیاتر لە ٤٠٠ لیتر ئاو بەکار دەهێنن. جا ئەگەر دانیشتووانانی وڵاتانی هەژار- ئەگەر لە ڕۆژێکدا ٤٠ لیتر ئاو وەدەستبێنن بەبەختدار دەژمێردرێن- دەوڵەمەندتر ببن، ئەوا داواکارییە زۆربوزەوەندەکانیان دەبێتە هۆی دروستکردنی فشارێکی زۆر. ئەگەر لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەینەوە دەبینین خەڵك لەپێناو گەڕان و دۆزینەوەی ئاودا شوێنی نیشتەجێبوونیان گواستۆتەوە، ئەدی ئەگەر سەرچاوەکانی ئاو لە ئایندەدا وشکبن چی؟ ئەوا دەیان ملیۆن مرۆڤ ناچار دەبن بچنە شوێنی دیکە. ئەمەیش دەبێتە هۆی بەرپابوونی ململانێی زۆر توندوتیژ، وەك ئەوەی پێشتر لە ئەفریقیا و خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا ڕووی دا.

لە دەیەی رابردوودا ئەوە روونبوویەوە کە زۆربەی ئەو پێشبینییانەی تایبەت بوون بە گۆڕانی کەشوهەوا لە شوێنی خۆیاندا نەبوون، چوونکە گەشەکردنی جیهانی گشت مەزەندەیەکی تێپەڕاند، بۆ نموونە لە ساڵی٢٠٠٧دا دوا راپۆرتی مەزەندەیی لیژنەی هاوبەشی حکومیی نێو دەوڵەتیی تایبەت بە گۆڕانی کەشوهەوا دەرچوو. جا لەگەڵ کۆتایی هاتنی ساڵدا زانایان ئەوەیان سەلماند کە لوونکە بەفرینەکانی جەمسەریی بە دوو هێندەی خێرایی ئەو پێشبینییە دەتوێنەوە کەوا راپۆرتەکە پێشبینی کردبوو. خواست لەسەر کارەبا و ئۆتومبێل و فرۆکە زۆر لەو پێشبینییانە گەورەتر بوو کەوا هەر کەسێك پێش پەنجا ساڵ لەمەوبەر پێشبینیی کردبوو- لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٣- و ٢٠٢٠ لە ٢٦ ملیۆنەوە بۆ ١٢٠ ملیۆن. هەروەها هیند و رووسیا و خۆرهەڵاتی نێوەراست؛ ئەوانی دیکەش هەن.

پێشبینی دەکرێ خواست لەسەر کارەبا بە رێژەی ٤٪ی ساڵانە و بۆ ماوەی چەند دەیەیەك زیاد بێت. ئەم کارەبایەش بەزۆری لە خەڵووز دێت کە پیسترین جۆرە بەردەستەکانی سووتەمەنییە. بۆچی خەڵووز؟ چوونکە هەرزانە و زۆریشە، لەبەر ئەم هۆیە جیهان لە بەرهەمهێنانی ئەو کارەبایە پشتی پێدەبەستێ کەوا پێویستی پێی هەیە. جا بۆ تێگەیشتن لە کاریگەریی ئەم پرسە لەسەر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمیی گۆی زەوی، لەو راستییە وردبەرەوە. لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٦ و ٢٠١٢ دا چین و هیند ٨٠٠ کارگەی بەرهەمهێنانی وزە -بەهۆی خەڵووزەوە- بەرهەم دەهێنن، هەروەها ئەبارەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی سەرچاوەگرتوو لەو خەڵووزە بە تێکڕایی، بە پێنج هێندەی تێکڕای ئەو قەبارەیە دادەندرێ کەوا لە رێککەوتننامەی کیۆتۆ رێگەی پێدراوە.

## گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی

لەم جیهانە گلۆبالیزەكراوەدا، گشت گرفتەكان سنووربڕ و كێشوەربڕن، لەبەر ئەم هۆیە، جا ئەگەر گرفتەكە پەیوەندیی بە تیرۆر و بە بلاوبوونەوەی ئەتۆمی و نەخۆشییەكان و قەیرانی دارایی و زیانگەیاندن بە ژینگە و كەمیی ئاوەوە هەبێت، ئەوا بەرپەرچدانەوەی هەر یەكێك لەمانە بەبێ هەماهەنگی و هاوكارییەكی زۆری نێوان زۆرێك لە ولاتان، ناكردەییە. بەلام لەو كاتەی دەكرێ ئابووری و زانیارییەكان و تەنانەت رۆشنبیریش بكرێتە جیهانگەرایی، ئەوا دەستەلاتی فەرمیی سیاسی هەر وابەستە و پەیوەندیدارە بە ولاتانی سەربەخۆوە، تەنانەت ئەگەر یەكێك لەو ولاتانە بۆ چارەسەركردنی زۆربەی گرفتەكان بەشێوەیەكی تاكەكەسی توانای كەمتر بێت. بەداخەوە، ئامادەیی ولاتانی سەربەخۆ بۆ هاوكاری لە چارەسەركردنی گرفتەكانی باودا بەبەردەوامی لە كەمبوونەوەدایە. چوونكە لەگەلّ زیادبوونی ژمارەی یاریزانانی حكوومی و نا حكوومی و گەشەكردنی هێز و متمانەی هەر یەكێكیان، ئەگەرەكانی رووداني رێكەوتن و هاوكارییەكی هاوبەش لە كەمبوونەوەدان. ئەمەیش بەرەنگاربوونەوە و تەگەرە سەرەكییەكەی رابوون و پێشكەوتنی ئەوانی دیكەیە؛ بۆ رێگەگرتن لە هێزی گەشەكردنی جیهانی لەوەی تەمێلدرێ ببێتە هێزی شلەژاندن و تێكدان و لەیەكدابرانی جیهانی.

گەشەكردنی شانازی و متمانەبەخۆكردنی ولاتانی دیكە، بەتایبەتیش ئەوانەی بەقەبارە گەورەتر و سەركەوتووترن، پێشتر روون و ئاشكرایە. سەبارەت بە خۆیشم، پێش چەندان سالّ لەمەوبەر لە قاوەخانەیەكی ئینتەرنێتی لە شنگهای ئەوەم بۆ روونبووەتەوە كاتێك گفتوگۆم لەگەلّ بەرێوەبەرە جێبەجێكارە چینییەكە دەكرد كەوا كەسێكی گەنج بوو. ئەو بەرێوەبەرە گەشەكردنە نائاساییەكەی چینی بۆم باس دەكرد كە چۆن چین لە ئایندەدا دەبێتە ولاتێكی

هاوچەرخ و گەشەکردوو. بەرێوەبەرە گەنجەکە پۆشاک و ڕەفتاری زۆر سەیر و نامۆ بوو، بە ئینگلیزییەکی زۆر ڕەوانیش قسەی دەکرد، دەیتوانی بەوپەڕی ئاسانییەوە گفتوگۆ لەسەر دوا ئاراستە باوەکانی بازرگانی بکات یانیش زۆر بە ڕەوانی باس لە کەلچەری گشتیی ئەمریکی بکات. وەها هاتە بەرچاوم کەوا بەرهەمهێنەرێکی نموونەیی جیهانگەراییە و ڕێك ئەو کەسەیە کەوا پرد لەنێوان رۆشنبیری و کەلچەرەکاندا دروست دەکات و جیهان بچووك دەکاتەوە و هەمەڕەنگتری دەکات. بەلام هەر لەگەڵ ئەوەی باسی تایوان و یابان و ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکامان کرد، وەڵامەکانی تووڕەییان پێوە دەبیندرا. بە تۆنێکی پڕ لە تووڕەیی و ڕقەوە بەمنی گوت: " ئەگەر تایوان بوێریی ئەوەی کرد کە سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێ، ئەوا لەسەر چین پێویستە یەکسەر داگیری بکات". هەروەها گوتی:" یابان گەلێکی دەستدرێژکارن و ناکرێ متمانەیان پێ بکرێ". سەبارەت بە ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکایش دڵنیابوو لەوەی کە لە شەڕی کۆسۆڤۆی ساڵی ١٩٩٩ دا بە ئەنقەست باڵیۆزخانەی چینی بۆردومان کرد، ئەمەیش بۆ ترساندنی گەلی چینی بوو بە هێزە سەربازییەکەی. هەستمکرد هەر دەڵێی لە بەرلینی ساڵی ١٩١٠دام و قسە لەگەڵ گەنجێکی ئەڵمانیی دانپێدانراو و ڕۆشنبیر دەکەم! چوونکە ئەو گەنجە وەك نموونەیەکی پیاوی هاوچەرخ دەهاتە بەرچاو- بەپێی پێوەرەکانی ئەوکات - و بۆ نەتەوەکەی خۆی زۆر دەمارگیر بوو.

لەگەڵ گەشەکردنی دەرفەتەکانی ئابووریدا هەستی نەتەوەییش گەشە دەکات. ئەمەیش شتێکە لە ڕاستیدا و هەموومان تێیدەگەین. وەها بێنە بەرچاوت تۆ لە ولاتێکدا دەژیت کەوا ماوەی چەندان سەدەیە بەدەست هەژاری و نا سەقامگیرییەوە دەناڵێنێ. لە کۆتاییدا، هەلومەرج و شتەکان دەگۆڕێن و

ولاتەکەت دەست بە گەشەکردن دەکات. بێگومان تۆ شانازی بەخۆتەوە دەکەیت و پەرۆشی ئەوەیت خۆت بە خەڵکی پیشان بدەیت. ئەم حەزەی خۆسەلماندن و وەدەستهێنانی ڕێزە لە تەواوی شوێنەکانی جیهاندا بڵاوبووەتەوە و شتێکی باوە. ڕەنگە دژبوونێك لە قسەکانماندا ڕووبدات ئەگەر بڵێین جیهانگەرایی و نوێگەرایی گەشە بە شابووری نەتەوەیی سیاسی دەدەن، بەڵام ئەم بۆچوونە تەنیا لەو کاتەدا دێتە نێو مێشکەوە کە بە ئایدۆلۆژیایەکی پاشەکشەکردووی لاواز لە نەتەوایەتی بنوارین، چوونکە لەم دۆخەدا بێگومان لەگەڵ کاروانەکەی پێشەوەی پێشکەوتندا ڕادەماڵدرێ و لەنێو دەچێ.

هەستوسۆزی نەتەوایەتی بەبەردەوامی ئەمریکییەکانی سەرسوڕماو کردووە. کاتێك ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە دەرەوەی ولات خۆی ڕووچاری کێشە دەکات، ئەوا زۆر بەڕاستی باوەڕی بەوە هەیە کەوا هەوڵ دەدات یارمەتیی ولاتانی دیکە بدات بۆ ئەوەی خۆیان چاکتربکەن. لەبەر ئەم هۆیە، کاتێك هەوڵەکانی ئەمریکا لەنێو فلیپین و هایتی و ڤێتنام و عێراقدا ڕووبەڕووی بەرهەڵستی و بەرپەرچدانەوەی دانیشتووانانی ئەم ولاتانە دەبوویەوە، ئەمریکییەکان لەهەمبەر کاردانەوەی دانیشتووانانی نێو ئەم ولاتانە ڕووچاری هێدمە دەبوون. لە ڕاستیدا ئەمەیش شتێکی سەیرە، چوونکە ئەمریکییەکان شانازی بە ولاتەکەیانەوە دەکەن - ئێمە بە نیشتمانپەروەریی لێکی دەدەینەوە- لەمەیشدا ئەولو مافی خۆیانە، بەڵام کاتێك خەڵکانی دیکە شانازی بە نیشتمانەکەیانەوە دەکەن و پێوەی پەیوەستن ئەوان - ئەمریکییەکان- دەتۆقن.

لە دوا ڕۆژەکانی حوکمی بریتانیا لە هیند، دوا دەستهەڵاتداری بریتانی کە لۆرد لویس ماونتباتن بوو، بە توورەییەوە ئاوڕی لە ماهاتما گاندیی ڕابەڕی

هیندییەکان دایەوە و بەتووڕەبییەوە گوتی:" ئەگەر ئێمە بڕۆین، ئەوا پاشاگەردانی و هەراوزەنا بڵاو دەبێتەوە". گاندیش وەڵامی دایەوە: " بەڵێ، بەلام پاشاگەردانییەکی تایبەت بە خۆمانە". ئەم هەستە بەوەی کە خۆت حوکمی خۆت دەکەیت، بەبێ ئەوەی خەڵکانی دیکە دەستی تێوەربدەن، بەشێوەیەکی زۆر بەهێز لەنێو ئەو وڵاتانەدا هەیە کە تازە گەشەیان کردووە، بەتایبەتیش ئەوانەی پێشتر لە لایەن ئیستیعمار داگیرکراو بوون یان بەشێوەیەکی نیمچە ئیستعمارکراو لە لایەن خۆرئاواوە داگیرکرابوون.

زبیجینیۆ بریجینسکی بەمدواییانە سەرنجی خەڵکی بۆ ئەو دیاردەیە ڕاکێشا کەوا بە ڕابوونی سیاسیی جیهانی ناوی بردووە، هەروەها ئاماژەی بە هەستوسۆزە هەڵکشاوەکەی جەماوەر کردووە کە چەند پاڵنەرێکی جۆراوجۆر پاڵی پێوە دەنێن؛ سەرکەوتنی ئابووری، شانازیی نەتەوەیی، بەرزبوونەوەی ئاستەکانی پەروەردە و فێرکردن، گەشەکردنی توانای وەدەستهێنانی زانیاری و زیادبوونی شەفافیەت، یادەوەرییەکانی ڕابردوو. نابراو ئاماژەی بەو لایەنانە کردووە کەوا دەبنە هۆی شڵەژاندن و تێکدانی هێزە نوێیەکە؛ بۆیێ دەنووسێ: " دلنیشتووانی زۆربەی جیهانی گەشەسەندوو لە ڕووی سیاسییەوە چالاک دەبن و لە زۆر شوێندا هەست بە نارەزایی دەکەن. ئەو (واتا جیهانی گەشەسەندوو) ئەواو و بە ڕێژەیەکی نائاسایی درك بە ستەمی کۆمەڵایەتی دەکات... ئەمەیش جڵاکێکی وەها دروست دەکات کە تاکەکانی نێوی هەڵوێست و حەزی هاوبەشیان هەیە و دەکرێ بەهۆی حەزە دیماگۆگییە سیاسی و ئاینییەکانەوە بووروژێندرێ و ئاراستە بکرێ. ئەم ورزانە سنوورەکانی سەربەخۆ دەبڕن و دەبنە بەرەنگاری و گرفت بۆ ئەو وڵاتانەی کە هەن، هەروەها مەترسی بۆ سەر پلەبەندییە جیهانییەکەش

دروست دەکەن کە تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لەسەر ترۆپکی ئەو پلەبەندییەدا جێگەی گرتووە".

لە زۆربەی ئەو ولاتانەی کەوا کەوتوونەتە دەرەوەی جیهانی خۆرئاوایی، رق و تووڕەیی و بێزارییەکی چەپێندراو هەیە لەهەمبەر ناچاربوون بۆ قبوڵکردنی چیرۆکی ئەمریکایی یان خۆرئاوایی سەبارەت بە مێژووی جیهان؛ ئەو چیرۆکەی کەوا ئەو ولاتانە یان رۆڵێکی نەگونجاو یانیش رۆڵێکی نێوەندی تێدا دەگێڕن، بۆنموونە: رووسەکان بەردەوام لە چیرۆکە تەقلیدییەکەی جەنگی دووەمی جیهانی هەراسان دەبن کەوا تیایدا بریتانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە لایەن هێزەکانی ئەڵمانیا و یابانی فاشی شکستیان هێنا. چوونکە بەپێی چیرۆك و گێڕانەوە باوەکانی ئەمریکا– لە ستیڤن ئەمبرۆز تا دەگاتە کێن بێرنز– دەکرێ چاو لەو باوەڕەی ئەمریکییە بپۆشین و لێی ببوورین کە پێی وایە رووسیا رۆڵێکی مامنێوەندی لە جەنگە یەکلاکەرەوەکانی دژ بە هێتلەر و تۆگۆ دا بینیوە، گەرچی بەرەی خۆرهەلاتی، لە ڕاستیدا گۆڕەپانی مەڵبەندی و سەرەکیی جەنگی دووەمی جیهانی بووە. چوونکە ئەو جەنگانەی تیایدا بەڕێوەبران زۆرتربوون لەوانەی کە گۆڕەپانەکانی دیکەی جەنگ بەخۆیانەوە بینیان و بەهۆیەوە سی ملیۆن کوژراوی لێ کەوتەوە. لەو بەرەیەدا سێ چاریەکی سوپای ئەڵمانی جەنگی کرد و ڕێژەی زیانەکانی ٧٠٪ لە سەدا بوو. هەرچەندە بەرەی ئەورووپا لە زۆربەی لایەنەکاندا گۆڕەپانێکی لاوەکی بوو، بەلام لە خۆرئاوادا وەها مامەڵەی لەگەڵدا کرا وەك ئەوەی شانۆ و گۆڕەپانی سەرەکیی جەنگەکە بێت، بنجامین شوارتزی نووسەر دەڵێ کە ستیڤن ئەمبرۆز " زێدەڕۆیی دەکات لە ڕاکێشانی سەرنج بۆ هێرشی ئەمریکی و بەریتانی بۆ سەر دوورگەی سەقەلییە، کە تیایدا لە دەرکردنی ٦٠.٠٠٠ ئەڵمانی لەو دوورگەیە سەرکەوتنی وەدەستهێنا،

بەلام بەتەواوی کورسك فەراموش دەکات کە گەورەترین جەنگ بووە لە مێژوودا و تیایدا ملیۆن و نیوێك سەربازی سۆڤیەتی و ئەلمانی دژی یەکتر جەنگیان کرد و لە هەمان کاتی شەڕی دوورگەی سەقەلییەدا ڕووی دا... جا بەقەد ئەوەی ئەم مەسەلەیە دووچاری ناڕەحتیمان دەکات...بەلام دەبێ دان بەوەدا بنێین کە جەنگی دژ بە ئەلمانیای نازی... بەشێوەیەکی سەرەکی- بەپێی وەسفی مێژوونووسی سەربازی جۆن ئەریکسۆن- جەنگی ستالین بووە".

هەروەها تەماشای بۆچوونێکی دیکەی تایبەت بە هەمان جەنگ بکە کە دەکەوێتە شوێنێکی دیکەی سەر نەخشەکە. هاوڕێیەکی هیندیم پێمی گوت: " سەبارەت بە بریتانیا و ئەمریکا، جەنگی دووەمی جیهانی جەنگێکی پاڵەوانانە بوو کەوا ئازادی بەسەر بەدخوازیدا زاڵبوو. هەروەها بۆ ئێمەیش، جەنگێك بوو کە بریتانیا هیند و هێزە چەکدارەکانی هیندستانی تێوەگلاند بەبێ ئەوەی خۆی لە ووروژاندنماندا ماندوو بکات. بریتانیا داوای لە ئێمە کرد کە لەپێناو ئەو بیرۆکەیەی ئازادیدا بمرین کەوا لە هەمان ئەو ساتیدا بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە لە ئێمە قەدەغەکرابوو".

بەردەوام ئەم بۆچوونە جۆراوجۆرە نیشتمانییانە هەبوون، بەلام لەم ڕۆژگارەدا و بەهۆی زیادبوونی مەعریفە و زانیارییەکان و گەشەکردنی متمانەبەخۆکردنەوە لە تۆڕە نوێیەکانی هەواڵ و وێستگەکانی کێبڵی و پێگەکانی ئینتەرنێتی جیهانی گەشەسەندوودا بلاو دەکرێنەوە. زۆرێك لە ولاتان (ئەوانی دیکە) شیکردنەوە بۆ گێرانەوە و بەلگە و ئیمانەکانی خۆرئاوا دەکەن و بە نواڕینێکی جیاواز لە جیهان ڕووبەڕووی دەبنەوە. بەرپرسێکی گەنجی چینی لە ساڵی ٢٠٠٦دا پێمی ڕاگەیاند:" کاتێك بە ئێمە دەڵێن کە پشتگیری لە ڕژێمی دیکتاتۆریی سودان دەکەین لەپێناو وەدەستهێنانی نەوتەکەی، ئەوا من پێتان دەڵێم: ئایا ئەمە

جیاوازە لەو پاڵپشتییەی ئێوە بۆ ئەو وڵاتانەی کەوا بەرهەمهێنەری نەوتن؟ ئێمە دووڕووییەک دەبینین، بەلآم لەگەڵ ئەمەیشدا هیچ نالێین".

دوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد، هیوا و پێشبینییەکی گشتی هەبوو بەوەی کە رووسیا و چین زۆر بەهێزەوە تەقلی سیستمی ئابووری و سیاسیی خۆرئاوایی دەبن کەوا دوای جەنگی دووەمی جیهانی سەری هەڵداوە. کاتێکیش جۆرج دەبلیو بۆش باسی لە سیستمی نوێی جیهانی کرد، زۆر بە سادەیی مەبەستی ئەوەبوو بڵێ کە سیستمی کۆنی خۆرئاوایی بە پانایی و درێژیی سەرتاپای جیهاندا فراوان و بڵاو دەبێتەوە. لەوانەیە ئەم بۆچوونە بەهۆی ئەزموونی خۆرئاوا لەگەڵ یابان و ئەڵمانیای دوای جەنگەوە بەرهەم هاتبێ، چوونکە گەرچی هەردووکیان گەیشتنە ترۆپکی هێزی ئابووری، بەلآم تا ئاستێکی زۆر بەرز هەر بە دوو ئەندامی پابەند و هاوکار و بێدەنگ لەگەڵ سیستمە بەرپایەکەدا مانەوە. بەلآم، لەوانەیە ئەمە بەهۆی چەند هەلومەرجێکی تایبەتەوە بووبێت. چوونکە ئەم دوو وڵاتە دوو مێژووی بێهاوتا و تایبەت بەخۆیان هەیە، چوونکە دوو جەنگی دوژمنکارانەیان بەڕێوەبردووە کە وای کردووە لە جیهاندا بێزراو بن، هەروەها ڕووبەڕووی هەڕەشەیەکی نوێی کۆمۆنیزمی سۆڤییەتی بوونەوە و لەپێناو پاراستنی خۆیاندا پشتیان بە هێزی سەربازیی ئەمریکا بەست. بەلآم کۆمەڵەی دواتری هێزە هەڵکشاو و گەشەسەندووەکان زۆر پەرۆشی ئەوە نەبوون لەگەڵ سیستمە بەرپایەکەدا تێکەڵ بین.

ئێستەیشی لەگەڵدا بێت ئێمە بیر لە جیهانێک دەکەینەوە کەوا دەبێ هەر هێزێکی گەشەسەندوو لەنێوان دوو بژاری توندوتیژدا یەکێک هەڵبژێرێ: تەقلیبوون بە سیستمی خۆرئاوایی یانیش ڕەتکردنەوە، بەمەیش وڵاتی هەڵگەڕاوە و نەبار ڕووبەڕووی بێزراندن دەبێتەوە. بەلآم وەها دێتە پێشچاو کە هێزەکانی

کەشەسەندوو ڕێگەی سێیەم بگرنەبەر: دەچنە نێو سیستمی خۆرئاوایی بەلام بەپێی مەرجە تایبەتەکانی خۆیان؛ لەمەیشدا شێوەی سیستمەکە دەگۆڕێ. چوونکە لەو جیهانەی کە هەمووان هەست بە هێز و متمانەبەخۆکردن دەکەن- بەپێی بۆچوونی زانایانی سیاسی، نازنین بارما و ئیلی ڕاتنز و ستیڤن و بیر- دەکرێ هەندێك ولات چەق و سەنتەرە خۆرئاواییەکە پشتگوێ بخەن و چەند پەیوەندییەکی تایبەت لەنێوان خۆیاندا ببەستن. ئەوجا لەوانەیە لە جیهانی دوای ئەمریکادا هەر لەبنەڕەتەوە هیچ مەڵبەند و چەقێك بوونی نەبێت. جیمس بێکەری وەزیری دەرەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩١دا ئاماژەی بەوە کرد کە جیهان بەرەو چوونە نێو سیستمی مەڵبەندی دەچێت (hub- snd-spoke system) کە تیایدا گشت ولاتێك لەپێناو گەیشتن بەو ڕووگەیەی کەوا مەبەستیەتی لە میانی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاوە پێیایدا گوزەر دەکات. بەلام وەسفێکی باشتر بۆ جیهانی سەدەی بیست و یەك هەیە، ئەویش ئەوەیە کە جیهانێکە و ڕەوتی جۆراوجۆری هەیە و تیایدا ڕۆژانە پلانەکانی کاروان و گەشتەکان دادەڕێژرێن (ئەمەیش ڕاستە تەنانەت بە مانا مادییەکەیشی، چوونکە لە میانی تەنیا دە ساڵدا، ژمارەی ئەو سەردانکەرە ڕووسییانەی کەوا سەفەری چین دەکەن زیاترە لە چوار هێندە، لە ڕێژەی ٨٩,٠٠٠ی ساڵی١٩٩٥گەیشتووەتە ٢.٢ ملیۆنی ساڵی ٢٠٠٥). جێگە و پێگەی حەختکردنەوە وەرچەرخاوە، ولاتان زیاتر گرنگی بەخۆیان دەدەن- بە چیرۆکی هەڵکشانیان- هەروەها گرنگییەکی کەمتر بە خۆرئاوا و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەدەن. لەبەر ئەم هۆیە دەبینین کە ئەو گفتوگۆیانەی تایبەتن بە زەرووەتی کەمکردنەوەی دوژمنایەتیی هەمبەر ئەمریکا، لە ڕەوتی هەڵمەتی سەرۆکایەتیی ساڵی ٢٠٠٧دا بەجۆرێك لە جۆرەکان گرنگییەکی هێندە گەورەی

پێنەدرا. جیهان لە تووڕەییەوە بەرەو گوێپێنەدان و لە دوژمنایەتیکردنی ئەمریکاشەوە بەرەو ئەمریکایەکی دوای ئەمریکا دەچێت.

ئەو ڕاستییەی کە پێی وایە هێزەکانی نوێ لە پڕبوون لەسەر بەرژەوەندییەکانیان لە جاران زیاتر پشتئەستوورتر و لێبڕاوانەترن، لە جیهانی دوای ئەمریکادا ڕاستییەکی سەرەکییە، ئەمەیش مەسەلەیەکە و ئەو گرفتە سیاسییە دەورووژێنێ کە خۆی لە چۆنییەتیی وەدیهێنانی ئامانجەکانی نێونەتەوەییدا دەبینێتەوە؛ لە جیهانێکدا کە لە چەندان یاریزان پێکهاتووە و یاریزانی حکوومی و نا حکوومین. بەپێی نموونەی کۆن، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا و هەندێك هاوپەیمانی خۆرئاوایی خۆیان بەتەنیا ڕووداوەکانیان ئیدارە دەدا، جیهانی سێیەمیش یان خۆی لەگەڵیاندا دەگونجاند (وەك خۆدوورگرتن لە گرفتەکان یانیش هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی دەستکەوتێك) یانیش لە دەرەوەی بازنەکەدا دەمانەوە، واتا هیچ ڕۆڵ و گرنگییەکیان نەبوو. بەلام یاریزانەکانی ناحکوومی ژمارەیان کەم بوو، هێندەش لاواز و بێهێز بوون کە هی ئەوە نەبوون غەمیان لێ بخورێت. لە بەرانبەریشدا، وەك نموونە سەیری دانوستانەکانی بازرگانی بکە، ئەوسا دەبینی چۆن جیهانی گەشەسەندوو بەهێزێکەوە ڕەفتار دەکات کەوا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبێت. چوونکە لەو کاتەی ولاتانی وەك بەرازیل و هیند بەهەر جۆرە ڕێککەوتننامە و گرێبەستێك ڕازی دەبوون کەوا لە لایەن خۆرئاواوە بۆیان دەخرایە ڕوو- یانیش بەتەواوی پشتگوێی دەخست- دەبینین ئێستە بەوپەڕی هێزەوە مانۆڕ دەکەن بۆ ئەوەی ئەو ڕێککەوتننامە و گرێبەستە وەدەستبێنن کە دەیانەوێ. ئەوەیان گوێ لێبووە کە چۆن بەڕێوەبەرانی جێبەجێکاری خۆرئاوایی ڕاڤەی ئەوەیان کردووە کە ئایندە لە کوێدا خۆی

حەشاردراوە، هەروەها راپۆرتی دەستەکەی گۆڵدمان ساکسیان BRIC خوێندەوەتەوە، لەبەرئەوە دەزانن کە تەرازووی هێز گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

ڕێککەوتنامەی کیۆتۆ(کە لە ئێستەدا بەهۆی ڕەتکردنەوەی لەلایەن سەرۆك بۆشەوە بە ڕێککەوتننامەیەکی تایبەتمەند دادەندرێ)، بەوە دەناسرێتەوە کە پشتگیریی لە دونیابینیی کۆنی جیهان دەکات. کیۆتۆ وەهای شیمانە کردووە کە ئەگەر خۆرئاوا لەسەر پلانێك ڕێککەوتن، ئەوا جیهانی سێیەم بنەمای نوێ دەگرێتەبەر و گرفتەکە چارەسەر دەبێت. لەوانەیە ئەمە ئەو ڕێگەیە بێت کە بۆ ماوەی چەند دەیەیەکی ڕابردوو کارە تایبەتەکانی نێودەوڵەتی پێ بەڕێوە دەبردرا، بەلاّم لە ئێستەدا وەك جاران هێندە پابەندکار نییە. چوونکە چین و هیند و بەرازیل و چەند ولاّتێکی دیکەی گەشەسەندوو پێڕەوی هیچ ڕێکارێکیان نەکردووە کەوا خۆرئاوا سەرکردایەتی دەکات، بەتایبەت ئەگەر خۆیان واتا ئەو سێ ولاّتە تیایدا بەشدار نەبن. لەمانەیش گرنگتر ئەوەیە حکوومەتەکان بە تەنیا ناتوانن بۆ چارەسەرکردنی گرفتێکی گەورەی وەك گۆڕانی کەشوهەوا کار و هەوڵێکی زۆریان هەبێت. چوونکە چارەسەری ڕاستین پێویستیی بە هاوپەیمانییەکی فراوانتر هەیە کەوا کەرتی تایبەت و ڕێکخراوەکانی ناحکوومی و شار و هەرێمەکان و ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بگرێتەوە. لە جیهانێکی گلۆبالیزەکراو و دیموکراسی و لامەرکەزیدا، ئێمە پێویستمان بەوە هەیە تاکەکان هانبدەین ڕەفتاری خۆیان بگۆڕن. باج و فەرمانە (رسومات) و جەنگەکان بۆ ئەنجامدانی ئەمە چەند ڕێگەیەکی کۆنن، بەلاّم ئێستە دەوڵەتان پانتاییەکی کەمیان لەبەردەستە بۆ ئەوەی لەو بەرەیەدا (الجبهە) مانۆڕ بکەن، لەبەرئەوە لەپێناو ئەنجامدانی گۆڕانکاری پێویستیان بە ئامرازی زیرەکانەتر و کاراتر هەیە.

میکانیزمە تەقلیدییەکانی هاوکاریی نێودەوڵەتی پاشماوەی قۆناغ و سەردەمێکن کە ئیدی کاتیان بەسەرچووە. سیستمی نەتەوەکانی یەکگرتوو بۆ رێکخستنی هەزموون مۆدێلی زۆر کۆنە. چوونکە ئەندامەکانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش سەرکەوتووی جەنگێکن کە ماوەی شێست ساڵە کۆتایی هاتووە. هەروەها ئەنجوومەنەکە یابان و ئەڵمانیای تیادا نییە کە دووەم و سێیەم گەورەترین ئابووریی جیهانین، هیندیش ناگرێتەوە- کە مەزنترین وڵاتی دیموکراسییە لە جیهاندا- هیچ وڵاتێکی ئەمریکای لاتین و ئەفریقیاشی تیادا نییە. هەروەها کۆمەڵەی هەشت وڵاتی چین لەخۆی ناگرێ – کە چوارەمین مەزنە ئابووریی جیهانییە- هەروەها هیند و کۆریای باشووریشی تیادا نییە- کە بەدوای یەکتریدا دوانزەیەم و سێزدەیەمن. ئەوە بووەتە نەریت کە کەسێکی ئەورووپی ببێتە سەرۆکی سندووقی دراوی نێودەوڵەتی و کەسێکی ئەمریکیش ببێتە سەرۆکی بانکی نێودەوڵەتی. راستە کە ئەم نەریتە- وەك نەریتی یانەکانی کۆنی کۆمەڵایەتیی رەگەزپەرستەکانن- لەوانەیە باش و دڵخۆشکەر بێت و کەسانی بەشداری نێوی دڵخۆش بکات، بەڵام لەلای ئەو کەسانەی رێگەیان لێ گیراوە سەرکردایەتییەکەی بگرنە ئەستۆ، قێزاوییە و نیشانەی دەمارگیرییە.

ئاڵۆزی و گرێیەکی دیکەش هەیە: کاتێك باس لە گەشەکردن و رابوونی نەتەوابیانە دەکەم، باس لە دیاردەیەکی فراوانتر دەکەم، ئەویش جەختکردنەوەیە لەسەر شوناس. دەوڵەت- نەتەوە داهێنانێکی بەرێژە نوێیە، چوونکە تەمەنی لە سەد ساڵ تێناپەڕێ. بەڵام شێوە کۆنترەکەی بریتیبوو لە کۆمەڵەکانی ئایینی و ئەتنیکی و زمانەوانی و لەنێو سنووری دەوڵەتێکدا دەژیان. ئەم پەیوەندییانەش هەر بەبەهێزی مانەوە، نەك هەر ئەمە، بەڵکو لە لەگەڵ قووڵبوونەوەی متمانە و پشتبەستنی ئاڵوێرکراوانەی ئابووریدا بەهێزتریش

بوون، بۆنموونە: لە ئەورووپا فلامنگییەکان (Flemish) و فەرەنسییەکان لە بەلژیك وەك جاران مۆرکی تایبەتمەندانەی خۆیان پێوە دیارە. هەروەها لە بریتانیادا، سکۆتلەندییەکان حزبێکی دەستهەلاتداریان هەڵبژارد کەوا پێشنیازی کۆتاییهاتنی یاسایەکانی یەکییەتی (Acts of Union) دەکرد کە تەمەنی – مەبەست لە یاسایەکە– سێ سەدەیە کەوا میرنشینی یەکگرتووی دروستکرد کە لە ئینگلترا و سکۆتلەندا و ویلز پێکهاتبوو. لە هیندیشدا، پارتەکانی نیشتمانی لە بەرانبەر پارتەکانی هەرێمی و ناوچەییدا لە پاشەکشەدان. لە کینیاشدا جیاوازییەکانی هۆزی و عەشیرەتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گرنگییەکی زیاتر وەدەستدەهێنن. هەروەها لە زۆرێك لە شوێنەکانی دیکەی جیهاندا هێشتا ئەو شوناسانە سەرەکین (لە دەوڵەت– نەتەوە قووڵترن) و بە شەقڵی دیاریکەری ژیان دادەندرێن و پاڵ بە خەڵکەوە دەنێن دەنگ بدەن، لەپێناویشیدا ژیانی خۆیان دەکەنە قوربانی. هەروەها لە ئابووریی کراوەی جیهانیدا، ئەو کۆمەڵەگەراییانەی خەڵك هەست دەکەن کە پێویستییان بە حکوومەت نەماوە، ئەم هەستەش ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندایە. هەروەها لە سایەی سەردەمی هەنووکەیی دیموکراسیدا، ئەو جۆرە خەڵکە زۆرێك لە هێز و هەژموون وەدەستدەهێنن کاتێك وەك یەك کۆمەڵەی یەکگرتوو خۆیان دەهێڵنەوە. بەکورتی: گەشەکردنی هەستکردن بە شوناس وادەکات کردەی ئامانجداری نەتەوەیی دژوارتر بێت.

کاتێك دەستهەلات هەمەچەشن و دابەشکراوە، کردەی شەرعییەت لە جاران زیاتر گرنگ دەبێت، چوونکە تاکە ڕێگەی ڕاکێشانی یاریزانانی جیاوازی سەر گۆڕەپانی جیهانییە. ئێستەیش، هیچ چارەسەرێك نییە – جا هەرچەندە کردارییش بێت– بتوانێ بەردەوام بێت، ئەگەر بە شەرعی دانەندرێ. هەروەها سەپاندنیشی

سەرکەوتن وەدەستناهێنێ ئەگەر وەها لێکبدرێتەوە کە بەهۆی هەژموون و هەڵبژاردنی یەك دەوڵەتەوە هاتووەتە کایەوە، جا ئەو دەوڵەتە چەندە بەهێزیش بێت گرنگ نییە. لەگەڵ کۆی ئەو ڕووداوە نامرۆڤانە و مەترسیدارانەی کەوا لە سووداندا ڕوو دەدەن، بەلام دەستوەردانی سەربازی لەوێدا - تاکە هۆکاری سەرکەوتوو بۆ وەستاندنی - تەنیا لەو کاتەدا سەرکەوتوو دەبێت کە زلهێزەکان و وڵاتانی ئەفریقیی هاوسێیی سودان بڕیاری لەسەر بدەن. جا ئەگەر ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا هەر لەخۆیەوە یان لەگەڵ هاوپەیمانییەکی بچووکدا ڕەفتار بکات- واتا لە ماوەی پێنج ساڵدا سێیەمین وڵاتی موسڵمان داگیر بکات- ئەوا بەزۆری و بەدڵنیاییەوە ئەم هەوڵە دەرئەنجامی پێچەوانەی دەبێت، چوونکە دەرفەتێکی مەزن بۆ حکوومەتی سوودانی دەڕەخسێنێ گەل لە دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکی هان بدات. لە ڕاستیدا، تۆمەیەی ئیدارەکەی بۆش لە سیاسەتی دەرەوەدا بەشێوەیەکی زۆر ڕوون زەرووڕەتی کرداریی بۆ شەرعییەت ڕوون دەکاتەوە. بەلام لەگەڵ ئەمەیشدا- بەبێ ڕەچاوکردنی شکستەکانی بۆش- گرفتەکە ئەوەیە: ئەگەر شیمانەی ئەوەمان کرد کە زۆربەی وڵاتان لەپێناو چارەسەرکردنی گرفتێکدا پێویستیان بە هاوکاریی هەیە، ئاخۆ ئەمە لە جیهانێکدا چۆن ڕوو دەدات کە ژمارەیەکی زۆری یاریزانی هەیە و زۆربەشیان بەهێزن؟

## زلهێزەکانی دووایی

ژمارەیەک لە چاودێران و شرۆڤەکاران لە زیندوویەتی و چالاکیی ئەو جیهانە گەشەسەندووەیان نواڕیوە و ئەو دەرئەنجامەیان وەدەستهێناوە کە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا گەیشتووەتە کۆتایی خۆی. ئەندی گرۆڤی دامەزرێنەری کۆمپانیای ئینتل زۆر بەڕاشکاوی گوزارشت لەمە دەکات و دەڵێت: " ئەمریکا

ڕووبەڕووی مەترسیی هەنگاوهەڵێنان و شوێنپێهەڵگرتنی ئەورووپا بوونەتەوە بەرەو داڕووخان. خراپترین شتیش لە مەسەلەکەدا ئەوەیە کەس بەمە نازانێت. ئەوان هەموویان لە دۆخی نکۆڵیکردندا دەژیەن، لەو کاتەی ئابنانیك ڕاستەوخۆ بەرەو جیایەکی بەستەڵەك زۆر بەخێرایی ڕێگە دەگرێ، ئەوان دەست لە پشتی یەکتری دەدەن ". بەلام تۆماس فریدمان وەسفی چاودێرییەکەی خۆی دەکات بۆ شەپۆلی ئەو کەسە لاوە پیشەییە هندییانەی کە لەکاتی هاتنی وادەی کارکردنی شەوانەیان لە کۆمپانیای ئینفۆسیس لە شاری بانگالوردا دێنە سەر کار، ناوبراو دەڵێ: چۆن کچەکانم و ملیۆنەها ئەمریکیی دیکە دڵیان دەهێنێ دەستخۆشی لەوە بکەن کە ئەم هیندییانە بتوانن هەمان کار بکەن کەوا خۆیان لە بەرانبەر بەشێکی بچووکی کرێیەکانیاندا پێیان دەکرێ؟". هەروەها جابوور شتابنگارت- سەرنووسەری ڕۆژنامەی دیر شپیگلی ئەڵمانی- لە کتێبەکە بەناوبانگەکەی خۆیدا جیهانگەرایی تۆڵە دەکاتەوە، دەڵێت:" ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا پیشەسازییەکانی سەرەکیی خۆی لەدەست دا، گەلەکەشی ولزیان لە پاشەکەوتنەکردنی پارە هێناوە، حکوومەتەکەی بەردەوام قەرز لە بانکەکانی مەڵبەندیی ئاسیا دەکات، ئەمەیش ڕێك لەو کاتەیە کە ڕکابەرەکانی گەشە دەکەن".

بەلام لێرەدا مەسەلە سەرسوڕهێنەرەکە ئەوەیە کە ئەم گۆڕانکارییانە لە چوار دەورماندا ڕوودەدەن؛ بەشێوەیەکی کرداریش کاریگەرییان بەسەر ئەنجامەکانی ئەمریکادا نەبووە. چوونکە لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا- لەو کاتەی جیهانگەرایی و تەوزیفی دەرەکی بەشێوەیەکی زۆر گەورە گەشەیان دەکرد- ڕێژەی گەشەکردن لە ئەمریکادا کەمێك لە ٣٪ زیاتر بوو، بە یەك خاڵی تەواوی سەدی لە ئەڵمانیا و فەرەنسا زیاتر بوو (لەو کاتیدا تێکڕای یابان لە هەمان کاتدا

۲.۳ لە سەدا بوو). هەروەها پارێزەری گەشەکردن لە توانای بەرهەمهێنانداـ دەرمانی ئابووریی نویێ– لە ماوەی یەك دەیەی تەواودا لە ڕێژەی ۲.٥ لە سەدا بەرزتر بوو (جارێکی دیکە بە یەك خاڵی سەدی لە تێکڕای ئەورووپی زیاتر بوو). تەنانەت هەناردەکراوەکانی ئەمریکا چالاکیی خۆیان پاراست، هەرچەندە بەهای دۆلار بۆ ماوەیەکی یەك دەیەی تەواو بەرزبوویەوە پێش ئەوەی لەم دواییانەدا کۆتایی بێت. (لە ساڵی ۱۹۸۰دا هەناردەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ۱۰٪ی کۆی هەناردەکانی گشت جیهانی پێکدەهێنا. لە ساڵی ۲۰۰۷دا هێشتا ژمارەکە لە ۹ لەسەدا نزیك بوو). بەپێی یانەی ئابووریی جیهانی، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا هەر بە کێبڕێکارترین ئابووریی جیهانی دەمێنێتەوە، چوونکە لە داهێناندا پلەی یەکەمی هەیە، هەروەها لە ئامێری تەکنۆلۆژیدا پێگەی تۆپەمی هەیە؛ بۆ پارەدارکردنی کۆمپانیاکانی توێژینەوەی تەکنۆلۆژی لە پلەی دووەمدایە، هەروەها لە جۆرایەتیی دەستگەکانی شرۆڤەکردندا لە پلەی دووەمدایە. وڵاتی چینیش ناچێتە نێو چوارچێوەی ئەو سێ وڵاتەی کەوا لە هەر یەکێك لەو کەرتانەدا دوای ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دێن، لە کاتێکدا هیند تەنیا لیستی دە یەکەمەکە لە یەك کەرتدا دەبڕێت کە ئەویش قەبارەی بازاڕە. هەروەها دەستگەکانی ئەمریکا –لە ڕووی جیهانییەوە– لە ڕەوتی توانای بەرهەم و قازانج لە گشت ئەو کەرتانەی کەوا وڵاتانی پێشکەوتوو لە پیشەسازیدا تیایدا بەشدارن، پلەی یەکەم داگیر دەکەن.

بەشی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە ئابووریی جیهانیدا لە کاتی جەنگەکان و بێبازاڕییەکاندا بەشێوەیەکی نائاسایی بە جێگیری مایەوە، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆری هێزی دیکە ڕابوون. ۱۲٥ ساڵە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا کە ژمارەی دانیشتووانەکەی ٥٪ ی دانیشتووانی جیهان

پێکدەهێنی، لەنێوان ٢٠ – ٣٠٪ کۆی بەرهەم و کالای جیهانی بەرهەم دەهێنی. بێگومان پێگەی ئەمریکا لە ماوەی چەند دەیەیەکی داهاتوودا هەندێك دابەزین بەخۆیەوە دەبینیّ، ئەمە واژەیەکی سیاسی نییە بەڵکو تەواو بیرکارییانەیە، چوونکە قورسایی ئابوورییە ڕێژەییەکەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بەهۆی خێرا گەشەکردنی ولاتانی دیکە کەم دەبێتەوە، بەلام ئەم دابەزینە زۆر بەرفراوان و خێرا و گرنگ نابێت مادام ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەتوانیّ بەشێوەیەکی باش لەگەلّ بەرەنگاری و گرفتەکاندا خۆی بگونجێنیّ هەر وەك چۆن ڕەفتاری لەگەلّ ئەو دیاردەیە کرد کەوا لە سەدەی ڕابردوودا ڕووبەڕووی بوویەوە. لەوانەیە چەند گەلێکی گەشەسەندوو لە چەند دەیەکی کەمی داهاتوودا لەسەر حیسابی ئەورووپای خۆرئاوا و یابان سەرهەلّبدەن کە لەنێو چوارچێوەی لێژبوونەوە و دابەزینی دیموگرافییەکی هێواش و مەبەستداردان.

ئەمریکا ڕووبەڕووی ڕکابەرییەکی ئابووریی وەها دەبێتەوە کە لە ڕابردوو هەرگیز ڕکابەریی وەها توندی بەخۆیەوە نەبینوە. هەرچەندە ریفۆرمەکانی پێویست ڕوونن، بەلام سیستمی سیاسیی ئەمریکا ناتوانیّ ئەنجامی بدات، چوونکە لەپێناو وەدەستهێنانی دەستکەوت لە دوور مەودادا، بەرگەی ئازاری ئێستە دەگریّ. دەبیّ ئەوەش بزانین کە سیستمی ئابووری و کۆمەلایەتیی ئەمریکی دەزانیّ چۆن کاردانەوەی هەبێت و لەگەلّ ئەو فشارانەدا ڕەفتار بکات. بەلام ئەو گرفت بەرەنگاربوونەوە دژوارترەی کەوا ڕووبەڕووی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەبێتەوە بەرەنگاربوونەوە و تەنگەژەیەکی نێودەولەتییە، چوونکە ڕووبەڕووی سیستمێکی وەها دەبێتەوە تەواو لەو سیستمە جیاوازە کەوا ڕاهاتووە بەنێویدا بجوولێت. ڕاستە کە ئەمریکا ئێستەیشی لەگەلدا بێت هێشتا یاریزانە بەهێزە

جیهانییەکەیە، بەڵام لەگەڵ کۆتاییهاتنی گشت ساڵێکدا ئاست و ڕێژەکە دەگۆڕێ.

لە ساڵی ١٩٨٩ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا – بەهۆی ئەو هێزە زەبەلاحەی هەیەتی– دانانی بنەمایەکانی سیستمی نێودەوڵەتی تاکە سواری مەیدانەکەیە. گشت ڕێگەکان دەچوونەوە واشنتۆن، هەروەها هێزەکانی ئەمریکی سەبارەت بە ئابووری و سیاسەتی دەرەوە لە گشت جوولە و هەنگاوێکی جیهانیدا وەك بەردی بناغەبوو. واشنتۆن لە گشت کیشوەرەکاندا بەهێزترین گەمەکاری دەرەکی بوو، چوونکە هەژموونی بەسەر نیوە گۆی خۆرئاوای زەویدا پەیداکرد، هەروەها لە ئەورووپا و خۆرهەڵاتی ئاسیادا هەر بەهێزی یەکلاکەرەوەی هاوسەنگکردن داندرا، لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و نێوەند و باشووری ئاسیاشدا ڕۆڵی خۆی کاراتر و فراوانترکرد، هەر بە تاکە دەوڵەتێکیش مایەوە کەوا دەیتوانی بۆ هەر کردەیەکی سەربازی لە جیهاندا هێزی پێویست دابین بکات. پەیوەندییەکانیش لەگەڵ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا، بەنیسبەت هەر وڵاتێك لەم جیهانەدا– لە ڕووسیا و چینەوە بگرە تا دەگاتە باشووری ئەفریقا و هیند– لە گشت پەیوەندییەکی دیکە ئەو وڵاتانە لەگەڵ هەر وڵاتێکی دیکە گرنگتر بوو.

ئەم هەژموونە لە جەنگی دژ بە عێراقدا گەیشتە بەرزترین لووتکە. چوونکە جگە لە تووڕەیی و بەرهەڵستی و تەنانەت دوژمنایەتیی زۆرێك لە وڵاتانی جیهان، ویلایەتەکانی یەکگرتوو بەبێ هیچ تەشقەڵەیەکی پێشوەخت دژی وڵاتێکی سەربەخۆ و بە سەربازکردنی چەندان دەوڵەت و ئاژانسی نێودەوڵەتی بۆ یارمەتیدانی لە کاتی جەنگەکە و دوای جەنگەکەش، توانی هێرشەکە ئەنجام بدات. ئاڵۆزییەکانی عێراق بەتەنیا بەرپرسی هەڵوەشانەوەی سیستمی ئەم

تاکجەمسەرییە نەبوو، چوونکە ئەگەر کردەکەی سەر عێراق سەرکەوتنێکی مەزنیشی بەدەستبهێنابایە، ئەوا شێوازی جێبەجێکردنی وەهای دەکرد هێزی ڕەهای ویلایەتەکانی یەکگرتوو زۆر ڕوون و بێگومان بێت؛ ئەم کارە تاکلایەنەیە بوو کەوا کاردانەوەی گشت ولاّتانی جیهانی وروژاند. سیستمی تاکجەمسەری نەك بەهۆی عێراقەوە، بەڵکو بەهۆی فراوانیی بلاّوبوونەوەی هێز لە جیهاندا دادەڕووخێت.

لە هەندێك لایەندا، وەها دێتەبەرچاو کە سیستمی تاکجەمسەری پێشوەخت کۆتایی هاتبێت. چوونکە یەکیەتیی ئەورووپا لە ئێستەدا بارستە (کتلە) هەرە گەورەکەی بازرگانییە، بەمەیش جەمسەرێکی دیکەی پێکهێناوە، جا مادام چین و هەندێك ولاّتی زەبەلاحی دیکەی گەشەسەندوو گەشەکردنێکی خێرایان بەخۆیانەوە بینیوە، ئەوا کەرتی دوولایەنەی جەمسەریی بازرگانی دەبێتە جەمسەری سێینە، دواتر دەبێتە فرە جەمسەر. بەلاّم، لەگەڵ بوونی وەرچەرخانی هاوشێوە کە لە گشت کەرتەکاندا بەڕێوەدەچێت- بە دەرهاوێشتنی کەرتی سەربازی- ئەوا بیرۆکەی جیهانێکی فرە جەمسەر، لەگەڵ پەنجاوچوار پاریزانی خاوەن قەبارەی بەڕێژە یەکسان، نە لە ئێستە و نە لە ئایندەیەکی نزیکدا وەسفی واقیعی هەنووکەیی ناکات. چوونکە ئەورووپا ناتوانێ لە ڕووی سەربازییەوە - تەنانەت سیاسیشەوە- وەك یەك بارستە ڕەفتار بکات. ئەڵمانیا و یابانیش بەهۆی ڕابردووی خۆیانەوە ئیفلیج بوون. چین و هیندیش هێشتا هەر لە قۆناغی گەشەکردن و پێشکەوتنن. لەبەرئەوە، زاراوەکەی سامۆیل هانتینگتۆن، ناکایەتییەکی فرە جەمسەر unti-muiltipolarity، یان ئەوەی پسپۆڕانی چینیی جوگرافیای سیاسی بە هێزی جۆراوجۆر و یەك هێزی مەزن ناوی دەبەن، زیاتر گوزارشت لە سیستمی هەنووکەیی نێودەوڵەتی دەکەن

و گوزارشـتکارتره. زەمـانی تێکچـوو نیشـانەی واقیعێکـی تێکچـووە. بـەکورتی، ویلایەتەکانی یەککرتوو بـە هێـزە هـەرە گەورەکـەی جیهـان دەمێنێتـەوە، بـەلام جیهانێکە و چەندان هێزی گەورە و گرنگی دیکەش لەخۆی دەگریّ، جیهانێکـە و تیایدا کارایی و متمانەی گشت یاریزانەکان زیاتر دەبێت. ئەم سیسـتمە تێکـەلّ و فرەچەشنە نێونەتەوەییە- دیموکراسیتر و دینامیتر و کراوەتر و پەیوەندداترە- مەزندە دەکریّ، ئەو سیستمە بێت کەوا لە ماوەی چەند دەیەیەکی داهـاتوودا لـە سایەیدا دەژین. بۆ ئێمە وەها ساناترە کە وەسفی ئەو قۆناغـە بکـەین کـەوا لێـی دێینە دەرەوە نەك ئەوەی بەرەو ڕووی دەچین؛ لێرەوە ناونیشانی جیهـانی دوای ئەمریکا سەری هەلّدا.

ویلایەتەکانی یەککرتوو لە سیستمە تازە گەشەسەندووەکەدا پێگەی بەرزتر دالگیر دەکـات، بـەلام ولاتێکـیش دەبێـت کـە کـەمتر سـوود لـە سیسـتمە نوێیەکـە وەردەگریّ. چوونکە زۆربەی هێزە گەورەکانی دیکـە گەشـەکردنی ڕۆلّ و پێگـەی خۆیـان لەجیهانـدا دەبیـنن؛ لـە ڕاسـتیدا، ئـەم کردەیـە لـە ئێسـتەوە دەسـتی پێکـردووە. چین و هینـد لـە ناوچـەی خۆیـان و دواوەی خۆیشـیاندا دەبنـە دوو یاریزانی گەورە. هەروەها ڕووسیا لـە قۆنـاغی خۆگونجانـدنی دوای کۆتاییهـاتنی یەکیـەتیی سـۆڤییەت هاتووەتـە دەرەوە و ڕۆژ بـەڕۆژ بـەهێزتر و دوژمنکارانـەتر دەبێـت. هەرچـەندە یابـان لـەنێو ڕیـزی هێـزە هەلّکشـاوەکاندا نییـە، بـەلام ئامادەییـەکی زیـاتری هەیـە لەبـەردەم هاوسـێیەکەی خۆیـدا گوزارشـت لـە ڕا و بۆچوون و هەلّوێستەکانی بکات. ئەورووپاش لـە پرسـەکانی بازرگـانی و ئابووریـدا بەهێز و بڕیارێکی زۆر مەزنەوە ڕەفتـار دەکـات. دەنگـی بـەرازیل و مەکسـیکیش سەبارەت بە پرسەکانی ئەمریکای لاتینی بەشێوەیەکی زۆر بـەهێز دەنگدانـەوەی هەیـە و دەبیسـتریّ. بـەلام ولاتـانی باشـووری ئـەفریقیا پێگـەی ڕێبەرایـەتیی

کیشوەری ئەفریقیابان بۆ خۆیان داگیرکردووە. کۆی ئەو هێزانە پانتاییەکی گەورەتر بۆخۆیان دەبەن کە لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا زۆر لەو پانتاییە گەورەترە کە هەریەکێکیان لە ڕابردوودا داگیریان کردبوو.

بەڵام سەبارەت بە ویلایەتەکانی یەکگرتوو، ئەم نیشانەییەکە ئاماژە بە ڕەوت و ئاراستەیەکی پێچەوانە دەکات. ڕاستە کە ئابووری گەمەیەکی دەرئەنجام سفر نییە- گەشەکردنی یاریزانەکان بابۆڵەکە فراوانتر دەکات، ئەمەیش بۆ هەمووان کارێکی باشە- بەڵام سیاسەت واتا ململانێییەك لەپێناو هەژموون و بەرژەفتکردن. چوونکە کاتێك چالاکی و کارایی وڵاتانی دیکە زیاتر دەبێت، ئەوا ئەو ڕووبەرەی جوولەکردن کەوا ئەمریکا هەیەتی (زۆریش گەورەیە) بێگومان کەم دەبێتەوە. جا ئایا ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەتوانێ لەگەڵ هەڵکشانی هێزی دیکەدا خۆی بگونجێنێ؟ ئەو هێزانەی کەوا ئاراستەی هەمەجۆری سیاسیان هەیە و لە چەندان کیشوەردان؟ گەرچی ئەمە بەو واتایە نییە قبووڵی هەراوزەنا و پاشاگەردانی و ئەو دوژمنایەتییانە بکات کەوا لێی دوورن، بەڵام تاکە ڕێگەی بەرپەرچدانەوەی ڕەفتاری شەڕخوازانە لە ڕێگەی پێکهێنانی هاوپەیمانییەکی فراوان و پتەودا دەبێت. ئەمەیش کردەیی (ممکن) نییە تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کە واشنتۆن ئامادەیی خۆی دەربڕێ بۆ ئەوەی ڕێگە بە دەوڵەتی دیکە بدات لە سیستمە نوێیەکەدا ببنە خاوەنی پشك. ئەم هاوسەنگییەی نێوان هەماهەنگی و بەرپەرچدانەوە لە چەند دەیەکی کەمی داهاتوودا بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بەرەنگاربوونەوە و تەگەرەی سەرەکییە.

ئەم بەشەم بە گفتوگۆکردن لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەستپێکرد و گوتم کە سیستمی نوێ هۆشداری لە دابەزین و لێژبوونەوەی ئەمریکی نادات، چوونکە من پێم وایە ئەمریکا هێزێکی زەبەلاحی هەیە و جیهانی نوێش هیچ هێزێکی زەبەلاحی نوێی

بەرهەم نەهێناوە، بەڵکو کۆمەڵێك هێزی جۆراوجۆری بەرهەم هێناوە کە واشنتۆن دەتوانێ سەرکردایەتی و ئاراستەیان بکات. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەمریکا نزمبوونەوە و لێژبوونەوە (انحدار)ی رێژەیی بەخۆیەوە دەبینێ– بەتایبەت لە لایەنی ئابووری– لەگەڵ رابوون و گەشەکردنی بەشەکانی دیکەی جیهان. جا هەرچەندە گەشەکردنی ئەوانی دیکە خێراتر بوو، ئەوا پشکەکەی لە بابۆڵەکەدا کەمتر دەبێتەوە (هەرچەندە ئەم گۆڕانە بۆ ماوەی ساڵانێکی دوورودرێژ زۆر کەم دەبێت). جگە لەمانەیش، هێزی دیکەی ناحکوومی کە رۆژ لە دوای رۆژ چالاکییەکانیان زیاتر دەبێت، تا ئاستێکی زۆر جوولەی واشنتۆن کۆتوبەند دەکەن.

راستە ئەمە بۆ ئەمریکا بە بەرەنگاربوونەوە و تەگەرە دادەندرێ، بەڵام بەرەنگاربوونەوەیەکە و رووبەرووی هەمووان دەبێتەوە. بەدرێژایی نزیکەی سێ سەدە، جیهان لە لایەن دەوڵەتێکی مەزنی هەژموونداری لیبراڵییەوە پشتیوانیی لێ دەکرا؛ سەرەتا بریتانیا، دواتریش ویلایەتەکانی یەکگرتوو. ئەم دوو زلهێزە بەهۆی پاراستن و پاسەوانیکردن لە رێگەکانی بازرگانی و رێگەکانی دەریاییەوە پارەتێدەری بەرهەمهێنانی ئابوورییەکی کراوەی جیهانی بوون، لە کاتەکانی ناخۆش و رووگیریشدا رۆڵی قەرزدەریشیان گێڕاوە و یەدەگی دراو و وەبەرهێنانی دەرەوەشیان پاراستووە و بازارەکانی خۆیانیان بە کراوەیی هێشتووەتەوە. کاریگی وەهاشیان کرد کە لە زەمەنی ئەواندا هاوکێشەی سەربازی لە بەرژەوەندیی گەورە ستەمکارەکان نەشکێتەوە، هەر لە فەرەنسای ناپلیۆنییەوە بگرە تا دەگاتە ئەڵمانیا و یەکیەتیی سۆڤییەتی پێشوو. هەرچەندە لە رووی بەکارهێنانی هێزە زەبەلاحەکەیاندا خراپەی زۆریان کردووە، بەڵام ویلایەتەکانی یەکگرتوو بوو کە ئەم سیستەمەی ئێستەی بەرهەمهێنا و پاراستیشی؛ مەبەست

سیستمی بازرگانیی کراوە و دەستهەڵاتی دیموکراسییە کەوا سوودێکی زۆری بە زۆرینەی ڕەگەزی مرۆڤی گەیاندووە. جا لەگەڵ ئەوەی کاروبار و هەلومەرجەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت و ڕۆڵی ئەمریکاش دەگۆڕێت، ئەوا ئەو سیستمەی باسمانکرد بەرەو داڕووخان دەچێت. دابەزین و داڕووخانی دۆلار- بە ئاستێک کە ئیدی وەک جاران یەدەگێکی جیهانیی دراوی نییە- دەبێتە گرفتی هەموو جیهان هەر وەک چۆن گرفتی ئەمریکاشە. ئەوەش ڕوونبووەتەوە کە چارسەری گرفتەکانی گشتی لە سەردەمی لامەرکەزییەت و دابەشبوونی هێزدا، بەبێ بوونی زلهێزەکان دژوارتر دەبێت.

هەندێک لە ئەمریکییەکان تەواو درکیان بە جیهانی گۆڕاوی دەوروبەری خۆیان کردووە. جیهانی بازرگانیی ئەمریکی زیاتر درک بەو وەرچەرخانانە دەکات کەوا لە جیهاندا ڕوو دەدەن و زۆریش بە خێرایی و ئەقڵانییەتەوە خۆی لەگەڵیاندا دەگونجێنێ. هەندێک ڕاپۆرتی نیمچە هاوشێوە کەوا لە کۆمپانیا زەبەلاحە فرەڕەگەزەکانی نێو ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەرچووە، ئاماژە بەوە دەکەن کەوا گەشەکردنیان لە ئێستەدا پشت بە بڕین (اختراق)ی بازاڕی نوێی بیانی دەبەستێ. لەگەڵ گەشەکردنی داهات کەوا لەنێو ویلایەتەکانی یەکگرتوودا ڕێژەکەی ۲ بۆ ۳٪ی ساڵانەیە، لە دەرەوەشدا ۱۰ بۆ ۱۵٪ ی ساڵانەیە، درکیان بەوەکردووە کە لەسەریان پێویستە لەگەڵ جیهانی دوای ئەمریکا بگونجێن یان تیایدا زیان بکەن. هەروەها درککردنێکی هاوشێوە هەیە کە دەکرێ لە زانکۆیەکانی ئەمریکی تێبینی بکرێ، چوونکە ژمارەی ئەو قوتابیانە زیاتر دەبێت کەوا تیایاندا دەخوێنن و دواتریش بۆ دەرەوە سەفەر دەکەن و لەگەڵ قوتابییانی بیانی کارلێک دەکەن.

ئیدی گەنجانی ئەمریكا بەوە هەراسان نابن كە دەزانن دوا شێواز- لە كەرتی ئابووری و ئەندازیاریی بیناسازی و هونەر و تەكنۆلۆژیا- لە لەندەن و شانگهای و سیئۆڵ و تالین و مۆمبایدا بەرهەم دەهێندرێن.

بەلام ئەم دیاردەیە - دیاردەی ڕووكردنە دەرەوە- لە جڤاكی ئەمریكی بەشێوەیەكی گشتی شتێكی باو نییە. چوونكە تاكو ئێستەیش بیركۆ (تركین)ی ئابووریی ئەمریكی ئاراستەی نێوەخۆ كراوەتەوە، هەرچەندە ئەم مەسەلەیە لە ئێستەدا دەگۆڕێت، چوونكە بازرگانی ٢٨٪ تێكڕای بەرهەمی نێوەخۆ پێكدەهێنێ (بەبەراورد بەڕێژەی ٣٨٪ لە ئەڵمانیا). گۆشەگیری و دابڕان بەكێك بوو لە نیعمەتەكانی سروشت بۆ ئەمریكایەك كەوا بەچواردەوری مەزن و هاوسێی خۆشخۆ دەورەدراوە. ئەمریكا بە فێڵ و تەڵەكە و داڕووخانی جیهانی كۆن پیس بووە، بەردەوامیش توانای ئەوەی هەبووە وێنای سیستمێكی نوێ و جیاواز بكات؛ جا ئەگەر لە ئەڵمانیا بێت یان لە یابان و تەنانەت عێراقیش. بەلام ئەم گۆشەگیرییە، لە هەمان كاتدا، وەهای لە ئەمریكییەكان كردووە زانیارییان لەسەر جیهانی دەرەوەی سنووری خۆیان نەبێت. چوونكە ئەمریكییەكان تەنیا بە چەند زمانێك قسە دەكەن و سەبارەت بە ڕۆشنبیری و كەلتوورەكانی دیكە شتێكی كەم دەزانن، لەگەڵ ئەمەیشدا هێشتا باوەڕ بەوە ناهێنن كە ئەوان پێویستیان بە چاككردنەوەی ئەم دۆخە بێت. ئەمریكییەكان زۆر بەدەگمەن گرنگیی بە پێوەرە نموونەییەكانی جیهانی دەدەن، چوونكە ئەوان دڵنیان كە ڕێگە و شێوازی ئەوان باشترین و پێشكەوتووترە. لەبەر ئەم هۆیە دەبینی باوەڕ بەو قۆناغە گەشەسەندووە جیهانییە ناكەن. لەنێوان دەستەبژێری پیاوانی جیهانیی كار و چینی ڕۆشنبیری ئەمریكی لەلایەك و هەروەها لەنێوان زۆرینەی گەل ئەمریكی لە لایەكی دیكەوە، بۆشاییەك هەیە كە بەردەوام لە فراوانبووندایە. جا بەبێ هەوڵ د

کۆششی ڕاستین بۆ دروستکردنی پردێك لەنێوان ئەم بۆشاییەدا، ئەوا لەوانەیە ئەم دلبەشبوونە پێشکەوتن و سەرکەوتنە پڕ لە کێبڕکێیەکەی و ئاینده سیاسییەکەی وێران بکات.

گومانەکانی میللیی لە لایەن ڕۆشنبیرییەکی نابەرپرسانەی سیاسیی نیشتمانی پشتگیری لێ دەکرێ. زۆر سانایە ڕەخنە لە لووتبەرزی و ناکلایەنی و ناکرەویی ئیدارەی بۆش بگیرێ کەوا لە دەرەوەڕا ئەمریکای پەکخست، بەلام گرفتەکە هەر تەنیا لە بۆش و دیك چینی و ڕامسفێلد و کۆمارییەکان کورت نابێتەوە، هەرچەندە ئەوان بوونە حزبی نێرینەکانی لووتبەرز کە شانازی بەوە دەکەن لە دەرەوە بێزراون. گوێ لە دیموکراتەکانی واشنتۆن ڕابگرە، ئەوسا سەبارەت بە بازرگانی و پێوەرەکانی کار و پرسەکانی مافی مرۆڤ و ئاژەل وەند گوێت لە دەنگێکی ناکلایەنە دەبێت- جا ئەگەر لاوازتریش بێت-. بەلام سەبارەت بە تیرۆر، ئەوا هەردوو حیزب هێشتا هەر بە زمانێك قسە دەکەن کە بەتایبەت ئاراستەی جەماوەری نێوخۆیی دەکرێ بەبێ گرنگیدان بەو کاریگەرییە ژەهراوییەی کەوا لە شوێنی دیکەدا دروستی دەکات. سیاسییەکانی ئەمریکی بەردەوام و بەشێوەیەکی هەڕەمەکی -بەهۆی چەندان شکستی بێشومار- پۆلین و سزا و ئیدانەی گشت دەولەتەکان دەکەن (لە ماوەی پانزە سالی ڕابردوودا، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا سزای بەسەر نیوەی دانیشتوولنی سەر گۆی زەویدا سەپاند). ئێمە ئاکە دەولەتی دڵنیاین کەوا ڕاپۆرتی سالانە سەبارەت بە ڕەفتاری گشت ولاتانی دیکە دەردەکەین. بەمەیش واشنتۆن گۆشەگیر و لووتبەرزە و لە جیهانی دەرەوە دابڕاوە.

شرۆڤەیەك کە لە پرۆژەی (پیو) بۆ هەڵوێستەکانی جیهانی لە سالی ۲۰۰۷دا دەرچووە (pew global Attitudes Survey) زیادبوونێکی گرنگی

بیروڕایە ئەرێنییەکانی سەبارەت بە بازرگانیی ئازاد و بازاڕەکان و دیموکراسی پیشان داوە. چوونکە زۆرینە فراوانەکانی وڵاتان کە لە چین و ئەڵمانیا تا دەگاتە بەنگلادیش و نیجیریا پێکهاتوون، لەهەمبەر گەشەکردنی پەیوەندییەکانی بازرگانیی نێوان وڵاتاندا گوزارشت لە سوپاس و دەستخۆشیی خۆیان دەکەن. بەڵام ئەو وڵاتەی کە سەبارەت بە پشتگیریکردنی بازرگانیی ئازاد دوایین و کۆتا پێگەی وەدەستهێناوە– لەنێو ئەو چل و حەوت وڵاتەی کە لە ماوەی پێنج ساڵدا ڕا و بۆچوونەکانی وەرگیراوە– ویلایەتەکانی یەکگرتووە.

هەروەها تەماشای هەڵوێستی هەمبەر کۆمپانیاکانی بیانی بکە. کاتێک پرسیاری ئەوەیان لێ کرا ئاخۆ بۆچوونیان لە هەمبەریدا ئەرێنییە، خەڵکانێکی زۆر– کە ئەمەیش شتێکی کتوپڕ بوو– لە وڵاتانی وەک بەرازیل و نیجیریا و هیند و بەنگلادیش بە بەڵێ وەڵامیان دایەوە. ئەوەی لە مەسەلەکەشدا کتوپڕ بوو ئەوە بوو کە ئەم وڵاتانە بەزۆری لە هەمبەر کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانی خۆرئاوا بەگومان بوون. (لە ڕاستیدا، بۆ نیگەرانییەکەی باشووری ئاسیا پاساوێکی ڕاستین هەبوو، چوونکە لە ڕابردوودا لەلایەن کۆمپانیایەکی فرە ڕەگەزەوە ئیستعمار کرابوو کە ئەویش کۆمپانیای بریتانی بۆ خۆرهەڵاتی هیندە). لەگەڵ ئەمەیشدا، ٧٣٪ ی خەڵك لە هیند و ٧٥٪ی بەنگلادیش و ٧٠٪ بەرازیل و ٨٢٪ی نیجیریا لە ئێستەدا هەڵوێستێکی ئەرێنییان لە هەمبەر ئەو کۆمپانیایانە هەیە، بەڵام ژمارەکە لە ویلایەتەکانی یەکگرتوودا ٤٥٪ بوو، ئەمەیش دەمانخاتە نێو پێنجیەکی ئەوانەی لە کۆتایی لیستەکەدا هاتوون. ئێمە حەز دەکەین جیهان ئامێزی خۆی بۆ لەباوەشگرتنی کۆمپانیاکانی ئەمریکی بکاتەوە، بەڵام کاتێك کۆمپانیایەکان دێنە ئەمریکاوە مەسەلەکە جیاواز دەبێت. هەروەها وەرچەرخانێکی گەورەش لە هەڵوێستی ئەمریکییەکان سەبارەت بە پرسی پەنابەندەیی دروستبووە. بەڵام

سەبارەت بە تەکنۆلۆژیا کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو تیایدا نموونەی سەرمەشقی هەموو جیهان بوو، ئەوا لە ئێستەدا هەڵوێستێکی بەرگریکارانەی توندی لەهەمبەریدا گرتووەتەبەر. چوونکە لەو کاتەی دەمانویست لە دروستکردنی هەر تەکنیکێکی نوێدا پێش هەموو دونیا بکەوین، ئێستە بە ترسەوە لە داهێنانەکان دەنواڕین و پرسیار سەبارەت بە توانای داهێنانەکان دەکەین بۆ گۆڕینی شتەکان.

لێرەدا جیاوازییەکە ئەوەیە کە ڕابوون و پێشکەوتنی ئەوانی دیکە بەهۆی هێز و کرداری ئەمریکییەوە بووە، چوونکە بەدرێژایی شێست ساڵ، سیاسی و دیبلۆماسییەکانی ئەمریکا بە گشت جیهاندا دەگەڕان بۆ ئەوەی هانی ولاتان بدەن بازاڕەکانیان بکەنەوە و سیاسەتەکانیان ئازادبکەن و ڕەوتی بازرگانی وتەکنۆلۆژیا بگرنەبەر. ئێمە لە ناوچەکانی دووردەستی جیهاندا خەڵکمان هان دا لە ئابووریی جیهاندا بەرەنگاریی کێبڕکێ بگرنەبەر و دراو و پارەوپولیان ئازاد بکەن و پیشەسازییەکانی نوێیان پێشبخەن، ئامۆژگاریی خەڵکانی ئەو شوێنانەمان دەکرد لە گۆڕان نەترسن و نهێنیی سەرکەوتنەکانی ئێمە فێربن. لەمەیشدا سەرکەوتنمان وەدەستهێنا، چوونکە دانیشتووانانی نێوخۆیی لە سەرمایەداریدا بوونە کەسی زۆر کارامە. بەلأم ئێمە لە ئێستەدا لەهەمبەر ئەو شتانەدا کەوتووینەتە گومانەوە کە بەردەوام مەزنمان دەکردن و شوێنپێیەکانیانمان هەڵدەگرتن؛ هەر لە بازاڕی ئازادەوە بگرە تا دەگاتە بازرگانی و کۆچبەری و گۆڕانی تەکنۆلۆژییەوە. کۆی ئەو شتانەش لەو کاتەدا ڕوودەدەن کەوا شەپۆڵەکە بەرەو ئێمە دێت. جیهان دەستی بە کرانەوە کردووە، ئەمریکاش دەرگە بەڕووی خۆی و خەڵک دادەخات و گۆشەگیر دەبێت.

دوای چەند نەوەیەکی دواتر، کاتێك مێژوونووسان سەبارەت بەو ڕۆژگارانە دەنووسن، لەوانەیە سەبارەت بە ئەمریکا وەها بنووسن کە لە دەیەکانی یەکەمی سەدەی بیست ویەکدا، ئەمریکا لە ئەرکە مەزن و مێژووییەکەی خۆیدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا کە ئەویش گلۆبالیزەکردنی جیهانە. بەڵام لەوانەشە ئەوەش بنووسن کە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ئەوەی بیرچوو خۆی گلۆبالیزە بکات.

## ١- جیهانی ناخۆرئاوایی؟

وەك هەمووتان دەزانن، کریستۆفەر کۆلۆمبۆس لەساڵی ١٤٩٢دا لە یەکێك لە سەفەرە دەرياییە نوێژەرەوەکانی خۆی کە لە هەموو سەفەرێکی دیکە بەرتەماتر بوو، ملی دەریای گرت. بەڵام ئەوەی زۆرێك لە خەڵك نایزانن ئەوەیە کە پێش هەشتا و حەوت ساڵ ئەدمیراڵێکی چینی بەناوی زینگ هی یەکەمین گەشتی -لە حەوت گەشتی دۆزینەوەیی- دەستپێکرد کە بەرنامەییەکانی لە کۆلۆمبۆس کەمتر نەبوو. کەشتییەکانی زینگ لە کەشتییەکانی کۆلۆمبۆس یان فاسکۆ دا گاما یان هەر گەورە دەریاوانێکی ئەوروپای هەردوو سەدەی پانزەیەم و شانزەیەم گەورەتر و باشتر بوون. زینگ لە گەشتی یەکەمیدا کەوا لە ساڵی ١٤٠٥ دا دەستیپێکرد، ٣١٧ کەشتی و ٢٨.٠٠٠ پیاوی لەگەڵ خۆیدا برد بە بەراورد لەگەڵ کەشتییەکانی کۆلۆمبۆس کە چوار کەشتی و سەدوپەنجا دەریاوان بوون. درێژیی گەورەترین کەشتیی چینی کە ناوی کەشتی گەنز بوو لە ٤٠٠ پێ زیاتر بوو، واتا چوار هێندەی درێژیی کەشتییە سەرەکییەکەی کۆلۆمبۆس بوو کە ناوی " سانتا ماریا" بوو و هەر یەکێکیشیان نۆ ئەستووندەی ڕاگری چارۆگەی هەبوو. بینای هەر یەکێك لەو کەشتییە زەبەلاحانە پێویستی بە بڕینی دارێکی هێندە نقد بوو کە بەقەد ڕووبەری ٣٠٠ هێکتار دارستان دەبوو. جگە لەمانەیش، چەند

کەشتییەك هەبوون تایبەت بوون بە هەڵگرتنی ئەسپ و ئازووقە و خۆراك و ئاو و سەرباز. تەنانەت بچووکترین کەشتیی کەشتیگەلەکەی زینگ- کە کەشتییەکی جەنگی پێنج چارۆگەیی بوو، توانایەکی زۆری مانۆڕ و جووڵەی هەبوو- دووهێندەی کەشتییە ئەفسووناوییە ئیسپانییە سێ چارۆگەکە بوو.

کەشتییەکانی چینی بە داری تایبەت و جومگەی ئاڵۆز و تەکنیکی پێشکەوتووی دابڕینی ئاو دروستکرابوون، هەروەها بەشی خوارەوە و قووڵاییەکەی دەتواندرا دەستکاری بکرێت و هەموار بکرێتەوە. کەشتییەکانی کنز ژووری گەورە و خۆشی تیادابوو، هەروەها چارۆگەکانی لە هەریر دروستکرابوون، مۆڵەکانی پەنجەرەیان هەبوو. هەر هەمووشیان لە حەوزە وشکەکانی نانجینگ دروستکرابوون کە گەورەترین بەندەری دروستکردنی کەشتی بوو لە جیهاندا و لە هەمووشیان پێشکەوتووتر بوو. لە میانی سێ ساڵی دوای ١٤٠٥ (١.٦٨١) کەشتی لەو بەندەرەدا نۆژەنکرانەوە و دروستکران. لەو کاتیدا بەشێکی کەمی ئەم کارە لەنێو ئەوروپادا ڕووی ئەدا.

ئەبارە زۆر گرنگ بوو، چوونکە مەبەست لەو کەشتیگەلە زەبەلاحانە ترساندنی خەڵکانی دەوروبەر و پیشاندانی هێز و ئەزموونی ڕەچەڵەکی مینگ بوو. زینگ لە حەوت گەشتەکەیدا لە نێوان ساڵانی ١٤٠٥ و ١٤٣٣دا لە ناوچەیەکی زۆری زەریای هیندی و لە دەوری ناوچەی باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیادا گەڕا. هەروەها دیاریی پێشکەش بە دانیشتووانی ئەو شوێنانە کردوو و دیارییەکانی ئەوانیشی قبوڵکرد. کاتێکیش ڕووبەڕووی بەرهەڵستی دەبوویەوە، لە بەکارهێنانی هێزی سەربازیدا دوودڵیی نەدەکرد. لە یەکێك لە گەشتەکانیدا چەتەیەکی دەریای سۆمەترەیی بەدیل گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی، لە گەشتێکی دیکەیدا، ڕێبەرێکی یاخیبووی لە سیلان دەستگیرکرد و لەگەڵ خۆیدا بردی. لە تەواوی گەشتەکانیشیدا گوڵ و

میوە و بەردی گرانبەها و گیانداری سەیری وەك زەڕافە و گویدرێژی کێویی لەگەڵ خۆیدا دەمردەوە، بۆ ئەوەی لە باغچەی ئاژەڵانی ئیمپراتۆریان دابنێن.

بەڵام ئەم سەربردەیەی زینگ بەشێوەیەکی سەیر کۆتایی هات. لەگەڵ هاتنی سەرەتای سییەکانی سەدەی پانزەیەمدا ئیمپراتۆرێکی دیکە جڵەوی دەسەڵاتی چینی گرتە دەست. ئیمپراتۆری نوێ بەشێوەیەکی کتوپڕ نێردەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕاگرت و پشتی لە بازرگانی و دۆزینەوە کرد. هەندێك بەرپرس هەوڵیان دا ئەو نەریتە بهێڵنەوە، بەڵام بێسوود بوو. لە ساڵی ١٥٠٠ دا، سەرای ئیمپراتۆریەت فەرمانی ئیمپراتۆری دەرکرد کە تیایدا بڕیار درابوو هەر کەسێك لە سێدارە بدەن ئەگەر کەشتییەك دروست بکات کە لە دوو چارۆگە زیاتر بێت (قەبارەی پێویست بۆ بڕینی مەودا دوورەکانی نێو دەریا). لە ساڵی ١٥٢٥ دا، دەسەڵاتەکانی دەریایی فەرمانیان پێ کرا هەر کەشتییەك وێران بکەن کەوا بۆ دەریاوانیی نێو زەریا ئامادە کرابێت و خاوەنیشی بخەنە بەندیخانەوە. لە ساڵی ١٥٥١دا، دەریاوانی بە کەشتییەکی دوو چارۆگە بۆ هەر مەبەستێك بووبێت بە تاوان هەژمار کرا و یاسا سزای دەدا. کاتێکیش بنەوەچەی (السلالە) کینگ لە ساڵی ١٦٤٤دا دەسەڵاتیان گرتە دەست، لەسەر ئەم سیاسەتە بەردەوامبوون، بەڵام نەك باوەڕیان بە ڕێوڕەسمەکان نەبوو، بۆیێ زۆر بەئاسانی بە درێژایی ٧٠٠ میل دەستیان بە سووتاندنی پشتێنیەك کرد کە لە کەناری باشوورییەوە دەستی پێدەکرد تا دەگیشتە چین و کردیانە ناوچەیەك کە بۆ نیشتەجێبوونی خەڵك نەدەگونجا. لە کۆتاییدا، ئەم ڕێکارانە بوونە هۆی هاتنەکایەی دەرئەنجامەکانی خوازراو کە: بڕیتبوو لە داڕووخانی پیشەسازیی دروستکردنی کەشتی لە چیندا. لە ماوەی ئەو دەیانەی کەوا لە پاش دوا گەشتی زینگ هاتن، دەیان دۆزەرەوەی خۆرئاوایی چوونە نێو ئاوەکانی چوار دەوری هیند و چین، بەڵام گەیشتنی

کەشتییەکی چینی بۆ ئەورووپا لە ساڵی ۱۸۵۱دا پێویستی بە سێ سەدەی تەواو هەبوو؛ لە سەردانێکدا بۆ لەندەن لەپێناو ئامادەبوون لە پیشانگەیەکی گەورە.

چ شتێك بووە هۆی ئەم وەرچەرخانە گەورەیە؟ دەستەبژێری چینی سەبارەت بە نزیکبوونەوەی چین لە دەرەوە دابەش ببوونە سەر دوو دەستە، هەروەها دەستەهەلاتدارە نوییەکانی پەکین پێیان وابوو نێردەکانی دەریاوانی شکستخواردوو و بێ ئەنجامن، چوونکە تێچوو و خەرجییان یەکجار زۆر بوو، پێشوەخت باجێکی زۆری بەسەر دانیشتووانانی شەکەندا دەسەپاند داهاتەکانیشی زۆر کەم بوو. هەرچەندە بازرگانی بەهۆی هەندێك لەو پەیوەندییانە پێشکەوت و گەشەی کرد، بەلام زۆربەی مامەڵە بازرگانییەکان بەتەنیا لە بەرژەوەندیی بازرگان و چەتەکانی دەریا تەواو دەبوو. جگە لەمانەیش مەنگۆلییەکان و هێرشهێنەکانی دیکە هەڕەشەیان لە سنووری ئیمپراتۆریایەکە دەکرد، ئەمەیش پێویستی بە سەرچاوە و ئاگاییەکی زۆر هەبوو. وەك پێدەچێ نێردەکانی دەریاوانی بێئاگاییەکی زۆر گران و بەخەرجی بوون.

بەڕاستی بڕیارێکی چارەنووسساز بوو. چوونکە کاتێك چین بڕیاری دا لە جیهانی دەرەکی دوور بکەوێتەوە، ئەوا لە هەمان کاتدا ئەورووپا پەلوپۆی بۆ دەرەوە دەهاوێشت. ئیمە نێردراوە دەریاوانییەکانیش بوو کە وزەی بە ئەورووپا بەخشی و ڕێگەی بۆ خۆشکرد هێز و هەژموونی خۆی لە گشت جیهاندا بلاو بکاتەوە. بەلام ئەگەر شیمانەی ئەوە بکەین کە ئەگەر چین کەشتیگەلە دەریاییەکانی خۆی پاراستبایە، ئایا ڕەوتی مێژووی هاوچەرخ دەگۆڕا؟ لەوانەیە وەلامەکە نەخێر بێت. چوونکە بڕیاری چین بۆ ئاراستەگرتنەوە بەرەو نێوەخۆ بەسانایی بڕیارێکی خراپی ستراتیژی نەبوو، بەڵکو گوزارشتێك بوو لە چەقبەستنی شارستانی. جا ئەو بڕیارە کە پەیوەندار بوو بە وەستاندنی ئیمە دەریاییە نێردراوەکانی

دۆزینەوەیی، گشت هۆیە ئاڵۆزەکانی هێشتنەوە و دواخستنی چین* و وڵاتانی ناخۆرئاوایی پێکهێنا کە بەیەکەوە وایانکرد بۆ ماوەی چەندان سەدە لە وڵاتانی خۆرئاوایی دواکەوتووتربن.

ئەگەر بمانەوێ بزانین مەبەست لە رابوون و پێشکەوتنی ئەوانی دیکە چییە، دەبێ بزانین چەندە ئەو (ئەوانی دیکە) یە بە ئەنبەڵی ماونەتەوە. ئەوە روونبوویەوە کە ئەزموونی کلتووری و مادییانەی خۆرئاوا دیاردەیەکی نوێ و کورتمەودا نییە، چوونکە نزیکەی زیاتر لە پێنج سەدە لە جیهانی خۆرئاواییدا دەژین. هەرچەندە ئێمە لە ئێستەدا رابوونی گەلان و کیشوەری دیکە دەبینین، بەڵام سایەی خۆرئاوا زۆر درێژتر دەبێتەوە و میرات و کەلتوورەکەشی بۆ ماوەی چەندان دەیەی دیکە و لەوانەیە لەمەیش زیاتر درێژ بێتەوە.

ئەو گوتەیە بووەتە شتێکی باو کە چین و هیند تاکو سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم لە رووی دەوڵەمەندییەوە لە خۆرئاوا هەژارتر نەبوون. جا بەپشتبەستن بەم بۆچوونە، مانای ئەوەیە کە ئەزموون و دەستهەڵاتی خۆرئاواییی تەنیا لادانێکی کاتی بوو کەوا لە رەوتی مێژوودا تەمەنی ۲۰۰ ساڵە و ئێستە ئێمە دەگەڕێینەوە سەر هاوسەنگییە سروشتییەکەی خۆمان. هەروەها ئەم گوتەیەش ئاماژە بەوە دەکات کە رێکەوت رۆڵێکی گەورەی لە سەرکەوتن و پێشکەوتووتربوونی خۆرئاوادا هەبووە ئەویش بەهۆی خەڵوزی بەردین و موستەعمەراتەکانەوە

* لەم بەشەدا نموونەیەکی زۆر سەبارەت بە چین و هیند دەهێنمەوە وەک دوو نوێنەری جیهانی ناخۆرئاوایی، چوونکە ئەم دوو وڵاتە لە پێش قۆناغی پیشەسازیدا لە گشت وڵاتانی دیکەی پێشکەوتووی ئاسیایی پێشکەوتووتر بوون.جا کۆی ئەو شتانەی کەوا سەبارەت بە دواکەوتنیان لە سەدەکانی پێنجەم و شەشەمدا - بە بەراورد بە خۆرئاوا- دروستن، ئەوا بەسەر زۆربەی شوێنەکانی جیهانی ناخۆرئاواییدا پیادە دەبێت.

بووە، هەر دۆزینەوەیەکیش سەرچاوەیەکی هەرزانی وزە و هەژموون لەسەر زەوییە بەپێت و دەوڵەمەندەکانی ئاسیا و ئەفریقیا و کیشوەری ئەمریکادا ڕۆڵی بەرچاوی لەمەدا هەبووە. بێگومان، ئەو بۆچوونەی کە نکۆڵی لە بوونی هەر تایبەتمەندییەکی خۆرئاوایی دەکات سوودی سیاسی هەیە؛ بەلام لەگەڵ ئەوەی کە لەوانەیە لە ڕووی سیاسییەوە ڕاست بێت، بەلام لەسەر ئاستی مێژووییدا ڕاست نییە.

یەکێک لە هۆیەکانی ئەم بەدحاڵیبوونە ئەوەیە کە شیکەرەوەکان لە شیکردنەوەکانی خۆیاندا بەزۆری تەنیا جەخت لەسەر قەبارەی تێکڕایی هەردوو ئابووریی چین و هیندی دەکەنەوە. ئەم سیگنەڵەش لە ڕووی مێژووییەوە سەرلێشێوێنەرە، بۆنموونە: لە سەدەی حەڤدەیەمدا، ملیۆنەها جووتیاری هەژاری چینی کەوا لە ناوچە دووردەستەکان و دابڕاوەکانی چیندا دەژیان و بەرهەمێکی زۆر گەورەشیان هەبوو، بەلام بەشدارییان لە سامان و هێزی وڵاتدا نەدەکرد. ژمارەی دانیشتووان پێکهێنەری سەرەکی تێکڕای بەرهەمی نێوەخۆیی بوو؛ زۆربەی بەرهەمەکەش کشتوکاڵی بوو. جا هەرچەندە ژمارەی دانیشتووانی چین و هیند لە ساڵی ١٦٠٠ دا چوار هێندەی ژمارەی دانیشتووانی ئەورووپای خۆرئاوا بوو، بەلام بەرهەمی نێوەخۆییان گەورەتر بووە. تەنانەت لە ساڵی ١٩١٣ دا کاتێك بریتانیا یەکەمین زلهێزی جیهان بوو، لەگەڵ ئەو تەکنۆلۆژیا هاوچەرخەی کە هەیبوو و بەرهەمی پیشەسازی و بازرگانییەکەشی لە کۆی بەرهەمی گشت کیشوەری ئاسیا زۆرتر بوو، بەلام چین دەیتوانی بانگەشەی ئەوە بکات کە تێکڕایەکی زیاتری بەرهەمی نێوخۆیی هەیە.

لەکاتی شرۆڤەکردنی قۆناغی پێش پیشەسازی– واتا بەر لە حکوومەتەکانی دەستتێوەردەر و گواستنەوە و گەیاندن و باجەکانی هەمەچەشن– دەبینین کە

تێکڕای بەرهەمی نێوەخۆیی سەبارەت بە هێزی نیشتمانی یان ئاستی پێشکەوتنی ولاتێك شتێکی ئەوتۆمان پێنالێت. هەروەها گوزارشت لە دینامیبەت و توانای جڤاك ناكات بۆ دۆزینەوەی داهێنان و شتەكانی نوێ و ئەو تواناپانەی کەوا رێگەی نوێی پێکهێنانی سامان و بونیادنانی هێزی بە ولاتان دەبەخشی.

هەرچۆنێك بێت، دەتوانین سەبارەت بە پێگەی راستینی ولاتان وێنەیەکی روونتر وەدەستبێنین ئەگەر هاتوو گەشەکردنی ئابووری و تێکڕای داهاتی نێوەخۆیی بۆ هەر تاکێك لەبەرچاو بگرین. تێکڕای داهاتی نێوخۆیی بۆ هەر تاکێکی ئەورووپای خۆرئاوا لە ساڵی ١٥٠٠ دا لە هی چین و هیند گەورەتر و زۆرتربووە. بە هاتنی ساڵی ١٦٠٠ یش گەورەترین و زۆرترین تێکڕای داهاتی نیوەخۆیی چینی بەرێژەی ٥٠٪ بوو. لەو کاتییەوە تا ئێستەش بۆشاییەکە هەر بەرەو فراوانبوون دەچێت. لەنێوان ساڵانی ١٣٥٠ و ١٩٥٠ – شەشسەد ساڵ– تێکڕای نێوەخۆیی لە چین و هیند بە جێگری مایەوە (بۆ چین خۆی لەنێوان ٦٠٠ دۆلار و بۆ هیند خۆی لە ٥٥٠ دۆلار دەبینیەوە). هەر لەو کاتیدا، تێکڕای داهاتی نێوخۆیی بۆ هەر تاکێك

لە ئەورووپای خۆرئاوا لە ٦٦٢ دۆلارەوە بووە ٤,٥٩٤ دۆلار؛ واتا بە زیادبوونی ٥٩٤٪.*

*) خەملاندنەکانی تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی پێش ساڵی ١٩٥٠ لە کتێبی ((الاقتصاد العالمي: رؤية ألفية)) وەرگیراوە کە نووسەرەکەی ئەنگوس مادیسۆنە و سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری و دەرامەت و ژمارەی دانیشتووان و چەندان ژمارەی دیکەی تایبەت بە رابردووی دوورە. گشت ژمارەکانی مادیسۆن بەپێی دۆلار و بەهای هاوکێشەی هێزی کڕین PPP هەژمارکراوە. ئەمەیش لە کاتی بەراوردکردنی قۆناغە زۆر دوورەکانی زەمەنیدا شتێکی گونجاوە.

گەڕیدەکانی ئەورووپیی سەدەی حەفدەیەم بەزۆری ئاماژە بەوە دەکەن کە هەلومەرجی بژێوی لە چین و هیند لە بژێویی باکووری خۆرئاوای ئەورووپا زۆر نزمتر بووە، بۆ نموونە: گریگۆری کلارکی زانای ئابووریزان وەها دەخەملێنێ کە ڕێژەی مامناوەندیی کرێی ڕۆژانەی کرێکارێك لە سەدەی هەژدەیەم لە ئەمستردام ٢١ ڕتل گەنم و لە لەندەن ١٦ ڕتل و لە پاریس ١٠ ڕتل بووە. لە کاتێکدا ڕێژەی مامناوەندیی لە چین – واتا هەر لە هەمان کاتدا– دەیتوانی ٦.٦ ڕتل گەنم بکڕێت. هەروەها کلارك شرۆڤەی دۆسییەکانی کردووە بۆ ئەوەی جیاوازیی نێوان ژمارەی قاتوقڕی و برسییەتییەکان دیاری بکات، ئەمەیش دەڕژێتە نێو هەمان ڕەهەند و ئاراستە. بەکورتی، خۆرئاوا بە ماوەیەکی زۆر و پێش سەدەی هەژدەیەم لە خۆشگوزەرانییەکی باشتردا دەژیا.

لەگەڵ ئەمەیشدا، مەسەلەکە بەردەوام بەمشێوەیە نەبووە. چوونکە سەبارەت بە سەدە یەکەمەکانی هەزاری دووەم، خۆرهەلأت لە گشت لایەنەکانی دیکەدا لە خۆرئاوا پێشکەوتووتر بوو. چوونکە لەو کاتەی کە ئەورووپا لەنێو تاریکیی سەدەکانی نێوەڕاستدا نقوم ببوو، خۆرهەلأتی نێوەڕاست و ئاسیا لەگەڵ کەلتوور و میراتێکی داهێنانی زانستی و ئافراندنەکان و پەیوەندییەکانی بازرگانیدا لەنێو گەشەکردن و پێشکەوتندا دەژیان. خۆرهەلأتی نێوەڕاست لەو کاتیدا لەسەر عەرشی شارستانییەت دەژیا، چوونکە لەسەر بنەمای زانیاری و مەعریفەی گریکی و ڕۆمانی دەستی بە بونیادنان کردبوو، هەروەها لە چەندان بواری جۆراوجۆری وەك بیرکاری و فیزیا و پزیشکی و زانستی مرۆڤ و دەروونناسیدا داهێنانی پێشەنگانەی وەدیهێنا. بێگومان، ژمارەکانی عەرەبی لەوێدا داهێندران، هەروەها چەمکی سفریش هەر لەوێ داهێندرا. وشەی Aljdbra ش لە کتێبی الجبر و المقابلە ی خوارزمی وەرگیراوە. هەروەها وشەی algorithm

ئـەلگۆریتم- لـە نـاوی ئـەو زانایـەوە وەرگـیراوە. لـە ڕووی سـەربازییەوە، عوسمانییـەکان جێگـەی ئیرەیـی پێبردنـی ڕکابـەرەکانیان بـوون، چـوونکە تـا سـەدەی حەڤدەیـەم لـە ئاسـیای نێوەڕاسـت و ئـەورووپا لـە فراوانکردنـی ئیمپراتۆریەکـەی خۆیـان بـەردەوام بـوون. هـەروەها هینـدیش لـە قۆناغـە زۆر گەشەسەندوو و پێشکەوتووەکەی خۆیدا، شـانازی بـە سـەرکەوتن و پێشـکەوتنە زانسـتی و بلیمەتییـە هونەرییەکـەی و مەزنایـەتیی بـواری تەلارسـازیی خـۆی کردووە. تەنانەت لە سەرەتای سەدەی شـانزەیەمدا- لـە سـەردەمی بنەوەچەی کریشنادیفارایادا- زۆربەی سەردانیکەرە بیانییەکان وەسفی شاری فیجایاناجاری باشووری هیندییان کردووە بەوەی کە یەکێکە لـە مـەزنترین شـاری جیهـان و بـە شاری ڕۆمایان داناوە. پێش ئەمە بە چەندان سەدە، چین لـە ڕووی تەکنیکیەوە لە هـەر وڵاتێکـی دیکـە دەوڵەمەنـدتر و پێشـکەوتووتر بـووە، چـوونکە تـەکنیکی ئەوتۆیان بەکاردەهێنا کە خۆرئاوا دوای چەندان سـەدە ئاشـنای بـوون. تەنانـەت لەو کاتیدا لە ئەفریقیا ڕێژەی داهاتی مامناوەندیی لە هی ئەورووپا بەرزتر بوو.

بەڵام دواتر و لە سـەدەی پانزەیەمدا شـەپۆلەکە وەرچـەرخا و گـۆڕانی بەسـەردا هـات؛ لەگـەڵ هـاتنی سـەدەی شانزەیەمیشـدا دەسـتی بـە پێشـکەوتن کردبوو. زانستی نوێ لەگەڵ شۆڕشی هزر دەستپێکرد کەوا بە ڕێنسانس نـاوبرا و لەسـەر دەسـتی کەسانی وەک کۆپەرنیکۆس و فیسالیۆس و گالیلۆدا سەری هەڵدا. ماوەی نێـوان سـاڵانی ١٤٥٠ و ١٥٥٠ گـرنگترین دووکـەرتبوونی لـە مێـژووی مرۆڤایەتیدا بەخۆیەوە بینـی لـە لایەک لـەنێوان بـاوەڕ و خـوو و نـەریت و ئایدۆلۆژیەکانـەوە، لەلایەکی دیکەشەوە تێبینی و ئەزموونکردن و هزری ڕەخنەیی بوو. ئەمەیش لە ئەورووپا ڕووی دا و پاڵی بەو شارستانیەوەنا بۆ ماوەی چەندان ساڵ بـەرەو پـێش بڕوات. لە ساڵی ١٥٩٢دا کاتێک کەشتییەکی ئینگلیـزی ئامـادەکراو بـە هەشـتا و

حەوت تۆپهاوێژەوە ‌هەودای ٣,٧٠٠ میلی بڕی بۆ ئەوەی بگاتە ئەستەنبۆل، مێژوونووسی عوسمانی بە " شتە سەرسوڕهێنەرەکەی سەردەمی لە قەڵەمدا کە پێشتر کەس نە بینیویەتی و نە گوێی لێ بووە". لەگەڵ هاتنی سەدە حەڤدەیەمدا، گشت جۆرەکانی تەکنۆلۆژیا و بەرهەم و دەستگەکانی ئاڵۆز (وەك کۆمپانیا و سوپایەکان) لە ئەورووپای خۆرئاواییدا هێندە پێشکەوتوو بوون کە لە هیچ شوێنێکی دیکەی جیهاندا هاوشێوەی نەبوو.

ئەو باوەڕەی کە پێی وایە جڤاکەکانی ئاسیایی – بە هەر مانایەکی مادی– لە سالآنی ١٧٠٠ یان ١٨٠٠ بە هەمان ئاستی جڤاکەکانی خۆرئاوایی ژیاون، ڕێك وەك ئەو باوەڕە وەهایە کە داهێنانەکانی زانستی و تەکنۆلۆژیی کەوا لە ماوەی سێ سەدەی ڕابردوودا جیهانی خۆرئاواییان گۆڕیوە، هیچ کاریگەرییەکی لە لۆخە ئابوورییەکەیدا نەبووە، بێگومان ئەمەیش مەسەلەیەکی زۆر پووچ و بێمانایە*. خۆ پێشکەوتنی زانستی هەر واتای داهێنانی ئامێرەکانی نوێ ناگەیەنێ، بەڵکو سەرلەنوێ دارشتنەوەی ڕوانگەی ئەقڵیی جڤاکەکانی خۆرئاواییە، بۆنموونە: با باس لە کاتژمێری میکانیکی بکەین کەوا لە ئەورووپا سەدەی سێزدەیەمدا لە دروستکرا. دانییل بۆرستینی مێژوونووس کە بە دلێکی ئامێرەکانی ناوبێر کردووە، دەڵێ: " کاتژمێر دیواری نێوان جۆرەکانی مەعریفە و داهێنان و کارلەبی ڕووخاند. هەروەها دروستکەرانی کاتژمێر لە دروستکردنی ئامێرەکاندا زۆر بە ئاگاداری و زانیارییەوە بیرۆزەکانی میکانیك و فیزیایان پیادە کردووە".

---

*)لۆسییەکانی بولری شوێنەوار سەبارەت بەم بۆچوونەی خۆمان، بەڵگەیەکی دیکەی گرنگمان پێدەبەخشن، چوونکە پاشماوەی ئێسکە پەیکەری سەدەی هەژدەیەم ئەوە پیشان دەدەن کە ئاسیاییەکان لەو کاتیدا کورتتر بوونە، ئەمەیش ئامازەیەکە بۆ هەبوونی لۆخی بەدخۆراکی لە ئاسیا یان هەبوونی دەرامەتێکی کەمتر.

بەلام کاریگەری و شوێنەوارەکانی لە مەودایەکی دوورتردا شۆڕشگێڕانەتر بوو. کاتژمێر مرۆڤی لەوە ڕزگارکرد پشت بە خۆر و مانگ ببەستێ، ئەوەشی کردە شتێکی کردەیی کە ڕۆژەکانی مرۆڤ ڕێکبخات و شەو دیاری بکات و کار ڕێکبخات، لەوانەیە لە کۆی ئەمانەیش گرنگتر پێوانی تێچووی کار بێت بەهۆی ژماردنی ئەو کاتژمێرانەی کەوا پرۆژەیەك تیایدا بونیادنراوە. پێش دروستکردنی کاتژمێر کات هیچ بەهایەکی ئەوتۆی نەبوو کە بتواندرێ حیساب بکرێ.

کاتێکیش لەگەڵ هاتنی سەدەی شانزەیەمدا پرتوگالییەکان هێنایانە ولاتی چین، ئەوا کاتژمێرە میکانیکیە ئەورووپییەکان لەو کاتژمێرە ئاوییانە زۆر ئالۆزتر بوون کە لە پەکین دروستکرابوون. بەلام چینییەکان هێندە ڕێز و بەهایان بۆ ئەم ئامێرانە دانەنا و وەك گەمەیەك هەژماریان دەکرد، ئەوان زەحمەتیی ئەوەیان نەکێشا خۆیان فێری چۆنییەتی کارپێکردنی بکەن. لەبەر ئەم هۆیە، پێویستیان بەوە هەبوو لەپێناو کارپێکردنی دامێنانەکانیان هەندێك ئەورووپی لە لای خۆیاندا بهێڵنەوە. ئەمەی جاری دووەم بوو کە دوای سەد ساڵ دووبارە ڕووی دایەوە کاتێك پرتوگالییەکان تۆپهاوێژیان هێنایە پەکین، چوونکە ناچاربوون کارپێکەر بۆ مەکینەکانیان داوا بکەن. لەگەڵ هاتنی سەدەی هەژدەیەمدا، پەکین بەهیچ جۆرێك نەیدەویست ئەو ئامێرانە ببینێ کەوا بیانییەکان دروستیان کردبوو. لە ساڵی ١٧٣٦ تا ١٧٩٥ کیانلۆنگی ئیمپراتۆر حوکمی چینی کرد. ئەوجا لەو کاتیدا پاشا جۆرجی سێیەمی بریتانیا داوای بەستنی پەیوەندیی بازرگانی لەگەڵ چین کرد. ئیمپراتۆری ناوبراویش بەمشێوەیە داوایەکەی ڕەتکردەوە: " ئێمە گرنگییەکی زۆر بە ئامێرە داهێنراو و خۆرئاواییەکان نادەین، هەروەها پێویستمان بە ڕێژەیەکی زۆری دروستکراوەکانی ولاتەکەتان نییە". چینییەکان ئەقڵی خۆیان بەڕووی جیهاندا داخست.

ئاسیا بەبێ تەکنۆلۆژی و تەکنیکی نوێ، بووە نێچیری گرفتی مالسۆسیەی کلاسیکی. شرۆڤە و توێژینەوەکانی تۆماس مالسۆس کەوا لە ساڵی ١٧٩٨دا دەرچوو، تیۆرێکە و تایبەتە بە بنەمای ژمارەی دانیشتووان و ڕەشبینییەکی گەورەی تیادایە، بەلأم زۆرێک لە تێبینییەکانی مالسۆس گوزارشتیان لە زیرەکییەکی زۆر دەکرد. مالسۆس تێبینی ئەوەی کرد کە بەرهەمهێنانی خۆراکی لە ئینگلترا بە ڕێژەی بیرکارییانەی (١، ٢، ٣، ٤......) زیادی دەکرد، لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتووان بە ڕێژەی ئەندازەیی (١، ٢، ٤، ٨، ١٦......) زیادی دەکرد، جا ئەگەر ئەمجۆرە دژبوون و پێچەوانەییە چارەسەر نەکرابایە، ئەوا وڵاتەکە دووچاری برسیەتی و هەژاری دەبوو، هەروەها ئاستەکانی بژێوی تەنیا مەرگەساتەکانی وەک برسیەتی و نەخۆشییەکان بەرز دەکاتەوە (چوونکە ژمارەی دانیشتووان کەم دەکاتەوە)*. بەلأم هەرچەندە گرفتی مالسۆس واقیعی بوو، بەلأم لە مەزەندەکردنی هێزی تەکنۆلۆژیادا سەرکەوتنی وەدەستنەهێنا. هەروەها درکیشی بەوە نەکردبوو کە خودی ئەم فشارانە لە ئەورووپادا کاردانەوەیەکی مرۆڤییانە دروست دەکات؛ شۆڕشی کشتوکاڵی کە ڕێژەی خۆراکی بەشێوەیەکی یەکجار گەورە زیادکرد. (هەروەها کیشوەرەکە بەهۆی ناردنی دەیان ملیۆن خەڵک بۆ زۆرێک لە مستەعمەرەکان و بەزۆریش بۆ کیشوەری ئەمریکا، فشاری دانیشتووانی کەمکردووە). کەواتە، مالسۆس سەبارەت بە

---

*) مەرگەسات و نەهامەتی و ڕووداوە مەزنەکانی وەک جەنگ و هتد ئاستی بژێوی بەرز دەکاتەوە، چوونکە دەبێتە هۆی کوشتن و لەناوچوونێکی زۆری خەڵک و ژمارەی دانیشتووان کەم دەبێتەوە و دەرلەتە جێگیرەکە لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن، لە بەرانبەریشدا، گەشەکردنی شۆڕش خەڵک هان دەدات منداڵ و وەچەی زۆرتر بخەنەوە و تەمەنیشیان گەورەتر دەبێت، بۆیێ دەرلەت کەمتر دەبێتەوە، لەگەڵ گوزەرکردنی کاتیشدا ژمارەی دانیشتووانیش کەمتر دەبێتەوە. ئەم پرسە بە تەڵەی مالسۆس دادەنرێ، ئەوەشت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی مالسۆس بە ڕەشبین دانراوە.

ئەورووپا کەوتە هەڵەوە، بەلام شیکردنەوەکەی سەبارەت بە ئاسیا و ئەفریقیا دروست دەرچوو.

## هێز بێهێزییە

بەلام، چۆن لەو گەشتە سەیروسەمەرە چینییانە تێبگەین؟ لە ڕاستیدا، کەشتیگەلی زینگ تەنیا بەشێکی بچووکی وێنەیەکی گەورەتری ئەو دامێنانە جوان و سەرسوڕهێنەرانە بوو کەوا لە هیند و چیندا وەدی دەهات (تەلار، باڵەخانە، شارەکان)، گەرچی خۆرئاوا لە هەمان کاتدا، لە ڕووی پێشکەوتندا لەوان لەپێشتر بوو، بۆنموونە لە هیند، زۆربەی خۆرئاواییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە کۆشکی تاج مەحەل- کەوا لەلایەن ئیمپراتۆری مەغۆلی شا جاهان لە ساڵی ١٦٣١دا وەك ڕێزگرتنێك لە هاوسەرە خۆشەویستەکەی بونیادنراوە- مۆزەیەکی هونەرییە و لە ئەورووپادا هاوتای نییە. ویلیام هۆدگزی گەڕیدەی بریتانی لە وەسفکردنی کۆشکەکەدا دەڵێ: مادەکانی بێگەردن، شێوە و قەبارەکانی زۆر مەزن و جوانن، گونجان و هارمۆنیای دیمەنە هەمەکییەکە لە هەموو ئەوشتانە جوانتر و سەرکەوتووترە کە من تا ئێستە لە ژیانمدا بینیبێتم". دروستکردنی تاج مەحەل پێویستی بە بەهرە و کارامەییەکی مەزن و توانایەکی سەرسوڕهێنەری ئەندازیاری هەیە. جا چۆن دەکرێ جڤاکێك ئەو شتە سەیروسەرسوڕهێنەرانە دروست بکات و لە گشت ئاستەکانی دیکەشدا پێشنەکەوێت؟ جا ئەگەر چین بتوانێ ئەو کەشتیگەلە سەرسوڕهێنەر و ئاڵۆزە دەریاییە دروست بکات، بۆ نەیتوانیوە کاتژمێر دروست بکات.

بەشێك لە وەڵامەکە خۆی لە شێوازی بونیادنانی تەلاری تاج مەحەلدا دەبینێتەوە کە لە لایەن مەغۆلەکانەوە دروستکراوە. بیست هەزار کرێکار شەو و ڕۆژ و ماوەی

بیست ساڵ کاریان تیایدا کردووە. هەروەها ڕێگەیەکی سەرەڕەوزیان بە درێژایی دە میل دروستکردووە لەپێناو گواستنەوەی مادە و کەرەستەکان بۆ ئەو گومەتەی کەوا ۱۸۷ پێ لەسەر زەوییەوە بەرزە. بودجەی دروستکردنی بێسنوور بووە، هەروەها نرخ بۆ کانزمێرەکانی کاری نێو پرۆژەکە دانەندراوە. بەهەمان ڕێگە و شێوازیش کەشتیگەلی زینگ هی دروستکراوە، هەروەها دروستکردنی بینای شاری موحەڕەمە لە پەکین کەوا لە ساڵی ۱٤۰٦ەوە کاری تیادا کراوە و دروستکردن و تەواوکردنی پێویستی بە یەك ملیۆن کرێکار و ملیۆنێك سەرباز هەبووە بۆ ئەوەی چاودێریی کرێکارەکان بکات. بەکورتی کاتێك وزە و سەرچاوەیەکی مەزنی جڤاك لە خزمەتی چەند پرۆژەیەکدا تەرخان بکرێت، ئەوا پرۆژەی وەها بەزۆری سەرکەوتن وەدەست دەهێنێ. یەکێتیی سۆڤییەت لە حەفتایەکاندا شانازی بە هەبوونی بەرنامەیەکی نایاب و دەگمەنی خۆزا (الفضاء) دەکرد. هەرچەندە لەو کاتیدا لەڕووی تەکنۆلۆژییەوە دواکەوتووترین گەلی پیشەسازی بوو.

بەڵام دابینکردنی هێزی مەزنی کارگەر لەپێناو چارەسەرکردنی گرفتێك ئەو ڕێگەیە نییە کە مرۆڤ بەرەو داهێنان ببات. لەم بارەیەوە، فیلیپ هانگی مێژوونووس بەراوردێکی جوان لەنێوان جووتیارانی دلتا یانگتزی و جووتیارانی ئینگلترا دەکات کە لە ساڵی (۱۸۰۰) دوو لە دەوڵەمەندترین شوێنەکانی شین و ئەورووپا بوون. هانگ ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە هەردوو ناوچە، بەپێی هەندێك پێوەر وەها دەهاتنە بەرچاو کە لەیەك ئاستی ئابووریدا بن، بەڵام ئینگلترا لە پێوەری سەرەکیی گەشەکردندا بەچەند هەنگاوێك لەپێشتربوو، ئەویش تێکڕای بەرهەمهێنان بوو. چینییەکان دەیانتوانی وەها لە زەوییەکەیان بکەن تا ئاستێکی زۆر بەرز بەرهەمهێن بێت، بەڵام بە تەرخانکردنی کرێکارێکی زۆرتر

ئەمەیان وەدی دەهێنا؛ هانگ بەم دۆخە دەڵێت بەرهەمی بێ پێشکەوتن. بەلام ئینگلیزەکان لە گەڕان بەدوای شێوازی نوێی زیادکردنی بەرهەم نەدەوەستان، بۆئەوەی هەر جووتیارێك بتوانێ بەرووبوومێکی زۆرتری هەبێت. بۆیێ بە بەکارهێنانی گیانداران و ئامێری داهێنەرلو، ئامرازی نوێی دابینکەری کاریان دۆزییەوە، بۆنموونە: کاتێك چەرخی ڕستنی هەمەجۆر پێشخرا کە پێویستی بە یەك کارپێکەری مەشقپێکرلو بوو- ئەوا سەر لەنوێ دەستکارییان کردەوە و لە ئینگلترا بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکارهێندرا. بەلام لە چیندا کارکردن لەسەر یەك ئامێر و دەستگەی ڕستن بەردەوام بوو کە لە ڕووی پێشکەوتنەوە لە دواوەتر بوو، بەلام نرخی کەمتربوو، چوونکە دەتواندرا بەهۆی زۆرێك لە کرێکارانی مەشقپێنەکراو وەگەڕبخرێ. (ئەگەر بەهای کار کەمبوو، بۆچی پارە لەو ئامێرانە خەرج بکرێن کەوا کاتەکانی کار کەم دەکەنەوە؟) لە کۆتاییدا، لە ئەنجامی ئەمەدا دیاردەیەك پەیدابوو ئەویش ئەوەبوو کە ژمارەیەکی کەمی بریتانییەکان وایان لێهات بتوانن ڕووبەری زۆر فراوانی زەوی بکێڵن و بچێنن. لەگەڵ هاتنی سەدەی هەژدەیەمدا، ڕێژەی مامناوەندی ڕووبەری کێڵگەکان لە باشووری ئینگلترا بووە ١٥٠ هێکتار، لە بەرانبەریشدا لە لە دلتا یانگتزیدا یەك هێکتار بوو.

هەروەها نێردە دۆزەرەوەکانی دەریایی جیاوازیی نێوان شێوازی خۆرئاوایی و خۆرهەلاتی ڕوون دەکاتەوە. نێردراوەکانی ئەوروپی قەبارەیان کەمتر بوو، بەلام بەرهەمیان زیاتر بوو. لە زۆربەی دۆخەکانیشدا، ڕێگەی نوێ بۆ بەخشینی نرخی گەشتەکان بەکاردەهێندران. هۆڵەندییەکان ڕێگەی داهێندراویان لە بواری دارایی و باجدا دۆزییەوە، بازرگانانی ماسیی رنگە (herring) گرێبەستی وەهایان بەکاردەهێنا کە لە ماوەیەکی دواتردا داوای ڕادەستکردنی کالآیەکانی دەکرد،

ئەمەیش لە هەشتایەکانی سەدەی شانزەیەمدا دەستیپێکرد. ئەم میکانیزمانەی دارایی بە پێشکەوتنێکی گەوهەری دادەنرێن، چوونکە بەخشینی پارە (التمویل)ی بۆ ژمارەیەکی زۆری نێردەکان دابین دەکرد. گشت گەشتێک شیمانەی ئەوەی لێ دەکرا قازانج وەدەستبێنێ و شتی نوێ و بەرهەمی نوێ بدۆزێتەوە. پرۆژەکە بەگرتنەبەری ڕێبازی ئەزموونکردن و فێربوون لە هەڵە بەرەو پێشەوە پاڵ دەندرا، چوونکە کۆی گەشت و نێردەکارییەکان لەسەر بنەمای ئەوانەی پێش خۆیان بونیاد دەنران. لەگەڵ کاتیشدا زنجیرەیەکی کارلەیەکترکردووی بازرگان و دۆزینەوە و زانست و فێربوون پێشدەکەوت.

لە بەرانبەرشدا لە وڵاتی چیندا، گەشتەکان و نێردەکارییەکان تەنیا پشتیان بە بەرژەوەندی و هێزی پاشا دەبەست، لەبەرئەوە لەگەڵ ڕۆیشتنی پاشادا ئەویش دەوەستا. لە یەکێک لە دۆخەکاندا، ئیمپراتۆری نوێ فەرمانی دەرکرد کە گشت پلانەکانی دروستکردنی کەشتییەکان لەنێوببرێن بۆ ئەوەی کەس نەتوانێ سەرلەنوێ بونیادیان بنێتەوە. چینیەکان هەر لە سەدەی سێزدەیەمەوە دەیانتوانی زۆر بەکاراییەوە تۆپهاوێژەکان بەکاربێنن، بەڵام دوای سێ سەدە بەبێ یارمەتیی ئەورووپییەکان و ڕێنماییەکانیان بۆ چۆنییەتی ئەنجامدانی کارەکە نەیانتوانی تەنیا یەک تۆپیش بتەقێنن. لێرەوە دیڤید لاندسی مێژوونووسی ئابووری لە زانکۆی هارفارد ئەو بۆچوونەی لەلا دروست دەبێت کە چین لە "وەدیهێنانی کردەی پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆژیایەکدا شکستی هێنا کەوا لە ڕووی ئابوورییەوە کارا و بەردەوامە". ئا ئەمە تراژیدیایەکەی ئاسیایە: هەرچەندە مەعریفە هەبوو، بەڵام فێربوونی تیادا نەبوو.

## ئایا ڕۆشنبیری قەدەریکە؟

بۆچی ولأتانی نا خۆرئاوایی لە جووڵە وەستان لە کاتێکدا خۆرئاوا لـە پێشـکەوتن بەردەوام بوو؟ ئەم پرسیارە بـۆ مـاوەی چـەندان سـەدە گفتوگۆ و بێزبازییـەکی زۆری لەسەر کراوە بەبێ ئەوەی کەس بگاتـە وەڵامێکی ورد و تـەواو. ڕوونـە کە مافی موڵکایەتیی تایبـەت و دەسـتگەکانی نـوێی دەسـتهەڵات و جڤـاکی بـەهێزی مـەدەنی (واتـا ئـەو جڤاکـەی کـە دەوڵـەت کـۆنترۆڵی ناکـات)، سـەبارەت بـە گەشـەکردنی ئـەورووپا و دواتـریش ویلایەتـەکانی یـەکگرتووی ئـەمریکا پرسـێکی کرۆکی بوو. لـە بەرانبەریشـدا، سـزاری ڕووسـی- بەشـێوەی تیـۆری- بەتـەواوی ولأتی کردبووە موڵکی خۆی. لە چینیشدا سەرا و کۆشکی خانەوادەی مینـگ لـە لایـەن هەنـدێك بەرپرسـی چـینییەوە بـەڕێوەدەبرا کـەوا ڕقیـان لـە بازرگـانی دەبوویەوە. بەڵام جڤاکەکان- لە گشت ناوچەکانی جیهانی نـا خۆرئاواییـدا- زۆر لاوازبوو و پشتی بە دەوڵەت بەستبوو. پیاوانی نێوخۆیی کـار لـە هینـد بـەردەوام دیل و کۆیلەی هەوەسـەکانی کۆشـك و سـەرای ئیمپراتـۆری بـوون. لـە چینیشـدا بازرگانانی دەوڵەمەند لەپێناو شارەزابوون لە فەلسەفەی کۆنفۆشیۆس وازیـان لـە بازرگانی دەهێنا بۆ ئەوەی لە کۆشك و سەرای ئیمپراتۆری نزیکبن.

مەغۆل و عوسمانییەکان جـەنگاوەر و ئەرسـتۆکراتی بـوون، لەبەرئـەوە وەهـا لـە بازرگانییان دەنواڕی کەوا هیچ مەزنایەتی و گرنگییـەکی تیـادا نییـە (هەرچـەندە خۆرهەڵاتی نێوەڕاست کەلتوور و میراتێکی زۆر دووروودرێژی بازرگانی هەبوو). لـە هینیشدا، ئەم لایەنگرییە بەهۆی ئەو پێگە نزمەوە پتەو دەکرا کەوا بازرگانـان لـە پلەبەنـدیی چینایەتیی هیندۆسـیدا داگیریـان دەکـرد. مێژوونووسـان باوەڕیـان وەهـابوو کـە بیروبـاوەڕ و سـرووتەکانی هیندۆسـی بیـووە تەگـەرەی بـەردەم پێشکەوتن، لەمبارەیەوە پۆل کنیـدی دەڵـێ " توندوتیـژیی ڕەهـای حـەرامکراوە ئاینییـەکانی هیندۆسـی کاریگەرییـەکی نـەرێنی لـە کـردەی نوێگەرابییـدا کـرد:

ڕێژەیەکی زۆری مادەی خۆراکی بەفیڕۆچوو، چوونکە ڕێگە نەدەدرا گیاندارانی قرتێنەر و مێرووەکان بکوژرێن؛ هەروەها خوو و نەریتەکانی کۆمەڵایەتیی تایبەت بە خۆ دەربازکردن لە خاشاک و پاشماوەکانی لەشی مرۆڤ بۆ بەرهەمهێنانەوە بووە هۆی سەرهەڵدانی هەلومەرجی بەردەوامی نادروستی کەوای کرد ناوچەکە ببێتە زەوییەکی بەپیتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تاعوون؛ سیستمی چینایەتیش گیانی دەستپێشخەری خنکاند و خوو و نەریتەکانی چەسپاند و بازاڕی کۆتوبەندکرد؛ هەروەها ئەو دەستەڵاتەی کەوا کامینە براهمانییەکان بە دەستەڵاتدارە نێوخۆییەکانی هیندییان بەخشیبوو، وەهای کرد ئەم شێواز و نۆرمە دژە ژیانە لە بەرزترین ئاستەکانی خۆیدا زۆر کاریگەر بێت". هەروەها گی ئەی ئێم. ڕۆبێرتس تیشکی خستە سەر وێنا و دونیابینیی هیندۆسیبانە بۆ جیهان.

بەڵام ئەگەر ڕۆشنبیری گرنگترین شت بێت، ئەدی چۆن دۆخی ئێستەیی چین و هیند لێکبدەینەوە؟ لە ڕاستیدا، لەم ڕۆژگارەدا، گەشەکردنە سەرسوڕهێنەرەکەی بەهۆی ستایشکردن و ڕۆڵی ڕۆشنبیریی هەردوو وڵات لێکدەدرێتەوە. ڕۆژێک لە ڕۆژان، کۆنفۆشیۆسییەت پێشکەوتنی ئیفلیج دەکرد، بەڵام لە ئێستەدا بووەتە ماندەری پێشکەوتن. هەروەها ئەقڵییەتی هیندۆسی ئەگەرە بوو، ئێستەیش وەها لێی دەنواڕدرێ جۆرێک لە واقیعیەتی مادی بەرجەستە دەکات کەوا بە بنەمای سەرمایەداریی بازرگانی دادەنرێ. واپێدەچێ کە بڵاوبوونەوە و بەلوپۆهاوێشتنی هەردوو ڕۆشنبیری و کەلتووری هیندۆسی و چینی پێژانە بەڵگەی سەلمێنەر دەبەخشنە ئەم بیردۆزانە.

دانییل پاتریک مۆینهانی سیناتۆر و مەزنە ئەکادیمیستی کۆچکردووی ئەمریکی جارێک گوتی:" ڕاستیی سەرەکی لە هزری پارێزەرانە ئەوەیە کە ڕۆشنبیری نەک

سیاسەت، سەرکەوتنی جفاکێك دیاری دەکات. بەلآم ڕاستیی سەرەکیی لیبراڵی ئەوەیە کە سیاسەت دەتوانێ ڕۆشنبیری بگۆڕێت و لەخۆیدا بیپارێزێ". ئەمەیش تەولو ڕاستە. ڕۆشنبیری گرنگە، بەڕاستی گرنگە، بەلآم گۆڕانی بەسەردا دێت. چوونکە لە ساتێکی دیاریکراودا، لەوانەیە هەندێك تایبەتمەندیی جیاکەرەوە زۆر گرنگبن و وەها بێنە بەرچاو کە جێگیرن، بەلآم هەر لەگەڵ ئەوەی نۆخێکی سیاسی و ئابووری گۆڕانیان بەسەردا بێت، ئەوا گرنگیی ئەو تایبەتمەندییانە کاڵ دەبنەوە و جێگە بۆ تایبەتمەندیی دیکە چۆل دەکەن. ڕۆژگارێك جیهانی عەرەبی مەڵبەندی زانست و بازرگانی بوو، بەلآم لە دەیەکانی کۆتاییدا هەناردە سەرەکییەکانی تەنیا نەوت بوو. هەر بێژبازی و گفتوگۆیەکی ڕۆشنبیری دەبێ توانای لێکدانەوەی هەردوو قۆناغی هەبێت: سەرکەوتن و شکست.

بۆچی بازرگانیی ئاسیایی – کەوا ئێستە زۆر بەرچەستە و باڵانۆمایە- بۆ ماوەی چەندان سەدە بزر و ژێر گڵ کەوتبوو؟ بەشێکی زۆری وەلآمی ئەم پرسیارە هەردەبێ خۆی لە بونیادی ولآتانی ئاسیاییدا حەشار دابێت. زۆربەی ولآتانی ئاسیایی حکورمەتی دوژمنکارانە و بەهێز و مەرکەزییان هەبوو کەوا باجیان لە هاوولآتیانی خۆیان وەردەگرت بەبێ ئەوەی لە بەرانبەردا شتێکی زۆریان پێببەخشن. لە سەدەی پانزەیەمەوە تا سەدەی نۆزدەیەم، دەسەڵاتدارانی ئاسیایی بەگشتی، کۆپی و هاوشێوەی دەستەڵاتدارە کەڵەگایەکانی خۆرهەڵاتی ئاسیابوون. کاتێك مەغۆلەکان لە سەدەی پانزەیەمەوە لە باکوورەوە هیندیان داگیر کرد، دەستەڵاتە دڕندەییەکەیان بە سەپاندنی باج و جزیە و بونیادنانی کۆشك و قەلآ دەناسرایەوە و بەتەولوی ژێرخانی ئابووری و ڕێگەوبانەکان و بازرگانی و دلعێنانەکانیان پشتگوێ خستبوو (تەنیا دەستەڵاتی پاشا مەزنەکەیان نەبێت ١٥٥٦-١٦٠٥). میرەکانی هیندۆسی لە باشووردا هێندە باشتر

نەبوون، چوونکە بازرگانەکان ناچاربوون ڕێژەی قازانجکردن بەبەرزی بهێڵنەوە، ئەمەیش بۆ خۆپاراستن بوو لەو باجە بەردەوام و ستەمکارەی کەوا دەستەهەڵاتدارەکانیان دەیانسەپاند. هیچ کامێکیان حەزیان بە پێکهێنانی سامان نەدەکرد، چوونکە پێشوەخت دەیانزانی دەستی بەسەردا دەگیرێ.

بەڵام لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا، دەستەهەڵاتی مەرکەزی زۆر دوای ئەمە هات. کاتێك ناوچەکە لە سایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بەشێوەیەکی نەرم و بەرێژە لامەرکەزی بەڕێوەدەبرا، ئەوا بازرگانی و کار و دامێنانەکان گەشەیان کرد، چوونکە کاڵا و هێز و خەڵك زۆر ئازادانە لە گشت شوێنێکدا تێکەڵی یەکتر دەبوون. تا سەدەی بیستەم داهات، لەو کاتیدا هەوڵێك بۆ دروستکردنی وڵاتانی سەربەخۆی بەهێز و نویٰ درا و بووە هۆی پەیدابوونی چەند سیستمێك کە بووە هۆی مەبوونێکی قووڵی ئابووری و سیاسی. جا لەگەڵ هەبوونی حکومەتەکانی بەهێز و جڤاکەکانی بێدەستەهەڵات و لاوازدا ناوچەکە دوا کەوت و لە زۆر لایەنی پێشکەوتندا کەوتە دوای وڵاتانی دیکە.

بۆچی ئەم جۆرە دەوڵەتە مەرکەزییانە لە ئەورووپادا سنووربەند و کۆتوبەند کرابوون، هەرچەندە بەزۆرێك لە شوێنەکانی دیکەی جیهانی نا خۆرئاواییدا بڵاوبووبونەوە؟ یەکەم، بەهۆی کڵێسای مەسیحییەوە بوو کە تاکە دەستگە بوو بتوانێ دژی دەستەهەڵاتی پاشایان بوەستێنێتەوە، دووەم، بەهۆی دەستەبژێرێکی خاوەنزەوی لە ئەورووپادا کەوا لە گوندەکاندا بنکەیەکی سەربەخۆی هەبوو و وەك کۆتوبەندکاری دەستەهەڵاتی ئاکرەو و خۆسەپێنی پاشایی ڕەفتاری دەکرد (یەکەم یاسای ماف The Magna Carta لە جیهانی خۆرئاواییدا لە ڕاستیدا پەیماننامەیەك بوو بۆ ئیمتیازی بارۆنەکانی خاوەنزەوی کە لە لایەن

خانەدانەکانەوە بەسەر پاشادا سەپێندرا). سێیەمیش، بەهۆی جوگرافیاکەیەوە بوو.

ئەورووپا بەچەند ڕووبارێکی گەورە و چیای سەرکەش و دۆڵی فراوان دابەش کراوە، ئەمەیش سروشتێکی تۆبۆگرافییە و چەندان سنووری سروشتیی بە ناوچەکە بەخشیوە و یارمەتیدەری دروستبوونی چڤاکی سیاسیی فرە قەبارە بووە: شاری سەربەخۆ، دۆقییەکان، کۆمارەکان، دەوڵەتان و ئیمپراتۆرییەکان. لە ساڵی ١٥٠٠ دا لە ئەورووپا زیاتر لە ٥٠٠ دەوڵەت و شاری سەربەخۆ و هەرێمی دەرەبەگایەتی هەبوو. ئەم هەمەڕەنگییەش وانا بوونی کێبڕکێیەکی بەردەوام لەنێوان هزر و خەڵك و هونەر و چەك و تفاقەکان. جا ئەو کەسانەی لە شوێنێکدا بەشێوازێکی خراپ ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرا یان دەبێزێندران و دەچەوسێندرانەوە، دەیانتوانی بچنە شوێنێکی دیکە و تیایدا گەشە بکەن. هەروەها ئەو دەوڵەت و وڵاتانەی سەرکەوتنێکیان وەدەستدەهێنا لاساییان دەکرایەوە، بەڵام شکستخواردووەکان لەنێودەچوون. جا بە تێپەڕبوونی کات ئەم کێبڕکێیە یارمەتیی ئەورووپای دا کە لە دروستکردنی سامان و دارایی و دروستکردنی جەنگەکانیشدا زۆر کارامە و دەستڕەنگین و داهێنەر بێت.

لە بەرانبەریشدا، ئاسیا لە چەند زەوییەکی دەشتایی فراوان پێکدێت وەك دەشتەکانی ڕووسیا و چین. جا لەم شوێنانەدا، سوپایەکان زۆر بەخێرایی پێشڕەوییان دەکرد و ڕووبەڕووی کەمە بەرگرییەك دەبوونەوە (چینییەکان ناچاربوون پەرژینە مەزنەکە دروستبکەن چوونکە بۆ خۆپاراستن و پاراستنی زەوییەکانیان نەیاندەتوانی پشت بە هیچ لەمپەرێکی سروشتی ببەستن). ئەم سروشتە جوگرافییە یارمەتیی دروستبوونی ئیمپراتۆریایەکانی بەرفراوان مەرکەزی دا کەوا توانیان بۆ ماوەی چەندان سەدە خۆیان بپارێزن. بۆنموونە لەو

ڕووداوە وردبەرەوە کەوا بەهۆیەوە دەستمان بەم بەشەکرد کە ئەویش بڕیاری خانەوادەی مینگ بوو بۆ وەستاندنی نێردە دوورەوە دەریاییەکانی دوای گەشتەکانی زینگ هی. لەوانەیە سەرنجڕاکێشترین شتێك لە قەدەغەکردنی ئەم گەشتە سەرکەوتن و سەرگرتنی بێت. سیاسەتێکی لەمجۆرە لە ئەوروپادا هەرگیز نەدەتواندرا پیادە بکرێ. چوونکە لەوێدا هیچ پاشایەك نەبوو هێزێکی تەواوی هەبێت ئەم جۆرە بڕیارە پیادە بکات، جا ئەگەر بەهێزیش بووایە، ئەوا خەڵکی شارەزا و کارامە دەچوونە وڵاتێکی دیکەی سەربەخۆ یان هەرێمێکی دەربەگیی هاوسێیان. بەڵام ئیمپراتۆری چین لەبەر ئەو هۆیانەی باسمانکردن توانای هەبوو ڕەوڕەوەی زەمەن بگەڕێنێتەوە دواوە.

ڕێڕگە و ڕێگەکانی دەریایی بۆ ئەوروپا بەخششێکی دیکە بوو. چوونکە ڕووبارەکانی بەهێواشی بەرەو کەنداوەکانی پارێزراو دەچوون کە بۆ دەریاوانی لەباربوون، بۆ نموونە، ڕاین ڕووبارێکی پان و هێواشە و دەکرێ وەك ڕێگەیەکی خێرا بۆ گواستنەوەی کاڵا و خەڵك بەکاربهێندرێ. هەروەها دەریای نێوەڕاست دەریایەکی هێمنە- زیاتر بە دەریاچە دەچێت- و زۆرێك لە بەندەری گەورەی تیادایە. ئەم ڕێڕگە و ڕەوتە ئاواییانە لەگەڵ ئەوانەی ئەفریقیا بەراورد بکە. هەرچەندە ئەفریقیا لە جیهاندا دووەم کیشوەری مەزنە، بەڵام پشتێنەیەکی کورتتری کەناریی هەیە، زۆربەشیان بۆ ئەوە دەست نادەن بەندەری گرنگییان لێ دروست بکرێ چوونکە ئاوەکانیان قووڵاییان کەمە. زۆربەی ڕووبارەکانیشی گەورەن و بۆ دەریاوانی ناگونجێن چوونکە تیژڕۆ و نقومکاران و دەبنە هۆی سەرگێژبوون. خۆ ئەگەر گەرمیی ناوچەی گەرمەسێریشی بخەیتە بان کە یارمەتیدەری تێکدانی خۆراك و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکانە، ئەوا ئەو لێکدانەوە

جوگرافییە سەرنجڕاکێشەی دواکەوتنی ئەفریقیاب دەگەڕێتە دەست! بێگومان ئەمە تاکە هۆکار نییە، بەڵام لە گشت هۆکارەکانی دیکە گرنگترە.

ڕەنگە ئەم لێکدانەوانەی سەرەوە ئەو بۆچوونە دروست بکەن کە مێژوو هیچ توانایەکی نەبێت ڕەوتێکی دیکەی جیاواز بگرێتەبەر. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم هۆکارە بونیادییانە گوزارشتن لە توانای جۆاکێك بۆ وەدەستهێنان و ئەنجامدانی شتێك؛ واتا ئەو شتانەی کەوا شیمانەکان ئاماژەی بۆ دەکەن. هەندێك کات لەوانەیە شیمانە دروستەکان و سەرلیستەکان شکستبێنن. چوونکە گەرچی ئەورووپا جوگرافیایەکی هەمەڕەنگی هەیە، بەڵام جارێك لە لایەن ئیمپراتۆریای مەزنی ڕۆما داگیرکرا؛ ئەو ڕۆمایەی کەوا هەوڵی دا مەرکەزییەتی ئیمپراتۆرییەکەی خۆی تا ئەوپەڕی توانا و بۆ درێژترین ماوە بپارێزێ. هەروەها خۆرهەڵاتی نێوەڕاست لە یەکێك لە قۆناغەکانی مێژوویدا لەسایەی ئیمپراتۆریایەکی پەلوپۆهاوێشتوودا گەشەکردنی بەخۆیەوە بینی. هەروەها چینیش هەرچەندە سروشتێکی کراوە و دەشتاییانەی جوگرافی هەیە، هەروەها هیندیش چەندان قۆناغ بەشێوەیەکی پێشکەوتووانە و گەشەسەندوو بووە و هەڵکشانی بەخۆیەوە بینیوە. هەروەها ئیمتیازەکانی ئەورووپی لە سەرەتادا زۆر کەم بووە و بەزۆری تایبەت بووە بە چەك و تەکنیکەکانی جەنگ، بەڵام لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا چەند بەرابەر بووەتەوە و پشتی یەکتریان گرتووە، خۆرئاوا زیاتر و زیاتر پێشکەوتووە و بەپێش هەموان کەوتووە.

## دەستکەوت و تاڵانییەکان (غنائم)ی جەنگ

دۆزینەوەی ڕەوت و ڕێگەكانی نوێی دەریایی و شارستانییەتەكانی دەوڵەمەند و گەلانی سەیر و نامۆ، وزەی خۆرئاوای جوولاند و خەیاڵیشی وروژاند. چوونكە ئەورووپییەكان ڕوویان لە هەر شوێنێك كردبایە كاڵا و بازاڕ و دەرفەتیان دەدۆزییەوە. جا لەگەڵ هاتنی سەدەی حەڤدەیەمدا، گەلانی خۆرئاوایی هەژموونی خۆیان بەسەر گشت شوێن و كەلتوورەكانی دیكەدا سەپاند كەوا پەیوەندییان لەگەڵیاندا بەستبوو. هیچ شوێنێكی دونیا نەما پێی نەگەیشتبن، هەر لە زەوییەكانی بەرانبەر زەریای ئەتڵەسییەوە تا دەگاتە دوورترین شوێنی باشووری زەریای هێمن كە وەك ئامانجی هەرە گرنگی ئەورووپییەكان لەبەرچاو گیران. لە سەرەتادا، خۆرهەڵاتی دوور - چین و یابان- لەم هەژموونەی ئەورووپا دووربوون، بەڵام ئەوانیش لەگەڵ هاتنی نیوەی سەدەی نۆزدەیەمدا بوونە نێچیری فتوحاتەكانی خۆرئاوایی. جا لەگەڵ ڕابوونی خۆرئاوادا وردە وردە شارستانییەتیی جیهانی پێكدەهات؛ شارستانییەتێك كە لە لایەن چەند وڵاتێكی ئەورووپای خۆرئاوادا ڕەهەند و ڕوخسارەكانی شكڵگیر بوون و هەر ئەوانیش هەژموونیان بەسەریدا پەیداكرد.

سەرەتا ئەورووپییەكان جەختیان لەسەر دۆزینەوەی ئەو بەرهەمانە كردەوە كەوا لەوانەبوو خەڵكی وڵاتانی خۆیان پێویستیان پێی ببێت. بەڵام ئەم مەسەلەیە لە هەندێك كاندا بەشێوازی ئاڵاْنكردن و هەندێك كاتی دیكەش بە پشتبەستن بە ئامرازی بازرگانییەوە دەبێت. ئەوان خوری و فەرووی كیشوەری ئەمریكا و بەهارتی ئاسیا و زێڕ و ئەڵماسی بەرازیلیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردەوە. بەڵام ئەم پەیوەندییەیان زۆر بەخێرایی سۆزكێكی بەردەوامتری بەخۆیەوە گرت. گرنگیدانەكانیان بەپێی كەشوهەوایەكان دەگۆڕا، بۆنموونە لە ناوچەكانی مامنێوەندیدا - لە ئەمریكای باكوور و باشوورەوە- سەقامگیرییان هەڵبژارد و لە

شوێنەکانی دووردەستیشدا ئەو جڤاکانەیان پێکهێنا کەوا مۆرکێکی خۆرئاواییان هەیە. ئەمە ئەو شتەبوو کەوا بە جیهانی نوێ ناویان دەبرد. هەروەها لەو شوێنانەشدا کە بینیان هی ئەوە نییە مرۆڤی تیادا نیشتەجێ ببێت- بەزۆری ئەو شوێنانەی کەوا کەشوهەوایەکی خولگەییان هەیە وەك باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا و ئەفریقیا- لەپێناو بەرهەمهێنانی بەرووبوومی سوودبەخش بۆ بازارەکانی نێوخۆیی سیستمێکی کشتوکاڵییان پێکهێنا. هۆڵەندییەکان لەو شوێنەی کەوا بە هیندی خۆرهەڵاتی ناودەبرا East Endies کێڵگەی زۆر فراوانیان دروستکرد (ئەوکات ئەورووپییەکان ئەم ناوەیان بەسەر هەموو ئەو شوێنانەدا بڕیبوو کەوا دەکەونە خۆرهەڵاتی هیند) هەروەها پورتوگالییەکانیش لە بەرازیلدا. بەڵام زۆر بەخێرایی کێڵگەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی لە دەریای کاریبی دایپۆشتن کە بۆ کارکردن تیایاندا ئەفریقییەکانیان وەك کۆیلە بەکاردەهێنا.

لە میانی سەد ساڵ لە یەکەم پەیوەندیی ئەورووپیدا، پێشکەوتنێکی ڕوون و بەرچاو هاتەکایەوە کە هی ئەوە نەبوو بگەڕێتەوە دواوە: و ئەو پەیوەندییانە سیستمەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی نێو جڤاکەکانی نا خۆرئاواییان گۆڕی یانیش وێرانیان کرد. سیستمی کۆن یان داڕووخا یان وێرانکرا یانیش لە زۆربەی کاتەکاندا دووچاری هەردوو دۆخ دەبوونەوە. ئەم وەرچەرخانە بەسەر گشت وڵاتاندا هات جا قەبارەیان هەرجۆرێك بوو بێت، - لە بۆرمای بچووکەوە کەوا بونیادە تەقلیدییەکەی لەژێر حوکمی بریتانیدا داڕووخا- تا دەگاتە هۆزە گەورەکانی ئەفریقیا کە تیایدا ئەورووپییەکان سنووری نوێیان دیاری کردبوو و چەندان دابەشکارییان تیادا ئەنجام دابوو و دەستەهەڵاتیشیان دابوویە دەست ئەو کەسانەی کە خۆیان پەسەندیان کردبوون. گەرچی هەندێکجار لەگەڵ ئەم کاریگەرییە دەرەکییەدا دڕندەییش بەکاردەهات، بەڵام لە زۆربەی کاتەکاندا

جۆرێك لە نوێگەرایی دروستکردبوو. لە دۆخەکانی دیکەشدا کاریگەریی ئەورووپی کۆنەپەرستانە و دواکەوتووانە بوو، چوونکە دوای وێرانکردنی شێواز و نۆرمەکانی کۆن ڕێگەی دیکەی ئەلتەرناتیڤی دانەهێنابوو جێگەیان بگرێتەوە. بەهەرحاڵ، ئەمریکا و ئاسیا و ئەفریقیا بۆ هەتاهەتایە و بەشێوەیەك گۆڕان کە گەڕانەوە ئەستەم بوو؛ ئەمەیش بەهۆی دۆزینەوەی ئەورووپا بوو بۆ ئەم شوێنانە.

ئەرلانووی هێز ڕۆڵی خۆی لە دیاریکردنی ئاراستە و ڕووگەی فراوانبوونی ئەورووپادا بینی. چوونکە بەهۆی ئەوەی ماوەی چەندان سەدە ئەورووپییەکان لە ڕووی پێشکەوتنی سەربازییەوە نەیانتوانی بەسەر تورك و عەرەبەکاندا زاڵبن و لە دواوەی ئەوانەوە بوون- هەرچەندە سەرەوەربیان بەسەر زەریاکاندا هەبوو- هەر تەنیا بە دروستکردنی پەیوەندیی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی خۆرهەڵاتی نیوەڕاست و باکووری ئەفریقیا دەستیان هەڵگرت، بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەن کۆنترۆڵی بکەن، ئەمەیش تا سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم درێژەی کێشا. لە ئاسیاشدا ئەورووپییەکان کەمە ڕێگەیەکی سانای ئاوییان بەرەو کیشوەرەکە دۆزییەوە، ئەوجا لەوێدا نووسینگە و وێستگەی بازرگانییان دامەزراند و بەو پاشماوەیە ڕازی دەبوون کەوا چینییەکان دەستیان لێی هەڵگرتبوو. بەڵام لە باشووری بیابانی ئەفریقیا و کیشوەری ئەمریکادا، زۆر بەڕوونی لە دانیشتووانە لۆکاڵییەکە بەهێزتربوون و ئەمەیان دەزانی. فراوانبوون و پەلوپۆهاوێشتنی پورتوگالییانە لە سەرەتای سەدەی شانزەیەمدا لە کۆنگۆ و زیمبابۆیدا دەستپێکرد، بەڵام کەشوهەوای ئەوێ بۆ سەقامگیربوون لەبار نەبوو بۆیێ چوونە نیوە گۆی خۆرئاوا.

ئەمریکاش بەڕێکەوت ڕۆڵی لە گەیشتنی ئەورووپییەکاندا هەبوو بۆ ئەوێ- کۆلۆمبۆس بەدوای ڕۆژینگەیەك (ممر) دەگەڕا بۆ ئەوەی بگاتە هیندی خۆرهەڵات

East Endies، بەلام ئەگەرەیەکی گەورەی لەبەردەم خۆیدا بینیەوە و دۆزینەوەکە دڵخۆشکەرانە بوو. ئەمریکا بۆ ماوەی چوار سەدە بووە دەرگە و کەلێنی هەلاتنی ئەوروپییەکان. ئەوروپییەکانیش بە چەند هۆیەکی جۆراوجۆری وەك زیادبوونی دانیشتووان و هەژاری و چەوسانەوەی ئاینی لە نیشتماندا یانیش حەزکردن بە سەرکێشی، بەرەو ناوچەکانی دیکەی جیهان کۆچیان دەکرد. کاتێکیش گەیشتنە ئەو شوێنانە، لە هەندێك لایەندا شارستانیی ئالۆزیان بینی، بەلام لە رووی سەربازییەوە زۆر سەرەتایی بوون، چوونکە دەستە و گرووپی بچووك – کۆرتیس، بیزارۆ- دەیانتوانی شکست بە سوپای نێوەخۆیی ئەو ولاتانە بێنن کە زۆر لە خۆیان گەورەتر بوون. ئەم مەسەلەیە و ئەو نەخۆشییە ئەوروپییانەی کەوا دانیشتووانەکانی نێوخۆیی نەیاندەتوانی بەرگەی بگرن، بوونە هۆی وێرانکردنێکی بەرفراوانی زۆرێك لە تیرە و هۆز و کەلتوورەکان.

ئیستعمار لە زۆربەی دۆخەکاندا بەهۆی ولاتانەوە رووی نەدا، بەلکو بەهۆی چەند کۆمپانیایەکی دیاریکراوی وەك هەردوو کۆمپانیای هیندی خۆرهەلاتی بریتانی و هۆلەندی (دوو کۆمپانیای قۆرغکار و رێگەپێدراو بوون و لەپێناو کۆتایی هێنان بە کێبرکێی نێوان پیاوانی هەردوو ولات دامەزران) هەروەها کۆمپانیایەکی دیکەی فەرەنسیی هاوشێوەیان کە ئەویش کۆمپانیای Compagne des Indes بوو، کە کۆمپانیایەکی حکومی بوو و بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەڕێوە دەبرا. لە سەرەتادا ئەو کۆمپانیا بازرگانییانە گرنگییان بە زەوی نەدەدا، بەلکو تاکە مەبەستیان قازانج بوو، بەلام کاتێك وەبەرهێنانیان لەو ناوچانەدا کرد، ئەوا ویستێکی زۆریان بۆ سەقامگیری و کۆنترۆلکردن هەبوو. جا لەو کاتیدا، هێزەکانی ئەوروپی دەیانەویست ولاتانی کێبڕکێکار دووربخەنەوە. بەمشێوەیە زەوتکردنی

زەوییەکان و دروستکردنی ئیمپراتۆرییەکان بەشێوەیەکی فەرمی دەستیپێکرد و ئیمپراتۆریای بریتانی لە هەموویان گەورەتر بوو.

لەگەڵ پەیدابوونی ئیمپراتۆرییەکان بەشێوەیەکی فەرمی، بەرتەماییە گەورەکان سەریانهەڵدا. چوونکە خۆرئاواییەکان تەمای شتێکیان هەبوو کە زۆر لە پارە و دارایی گەورەتر بوو، ئەوان بەرتەمایی دەستهەڵات و هەژموون و کەلتووریان هەبوو. بەمەیش – بێگومان بە ڕوانگە و بۆچوونی تۆ– یان بوونە ئایدۆلۆژیست یانیش کەسانی ئایدیالی. لەگەڵ خۆیشیاندا دەستگە و دابونەریت و هزری ئەوروپایان هێنایە نێو جڤاکەکانی ئیستعمارکراو، بۆنموونە: بریتانییەکان سیستمی دادوەریی بریتانییان هێنایە هیندستان، بەڵام دادوەری هیندی نەیدەتوانی سپیپێستەکان دادگەیی بکات. لەگەڵ گوزەرکردنی کاتیشدا، کاریگەریی ئەوروپییەکان لە موستەعمەراتەکاندا زۆر گەورە بوو، دواتریش پەرییەوە پشت ئەو موستەعمەراتانەش. لەمبارەیەوە نیال فێرگسۆن دەڵێ کە ئیمپراتۆریەتی بریتانی بەرپرسە لە بڵاوبوونەوە جیهانییەکەی زمانی ئینگلیزی و سیستمی بانکی و یاسای گشتی و پرۆتستانتی و حکوومەتی کۆتوبەندکراو و حکوومەتی نوێنەرایەتی و ئازادی. ڕەنگە ئەم نێزە دووڕوویی و فێرسیی (نفاق) و بڕندایەتی کۆنترۆڵ و دەستهەڵاتی ئیستعماری پشتگوێ خستبێ کە خۆی لە تاڵانکردنی ئابووری، لەسێدارەدانی بەکۆمەڵ، بەندکردن و ئەشکەنجەداندا دەبینییەوە. هەندێکیش – وەك هۆڵەندییەکان و فەرەنسییەکان– ڕەنگە دژی سەرچاوە ئینگلیزییەکەی ئەو هزرانە بوەستنەوە. بەڵام هەرچۆنێك بێت، گومانی تیادا نییە کە پەیدابوونی ئەو ئیمپراتۆرییانە بوونە هۆی بڵاوبوونەوەی هزر و خوو و نەریتەکانی ئەورووپی لە گشت شوێنەکانی سەر گۆی زەوی.

ئەنانــەت لــە خۆرهــەلاتی دووریشــدا کــە خۆرئــاوا هــیچ جــۆرە هــەژموون و دەستبەســەرداگرتنێکی فــەرمیی بەســەر زەوییەکانیــدا نــەبوو؛ بــەلام کاریگــەریی ئەوروپی زۆر مەزن بوو. کاتێك کۆشك و سەرای ئیمپراتۆریی خانــەوادەی بێهێــزی کینگ لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمدا ویستی بازرگانیکردن بە مادەی ئــەفیون قەدەغە بکات، بریتانیا – کە گەنجینەکەی لەسەر داهات و قازانجی بازرگانیکردن بە ئەفیون ڕاهاتبوو– هێرشێکی کردە سەر وڵاتی چین کە بــووە ســەرەتای ئــەو جەنگانەی کەوا بە جەنگەکانی ئەفیون ناودەبران و بۆشایی و کەلێنە گەورەکــەی نێوان هەردوو وڵاتی دەرخست. لە کۆتاییشدا، پەکین لە ســاڵی ١٨٤٢دا ناچــارکرا بە چەندان سازشکاری ڕازیبێت و دەست بە بازرگــانیکردن بــە ئــەفیون بکانــەوە؛ دەســتبەرداری هــۆنگ کــۆنگ بــوو و پێــنج بەنــدەری بــۆ کەســە بریتانییــە نیشتەجێیەکان کردەوە، گشت بریتانییەکیشــی لــە یاســایەکانی چــین وەدەرنــا و قەرەبوویەکی یەکجار زۆریشی دا. لە ســاڵی ١٨٥٣دا کەشــتییەکانی خۆرئــاوایی– ئــەمجارە ئــەمریکی– هاتنــە نێــو ئاوەکــانی یابــان و کۆتاییــان بــەو سیاســەتە گۆشــەگیرییە هێنــا کــەوا یابــان لــەو کاتــدا گرتبوویــە بــەر. دوای ئەمــە، یابان زنجیرەیەك ڕێکەوتنامــەی بازرگــانی واژۆکــرد کــەوا ئیمتیــازی تایبــەتی بەخشــییە وڵاتانی خۆرئاوایی و هاووڵاتییەکانیی. لــە هــەمان کاتیشــدا، ئیمپراتۆرییــەکان لــە گەشەکردن بەردەوام بوون؛ چوونکە پەلوپۆیان هاوێشت و گەیشتنە زەوییــەکانی ئیمپراتۆریــەتی نەخۆشــی عوســمــانی و ئــەفریقیاش. ئــەم کــردەی هەژموونــە لــە ســەرەتای ســەدەی بیســتەمدا گەیشــتە ترۆپکــی خــۆی و چــەند پێتــەختێکی خۆرئاوایی کۆنترۆڵی ٨٥٪ ی زەوییەکانی جیهانیان کرد.

## بەخۆرئاواییکردن Westernization

له ساڵی ۱۸۲۳دا، کۆمپانیای بریتانی بۆ خۆرهەڵاتی هیند، بڕیاری دروستکردنی خوێندنگەی دا له کالکوتا، ئامانجیش له کردنەوەی ئەم خوێندنگەیەدا ڕاهێنانی دانیشتوانانی لۆکاڵی بوو. لەگەڵ ئەوەی ئەم هەنگاوە تا ئەوپەڕی بە دڵنیایانە و شەریفانە دەهاتە بەرچاو، بەڵام هاوڵاتییەکی بەرجەستەی هیندی- کەلکوتایی بەناوی "ڕجا ڕام موهان ڕوی" هان دا بۆ ئەوەی نامەیەکی ئاگرین بۆ ویلیام بیتی سەرۆکوەزیرانی بریتانیا بنووسێت. ئەم نامەیە شایانی ئەوەیە چەند پەرەگرافێکی دووروودرێژی لێ بهێنینەوە و بیخەینە بەرچاوتان:

کاتێك ئەم فێرگەیەی فێرکردن پێشنیاز کرا.... چەندان خەونی پەمەیی نوقمی کردین کە ئەم ڕێژە پارەیە بۆ بەکارهێنانی چەند پیاوێکی بەڕێزی بەهرەدار و ڕۆشنبیری ئەورووپی بەکاربهێندرێت بۆ ئەوەی خەڵکی نێوەخۆی هیند فێری بیرکاری و فەلسەفە و سروشتناسی و کیمیا و زانستی توێکاری و چەندان زانستی دیکەی بەسوود بکرێ کەوا لەسەر دەستی گەلانی ئەورووپادا گەیشتووەتە پلەی تەواوەتی، پێگەی ئەو گەلانەی لە گشت گەلانی دیکەی جیهان بەرزتر کردووەتەوە.

ئێمە تازە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە حکوومەت بەسەرپەرشتیی دانایانی هیندۆسی خوێندنگەیەکی سانسکرێتی دادەمەزرێنی کە لە پێناو گەیاندنی ئەو زانیارییانەیە کە پێشتر لە هیندستاندا بڵاو بوونەتەوە و پێویستنیان بە مامۆستا و خوێندنگە نییە. دەتوانین تەنیا پێشبینیی ئەوە لەو خوێندنگەیە بکەین وردەکاریی قەواعیدی و تایبەتمەندیی کەمبەهای میتافیزیکی یان بێبەهای ئەوتۆ بئاخنێتە مێشکی گەنجان کە نە بۆ خاوەنەکانیان و نە بۆ جڤاکیش سوودێکی نییە.

زمانی سانسکریتی- هێندە دژوار و زەحمەتە بەشێوەیەك تەواو فێربوونی پێویستی بە تەواوی ژیانی تاکەکەسەکان هەیە- زۆر بەوە ناسراوە کەوا بەدرێژایی سەردەمەکان لەبەردەم بلاوبوونەوەی زانست و زانیاری و مەعریفەدا تەگەرەیەکی زۆر مەترسیدار بووە.... ناتواندرێ چاکبوونەوەیەکی گەورە لەو مەزەندانە بەرهەم بێن: ئەو بابەتانە چین کەوا فیدلنتا (فەلسەفەی سەرەکیی میندزسی پێشنیازی کردووە)؟..... رێگەم بدە بلێم لەگەڵ رێزی شایستە بۆ پێگە بەرزەکەی جەنابتان، ئەگەر کار بەم پلانە بکرێ کەوا ئێستە گیرلوەتەبەر، ئەوا بەتەواوی ئامانجە رەچاوکراو و پێشنیازکراوەکە لەنێو دەبات.

هەرچەندە گوێم لەو بۆچوون و بەڵگەیە دەبێت کە دەڵێ بەخۆرئاواییکردن تەنیا بەهۆی هێز و چەکەوە سەپێندرلوە، ئەم نامەیە و سەدان نامە و یادداشتی هاوشێوەی ئەم نامەیەم بیردێتەوە. راستە کە بلاوکردنەوەی هزرەکانی خۆرئاوایی لە زۆربەی کاتەکاندا بە زۆرەملێ هاتووەتەکایەوە، بەلام زۆرێك لە کەسانی پەروشی نا خۆرئاواییش هەبوون کە عەوداڵی فێربوونی نۆرمی خۆرئاوایی بوون. هۆی پشت ئەمە سانا و روونە: ئەوان دەیانویست سەرکەوتن وەدەستبێنن، خەڵکیش بەردەوام حەز بەوە دەکەن لاسایی کەسانی سەرکەوتوو بکەنەوە.

کارامەیی و لێهاتوویی خۆرئاوا لە کەڵەکەکردنی سامان و هەڵگیرساندن و بەڕێوەبردنی جەنگەکاندا لەگەڵ هاتنی سەدەی هەڤدەیەم بۆ هاوسێیەکانی زۆر بەهێز و بەرچاو بوو. یەکێك لەو کەسانە بوتروسی رووسیای مەزن بوو کە چەندان مانگ لە ئەورووپادا گەڕا و بە پیشەسازی و سوپایەکەی سەرسام بوو. کاتێکیش گەڕایەوە ولاتەکەی، بەخێرایی زنجیرەیەك رێکاری ریشەیی ریفۆرمییانەی دەرکرد: نوێکردنەوەی سوپا بە نۆرمی ئەورووپی، هەروەها نوێکردنەوەی

سیستمی کارگێڕی و گواستنەوەی پایتەخت لە مۆسکۆی ئاسیاییەوە بۆ شارێکی نۆرم ئەورووپی لەسەر لێواری خۆرئاوای ئیمپراتۆریەتی ڕووسی کە ناوی لێنا سانت پترسبۆرگ. هەروەها ڕیفۆرمی لە یاسا و سیستمی باجیشدا کرد و تەنانەت هەوڵی دا گاڵتە بە کڵێسای ئورسوذۆکسیش بکات، ئەمەیش بۆ ئەوە بوو زیاتر بیکاتە خۆرئاوایی. هەروەها داوای لە پیاوان کرد ڕیشیان بتاشن و پۆشاکی هاوشێوەی ئەورووپییەکان بپۆشن. جا ئەگەر یەکێك لەسەر پاراستنی مۆدەی کۆن سووربووایە، ئەوا ناچار دەبوو باجی ڕیش بدات کە ساڵانە سەد ڕۆبل بوو.

دوای بوترووسی مەزن، لیستێکی دووردرێژ و تایبەتمەندی ئەو کەسە ناخۆرئاواییانە هەبوو کەوا ویستیان هزرەکانی خۆرئاوا بهێننە وڵاتەکەیان. هەندێکیشیان وەك بوتروس ڕادیکاڵی بوون. لەوانەیە لە هەموویان بەناوبانگتر کەمال ئەتاتورك بێت، کەوا لە ساڵی ۱۹۲۲دا دەستهەڵاتی لە دەوڵەتی داڕووخاوی عوسمانی وەرگرت و ڕایگەیاند کە لەسەر تورکیا پێویستە دەستبەرداری ڕابردووی خۆی ببێت و لەپێناو گەیشتن بە کاروانی خۆرئاوا، کەلتوور و ڕۆشنبیریی ئەورووپی بگرێتە بەر. ئەتاتورك کۆمارێکی عەلمانی بونیادنا و نووسینی بە پیتی تورکی ڕەتکردەوە و بڕیاری دا نووسین بە پیتەکانی ڕۆمانی بێت، هەروەها پەچە و باڵاپۆش و تەربووشی قەدەغەکرد، گشت بنەمایەکانی ئاینیی خەلافەتی عوسمانی لابرد. پێش ئەمەیش، لە یابان و لە ساڵی ۱۸۸٥دا یوکچی فوکۆزاوای مەزن- تیۆردانەری ڕیفۆرمی ئیمپراتۆریەتی میجی- وتارێکی بەنێوبانگی بەناونیشانی دەستبەردان لە ئاسیا نووسی، لە وتارەکەیدا ئاوتۆیی ئەوەی کردبوو کە زۆر پێویستە یابان پشت لە ئاسیا بکات، بەتایبەتیش لە چین و کۆریا، هەروەها لە وڵاتە شارستانییەکانی خۆرئاوادا بەدوای بەخت و چارەنووسی خۆیدا بگەڕێت. زۆرێك لە ڕیفۆرمخوازی چینی هەن کەوا تیژی

هاوشێوەیان پێشکەش کردووە، وەك صن یات سێن، کەوا زۆر بەڕاشکاوی دانی بە پێگە سەرکەوتووەکەی ئەوروپا و زەروورەتی لاسایکردنەوەی داناوە ئەگەر وڵاتی چین بیەوێ پێشبکەوێ.

هەروەها جواهیر لال نەهرۆ- یەکەم سەرۆکوەزیرانی هیندی سەربەخۆ- باوەڕی وەهابوو کە لەوانەیە کۆتایی هێنان بە دواکەوتوویی وڵاتەکەی پێویستی بە لاسایکردنەوەی لایەنی سیاسی و ئابووریی خۆرئاوە بێت. نەهرۆ لە قوتابخانەی هارۆ و زانکۆی کامبرج خوێندبووی، ئەمەیش وەهای لێکردبوو هەڵوێستێکی لیبراڵییانەی خۆرئاوایی هەبێت، تەنانەت جارێکیان بە نهێنیی وەها خۆی وەسفکردبوو کە " دوا کەسی ئینگلیزە حوکمی هیند بکات". لە ڕاستیدا کەسانی هاوسەردەمی نەهرۆ لە گشت شوێنە جیاوازەکانی جیهاندا بەهەمانشێوەی نەهرۆ هزری خۆرئاوایییان وەرگرتبوو. دوای قۆناغی ئیستعماریش، خودی ڕێبەران و سەرکردەکانی شۆڕش هەوڵیان دا لە رووی سیاسییەوە خۆیان لە خۆرئاوا ڕزگاریکەن، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا ویستیان هەمان ڕێگەی خۆرئاوا بگرنەبەر بەرەو نوێگەرایی. تەنانەت جەمال عەبەدولناسری دوژمنە سەرسەختەکەی خۆرئاوا، قاتی مۆدێل سەیری لەبەردەکرد و زۆر بەپەرۆشییەوە مێژووی ئەوروپیی دەخوێندەوە. بەردەوامیش هزرە سیاسییەکانی خۆی لە زانایان و نووسەرانی بریتانی و فەڕەنسی و ئەمریکی وەردەگرت. فیلمە هەرە خۆشەکەش بەلای ناوبراو "ئەمە ژیانێکی مەزن و خۆشە" ی فرانك کابرابوو.

کە هەندێکجار ئەو سەرکردانە و رەتارە ئاگرینەکانیانمان بیردێتەوە کەوا دژی خۆرئاوا و ئاراستەکانی مارکسییە، ئەو باوەڕەمان لەلا دروست دەبێت کە رقیان لە خۆرئاوایە، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر بەسادەیی پێڕەویی کەلتووره ڕادیکاڵەکەی

خۆرئاوایان دەکرد. چوونکە مارکس و ئەنگلس و ڕۆزا لۆکسمبۆرگ و لینین هەر هەموویان بیرمەندانی خۆرئاوایین. تەنانەت لە ئێستەشدا کاتێك خەڵك لە ئاسیا و ئەفریقیا ڕەخنە لە خۆرئاوا دەگرن، بەزۆری ئەو بەڵگانە بەکاردێنن کەوا یان لە لەندەن یانیش لە پاریس و نیویۆرکدا بەدیارکەوتوون، بۆ نموونە: ڕەخنەکەی ئوسامە بن لادن لەو شریتە ڤیدیۆییەی کەوا لە ساڵی ٢٠٠٧دا دەرچوو، چەند ئاماژەیەکی تیادا بوو کە لە ئەسڵدا هی نوام چۆمسکی بوو، هەروەها نەبوونی یەکسانی و قەیرانی بارمتەی خانووبەرە و گەرمبوونی پلەی گەرمی زەوی وەك نووسینی ئەکادیمییەکی چەپڕەوی نێو بیرکلی بوو. لە ڕۆمانی (گەنجان)ی جۆزیف کۆنراد، ڕۆماننووس باس لە یەکەمین بەیەکگەیشتنی خۆی و خۆرهەڵات دەکات:" ئەوسا، پێش ئەوەی بتوانم لێوەکانم بکەمەوە، دەنگێك بە توندوتیژییەوە جنێوی دەدا و نەفرەتی دادەباراند: ڕێژنە وشەیەکی ناشرینی باراندە سەر گۆشە هێمنەکەی کەندلوەکە. بە ئاژەڵ و ڕەشەولاغ ناوزەدمی کرد، تا دەگاتە ناولێنانم بە چەند سیفەتێك کەوا لە زمانی ئینگلیزیدا ناتواندرێ باس بکرێ.

سەرکردەکانی تا خۆرئاوایی زۆر بە خۆرئاوا سەرسامبوون، بەتایبەتیش لە سەرکەوتن و پێشکەوتنی لە بەرهەمهێنانی سامان و زاڵبوون لە جەنگەکاندا. دوای شکستهێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر دەستی هێزەکانی ئەورووپا لە ڤیەننا و لە ساڵی ١٦٨٢دا، ئەم ئیمپراتۆریەتە بڕیاری دا شێواز و ڕێگەی دوژمنانی فێربێت. لە سەرەتادا چەکی لە ئەورووپا کڕی، بەڵام دواتر درکی بەوە کرد کە پێویستی بە شتێکی دیکەی زیاتر هەیە و پێویستییەکەی هەر تەنیا ئامێرەکان نییە، بۆیە کارامەییەکانی ڕێکخستن و تەکنیکی جۆراوجۆر و شێوازەکانی هزر و ڕەفتاری هاوردەکرد. جا لەگەڵ هاتنی سەدەی نۆزدەیەمدا،

سەرکردەکانی خۆرهەلاتی نێوەڕاست سوپایەکانیان کردە سوپای مۆدێل خۆرئاوایی کە لە سریە و کنائیب و کۆلونیل و جەنەڕاڵەکان پێکهاتبوو. نەک هەر تەنیا لە خۆرهەلاتی نێوەڕاست بەتەنیا، لە ڕاستیدا لە گشت جیهاندا، سوپایەکان یەک شێوازی خۆرئاواییان گرتەبەر. لە ئێستەشدا گشت هێزەکانی چەکدار لە تەولوی ولاتاندا- جا ئەگەر لە چین بێت یان ئەندۆنیسیا و نەیجیریا- بەپێی نموونەی خۆرئاوایی سەدەی نۆزدەیەم ڕێکدەخرێن.

ڕوی فۆکۆزاوا و ئەهرۆ و کەسانی دیکە بەلگەیەکی سەلمێنەری پێشکەوتن و سەرکەوتنی کەلتوور و ڕۆشنبیریی خۆرئاواییان پیشان نەدەدا. چوونکە ڕوی لە نامەیەکدا چەندان جار زانستی هیندی سەردەمی خۆی و زانستی ئەورووپیی پێش فرانسیس بیکۆنی بەراورد دەکرد. ئەوەی لە مەسەلەکەدا گرنگە مێژووە نەک بۆماوە. صن یات سینیش شارەزایییەکی باشی لەسەر شکۆیە ڕابردووەکانی چین و دەوڵەمەندیی میراتە مەعریفییەکەیدا هەبوو. فۆکۆ زاواش زانای مێژووی بابانی بوو. ئەهرۆش چەندان ساڵ تەمەنی خۆی لە بەندیخانەی بریتانیدا بەسەربرد و چەندان چیرۆکی مێژوویی نیشتمانی نووسی کەوا لێوانلێو بوو لە سۆزی هەمبەر هیند. ئەوان باوەڕیان بە شکۆ و ئەمرییەکانی کەلتوور و ڕۆشنبیریی گەلەکەی خۆیان هەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان وەهابوو کە ئەگەر بیانەوێ لەو قۆناغە مێژووییەدا لە ڕووی سیاسی و ئابووری و سەربازییەوە سەرکەوتن وەدەستبێنن، ئەوا لەسەریان پێویستە شوێنپێی خۆرئاوا هەلگرن.

## نوێگەرایی

ئەو پرسەی کەوا ڕیفۆرمخوازانی ناخۆرئاوایی لە سەدەی بیستدا لەپێناویدا خەباتیان دەکرد، دیسانەوە لە ئێستەدا وەک پرسێکی گەوهەریی نایبەت بە

ئایندە خۆی زەق دەکاتەوە: ئایا دەکرێ نوێخواز و هاوچەرخ بیت بەبێ ئەوەی خۆرئاوایی بیت؟ ئەدی جیاوازیی نێوان ئەو دووانە چییە؟ ئایا ژیانی نێودەوڵەتی بە ئاستێکی زۆر گەورە جیاواز دەبێت لەو جیهانەی کەوا هێزەکانی ناخۆرئاوایی فورسایییەکی گەورەیان تیادا هەیە؟ ئایا ئەم هێزە نوێیانە بەهای نوێیان هەیە؟ یان ئاخۆ کردەی گۆڕان بەرەو دەوڵەمەندبوون وەهامان لێ دەکات هەموومان وێکچوو بین؟ ئەمانە هزری بێهودە و بێبنەما نین. لە ماوەی چەند دەیەیەکی داهاتوودا، سێ ئابووریی لە کۆی چوار ئابووریی گەورەی جیهانی، ناخۆرئاوایی دەبن (یابان و چین و هیند)، چوارەمیش کە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە، بەشێوەیەکی زۆر بەو دانیشتووانە ناخۆرئاواییانەی خۆی کاریگەر دەبێت کەوا دەستیان بە گەشەکردن کردووە.

هەندێک لە بیرمەندانی هاوچەرخ و بەرجەستەترینیشیان سامۆیل هانتنگتۆن پێی وایە کە نوێگەرایی و بەخۆرئاواییکردن دوو کردەی تەواو جیاوازن. بەپێی بۆچوونی هانتنگتۆن خۆرئاوا پێش ئەوەی هاوچەرخ و نوێ بێت، خۆرئاوایی بووە. خۆرئاوا کەسییەتیە تایبەتمەندەکەی خۆی لە دەوروبەری سەدەی هەشتەم یان نۆیەم وەدەستهێناوە، بەڵام نەبووە شتێکی نوێ و نوێگەرا تا سەدەی هەژدەیەم داهات. کاتێک دەڵێین جڤاکێک نوێگەرا و مۆدێرنە، ئەوا پەیوەندیی بە پیشەسازی و مەدەنییەت و بەرزبوونەوەی ئاستی فێرکردن و پزشنبیری و سامانەوە هەیە. لە بەرانبەریشدا، ئەو سیفەتانەی کەوا دەکات جڤاکێک خۆرئاوایی بێت، چەند سیفەتێکی تایبەتن: کەلتوور و میراتێکی کلاسیکی و مەسیحی و جیاکردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت و دەستەهەڵاتداربوونی یاسا و کۆمەڵگەی مەدەنی. هانتنگتۆن دەڵێ: "شارستانییەتیی خۆرئاوایی بەهادارە، نەک لەبەر ئەوەی جیهانییە، بەڵکو لەبەرئەوەی بێهاوتایە".

جگە لەمانەیش دۆخی هزریی زۆر نامۆ بۆ ئەو شوێنانەی کەوا خۆرئاوایی نین؛ لە ڕاستیدا تەواو جیاواز دێنە بەرچاو. یابان بۆ ئەم خاڵە ڕوونترین نموونە پێشکەش دەکات. یابان بەپلەیەکی زۆر بەرز وڵاتێکی نوێخواز و مۆدێرن و هاوچەرخە، لە ڕووی تەکنۆلۆژیشەوە – بە بەرهەمهێنانی شەمەندەفەری خێرا و مۆبایل و ڕۆبۆتەوە– لە زۆربەی وڵاتانی خۆرئاوایی پێشکەوتووترە. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا بۆ بیانییەکان و بەتایبەتیش سەردانیکارانی خۆرئاوایی، هەر بە نامۆیی و جیاواز دەمێنێتەوە. جا ئەگەر سامان نەیتوانی یابان بەخۆرئاوایی بکات– واتا بیکاتە خۆرئاوایی– ئەوا ناشتوانێ ئەوانی دیکەش بەخۆرئاوایی بکات.

بەدواییانە کیشوەر مەحبوبانی کە ڕۆشنبیر و دیپلۆماسییەکی زۆر بەئەخلاقی سەنگافوورییە، پێشبینیی ئەوەی کردووە کە هێزەکانی ناخۆرئاوایی لە سیستمی گەشەسەندووی جیهانیدا شێواز و نۆرمە تایبەتمەندەکانی خۆیان دەپارێزن، جا ئەگەر دەوڵەمەندتریش ببن. لە وتارێکی خۆیدا کە لە ساڵی ۲۰۰٦دا خوێندییەوە، گوتی: ژمارەی ئەو ئافرەتانەی کەوا ساری لەبەردەکەن (پۆشاکێکی تەقلیدیی هیندییە) لە هیند زیاتر دەبێت. بەڵام، لەو کاتەی مەحبوبانی گەشەکردن و بەرزبوونەوەی حەزی ئافرەتانی بۆ لەبەرکردنی ساری ڕاگەیاند، ڕۆژنامەکانی هیندی باسیان لە دیاردەیەکی تەولو پێچەوانە دەکرد. ڕۆژنامەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئافرەتانی هیندی، لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا، لەبەرانبەر پۆشاکی کرداریتر– کە مادەی جیاواز و شێوازی دوورین و مۆدێلی جیاوازیان هەیە– وازیان لە لەبەرکردن و دروستکردن و دوورینی ساری هێناوە، ئەم مەسەلەیەش واتا پۆشینی ساری، تەنانەت لەنێو جەرگەی کار و ئەو وەبەرهێنانە مەزنەی کەوا لە هیندا بەڕێوە دەچێت، هەر لە نزمبوونەوەیەکی بەردەوامدایە. (بۆچی؟ با ئافرەتێکی فەرمانبەری هیندی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە و ئەوەت بۆ ڕاڤە

بکات کە ئاخۆ خۆ پێچانەوە بە شەش تا نۆ یاردە قوماش کە زۆرجار توند و ڕەقیشە و دواتریش نووشتاندنەوە و لوولدانی بە وردی، شتێکی چارسەکارە یان نا). لە ڕاستیدا، لە ئێستەدا ئافرەتانی هیندی پەنا دەبەنە بەر جۆرێک پۆشاکی تێکەڵ کەوا نۆرم و مۆدێلی نێوخۆیی و جیهانی لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، بۆنموونە: پۆشاکی salwar Kurtaی هیندی (پۆشاکێکی فشوفۆڵە و لە شەرواڵێك پێکهاتووە کەوا بەپارچەی سەرەوە گەیەندراوە) لەمرۆژگارەدا زۆر لەبەر دەکرێت. لە کاتێکدا ساری بووەتە پۆشاکێکی تایبەت بە بۆنە و ئاهەنگەکان، وەك پۆشاکی کیمۆنۆی یابانی.

واپێدەچێ قسەکردنمان لەسەر پۆشاك ڕووکەشانە بێت، بەلام لە واقیعدا وەها نییە. چوونکە پۆشاکی ئافرەت سیگەنلێکی بەهێزە بۆ گونجانی جڤاکێك لەگەل نوێگەراییدا. بێگومان گرفتەکە لە پۆشاکدا نییە، بەلام ئەمە هاوکاتە لەگەڵ هەڵوێستێکدا کەوا جیهانی هاوچەرخ بە ڕێگەی دیکە ڕەتی دەکاتەوە.

سەبارەت بە پیاوانیش، ئەوا پۆشاکی خۆرئاوایی لە گشت شوێنێکی ئەم جیهانەدا بڵاو بووەتەوە. چوونکە هەر لەو کاتەوەی سوپایەکان پۆشاکی مۆدێل خۆرئاواییان پۆشیوە، پیاوانی جیهانیش پۆشاکی خۆرئاواییانەی کاریان لەبەر کردووە. دەستەی کاریش کە لە پۆشاکی ئەفسەری سوپای ئەورووپاوە سەرچاوەی گرتووە، هەر لە یابانەوە بگرە تادەگاتە ئەفریقیا و پیرۆ بووەتە یەك جۆرە پۆشاك - هەرچەندە لە ڕووی کەلتووری و ڕۆشنبیرییەوە لە یەکتری جیاوازن- ئەوا لە بۆنەی تایبەتدا (وەك سوێندخواردنێك پێش وەرگرتنی پۆستێکی وەزاری) چاکەتی بەیانیان و شەرواڵی خەتخەت یان هەر پۆشاکێك لەبەر دەکەن کەوا دیبلۆماسییەکانی بریتانی لە سەردەمی شا ئیدواردی حەوتەم پێش سەد ساڵ لەمەوپەر لەبەریان دەکرد. لە هیندیشدا لەبەر وابەستەبوون بە

پەیوەستەیی نیشتمانی، پۆشاکی تەقلیدی لەبەردەکرێ- گاندی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە پۆشاکی نیشتمانی بپۆشرێت، وەك گوزارشتێك لە بەرەنگاربوونەوەی فەرمانەی (رسومات) گومرگی و ڕستوا و چەندراوەکانی بریتانی- بەلام دەستە و تاقمی کاری خۆرئاوایی لە ئێستەدا پۆشاکی نموونەیی پیاوانی کاری هیندی و تەنانەت زۆرێك لە فەرمانبەرانی حکوومییە، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ بەشێکی نوێی قۆناغی دوای ئیستعمار لە هیندستاندا*. لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا زۆرێك لە پیاوانی کار لە پیشەسازییەکانی نوێدا بەتەواوی دەستبەرداری پۆشاکی فەرمی بوون و لە جیاتیدا پۆشاکێکی ئاسایی لەبەر دەکەن کەوا لە پانتۆلێکی جینز و کراسی نیوقۆڵ پێکهاتووە. تەنانەت ئەمەیش لە هەندێك ولآتانی دیکەدا بووەتە شتێکی باو، بەتایبەت لەنێو ڕیزی ئەو گەنجانەی کەوا لە پیشەسازییەکانی تەکنۆلۆژیدا کاردەکەن. بەکورتی، شێواز و مۆدیلی پۆشاکی کاری خۆرئاواییانە بووەتە شێوازێکی نموونەیی پیاوانی سەرانسەری دونیا، ئەمەیش وەك ئاماژەیەکە بۆ نوێگەرایی و هاوچەرخبوون.

## مردنی سیستمی کۆن

بەخۆرئاواییکردن westernization هەر تەنیا دیمەنی دەرەوە نییە، بۆ نموونە: بەڕێوەبەرانی جێبەجێکار لە گشت شوێنەکانی جیهاندا بەهۆی چەند ئۆرمێکی توندوتیژانەی پێوەری بازرگانییانە کۆمپانیایەکانی خۆیان بەڕێوەدەبەن. کۆی ئەم شێوازانەش- لە سیستمی ژمێریاری تا دەگاتە بەشداربوونی پشکەکان لە قازانج- بنەمایەکی خۆرئاواییانەی هەیە. ئەمەیش

---

*) سەد لەسەد وەها نییە، چوونکە هەرچەندە پیاوانی هیندیی سەرکەوتوو لە بواری سیاسەت و کاردا، لە ئێستەدا پۆشاکی خۆرئاوایی لەبەر دەکەن، ئەوا ژمارەیەکی زۆر کەمتری ئافرەتانی بەرچەستەی هیندی هەمان شت دەکەن.

هەر تەنیا لەنێو بازرگانیدا ناگوزەرێ. چوونکە لە میانی هەردوو سەدەی رابردوو و هەردوو دەیەی رابردوو بەتایبەت، دەستگەکانی حکوومی لە گشت شوێنێکدا لە نێسته لە هەر کاتێکی دیکە زیاتر بەیەك دەچن؛ وەك پارلەمانەکان و دەستە و دامەزراوەکانی رێکخستن regulatory agencys (چەند دەستە و دامەزراوەیەکی سەربەخۆن و چاودێریی پیادەکردنی یاسا و بانکەکانی مەرکەزی دەکەن). دوو شرۆڤەکار توێژینەوەیەکیان ئەنجام دا کەوا چەندان وڵاتی ئەورووپی و ئەمریکای لاتینی گرتەوە و لە کۆتاییەکەیدا ئەوەیان بۆ روونبوویەوە کە ژمارەی دەستە و دامەزراوەکانی رێکخستن لەنێوان ساڵانی ۱۹۸٦ و ۲۰۰۲دا حەوت هێندە زیادیان کردووە. تەنانەت سیاسەتیش لە گشت جیهاندا مۆرکێکی هاوشێوەی هەیە. چەندان راوێژکاری ئەمریکی هەن کەوا لە بەرانبەر فێرکردنی سیاسییەکانی ئاسیایی و ئەمریکاییەکانی لاتینی کرێی زۆر گەورە وەردەگرن، بێگومان ئەمەیش لەبەرانبەر چۆنییەتیی فێرکردنی باشترین رێگەی کاریگەری دروستکردنە لەسەر هاووڵاتیانیان.

راستە کە کتێب و فیلمی سینەمایی و تەلەفزیۆن تاوتوێی چەند پرسێك دەکەن کەوا لەگەڵ سەلیقەی لۆکاڵیدا دەگونجێ، بەڵام بونیادی ئەو پیشەسازییانە (جگە لە زۆرێك لە لایەنەکانی نێوەرۆکەکانیاندا) زیاتر و زیاتر دەبنە یەك شت و وەك یەکیان لێ دێت، بۆ نموونە بۆلیوۆد: وردە وردە واز لە نەریتی تایبەت بە بەرهەمهێنانی فیلمە درێژەکانی دەهێنێت کەوا بە بودجەیەکی کەم بەرهەمی دەهێنان و بەرەو بەرهەمهێنانی فیلمی کورتتر دەچێت کە ماوەیەکەیان کورتترە و بازرگانیترن، لەمەیشدا لەگەڵ وەبەرهێنەرانی هۆلیوود و توانایەکانی هەناردەکردندا رێککەوتوون. بەهەر رێگەیەکی نێو پیشەسازیی سەرانسەری جیهانی پیشەسازیدا بڕۆیت، چەندان جۆری جیاوازی هەمان ئەو بابەتانە

دەبینیت- مەکینەکانی پارەگۆڕینەوە و ئاڵوێرکردن، قاوەخانە و شوێنەکانی فرۆشتنی پۆشاک لەگەڵ داشکاندنەکانی وەرزیی، جالیەی پەناهەندە و ڕۆشنبیری و مۆزیکی میللی.

ئەوەی لە ئێستەدا لە وڵاتانی گەشەسەندوودا بەرەو نەمان دەچێت، ڕۆشنبیرییەکی کۆنی دەستەبژێری و سیستەمەکانی تەقلیدییە. بەرپرسی ئەمەیش خەڵکی ڕەشۆکی و بازارییە، بەهۆی سەرمایەداری و دیموکراسییەوە پەیدابووە. ئەمەیش بەزۆری لەگەڵ خۆرئاواییکردندا ڕێ دەکات و هاوکاتە، چوونکە ئەوەی جێگەی کەلتوور و ڕۆشنبیرییە کۆنەکە دەگرێتەوە- واتا کەلتوور و ڕۆشنبیریی نوێی باو- زۆر خۆرئاواییانە و بەدەستنیشانکراوی ئەمریکییانەیە. چێشتخانەکانی ماکدۆنالد و کاوبۆی شێن و مۆزیکی ڕۆك بە گشت شوێنێکدا بڵاوبوونەتەوە، لەمەیشدا شێوە کۆن و زۆر تایبەتترەکانی وەك خواردن و پۆشاك و گۆرانییان بەرەو لەنێوچوون ناچارکردووە. بەڵام ئەمە پەیوەندیی بە گرنگیدانە زیاترەکە هەیە بە عامەی خەڵك و ئەو دەستەبژێرە بچووکەش کەمتر گرنگییان پێ دەدرێ کەوا لەسەر دیاریکردنی دابونەریتەکانی وڵاتێك ڕاهاتوون. کۆی ئەمانەیش بە ئەمریکی دەچێت، چوونکە ئەمریکا کەوا داهێنەری سەرمایەداریی میللی و بەکاربردنە، یەکەمجار گەیشتووەتە ئەو شوێنانە. ئێستەیش کاریگەریی سەرمایەداریی میللی بووەتە شتێکی جیهانی. چەندان سەدەیە فەرەنسییەکان ڕەخنە لە لەنێوچوونی کەلتوور و ڕۆشنبیرییەکەیان دەگرن، بەڵام ئەوەی ڕوودەدا لە ڕاستیدا توانەوە و ئاوابوونی سیستەمە پلەبەندییە کۆنەکەیە. ئایا لە سەدەی نۆزدەیەمدا زۆربەی گەلی فەرەنسی (زۆربەیان جووتیاری هەژاربوون) خواردنیان لە چێشتخانە متمانەدارەکان یان هەر شوێنێکی دەرەوەی ماڵەکانی خۆیان دەخوارد؟ هەروەها دەڵێن لە ئێستەدا نوێبیرای چینی لە سەرمەرگدایە،

بەلام، ئایا ئەمە بۆ ئەو خۆرئاواییبوونە دەگەڕێتەوە یان بەهۆی هەلکشانی ڕۆشنبیریی میللی چینییەوەیە؟ ژمارەی ئەو جووتیارە چینییانە چەندە کەوا ماوەی چەندان دەیەیە لە گوندەکانیان گوێیان لە ئۆپێرا گرتبێ؟ ڕۆشنبیری و کەلتووری میللی بووەتە گرنگترین چوونکە چەندایەتی- لە سەردەمی دیموکراسیدا- بەسەر چۆنایەتیدا زاڵ دەبێت. ژمارەی ئەو کەسانەی گوێ دەگرن لە چۆنییەتیی ژمارەی گوێگران گرنگترە؟

تەماشای ئەو گۆڕانکارییانە بکە کەوا بەسەر شوێنێکدا هاتووە کە لە هەموو شوێنەکانی دیکە زیاتر تەقلیدی بوو. لە ساڵی ٢٠٠٤دا، کریستیان کاریلی پەیامنێری دەرەوەی گۆڤاری نیوزویك چووە تۆکیو دوای ئەوەی دەیەی پێشووی لە مۆسکۆ و بەرلیندا بەسەربردبوو. ناوبراو وەها پێشبینیی دەکرد کە وڵاتەکە واتا تۆکیۆ، زۆر بە نامۆ و گۆشەگیر بێتە بەرچاوی، چوونکە وەهای لەبارەوە خوێندبوویەوە، بەلام شتێکی تەواو پێچەوانەی بینی: " ئەوەی من بینیم وڵاتێکی خۆرئاوایی هاوچەرخ و گەشەسەندووی دیکە بوو لەگەڵ چەند دابونەریتێکی سەرنجڕاکێش؛ گەلێکی ئاساییە و ئەگەر کتوپڕ فڕێ بدرێتە نێو سنوورەکانی ئەورووپاوە، هیچ هەست بە نامۆیی ناکات ". دواتر ئەزموونی خۆی لەوێ باس دەکات و درێژەی پێ دەدات: " چووینە ماڵە نوێیەکەمان و کتوپڕ بینیمان خەریکین خۆمان بۆ بۆنەیەکی سەیری ژاپانی ئامادە دەکەین: هالۆوین".

هەروەها ئەو قسەیەی ئەکادیمیستی ئەمریکی دۆناڵد ریچی دەهێنێتەوە کە ماوەی پەنجا ساڵە لە ژاپان دەژیەت و وانە دەڵێتەوە، کە دەڵێ قوتابیانی گەنجی ژاپان وەك باوکانیان نین کە بەفەرمیبوون و ئاکاریبوون و بنەمایەکانی ڕەفتاریان دەناسرێنەوە. ریچی دەڵێ:" ئەوان سەبارەت بە سیستەمی خانەوادەیی هیچ شتێك نازانن، چوونکە ئێستە سیستەمی خانەوادەیی بوونی

نییە. لەبەرئەوە، لەسەرم پێویستە سەرلەنوێ ئەم سیستەمەیان بۆ بونیاد بنێمەوە". ئەو پابەندبوون و ڕەچاوکردنە ئاکارییە ئەفلیدییە ئاڵۆزە ژاپانییەی کەوا لە فیلمەکاندا دەیبینین، بۆ ئەو گەنجانە شتێکی سەیر و نامۆیە، وەك ئەوەی لە جیهانێکی لەنێوچووەوە بۆیان هاتبێ.

ئەوەی ئەمڕۆ بە نوێ و هاوچەرخە دادەنرێ زمانی ئینگلیزییە. لە ڕاستیدا، پێشتر و ئێستەیشی لەگەڵدا بێت هیچ زمانێك بەم فراوانی و قووڵییە لە جیهاندا بڵاو نەبووەتەوە. نزیکترین بەراورد کەوا دەیهێنینەوە زمانی لاتینییە لە چاخەکانی نێوەڕاستدا، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا بەراوردێکی لاوازە. چوونکە لاتینی لە زەمەنێکدا لە لایەن دەستەبژێرێکی زۆر کەمەوە بەکارهاتووە کە تیایدا نەخوێندەواری زۆر بەربڵاو بوو، هەروەها زۆربەی وڵاتانی ناخۆرئاوایی بەشێکی جیهانی مەسیحی نەبوون. بەڵام لە ئێستەدا، چارەکێك لە دانیشتووانی سەر گۆی زەوی (نزیکەی ١.٥ ملیار مرۆڤ) دەتوانن بە ئینگلیزی قسە بکەن، جا ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر سەرەتایی و لاوازیش بێت. نەك تەنیا ئەمە، بەڵکو ڕێژەی بڵاوبوونەوە و پەلوپۆهاوێشتنی لە گشت شوێنێکدا زیاتر دەبێت- لە ئەورووپاوە بۆ ئاسیا و تا دەگاتە ئەمریکای لاتینی. هەروەها ئەو جیهانگەراییەی کەوا سەردەوامی و پەیوەندی و ئاڵوێرێکی بەردەوام هەڵکشاوی بازرگانی دروست دەکات. لە هەمان کاتدا پاڵنەرێك بۆ هۆکارێکی سانای پەیوەندیش بەرهەم دەهێنێ. جا هەرچەندە یاریزانەکان زیاترین، ئەوا پێداویستی بۆ دۆزینەوەی بنەڕەتێکی هاوبەش زۆرتر دەبێت. لەبەرئەوە دەبینین کە نزیکەی ٨٠٪ی زانیارییە تۆمارکراوەکانی ئەلیکترۆنی بە زمانی ئینگلیزی نووسراون. ئەم مەسەلەیە لە پەیوەندییەکانی سیاسیشدا شتێکی باوە. کاتێك نێردراوی وڵاتانی یەکیەتیی ئەورووپی (بیست و پێنج دەوڵەت) لەپێناو گفتوگۆکردن و تاوتوێکردنی

پرسەکانی بازرگانی لە برۆکسلدا کۆ دەبنەوە، سەدان وەرگێڕیان لەگەڵدایە، بەڵام هەموویان بەزۆری بە زمانی ئینگلیزی قسە دەکەن.

ئایا زمانی هاوبەش وەها دەکات خەڵك بیر لە ڕێگەی هاوبەش بکەنەوە؟ هەرگیز بەشێوەیەکی سەدا سەد ئەمە نازانین، هەرچەندە زمانی ئینگلیزی لە ماوەی سەدەی ڕابردوودا لە گشت جیهاندا بووەتە زمانی نوێگەرایی. چوونکە وشەی تانك بە ڕووسی هەمان وشەی ئینگلیزییە کەوا هەمان واتای tank دەگەیەنێ. کاتێکیش هیندییەکان بە زمانی هیندی قسان دەکەن و دەیانەوێ بڵێن وشەی ناوەکی، دەڵێن nuclear. هەروەها پشووی کۆتایی هەفتە بە فەرەنسی le weekend. هەروەها بە ئیسپانی بە وشەی ئینتەرنێت دەڵێن internet. هەروەها بەکارهێنانی خەڵك بۆ شێوازی ئەمریکی بە کەمە ڕووخسار و نۆرمێکی تایبەتمەند زیاتر دەبێت کە ئەویش زمانێکی بازاڕی و ڕووکەشانەیە و پێویستی بە ئەدەب و ڕەچاوکردنی ڕێوڕەسم و ئادابەکان هەیە، لەوانەشە ئەم بازاڕیبوون و ڕەچاونەکردنەی لایەنی ئاکاری و ئەدەب – لە زمان و ئاخاوتندا– لە ئایندەدا بگاتە بواری دیکەش.

ئەم ئەگەرە گەورەساڵان و پیرەکان دەخاتە نێو نیگەرانییەوە. زۆربەی ئەو جڤاکانەی کەوا بەمدواییە چوونەتە نێو جیهانی نوێگەراییەوە حەز دەکەن سامانە نوێیەکەی و هەندێك ڕەگەزی سیستمە نوێیەکە ئاوێتەی یەکتر بکەن، بۆنموونە: لی کوان یو سەبارەت بە شوێنەکەی خۆی لە جیهاندا گوتی:" ڕابردوومان لە درلوەی خۆمان بەجێهێشت، نیگەرانییەکی ناوەخۆیی لەوەدا هەیە کە هیچ شتێکی ئێمە نامێنێتەوە سەرچاوەی لە ڕابردووەوە گرتبێ". بەڵام تەنانەت ئەم نیگەرانییەش لە ئەزموونی خۆرئاواییدا شتێکی ئاسایی و باوە. چوونکە کاتێك سەرکردەکانی ئاسیایی لە ئێستەدا باس لە پێداویستیی پاراستنی بەهایە

ئاسیاییە تایبەتمەندەکانیان دەکەن، رێك وەك ئەو موحافیزەکارە خۆرئاواییانە دێنە بەرچاو کەوا هەوڵیان داوە بۆ ماوەی چەندان سەدە بەهای ئاکاریی خۆیان بپارێزن. کاتێك ئینگلترا رێگەی وەرچەرخانی پیشەسازی گرتەبەر، ئۆلیڤەر گوڵد سمیس لە ساڵی ١٧٧٠دا نووسیویەتی: " سامان کەڵەکە دەبێت و پیاوانیش خراپ دەبن". پێدەچێ چین و هیند بە سەردەمە ڤیکتۆرییەکەی تایبەت بەخۆیاندا گوزەر بکەن، ئەو سەردەمەی کەوا سەرمایەداریی بەهێز هاوتەریب لەگەڵ پارێزکاریی کۆمەڵایەتیدا بەرێگەدا دەڕۆن. لەوانەیە ئەم مۆنتاژ و بەیەکگرێدانە بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە. چوونکە پابەندبوون بە دابونەریت و بەهاکانی کۆمەڵایەتی تەنانەت لە هەندێك لەو وڵاتانەی کەوا زۆر پێشکەوتوون هێشتاکە بەهێزە وەك ئەمریکا و ژاپان و کۆریای باشوور. بەڵام، بەشێوەیەکی گشتی و لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا، زیادبوونی سامان و دەرفەتەکانی تاکەکەسی وەرچەرخانێکی حەتمییانەی کۆمەڵایەتی دەهێنێتە ئاراوە. چوونکە نوێگەرایی جۆرێك لە ئازادبوونی ئافرەتان دروست دەکات، هەروەها هەژموونی ئەمەن و ئاین و کەلتوور و سیستمی دەرەبەگایەتی دادەرووخێت. کۆی ئەمانەیش وا دەکەن کەوا جڤاکەکان زیاتر بە جڤاکەکانی ئەورووپا و ئەمریکای لاتینی بچن.

## ئاییندەیەکی تێکەڵاو

کە بیر دەکەمەوە و لەخۆم دەپرسم جیهان بە چ شێوەیەك دەکەوێتە بەرچاو لەو کاتەی خۆرئاوا پاشەکشە دەکات و ئەوانی دیکە سەرهەڵدەدەن، یەکسەر فیلمێکی زۆر گرنگی هیندیم دێتەوە یاد کەوا لە ساڵی ١٩٦٥دا بەناوی Shakespeare Wallah بەرهەم هاتبوو. فیلمەکە باس لە گونجانی تیپێکی ئەکتەرانی گەڕۆکی شکسپیری دەکات لە هیندستانی دوای سەربەخۆیی' فیلمەکە باس لە راستییەکی سەیر و غەماوی دەکات، ئەویش ئەوەیە کە ئەو

تونابخانە و بانە و شانۆییانەی کەوا زۆر بەپەرۆشەوە داوای خزمەتگوزارییەکانی ئەو تیپەیان دەکرد، ئیدی وردە وردە گرنگییان پێنادەن. بەڕێزەکانی ئینگلیز ڕۆیشتن و کەسێکیان نەما خەڵك ناچار بکەن گرنگی بە شکسپیر بدەن. بەمشێوەیە ئەوە بەدیارکەوت کە پەرۆشبوون بۆ شکسپیر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە حوکمی بریتانیی نێو هیندستان هەبوو. ڕۆشنبیری و کەلتوورێك کە وەك پێدەچی پێرەوی هێزی دەکرد.

چ شتێك جێگەی ئەم تیمە گەڕۆکە دڵخۆشکەرانەی گرتەوە؟ فیلمەکانی سینەمایی. بە چەند وشەیەکی دیکە بەشێك لە چیرۆکی فیلمی Shakespeare Wallah پەیوەندیی بە ڕابوونی ڕۆشنبیریی مىللییەوە هەیە. بۆلیۆدیش کە بەشێکە لە ڕۆشنبیری و کەلتووری مىللییانەی هیندی، لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە تێکەڵەیەکە، چوونکە شت لە ڕێبەر و پێشەوای ڕۆشنبیریی مىللی و (لەوانەیە سەرچاوەکەی بێت) وەردەگرێ کە ئەویش ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە. چوونکە زۆربەی فیلمەکانی بۆلیۆد تەنیا دووبارەکردنەوەیەکی لاوازی فیلمەکانی کلاسیکیی ئەمریکییە، لەگەڵ زیادکردنی شەش بۆ دە گۆرانی بۆ هەر یەکێکیان. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕەگەزە سەرەکییەکانی هیندی دەپارێزێت، چوونکە چیرۆکەکان بەزۆری باس لە دڵیکانی قوربانیدەر و کێشمەکێشی خانەوادەیی و جیابوونەوە قەدەرییەکان و خورافاتەکان دەکات، بەکورتی تێکەڵەیەکە لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

ئەو جیهانەی کە ئێستە خەریکە دەچینە نێوییەوە، ئەواو وەك بۆلیۆد دێتە بەرچاو. تەولو نوێیە– واتا بە هێزەکانی خۆرئاوا کاریگەر دەبێت– بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەگەزە گرنگەکانی کەلتوور و ڕۆشنبیریی لۆکاڵیش دەپارێزێ. مۆزیکی ڕۆکی چینی بە ئامێر و ڕیتمە هاوشێوەکانی بە هاوشێوە خۆرئاواییەکەی

دەچێت، بەڵام بابەت و وشە و دەنگەکانی تەولو چینین. هەروەها سەماکارانی بەرازیلیش بە دیزاینەکانی خۆیاندا هەنگاوی ئەفریقی و لاتینی و هاوچەرخ (یان خۆرئاوایی) لەنێو یەکتریدا کۆدەکەنەوە.

لە ئێستەدا، خەڵك زۆر بەوە دڵخۆش و ئاسوودە دەبن کەوا مۆر و جێپەنجە لۆکاڵییەکانیان بخەنە سەر نوێگەرایی. کاتێك قۆناغی منداڵیم لە هیندستاندا بەرێدەکرد، نوێگەرایی تەنیا لە خۆرئاوادا هەبوو. هەموومان دەمانزانی کە پێشکەوتووتر لە گشت بوارەکاندا– لە زانستەوە تا دەگاتە دیزاینکردن– لەوێ دروست دەکرا، بەڵام لە ئێستەدا ئەمە ڕاست دەرناچێ. ئەندازیارێکی سەرکەوتووی بیناسازیی یابانی پێمی گوت کە کاتێك منداڵ بووە، وەهای زانیوە کە باشترین و پێشکەوتووترین تەلار و بینا تەنیا لە ئەمریکا و ئەورووپادا دروست دەکران. بەڵام لە ئێستەدا تەلار و بینای نوێ گشت مانگێك لە چین و یابان و خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و ئەمریکای لاتینیدا دروست دەکرێن. ئەوەی گەنج لە ئێستەدا دەتوانێ لە ماڵەکەی خۆیدا بیبینێتەوە و نوسخە تایبەتەکەی نوێگەرایی دابهێنێت کەوا لە پێشکەوتندا لەهیچ شتێکی دیکەی خۆرئاوایی کەمتر نییە.

لە ڕاستیدا، لۆکاڵی و هاوچەرخ پێ بەپێی جیهانی و خۆرئاوایی گەشە دەکەن، بۆنموونە: فرۆشی مۆزیکی پۆکی چینی هێندە زۆرترە کە هەرگیز ناکرێ لەگەڵ فرۆشی پۆکی خۆرئاواییدا بەراورد بکرێ. هەروەها سامبا لە ئەمریکای لاتینیدا لە درەوشانەوەدایە. پیشەسازییە لۆکاڵییەکانی سینەماییش لە گشت شوێنێکی جیهاندا و لە ئەمریکای لاتینییەوە تا دەگاتە خۆرهەڵاتی ئاسیا و خۆرهەڵاتی نێوەڕاست لە گەشەسەندنێکی بەردەوامن و بەشێك لە بەرهەمەکانیشیان دەفرۆشنە هۆلیۆد. هەروەها تەلەفزیۆنی یابانیش کە ڕاهاتووە ڕێژەیەکی یەکجار زۆری بەرنامەکانی ئەمریکی بکڕێت، ئێستە تەنیا بەڕێژەی لە سەدا پێنجی

بەرنامەکانی پشت بە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەبەستێت. لە فەرەنسا و کۆریای باشووریشدا کە بەردەوام فیلمەکانی ئەمریکی هەژموونی بەسەر وێستگەکانی تەلەفزیۆنییاندا هەبوو، ئێستە پیشەسازییەکی گەورەی سینەمایی تایبەت بەخۆیان هەیە. هونەری نوێی لۆکالّی- کە بەزۆری ئاوێتەیەکی سەیری نێوان شێوازە داماڵراو (المجرد)ی خۆرئاوایی و بابەتی تەقلیدیانەی لۆکاڵییە- بە گشت شوێنێکدا بلاّوبووەتەوە. لەوانەیە بەئاسانی بە لافیتەکانی ستاربکس و کۆکاکۆلا هەڵبخەڵتێی کەوا لەگشت جیهاندا بلاّو بووەتەوە، بەلاّم ڕابوون و سەرهەڵدان و گەشەکردنی لۆکاڵییانە و هاوچەرخانە گوزارشت لە کاریگەریی ڕاستینی جیهانگەرایی دەکەن.

بە وردبوونەوەیەکی زیاتر تەماشای هەژموونی زمانی ئینگلیزی بکە. هەرچەندە ژمارەی ئەو کەسانە زۆر زیاد بووە کە لە گشت جیهاندا بە زمانی ئینگلیزی قسەدەکەن، بەلاّم گەشەکردنە گەورەترەکە لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ئینتەرنێت بۆ زمانی لۆکاڵییە. لە هیندستاندا خەڵك باوەڕیان وەهابوو کە کردنەوەی شەپۆلەکانی هەوایی دەبێتە هۆی گەشەکردنی وێستگە تایبەتە هەواڵییەکان کەوا بەرنامەکانیان بە زمانی ئینگلیزی پەخش دەکەن- ئەو زمانەی کەوا زۆربەی شارەزایان قسەی پێ دەکەن- بەلاّم گەشەکردنە گەورەترەکە بۆ ئەو وێستگانە بوو کەوا بە زمانی نێوخۆیی دەپەیڤن. ئێستەیش دەبینین کە زمانی هیندی Hindi (یەکێك لە زمانە فەرمییەکانی هیند) و تامیل و تیلوگو و گوجاراتی و ماراسی، لەم جیهانە گلۆبالیزەکراوەدا کار و ڕۆڵێکی باش دەگێڕن. هەروەها زمانی چینی Mandarin زۆر بەهێز لە ئینتەرنێتدا بلاّو دەبێتەوە. لە قۆناغی یەکەمی جیهانگەراییدا هەموان تەماشای وێستگەی CNNیان دەکرد. لە قۆناغی دووەمیشدا، هەردوو ئێستگەی BBC و Sky News، تەقلی بوون.

ئێستەیش گشت ولاّتێك کۆپیی تایبەتی ئێستگەی سی ئێن ئێن بەرهەم دەهێنی؛ جەزیرە و عەرەبیە و NDTV و Aaj Tak ی هیندی.

کاتێك لە هیندستاندا بچووك بووم، ڕووداو و پرسە باوەکانی ئەو کات و بەتایبەتیش نێو دەوڵەتییەکان، بەهۆی ڕوومەکانی خۆرئاواوە زەق دەکرانەوە و پیشان دەدران. تۆ لەچاوی هەردوو ئێستگەی بی بی سی و دەنگی ئەمریکا جیهانت دەبینی و بەهۆی تایمز و نیوزویك و هیراڵد تریبیوّن و تایمزی لەندەنی (لە ڕۆژگارە کۆنەکاندا) تێی دەگەیشتیت. بەلاّم ئێستە دۆخەکە گۆڕاوە، چوونکە زۆرێك لە کەناڵی هەواڵی پەیدابوون کەوا لەگشت جیهاندا نوێنەرایەتیی بۆچوونی تەواو جیاواز دەکەن. ئەگەر تەماشای جەزیرە بکەیت، ئەوا بێگومان دونیابینییەکت سەبارەت بە کێشەی عەرەب ئیسرائیل دەستدەکەوێ؛ ئەمەیش بەهیچ شتێك ناچێت کەوا لە خۆرئاوادا دەیبینیت یان دەیبیستیت. هەروەها ئەگەر تەماشای کەناڵێکی هیندی بکەیت، ئەوا سەبارەت بە بەرنەمایی و ئامانجی ئێران بۆ چەکی ناوەکی، بۆچوونێکی دیکە وەدەستدێنێت. ئەو شوێنەی لێی دەژیت کاریگەری لەسەر ڕاوبۆچوونت لە هەمبەر جیهاندا هەیە.

ئایا ئەم جیاوازییانە وادەکەن کە ئەوانی دیکە بەشێوەیەکی جیاواز لە بازرگانی و دەستهەلاّت و سیاسەتی دەرەکی ڕەفتار بکەن؟ لە ڕاستیدا، ئەمە پرسێکی زۆر ئاڵۆزە. لە جیهانی بازرگانی و کاردا هۆکارە کرۆکییەکە قازانجە. بەلاّم چۆن خەڵك دەگەنە ئەو دەرئەنجامە ئەوا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەگۆڕێت، تەنانەت لەنێو سنووری خۆرئاواشدا. چوونکە بونیادی چالاکیی ئابووری لە ئیتاڵیا ئەولو لە هی بریتانیا جیاوازە. هەروەها ئابووری ئەمریکیش زۆر بەڕوونی لە ئابووریی فەرەنسی جیاوازە. هەروەها نۆرمەکانی بازرگانیی یابانیش لە نۆرمەکانی چین و هیند جیاوازە. ئەم جیاوازییانەش لە ئایندەدا زیاتر دەبن.

هەمان ئەو پرسە لە هەندێك ڕوودا بەسەر سیاسەتی دەرەوەشدا پیادە دەبێت. بێگومان چەند ڕاستییەکی بناغەیی و سەرەکی هەن، وەك ئاسایش و کاریگەریی دروستکردن لە ژینگەی ڕاستەوخۆدا کە ئەم دووەش لە هەر سیاسەتێکی ئاسایشی نەتەوەییدا دوو پێکهێنەری کرۆکین. بەڵام بێجگە لەمانە، لەوانەیە ناکۆکی و جیاوازیی ڕاستین هەبن، لەوانەیە ئەم ناکۆکییانەش پەیوەندییان بە ڕۆشنبیری و کەلتوورەوە هەبێت یانیش نەبێت. با وەك نموونە پرسی مافەکانی مرۆڤ بهێنینەوە، ئەم مەسەلەیە لە وڵاتانی ناخۆرئاواییدا ناکۆکی و جیاوازییەکی گەورەی لەسەرە، بەتایبەتیش لە چین و هیندستان لە لایەك و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاش لە لایەکی دیکەوە. دوو هۆی سەرەکی بۆ ئەم ناکۆکی و جیاوازییە هەن. یەکەم، ئەم وڵاتانە وەها لەخۆیان دەڕوانن کە وڵاتانی تازە گەشەسەندوون و هێندە هەژارن کە لێناگەڕێ و ناتوانن گرنگی بە پرسەکانی سیستمی جیهانی بدەن، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندیی بە سەپاندنی پێوەرەکان و مافەکان هەیە لە دەرەوە. دووەم، هێزی ڕێنوێنیکاری پرۆتستانتی نین، لەبەرئەوە کەمتر پەرۆشی ئەوەن بەهایەکانی جیهانی لە گشت شوێنە ئاوەدانەکانی جیهاندا بڵاوبکەنەوە. نە هیندۆسییەت و نە کۆنفۆشیوسییەت باوەڕیان بە هەبوونی ڕاسپاردە و ڕێنمایی و فەرمانەکانی گەردوونی نییە، هەروەها باوەڕیان بەوە نییە دین و ئیمان بە جیهاندا بڵاوبکەنەوە. لەبەرئەوە، شتێکی شیمانە نەکراو و دوورە کە هەردوو وڵات – لەبەر چەند هۆیەکی کرداری و ڕۆشنبیری بەیەکەوە– پرسەکانی مافەکانی مرۆڤ لە سیاسەتی دەرەکییاندا بە شتی سەرەکی دابنێن.

بێگومان، هیچ شارستانییەتێك ناتوانێ لە سندووقێکی داخراودا پێشبکەوێت. تەنانەت بەنیسبەت ئاین و هەر بۆچوونێکی سەرەکیی هەمبەر جیهانیش هەروایە،

چوونکە گشت ولاتان باکراوندی تێکەڵی وەهایان هەیە کەوا لە رەگەزی لۆکاڵی رەنگکرلو بە کاریگەریی دەرەکی پێکهاتوون، بۆنموونە هیند ولاتێکی هیندۆسییە و ماوەی چوار سەدە لە لایەن بنەوەچەکانی موسڵمانەوە و دواتریش هێزی پرۆتستانتیەوە حوکمی کراوە. چینیش هەرچەندە لە سایەی دەستهەلاتێکی راستەوخۆی دەرەکی نەژیاوە، بەلام باکراوندە کۆنفۆشیۆسییەکەی بەدرێژایی چل ساڵ زۆر بەشێوەیەکی درندانە لە لایەن ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیزمییەوە بێزێندراوە. هەروەها یابانیش لەماوەی سەدەی رابردوودا زۆرێك لە نۆرم و مزرەکانی ئەمریکی هەڵبژاردووە. هەرچەندە ئەفریقیا دابونەریتی رەگداکوتاوی تایبەت بەخۆی هەیە، بەلام لە هەمان کاتدا خاکی گەورەترین گردبوونەوەی دانیشتووانە مەسیحییەکانی جیهانە و لە گەشەکردنیشدا خێراترە. هەروەها لە ئەمریکای لاتیندا هێشتا کڵێسایەکان بەنیسبەت ژیانی ولاتەکانیان هێندە کرۆکین کە لە ئەوروپادا هەرگیز ناتواندرێ وێناشی بکرێ. ئێمە سەبارەت بە ئینجیلیەتی پرۆتستانتیی نێو ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا باسێکی زۆر دەبیستین، بەلام گەشەکردنە خێراترەکەی لە بەرازیل و کۆریای باشووردا بەڕێوە دەچێت. جا ئەگەر بەهایەکانی مەسیحییەت خۆی لە نێو جەرگەی دابونەریتەکانی خۆرئاواییدا دەبینێتەوە، ئەدی چۆن پێناسەی ولاتێکی وەك باشووری ئەفریقیا بکەین کەوا زیاتر لە حەوت هەزار تائیفەی مەسیحیی هەیە؟ چۆن پێناسەی نەیجیریا بکەین کەوا ژمارەی کەسە ئینجیلییەکانی نێوی لە ژمارەی نێو ئینگلتەرادا گەلێك زۆرترە؟

لە راستیدا، خۆرئاوا و ئەوانی دیکە لە هەزارەها ساڵ لەمەوبەر و تاکو ئێستەیشی لەگەڵدا بێت کارلێك دەکەن. خۆرهەلاتی نێوەراست بۆ ماوەی چەندان سەدە زانستەکانی خۆرئاوایی پاراستووە و پێشخستوون. هەروەها رووسیا

ململانێیەکی لەنێوان شوناسە خۆرئاواییەکەی و ناخۆرئاواییەکەی بەخۆیەوە بینی کە تەمەنەکەی لە چوار سەدە کەمتر نییە. لە زۆربەی شوێنەکانی جیهاندا، خۆرئاوا زۆر لەمێژە بوونی هەبووە کە ئەمەیش وەهای کردووە ببێتە پێکهاتەیەکی ئەم شارستانییانە. لەبەرئەوە ئاساییە کە گەورەترین گازینۆ لە جیهاندا لە ماکاو، چین، بونیادبنرێ و بەشێوەیەك دروست بکرێ کە لاساییەکی گۆرەپانی قەدیس مارکی نێو ڤینیسیا بێت، کە خودی ڤینیسیاش بەشێوەیەکی زۆر مەزن بە تەلارسازیی ئیسلامی کاریگەر بووە. جا ئایا چینییە، خۆرئاواییە، یان ئیسلامی و هاوچەرخە؟ لەوانەیە هەموویان بێت بەیەکەوە.

نوێگەرایی بۆیێ ڕوخسارە خۆرئاواییەکەی خۆی وەرگرت، چوونکە لەگەڵ ڕابوونی خۆرئاوا دەستیپێکرد، بەڵام لەگەڵ فراوانبوونی جیهانی نوێ و لەخۆگرتنی زۆرێك لە شوێنەکانی دیکەی جیهان، زیاتر بە قاڵبی تواندنەوە چوو. بازرگانی و سەفەرەکان و ئیستعمار و کۆچکردن و نێردەکانی تەبشیری شتەکانیان تێکەڵ بە یەکتری کرد. بەڵام ڕەگەزەکانی ڕۆشنبیری، تایبەتمەند و جیاکەرەوەن، هەندێکیان مانەوەی خۆیان دەپارێزن هەرچەندە نوێخوازی و نوێگەرایی لەئارادان، بەڵام هەندێکی دیکەیان ناتوانن، چوونکە لەگەڵ پێشکەوتنی سەرمایەداریدا، کۆنە دابونەریتە پلەبەندییەکان و خانەوادەییەکان و فەرمییەکان و دەربەگایەتییەکان دەمرن هەروەك چۆن هاوتاکانیان لە خۆرئاوادا مردن. هەروەها کاریگەریی بەهایە نوێیەکانی خۆرئاوایی هێشتا هەر بەهێزن. ڕاستە کە لەوانەیە چین و هیند کەمتر حەز بکەن لەنێو چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤدا ڕەفتار بکەن، بەڵام ناچارن مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕاستییەش بکەن بەوەی کە ئەم پرسە لەسەر ئەجێندای جیهانیدا دانراوە. سەبارەت بە هیند بەنموونە- وەك دەوڵەتێکی دیموکراسی لەگەڵ دەستەبژێرێکی ڕۆشنبیری لیبراڵی- توێژێکی

گرنگ لەنێو ولاتەکەدا هەن، بۆچوونیشیان سەبارەت بەم پرسە بەشێوەیەکی زۆر گەورە بە بەهایەکانی خۆرئاوایی کاریگەرە.

ئەو پرسیارەی کە دەڵێ ئایا ئایندە نوێگەرا و مۆدێرن دەبێت یان خۆرئاوایی؟ لەوە ئالۆزترە کە هێندە بە سادەیی لێی بنوارین. تاکە وەڵامی سادەش بۆ ئەم پرسیارە (بەڵێ) یە. هەروەها تاکە وەڵامە ئالۆزەکەش بەندە بە نوارین لە ولاتانی دیاریکراو، لەپێناو تێگەیشتن لە رابردوو و ئێستە و رۆشنبیری و دابونەریتەکانی و شێوازی خۆگونجاندن لەگەڵ جیهانی خۆرئاوایی و نوێگەراییدا. لە بەشی داهاتوودا دەمەوێ ئەمە لەگەڵ دوو هێزی زۆر گرنگی گەشەسەندوودا بکەم: چین و هیند. لە هەمان کاتدا ئەمە دەبێتە باشترین رێگە بۆئەوەی لە کاریگەرییەکانی جوگرافیای نوێی سیاسی تێبگەین. لە کۆتاییدا، ئەو تەگەرە و بەرەنگارییە راستینەی کەوا لە ئایندەدا رووبەرووی دەبینەوە، پەیوەندیی بە هەبوونی هەڵوێستی جیاوازەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە جوگرافیا و مێژوو و بەرژەوەندییەکان و توانایە جۆراوجۆرەکانەوە هەیە. قسەکردن سەبارەت بە رابوونی ئاسیا نالۆژیکییە، چوونکە شتێك نییە ناوی ئاسیا بێت، لە راستیدا ئەمە چەمکێکی خۆرئاواییانەیە. بەڵکو چەندان ولاتی زۆرروزەوەند هەن و لەنێو ئەو شتەی کەوا بە ئاسیا ناودەبرێ زۆر لە یەکتری جیاوازن– وەك چین، یابان، هیند، ئەندۆنیسیا– هەر یەکێکیش لەوانە گومانێکی لەهەمبەر ئەوانی دیکەدا هەیە. جیهانیش بەنیسبەت چین و هیند جیاوازە، جیاوازییەکەش هەر لە شوناسەکەیانەوە نییە، بەڵکو بەهۆی پێگە جوگرافییەکەیانەوە. ئەو وەرچەرخانە گەورەیەی لە ئێستەدا لە جیهاندا دەگوزەرێ ئەوە بەدیاردەخات کە هێندە پەیوەندیی بە رۆشنبیرییەوە نییە بەقەد ئەوەی پەیوەندیی بە هێزەوە هەیە.

### ١- ئەوەی کردەی بەرەنگاری دەکات

لەوانەیە ئەمریکییەکان بە جوانییەکان سەرسام بن، بەلام لەهەمبەر قەبارە و شتەکانی زەبەلاح سەریان سوڕدەمێنێ. بیر لە دۆڵی گەورە و دارستانە سوورەکانی کالیفۆرنیا و وێستگەی مەزنی مەرکەزی و جیهانی دیزنی و ئۆتومبێلەکانی دەبڵ ئەکسل و هێزەکانی چەکداری ئەمریکا و کۆمپانیای جەنەراڵ ئەلیکتریک و بابۆڵەی Double Quarter Pounder (لەگەڵ پەنیر) و Venti Latte بکەرەوە. ئەورووپییەکان حەزیان لە ئالۆزییە، یابانییەکان ڕێز لە شتەکانی ورد و وردەکارییەکان دەگرن. بەلام ئەمریکییەکان حەزیان لە قەبارەیە و حەز دەکەن زەبەلاح بێت.

لەبەرئەم هۆیەیە چین بەشێوەیەکی زۆر بەهێز شۆکی کارەبایی لە ئەقڵی ئەمریکی دەدات. قەبارەی چین بەجۆرێکە وەها لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەکات وەك بستە بالا بێتە بەرچاو، چوونکە ژمارەی دانیشتووانی چین (١.٣ ملیار کەسە) و چوار هێندەی ژمارەی دانیشتووانی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە. لە ڕابردوودا و بەدرێژایی زیاتر لە سەد ساڵ، موبەشیرەکان و بازرگانانی ئەمریکی خەونیان بە توانایەکانەوە دەبینی- ملیارێك مرۆڤ بۆ دەربازکردنی گیانیان، ملیار بنباڵ بۆ ئەوەی لادەری بۆنی لێ بدەن- بەلام هەرگیز نەیانتوانی لە قۆناغی خەونەکەیان بێنە دەرەوە و هەنگاوی زیاتر هەڵێنن. بەلام، هەرچەندە چین زۆر گەورە و زەبەلاح بوو، لە هەمان کاتیشدا زۆر هەژاریش بوو. کتێبی بیرل باك (زەوی باش) کە بووە شاکارگەری و فیلمیش، وێنەیەکی سەبارەت بە چین پیشان دا کە هێشتا لەنێو ئەندێشەکاندا ماوەتەوە: جڤاکێکی کشتوکاڵی، جووتیاری تێکۆشەر، خاوەنزەویی چاوبرسی، برسییەتییەکان، لافاوەکان، ئاعوون و هەژاری.

وتەیەکی بەناوبانگی ناپلیۆن بۆناپارت هەیە – کە لەوانەیە هی ئەویش نەبێت و درابێتە پاڵی– دەڵێ: " لێگەڕێن چین بخەوێ، چوونکە ئەگەر بێداربێتەوە جیهان دەلەرزێنێ". واپێدەچی چین بەپێی ڕێنماییەکەی ناوبراو بۆماوەی دووسەد ساڵ مابێتەوە، چوونکە بەبێ هیچ ڕۆڵێکی گرنگ هەر بە تەنبەڵی مایەوە، تەنیا گۆڕەپانی جێبەجێکردنی خەون و بەرتەماییەکانی زلهێزەکانی دیکە بوو. لە سەدەی بیستەمیشدا یابان پێشی کەوت– ئەو یابانەی کە لە ڕابردوودا لە جەنگ و ئاشتیدا لاسایی چینی دەکردەوە. هەروەها لە جەنگی دووەمی جیهانیدا ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا هاوپەیمانیی لەگەڵدا بەست و لە ساڵی ١٩٤٥دا کورسییەکی ئەنجوومەنی ئاسایشی پێ بەخشی. کاتێکیش چین و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بوونە دوژمنی یەکتر بەتایبەت لەو کاتەی کۆمۆنیستەکان لەساڵی ١٩٤٩دا دەستهەلاتیان گرتە دەست، چین زیاتر گەڕایەوە دواوە، چوونکە ماوتسی تۆنگ وڵاتی بەرەو زنجیرەیەك لەرزینی مەرگبار پەلکێشکرد کە سەرمایە ئابووری و تەکنۆلۆژی و هزرییەکەی ویرانکرد. بەلام هەر لە ساڵی ١٩٧٩ وە وردەوردە دۆخەکانی چین گۆڕانیان بەسەردا هات.

ڕاستە کە ڕابوونی چین سەرلەنوێ دیمەنی ئابووری و سیاسییانەی جیهانی دادەڕێژێتەوە، بەلام بەو جیهانەش کاریگەر دەبێت کەوا تیایدا ڕادەبێت. هەروەها ڕووبەڕووی هەمان ئەو دوو هێزە دەبێتەوە کە جیهانی دوای ئەمریکا پێدەناسرێتەوە – واتا جیهانگەرایی و نەتەوایەتی. فشارەکانی ئابووری و تەکنۆلۆژی پاڵ بە چینەوە دەنێن بە ئاراستەی ئاوێتەبوونێکی هاوکارانە لەگەڵ جیهان هەنگاو هەڵێنێ. بەلام هەمان ئەو دوو هێزە (جیهانگەرایی و نەتەوایەتی) دەبنە هۆی دروستکردنی دۆخێکی پڕ لە هەراوزەنا و شلەژانی کۆمەلایەتی لە چیندا، ئەمەیش پاڵ بە سیستمەکەوە دەنێت بەدوای ڕێگەی نوێدا بگەڕێت

بۆئەوەی ئەو جڵاکەی خۆی بەکبخات کە هەمەچەشنی و هەمەڕەنگی و جیاوازبوونەکانی بەرەو زیادبوون دەچن. لەهەمان کاتیشدا، گەشەکردن واتای ئەوە دەگەیەنێ کە چین هەژموونی زیاتر دەبێت، چوونکە سایەیەکی مەزنتر دەخاتە سەر ناوچەکە و جیهانیش. لەبەرئەوە سەقامگیری و ئاشتیی جیهانی دوای ئەمریکا، بەپلەیەکی زۆر پشت بەو هاوسەنگییە دەبەستن کەوا چین لەنێوان ئەم دوو هێزەدا – یەکبوون و جیابوونەوە– دەیڕەخسێنێ.

کاتێك مێژوونووسان دەنوارنە دەیەکانی سەدەی بیستەم، زیاتر شیمانەی ئەوە دەکرێ ئاماژە بە ساڵی ۱۹۷۹ بکەن، چوونکە وەك خاڵێکی وەرچەرخانە. چوونکە لەو ساڵەدا، یەکیەتیی سۆڤییەت هێرشی کردە سەر ئەفغانستان، بەمەیش وەك زلهێزێك بەدەستی خۆی گۆڕی بۆ خۆی هەڵکەند. هەروەها لە هەمان ساڵیشدا، چین دەستی بە ریفۆرمەکانی ئابووری کرد. هەروەها لە کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۷۸ ئاماژە بە ڕووداوێك درا ئەویش لە کۆبوونەوەیەکی نەگونجاودا: کۆنگرەی سێیەمی لیژنەی مەرکەزی یانزەیەمی حزبی شیوعی چینی، ئەمەیش وەك باوە بۆنەیەکە بۆ پێشکەشکردنی ڕناری پووچ و ئایدۆلۆژیایەکی بابردەڵەیە. چوونکە لە دانیشتنێکی پێش کۆبوونەوەی فەرمی، دینگ زیاوبینگی سەرۆکی نوێی حزب قسەیەکی کرد کە دەرکەوت لە مێژووی نوێی چیندا زۆرترین گرنگیی هەیە. دینگ هانی سیستمی دا بۆ ئەوەی جەخت لەسەر پێشکەوتنی ئابووری بکەنەوە و پشت بە ڕاستییەکان ببەستن نەك ئایدۆلۆژیا، ئەمەیش لەپێناو ئەوە بوو بۆ سەر ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنیی بکەن. دینگ لەو دانیشتنەدا گوتی: " گرنگ نییە کە پشیلە ڕەش بێت یان سپی. مادام هێشتا بتوانێ مشکان ڕاوبکات، ئەوا پشیلەیەکی باشە". لەو کاتەوە، چین لەو

ڕاسپاردەیەی لانەداوە. ڕێگەیەکی نوێگەرایانەی پراگماتیکی گرتووەتەبەر و بەموو لێی لانادات

دەرئەنجامەکان سەرسامکەربوون. چین بۆماوەی سی ساڵ بە ڕێژەی زیاتر لە ٩٪ی ساڵانە گەشەی کرد، ئەمە بۆ وڵاتێکی گەورە لەمێژووی تۆمارکراودا خێراترین تێکڕایە. هەر لەهەمان ماوەدا چین نزیکەی ٤٠٠ ملیۆن مرۆڤی لە هەژاری دەرهێنا، ئەمەیش شتێك بوو کە لەمێژوودا وێنەی نەبوو. دەرامەتی ئاسایانەی چین حەوت هێندە زیادی کرد. چین لەگەڵ گشت تەگەرە و لایەنەکانی ئەرێییدا بەشێکی زۆری خەونی هەر وڵاتێکی جیهانی سێیەمی وەدیهێنا، ئەویش لەنێوبردنی هەژاری بوو. یان بەپێی گوزارشتەکەی جیفری ساکسی زانای بواری ئابووری:" چین لە مێژووی جیهاندا سەرکەوتووترین سەربردەی سەرکەوتنە ".

ئەو ڕێژە گۆڕانەی کەوا لە چیندا هاتەکایەوە لە سنووری خەیاڵیش بەدەرە. قەبارەی ئابووریی چینی بۆ ماوەی سێ دەیە هەر هەشت ساڵ جارێك دوو هێندە بووبەوە. لە ساڵی ١٩٧٨دا ئەو وڵاتە ٢٠٠ سپلیتی هەوایی لە یەك ساڵدا بەرهەم دەهێنا. لەساڵی ٢٠٠٥دا ٤٨ ملیۆن سپلیتی بەرهەم هێنا. لە ئێستەشدا، چین لە یەك ڕۆژدا هێندە بەرهەم دەهێنێت کە بەقەد گشت هاوردەکانی ساڵی ١٩٧٨ دەبێت پانزە ساڵ لەمەوبەر بۆ یەکەمجار چوومە شانگهای، باندۆنگی خۆرهەڵاتی شارەکە تەنیا ناوچەیەکی دواکەوتووی لادێیی بوو. بەلام لە ئێستەدا بووەتە ناوچەیەکی ئابووری و بەچەندان تاوەری پۆلاین و شووشەیی ڕازێندراوەتەوە کە وەك درەختی لەدایکبوون بە بریسکەن. هەشت هێندەی گەرەکە نوێیە ئابوورییەکەی لەندەنە کەناوی Canary Wharf و کەمێکیش لەئەراوی شیکاگۆ بچووکترە. هەروەها شاری چونگکینگ لەسەر شێوەی شاری

شیکاگۆ خۆی ڕێکدەخاتەوە کە پێش سەد ساڵ لەمەوبەر لە گەشەکردندا خێراترین شاری جیهان بوو. لەوانەشە چونگکینگ – کە ژمارەی دانیشتووانی بە ڕێژەی ۳۰۰,۰۰۰ لە ساڵێکدا زیاد دەکات– ئێستە ئەو ناونیشانەی بۆ خۆی داگیر کردبێ، بەڵام تەنیا سەرلیستە، چوونکە سەرجەمی ئەو بیست شارە جیهانییەی کەوا لە گەشەکردندا زۆر خێران، هەر هەموویان لە وڵاتی چینن.

هەرچەندە شانگهای بۆ گەشتیارانی خۆرئاوایی زۆر سەرنجڕاکێشە، بەڵام پەکین هەر بە سەنتەری سیاسەت و ڕۆشنبیری و هونەر و تەنانەت ئابووریش دادەندرێ لە چیندا. ئەمڕۆیش ملکەچی کردەی دووبارە پێکهێنانەوەیەکە کەوا لە مێژوودا وێنەی نەبووە (نزیکترین بەراورد ڕازاندنەوەی هاوسمانی شاری پاریسە لە سەدەی نۆزدەیەمدا). چوونکە لە ئێستەدا پەکین – بەشێکی زۆری ئەو کارانەی کەوا دەیکات لە ڕەوتی ئامادەکردنی شارەکەیە بۆ خولی گەمە ئۆلۆمپییەکانی ساڵی ۲۰۰۸– کار بۆ دروستکردنی شەش هێڵی نوێی میترۆی تونێلەکان و سیستمی شەمەندەفەری سادە بەدرێژایی ۲۴ کیلۆمەتر و دروستکردنی هەڵبەندێکی نوێ (بێگومان بەبەراورد لەگەڵ ئەوانەی سەرجەم دوونیا لەهەموویان مەزنترە)، هەروەها موڵکایەتیی نوێی زەویوزاری کە ڕووبەرەکەی ۲۵ ملیۆن مەتری چوارگۆشەیە، هەروەها خەریکی دروستکردنی پشتێنەیەکی سەوزە بەدرێژایی ۱۲۵ کیلۆمەتر و دروستکردنی گوندێکی ئۆلۆمپی کە ڕووبەرەکەی ۱۲ کیلۆمەتر چوار گۆشەیە. کاتێك مرۆڤ تەماشای دیزاینە نوێیەکانی پەکین دەکات، تەنیا دەتوانێ بیر لە نەخشە زەبەلاح و ئاڵۆزەکانی ئەلبێرت سبیر بکاتەوە لەپێناو دووبارە بونیادنانەوەی بەرلینی دوای جەنگ ئامادەی کردبوون؛ لەڕاستیدا ئەلبێرت سبیر جۆنیۆر(کوڕی ئەندازیارێکی تەلارسازە) و دیزاینی ئەو شەقامە پانوپۆڕەی کرد کەوا کۆشکی موحەڕەم (شاری موحەڕەمە) و گوندی

ئۆلۆمپی بەیەکتری دەبەستێتەوە و درێژییەکەی هەشت کیلۆمەترە، هەروەها هیچ توانایەك لە وەرچەرخانی پەکین و دیزاینەکانی باوکی بۆ هێتلەر نییە: چوونکە دەڵێ: " ئەمە گەورەترە، زۆر گەورەترە).

هەر پیاوێکی کار لە ئێستەدا سەبارەت بە چین ژمارەی سەرسوڕهێنەری لەبەردەستە! بێگومان ئەمەیش بۆ سەرسامکردنی گونجاوە. لە ڕاستیشدا ژمارەی ڕووژێنەرن، هەرچەندە کاتێك دەگەنە گوێچکەت زۆربەیان ڕەتدەکرێنەوە. چین گەورەترین وڵاتی بەرهەمهێنەری خەڵووز و پۆڵا و چیمەنتۆیە لە جیهاندا. هەروەها گەورەترین بازاڕی موبایلە لە جیهاندا. چین لە ساڵی ٢٠٠٥دا کاری بۆ جێبەجێکردنی چەند پرۆژەیەك دەکرد کە ڕووبەرەکەی ٢٨ ملیار پێی چوارگۆشە بوو، واتا پێنج هێندە گەورەتر لەو پرۆژانەی کەوا لە ئەمریکا جێبەجێ دەکران. هەروەها لە پانزە ساڵی ڕابردوودا کاڵا هەناردەکراوەکانی چین بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بە ڕێژەی ١.٦٠٠ ٪ بەرزبوویەوە. لە ترۆپکی شۆڕشی پیشەسازیدا بریتانیا بە دوکان و دەستگەی جیهان دادەندرا، بەڵام لە ئێستەدا ئەم ناونیشانە بووەتە موڵکی چین. دوو لەوو سێیەکی ئامێرەکانی کۆپیکردن و فرنییەکانی مایکرۆیف و ئامێری وەگەڕخستنی دی ڤی دی و پێڵاوی جیهان لە لایەن چینەوە بەرهەم دەهێندرێ.

بۆئەوەی بیرۆکەیەکی تەواو سەبارەت بە هەزموونی چین لە دروستکردنی ئەو بەرهەمانە وەدەستبێنیت کەوا تێچوویەکی کەمیان هەیە، تەماشایەکی کۆمەڵگەکانی وول- مارت بۆ بازارکردن بکە. ئەم وول- مارتە لە زەبەلاحترین کۆمپانیاکانی جیهانە، چوونکە داهاتی ساڵانەی هەشت هێندەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتە و سەدا دووی تێکڕای بەرهەمی لۆکاڵییانەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە. هەروەها بە هەوڵە کارایەکانی – لەوانەیە هەندێك بڵێن

مەوڵە بێبەزەییەکانی- ناسراوە بۆ وەدەستهێنانی نزمترین نرخی کردەیی لەپێناو بەکاربەران. جا لەپێناو ئەم مەبەستەدا، کۆمپانیایەکی بە کاراییەکی زۆر بەرزەوە تەکنۆلۆژیای داهێنانی کارگێڕی بەکار دەهێنێ، لەوانەشە گرنگتریش لەمە ئەو کۆمپانیایانە بن کەوا بەرهەمی وەها دروست دەکەن کەوا تێچوویان کەمترە و ؟ بێگومان زۆرینە هەرە زۆرەکەشی لە چینە. وول- مارت ساڵانە ڕێژە کالایەکی وەها لە چین هاوردە دەکات کە بەهایەکەی ١٨ ملیار دۆلاری ساڵانەیە.

هەروەها چین لە لایەنی بازرگانی و وەبەرهێناندا سیاسەتێکی کراوە دەگرێتە بەر کەوا زۆر ڕوون و ڕەوانە. ئەمەیش یەکێکە لەو هۆیە زۆروزەوەندانەی کەوای لێدەکەن لە یابانی نوێ جیاواز بێت. دەبێ بزانین کە چین ڕێگەی پێشکەوتنی یابانی (یان کۆریای باشوور) ناگرێتەبەر، بەڵکو ستراتیژێکە و بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە هەناردەکردن دەبەستێت، بەشێوەیەك کە بازاڕی لۆکاڵی و جۆاکی بە داخراوی هێشتووەتەوە. بەڵام چین دەرگەکانی خۆی بەڕووی جیهاندا کردووەتەوە. لە ئێستەدا ڕێژەی داهاتە بازرگانییەکانی لە تێکڕای بەرهەمی لۆکاڵیدا دەگاتە ٧٠٪، ئەمەیش وەهای کردووە ئابووریی چین ببێتە یەکێك لە کراوەترین ئابووری لە جیهاندا. لە ماوەی پانزە ساڵی ڕابردوودا، هاوردەکانی لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاوە زیاتر لە حەوت هێندەبە. کۆمپانیای پرۆکتەر ئاند گامبڵ ساڵانە ٢.٥ ملیار دۆلار لە چین قازانج دەکات، بەرهەمەکانی وەك شامپۆی هێد ئاند شۆڵدەرز و دایبیی بامبزی منداڵان بەشێوەیەکی زۆر ناناسایی لە نێوەندی بەکاربەرانی ئەوێدا بووەتە شتێکی باو. هەروەها کۆمپانیای ستاربێکس پێشبینیی ئەوە دەکات ژمارەی ئەو قاوەخانانەی کەوا لەساڵی ٢٠١٠ لە چیندا ناوی ئەو هەڵدەگرن لە ژمارەی قاوەخانەکانی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا زۆرتر دەبێت. هەروەها چین دەرگەی بەڕووی

براند و ناوە جیهانییەکانیشدا کراوەیە. ئەندازیارانی بیناسازی زۆربەی تاوەرەکانی درەوشاوە و پرۆژە گەورەکانیان بونیادناوە کەوا چینی نوێیان پێ دەناسرێتەوە. لەو کاتەی چین بە دوای پیاوێکدا دەگەڕا کەوا لەسەر شانۆی جیهانیدا کردەی دەرهێنان بۆ یەکەمین بەدیارکەوتنی چین بکات، واتا گەمە ئۆلۆمپییەکانی سالی ٢٠٠٨، ئەوا پیاوێکی ئەمریکی هەلبژارد کە ئەویش ستیڤن سبیلبرگ بوو. ناتوانین بلێین کە هیند و یابان ڕێگەیان بەوە دەدا کەسێکی بیانی ڕۆلێکی ئاوایان بۆ بگێڕێت.

هەروەها چین گەورەترین پارەداری جیهانە، یەدەگی دراوە بیانییەکانی ١.٥ تریلیۆن دۆلارە و بەڕێژەی ٥٠٪ لە هی یابانی هاوسێی و بە سێ هێندە لە مولك و داراییەکانی کۆی یەکیەتیی ئەورووپا زۆرترە. ڕاستە کە لەوانەیە هەلگرتنی ئەو یەدەگە زەبەلاحە سیاسەتێکی دلنیایانە بێت، لەوانەشە پێچەوانە بێت، بەلام بێگومان ئاماژە بە توانایە زۆرباشەکەی چین دەکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێدمە و قەیرانەکان. بەکورتی ئەوانەی لەسەرەوە باسمانکردن بێهاتاویی چینیان پێکهێناوە. چین مەزنترین ولاتی جیهانە و ئابوورییەکی هەیە کە لە ئابووریی گشت شوێنەکانی دیکە زیاتر گەشە دەکات، هەروەها گەورەترین کارگە و دووەم گەورە بەکاربەر و گەورەترین ولاتە لە پاشەکەوتکردن و دووەم ولاتە لە خەرجییەکانی سەربازیدا[*]. چین شوێنی ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا ناگرێتەوە وەك مەزنترین هێز لە جیهاندا، هەروەها وەك ڕوونە لە هەر یەکە لە

[*]) گرژمەی فەرمیی سەربازیی چین دەبێتە پێگەی سێیەم لە جیهاندا، واتا لە دوای ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا و بەریتانیا دێت. بەلام ژمارێك لە لێکۆلەرانی هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ژمارێك لە خەرجییەکانی مەزن ناچنە نێو لیستی گرژمەی فەرمی. ئەمەیش وا دەکات کەوا چین لە خەرجیی سەربازیدا پێگەی دووەم داگیربکات ( جا ئەگەر بە جیاوازییەکی زۆر دووریش بێت) لە دوای ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا دێت. .

بوارەکانی سەربازی و سیاسی و ئابووریشدا لە چەند دەیەیەکی داهاتوودا پێش ئەمریکا ناکەوێت، بەڵام لە زۆر لایەندا (یەك لە دوای یەك) دووەم گرنگترین وڵاتە لە جیهاندا و ڕەگەزێکی نوێی هەمەکی بۆ سیستمی نێودەوڵەتی زیادکردووە.

## پلانی سەرکەوتووانەی مەرکەزی؟

لە ڕاستیدا، هەندێك کەس هەن گومان لە دۆسییەی ئابووریی چین دەکەن. هەندێك ڕۆژنامەوان و شرۆڤەکار باوەڕیان وەهایە کە ژمارەکان زۆر ورد و تەواو نین، هەروەها گەندەڵی لەو وڵاتەدا بڵاوبووەتەوە و بانکەکانی لەسەر لێواری خەرەندن و گرژییە هەرێمییەکانیشی لە بەرزبوونەوەدان، هەروەها نەبوونی یەکسانی بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار زیاتر دەبێت؛ سەرلەبەری دۆخەکە بەرەو قەیرانێکی سەداسەد هەنگاو دەنێت، دەبێ بۆ وردبوونەوەیەکی زیاتر لەم پێگەیەدا ئاماژە بەوە بکەین کەوا زۆربەیان ماوەی دوو دەیەیە ئەم قسانە دەکەن، بەڵام تاکو ئێستەیشی لەگەڵدا بێت بەلای کەمەوە پێشبینییە سەرەکییەکەیان نەهاتۆتە دی کە ئەویش داڕووخانی سیستمە نوێیەکەیە. ڕاستە چین بەدەست چەندان گرفتەوە دەناڵێنێ؛ بەڵام وەك هەر وڵاتێکی گەشەسەندووی دیکە هێشتا شتێکی لەدەستماوە لەپێناو وەدیهێنانیدا بیکات: ئەویش گەشەکردنی بەهێزە. لەمبارەیەوە، یەکێك لە بەناوبانگترین ڕەخنەگرانی سیستمەکە کە مینکسین بیی ناوە، دەڵێت" بەبەراورد لەگەڵ وڵاتانی دیکەی گەشەسەندوودا، سەربردەی چینی لە هەر سەربردەیەکی دیکە سەرکەوتووترە کەوا دەکرێ بێتەوە یادمان".

سەبارەت بە سیستمی کۆمۆنیزم، یەکێن لە پەسندکردنی سەرمایەداریدا بەڕووکەش هێندە ڕوونە کە جێگەی سەرسوڕمانە. ڕۆژێك سەبارەت بە باشترین

چارەسەر سەبارەت بە پرسی هەژاری لە گوند پرسیارم لە بەرپرسێکی چینی کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە: " لەسەرمان پێویستە واز لە بازاڕ بهێنین بۆ خۆی کار بکات، بازاڕ خەڵک لە زەوییەکانیانەوە ڕادەکێشێت و بەرەو کارگەکانیان دەهێنێ، لە کێڵگەکانیانەوە بەرەو شارەکانیان دەهێنێ. بەشێوەیەکی مێژوویی ئەمە تاکە ڕێگەی چارەسەرکردنی هەژاریی نێو گوندەکان بوو. دەبێ پارێزگەری لە وەرچەرخانە پیشەسازییەکەمان بکەین". کاتێکیش هەمان پرسیارم لە بەرپرسانی هیند یان ئەمریکیبە لاتینییەکان دەکرد، لە چەند لێکدانەوەیەکی ئاڵۆزەوە سەبارەت بە پشتگیریکردن لە گوندەکان و پێشکەشکردنی یارمەتی بە هەژاران و چەندان بەرنامەی دیکەی هاوشێوە سەرگەی خۆیان دەگرت کەوا هەرهەموویان بۆ هێواشکردنەوەی هێزەکانی بازاڕ و ئیفلیجکردنی کردەی وەرچەرخانە مێژووییەکەی پیشەسازی نەخشەیان بۆ کێشرابوو؛ کە زۆربەی جاریش ئازاربەخش بوون.

بەڵام نزیککارییەکەی یەکێن لەوانەش جیاوازە کەوا زۆرێك لە ئابووریزانانی بازاڕی ئازاد وەك ئامۆژگاری پێشکەشیان کردبوو؛ چەند بەرنامەیەك بوون کە لەهەموو ئاستەکاندا لە چەند ڕیفۆرمێکی هاوکاتانە پێکهاتبوو و هەندێکجار بە کوڕایی واشنتۆن ناودێر دەکرا. لەمانەیش گرنگتر ئەوەیە کە نزیککارییەکەی لە چارەسەری بە هێدمە جیاوازە کەوا ڕووسیا لە قۆناغەی بۆریس یەڵتسیندا پشتی پێبەستا و ڕێبەرانی چینی زۆر بەوردی شرۆڤەیان کرد و بەزۆریش وەك نموونەیەکی نەرێنی وەك بەڵگە دەیانهێنایەوە، هەروەها لەم بارەیەشەوە لەگەڵ وەسفە کورت و بەسوودەکەی ستڕۆپ تالبۆت هاوڕا بوون کاتێك لە ئیدارەی کلینتۆندا کاری دەکرد، ناوبراو گوتوویەتی:" زۆرێك لە هێدمە و کەمێك لە چارەسەر". یەکێن لەجیات ئەنجامدانی هێدمەیەکی گەورە نزیککارییەکی

پلەبەپلەی هەڵکشاوی هەڵبژارد، کە ناوی لێنا ستراتیژی گەورەکردنی پێگەی پۆینت (لە بیرکاریدا). چوونکە لە جیات داخستنی یەکسەری گشت پڕۆژە ناکارایەکان و کۆتایی هێنان بە قەرزەکانی خراپ و یاسادانان بۆ تایبەتکردنی کەرتەکانPrivatization بە شێوەیەکی فراوان، چین چەند سیاسەتێکی گرتەبەر کەوا لەهەمبەر ئەو جومگە شکستخواردووانەدا دەستی بە گەشەپێدانی ئابووری کرد بەشێوەیەك ئەم بابەتە و پرسە خراپانە لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا لە ئابووریی تێکڕایی (پێگەی پۆینت) ببنە بەشێکی بچووك و بچووکتر. جا بەهۆی ئەمەوە، پەکین کاتی پێویستی بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی بەشێوەیەکی پلەبەپلە کڕی. ئێستەیش دوای دە ساڵ لە هاندانی زۆربەی شارەزایان بۆ ئەنجامدانی ئەمە، دەستی بە خاوێنکردنەوەی بانکەکانی و کەرتەکانی ئابووری کردووە، بەخێراییەکیش ئەم کارە ئەنجام دەدات کەوا زۆر لەو ئامۆژگارییانە خاوترە کەوا شارەزایان پێشنیازیان کردووە. جگە لەمانەیش، چین لە ئێستەدا لەسایەی ئابوورییەکدا ئەو ریفۆرمانە ئەنجام دەدات کەوا قەبارەکەی دوو هێندەی جارانە و هەمەچەشنییەکەی بە ئاستێکی زۆر بەرز زیادی کردووە. ئەمە جۆرە سەرمایەدارییەکە بە تایبەتمەندی و مۆدێلی چینی.

شیمانەی ئەوە نەدەکرا پلانی مەرکەزی سەرکەوتن وەدەستبێنێ. لە ڕاستیشدا بە مانایەك لە مانایەکان تەنانەت لە چینیشدا سەرکەوتوو نەبوو. چوونکە زانیاریی پەکین و هەژموونی بەسەر شوێنەکانی دیکەی چین زۆر لەوە کەمترە کە حەزی لێدەکات و بیانییەکان خەیاڵی بۆ دەکەن. بەڵگەیش بۆ ئەمە پشکی حکوومەتی مەرکەزیی چینییە لە داهاتەکانی باجدا کە نزیکەی سەدا پەنجایە. هەمان ئەم ژمارەیە بۆ حکوومەتی فیدراڵیی ئەمریکی (کە بەپێی پێوەرەکانی نێودەوڵەتی حکوومەتێکی لاوازە) نزیکەی سەدا حەفتایە. بە واتایەکی دیکە،

کەمکردنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی لەهەمبەر سیاسەتی پێشخستندا لە نێستەدا لە چیندا تایبەتمەندییەکی ئابوورییە، هەروەها لە ژیانی سیاسیشدا روونتر و روونتر دەبێت. کەمکردنەوەی هەژموون و کۆنترۆڵەکەش بەمەبەستە، چوونکە حکومەت لە زۆر ناوچەی چیندا پێشخستنی بازاڕی ڕاستینی ئازاد هان دەدات، هەروەها ئابووریش بەڕووی وەبەرهێنان و بازرگانیی دەرەکیدا دەکاتەوە و لەپێناو پیادەکردنی ریفۆرم لە ئابووری و جڤاکەیدا سوود لە ئەندامبوونی خۆی لە ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی وەردەگرێت. زۆربەی سەرکەوتنەکانیشی (زۆربوونی پرۆژەکانی بازرگانی) و شکستەکانی (دلپەزینی چاودێریی تەندروستی)، بەهۆی لاوازیی هەماهەنگیی نێوان مەرکەز و هەرێمەکانییەوەیە. ئەم گرفتەیش– واتا کەمبوونەوەی خێرای مەرکەزییەت– دەبێتە گەورەترین بەرەنگاربوونەوە بۆ چین، دواتر دێنە سەر باسکردنی ئەم لایەنە.

لێرەدا زۆر پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە چین ناچار نییە بۆ گەلەکەی بگەڕێتەوە؛ گەلێك کە لە زۆربەی کاتەکاندا زۆر بارمەتیی پەکینی داوە بۆ ئەوەی ستراتیژەکانی جێبەجێ بکات. هەندێك حکوومەتی دیکە، کە زۆر بە نیرەییەوە چاودێریی ڕووداوەکانی چین دەکەن، درکیان بەو ڕاستییە کردووە. چوونکە بەرپرسانی هیند حەز دەکەن ئاماژە بەوە بکەن کە هاوتا چینییەکانیان ناچارنین سەبارەت بە دەنگدەران دووچاری نیگەرانی بین. ئەندامێکی گرنگی حکوومەتی هیندی پێمی گوت: " ئێمە ناچارین لەڕووی سیاسییەوە شتی زۆر خۆشەویستانە ئەنجام بدەین، بەڵام ئەو شتانە حەکیمانە نین. ئەمە لە دوورمەودادا تواناییەکانی ئابووریمان لاواز دەکات. سیاسییەکان لە نزیکمەودادا پێویستیان بە دەنگی دەنگدەرانە. بەڵام چین دەتوانێ پشت بە ڕوانگەیەکی دوورمەودا و دووربین ببەستێ. هەرچەندە هەموو شتێك بەشێوەیەکی دروست ئەنجام نادات، بەڵام

زۆرێك لە بڕیاری زیرەكانە و دووربینانە دەدات". ئەمە بەڕوونی لە گرنگیدانی هەنووكەیی بە فێركردن دەبینـدرێ. چـوونكە حكوومـەتی مەركـەزی وەك ڕركکردنێك بە پێداویستیی وڵاتەكە بەهێزی مەشقپێكراوی كار لە باشترین ئاستدا و لـەپێناو بەرزكردنـەوەی بـەهای ئابووریـدا، خـۆی پابەنـدكردووە بـەهای بەخشینەكانی (منحه) فێركردن و جۆرەكانی دیكەی یارمەتی لە ساڵی ٢٠٠٨دا بە ڕێژەی ٢.٧ ملیار دۆلار بەرزبكاتەوە، دەبێ ئەوەش بزانین كە ئەم بەخشین و تەرخانكردنی پارەیە لە ساڵی ٢٠٠٦دا نزیكەی ٢٤٠ ملیۆن دۆلار بوو. هەروەها بەرپرسان پلان بۆ زیاتركردنی ئەو خەرجییە حكوومییە دادەڕێژن كە لە ساڵی ٢٠٠٦دا ڕێژەی ٢.٨٪ تێكڕای داهاتی نێوخۆیی بۆ تەرخان كرابوو، دەیانەوێ لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠١٠دا لە تێكڕای داهاتی نێوخۆییدا ڕێژەی ٤٪ بۆ ئەم خەرجییە حكوومییە تەرخان بكەن كە بەشێكی زۆریشی بۆ چەند پەیمانگەیەك خەرج دەكرێ كەوا لەسەر ئاستی جیهانیدا دەستەبژێر و كێبڕكێكارن. بەڵام لەوانەیە ئەم جەختكردنەوە و گرنگیدانە لە هێندی دیموكراسیدا ئەستەم بێت، بۆنموونە: لەو كاتەی داهاتی زەبەلاح بۆ ڕیكلامە كورتەوداییەكانی ڕازیكردنی دەنگدەران خەرج دەكرێ، (ئەوا پەیمانگەكانی دەستەبژێری فێركاری لە هیند دا بەبەراورد لەگەڵ ئەوەی لە چیندا هەیە، لەپێناو كەمكردنەوەی ژمارەی ئەو قوتابیانەدا ڕووبەڕووی فشار دەبنەوە كەوا بەپێی شایستەیی و توانای خۆیان لەو پەیمانگەیانەدا وەرگیراون، لە هەمان كاتیشدا نیوەی قوتابیان لەسەر بنەمای پشكی ڕێژەیی و بەپێی سیاسەتی دانانی ئاستێك بۆ هەڵاواردن وەردەگیرێن).

بۆ حكوومەتێكی نا دیموكراسی هیچ باو و ئاسایی نییە بۆماوەیەكی زۆر لە گەشەكردندا بەكارایی سەركەوتن وەدەستبێنێ. زۆربەی حكوومەتەكانی دڵپڵۆسێنەر بەخێرایی گۆشەگیر و گەندەڵ و دەبەنگ دەبن؛ باشترین بەڵگەش بۆ

ئەمە مارکز و مۆبزتۆ و مۆگابین (جا لە دۆخێکدا ئەگەر یەکێك باسی لە چەند لێکدانەوەیەکی ڕۆشنبیری کرد، ئەوەی وەبیر دێنەوە کە دۆسییەی حکومەتی چینی لەسەردەمی ماودا زۆر خراپ بووە). بەلام ئێستە حکومەتی چینی، هەرچەندە هەڵەی هەیە، بەلام پارێزگەری لە ڕەگەزی پراگماتیکی و کارامەیی دەکات. کەسێکی پایەبەرزی بواری بانکی لەمبارەیەوە دەڵێ:" لەگەڵ زۆربەی حکومەتەکانی جیهان مامەڵەم کردووە، بەلام حکومەتی چینی زیاتر سەرنجڕاکێش و سەرسامکارە". ئەمە بۆچوونی زۆربەی ئەو پیاوانەی کارە کەوا سەردانی چین دەکەن، وەك بیل گیتس کە لە ساڵی ۲۰۰۷دا بە گۆڤاری فۆرچنی ڕاگەیاند: " لەسەر خەڵك پێویستە.... حوکمەکانی هەڵسەنگاندنی خۆیان لەگەڵ ئەو شتانە بەراورد بکەن کەوا بەردەوامی بە باشترینی دادەنێن. بەشێوەیەکی کەسی ئەوەم بۆ ڕوونبوویەوە کە سەرکردەکانی چین گرنگییەکی زۆر بەو شتانە دەدەن".

بەلام ئەم وێنەیە وێنەیەکی تەولو نییە. چوونکە هەرچەندە چین بەخێراییەکی زۆر گەورە گەشە دەکات و بەختی لە گشت ئاستەکاندا مشە و بەردەستە، بەلام دەوڵەتەکە- بەهۆی نزیککارییی لە ڕیفۆرمێکی پلەبەپلە- هێشتا هەژموونی بەسەر زۆرێك لە ئاستە بەرزەکانی ئابووریدا هەیە. چوونکە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت. ئەو دەستگەیانەی موڵکی دەوڵەتن نزیکەی نیوەی تێکڕای بەرهەم و داهاتی نێوەخۆیی چینییە. چوونکە لەنێو ۳۵ گەورە کۆمپانیای بازاڕی شتنگهای بۆ پشکەکان، ۳٤ کۆمپانیا یان بەتەواوی یان بەشێوەیەکی بەشەکی موڵکی دەوڵەتن. بەزۆریش کۆنترۆڵی دەوڵەت دژ بە پایەداری و دەستپاکی و کارامەییە. چوونکە بانکەکانی چین- کە لە زۆربەی دۆخەکاندا هێشتا چەند ئەوارەیەکی حکومین- ساڵانە لەبنیاو پاڵپشتیکردنی کۆمپانیاکانی لاوازدا دەیان ملیار دۆلار

دابەش دەکات و بەچەند هۆیەک پارە بۆ هەرێم و کۆمەڵە و چەند کەسانێک دەنێرێ کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئابوورییەوە نییە. وەهاش دێتە بەرچاو کە گەندەڵی لە زێدەبووندایە و ڕێژەی ئەو دۆخانەی کەوا بەرپرسانی پلەبەرز دەگرێتەوە لە ڕێژەی ١.٠٧٪ی ساڵی ١٩٩٩دا گەیشتە ٦.١٪ ساڵی ٢٠٠٢. هەروەها جیاوازییەکانی نێوان هەرێمەکان ڕوو لە زیادبووندایە و نەبوونی یەکسانیش بەخێراییەکی زۆر زیاد دەکات، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی گرژیی کۆمەڵایەتی لێ بکەوێتەوە. لەمبارەیەوە ئامارێکی گوزارشتکار هەیە- کە لەلایەن حکوومەتەوە دەرچووە- زۆر پشتی پێ دەبەسترێ: لە ساڵی ٢٠٠٤دا ٧٤.٠٠٠ خۆپیشاندانی ناڕەزایی جۆراوجۆر لە چیندا ڕووی ئەنجام دران. پێش دە ساڵ لەمەوبەریش تەنیا ١٠.٠٠٠خۆپیشاندان کرا.

لەگەڵ ئەمەیشدا دەتوانین ئەم دوو وێنە جیاوازە بەیەکەوە بگونجێنین. چوونکە لە زۆربەی دۆخەکاندا، گرفتەکانی چین لە سەرکەوتنەکانییەوە سەرچاوەیان گرتووە. چوونکە ئەو گەشەکردنە نایاب و ناوازەیەی ئابووری، گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی ناوازەی دروستکردووە. چین کردەی وەرچەرخانی دووسەد ساڵی پیشەسازی خۆرئاوای تەنیا لە سی ساڵدا ئاخنیوە. لە هەموو ڕۆژێکدا، دەیان هەزار کەس لە گوندەکانەوە کۆچ دەکەنە شارەکان و لە کێڵگەکانەوە دەچنە کارگەکان و لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات دێن، ئەو هاتنەش هێندە خێرایە کە مێژوو پێشتر هەرگیز دیاردەی وەهای بەخۆیەوە نەبینیوە. ئەو کەسانە هەر تەنیا بەشێوەیەکی جوگرافییانە کۆچ ناکەن، بەڵکو لەدوای خۆیاندا خانەوادە و چین و مێژوویەک بەجێدەهێڵن. لەبەرئەوە، سەیر نییە کە حکوومەتی چینی هەرگیز چاری خۆی لەو قوڵبوونە کۆمەڵایەتییە نەپۆشێ. مینکسین پێی سەبارەت بە کەمبوونەوەی توانای حکوومەتی چینی لە نێو قسەکانیدا ئەوە بەدیاردەخات

کە ئیدی دەستهەلاتەکان وەك جاران تەنانەت ناتوانن مامەڵە لەگەڵ پرسێکی سادەی وەك سەلامەتیی رێگەکانیش بکەن، چونکە رێژەی مردن بەهۆی رووداوەکانە بۆ هەر ١٠.٠٠٠ ئوتومبیلێك ٢٦ حاڵەتی مردنە (بە بەراورد لەگەڵ ٢٠ لە هیند و ٨ لە ئەندۆنیسیا)، بەلام زۆر گرنگە ئاماژە بەوە بکەین کە ژمارەی ئوتومبیلەکانی سەر رێگەکانی چین سالانە بەرێژەی ٢٦٪ زیاد دەکات و لە هیندستاندا ١٧٪ و لە ئەندۆنیسیا ٦٪. جا کاتێك هیند لە رووی گەشەکردنەوە بەسەر چیندا زاڵ دەبێت، بێگومان ئەم مەبەستەشی هەیە- من گرەو دەکەم کە ئەویش بەرزبوونەوەی رێژەی رووداوەکانی هاتووچوو بەخۆیەوە دەبینێ، جا ئەگەر دەوڵەتێکی دیموکراسی بێت یان نا.

چاوێك بە دەرئەنجام و کاریگەرییەکانی گەشەکردنی چین لەسەر ژینگەدا بگێرەوە؛ نەك بە نیسبەت هەموو گۆی زەوی بەڵکو تەنیا بە نیسبەت چین. ٢٦٪ ئاوەکانی گەورەترین رووبارەکانی چین هێندە پیسن کە ئیدی توانای بەرێوەبردنی ئەرکە سەرەکییە ژینگەییەکەی خۆیانیان لەدەست داوە". تەنیا بەدرێژایی رووباری یانگتزی نۆ هەزار کارگەی کیمیایی هەیە. هەروەها پەکین پێشتر لە پیسبوونی هەوادا پلەی یەکەمی داگیر کردبوو. لەنێو دانیشتووانی شارەکانی چیندا کە ژمارەیان ٥٦٠ ملیۆنە ١٪ ی دانیشتووانەکەی هەوایەك هەڵدەمژن کە بەپێی پێوەرەکانی یەکێتیی ئەورووپا بە پاك و دروست دادەندرێ. بەلام، لێرەدا جێگەی خۆیەتی ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە گۆی ئەو ژمارە و خەملاندنانە لە حکومەتی چینییەوە دێن. لە راستیدا رەچاوکراوەکانی ژینگەیی لە بەرنامەی کاری پەکیندا پلەیەکی بەرز داگیر دەکەن و لە هی گشت ولاتانی دیکەی تازە گەشەسەندوو بەرزترە. هەروەها گەورە بەرپرسانی چینی باس لە پێداویستیی تێکرایی بەرهەمێکی سەوز و لۆکالی و گەشەیەکی هاوسەنگ

دەکەن، هەروەها ڕەچاوکراوەکانی ژینگەیی بەشێوەیەکی زۆر گرنگ و بەرجەستە لە پلانی سەرۆك هیو جینتاو دێت کە سەبارەت بە گەیشتن بە جڤاکێکی ڕێکوپێك و گونجاوە. لەم چوارچێوەیەدا، دەستگەیەکی ڕاوێژکاریی خۆرئاوایی لە چیندا شرۆڤەی چەند یاسایەکی نوێیان کردووە کەوا تایبەتە بە پیسبوونی هەوا، ئەو دەستگەیە وەها مەزەندەی کردووە کە داواکاری لەسەر ئەو بەرهەمانەی کەوا بەشۆکەی هەوا لادەدەن و لەنێوی دەبەن، بە ڕێژەی ۲۰٪ زیاد دەکات، ئەمەیش بازاڕێك بەرهەمدەهێنێ کەوا بە دە ملیار دۆلار مەزەندە دەکرێ. ئای لەو گرفتە دژوارەی کەوا پەکین دەیەوێ مامەڵەی لەگەڵدا بکات: کەمکردنەوەی ڕێژەی هەژاری پێویستی بە گەشەکردنێکی بەهێز هەیە، گەشەکردنیش واتا پیسبوون و تێکچوونی ژینگەیی.

گرفتە گەورەترەکە کەوا چین لەکاتی پێشکەوتنیدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، لەوەدا خۆی نابینێتەوە کە حکومەتەکەی بە شێوەیەك شەڕخوازە کە هەرگیز چارەسەر ناکرێ، بەڵکو خۆی لەو مەترسییەدا دەبینێتەوە کە حکوومەت توانای پاراستنی یەکبیەتیی جڤاك لەدەست بدات؛ ئەم گرفتەیش لە دوو تونێی خۆیدا کەمکردنەوەی خێرای دەستهەڵاتی مەرکەزی لەخۆ دەگرێ بەڵام زۆر لەوەش دوورترە. قۆرغکردنی دەستهەڵات لە لایەن حکوومەتەوە ڕێگەی بۆ خۆشکردووە ریفۆرمی فراوان و خێرا پیادە بکات، چوونکە لە توانایدا هەبووە خەڵك و سەرچاوەکان بەپێی پێداویستی ئاراستەی ئەو شوێنانە بکات کەوا پێویستیان پێیان هەیە. بەڵام ئەو بڕیارانەی کەوا بوونە هۆی دروستبوونی ئەو پرس و قەیرانانە، واتا شڵەژانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی، هەروەها دابڕانی حزبی کۆمۆنیستی و بونیادە پلەبەندییەکەی توانای چارەسەرکردنی ئەو شڵەژانانەی کەمتر دەکەنەوە. چوونکە پارتی کۆمنیستی چینی- پارتی کرێکاران و

جووتیاران- لە ڕاستیدا یەکێکە لە ڕێکخراوە هەرە دەستەبژێرەکانی جیهان. لە سێ ملیۆن کەس (ژن و پیاو)ی مەدەنی و خوێندەواری پلەبەرز پێکهاتووە، ئەم کۆمەڵەیەش هەرگیز نوێنەرایەتیی جڤاکێکی فراوانی ئەو جووتیارانە ناکات کەوا سەرکردایەتیان دەکات. کەمینەیەکی زۆر کەمی گەورە بەرپرسەکانی کارلەمەی سیاسییانەی گشتیی ڕاستینیان هەیە. بەلام ئەو پاڵپشتکرلوانە بەزۆری لە پسپۆڕییەکانی خۆیان و لە مانۆڕە حزبییەکانی نێوخۆیی و هونەری چاوێری و گرنگیپێدانی سیاسی (یان مەحسوبیەتی سیاسی) زۆر کارامە و شارەزان. لەسەر ئێمە پێویستە ئەوە ببینین کە ئاخۆ ئەو سەرکردانە لەگەڵ ژیانی گشتیی سیاسیدا کاریزما و توانای ڕەفتارکردنیان هەیە - ئەو کارامەییانەی کە لەپێناو حوکمکردنی گەلێک پێویستیان پێی هەیە کە خۆی ۱.۲ ملیار مرۆڤ دەدات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ متمانەبەخۆکردنی زیاتر دەبێت.

لە شوێنەکانی وەک تایوان و کۆریای باشووردا -لە حەفتایەکان و هەشتایەکاندا- گەشەکردنی ئابووری لەگەڵ ڕیفۆرمە پلەبەپلەکانی یاسایی و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا هاوکات بوو. ئەم دوو ڕژێمە توندوتیژبوون بەلام زۆرەملێیانە و ملهوڕ و داپلۆسێنەر نەبوون- جیاکردنەوە گرنگە- لەبەرئەوە هەوڵیان نەدا بەتەواوی کۆنترۆڵی جڤاک بکەن، ئەمەیش وایکرد شلکردنەوە و لادانی دەستەکە ساناتر بێت. جگە لەمانەیش ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا- پاڵپشتە داراییە هەرە گەورەکەیان- لەپێناو کرانەوەی سیستەمەکانیان فشاری خستنەسەر. بەلام پەکین ئەم فشارەی لەسەر نییە. ئەو وەرچەرخانەی کەوا چین بەخۆیەوەی دەبینێ وا دەکات بونیادەکانی زۆرەملێیی و ئاکرەوییەکەی هەڵبوەشێنەوە یانیش لە هەندێک شوێندا کاریگەرییەکەی خۆیان لەدەست بدەن. چوونکە خەڵک لە جاران زیاتر بژێو و ئازادییەکی زۆرتریان هەیە.

هەروەها دەتوانن کار بکەن و جێگۆڕکێ بکەن و موڵکیان هەبێت و دەست بە پرۆژەکانی بازرگانیی تایبەت بەخۆیان بکەن. لەگەڵ گۆڕی ئەمانەیشدا، بەرزەفتکردنی سیاسی هێشتا هەر بەهێزە و لە چەند شوێنێکی گرۆکیی دیاریکراویشدا چەند ئاماژەیەکی بەهێز بۆ هەبوونی هەن، بۆنموونە: یەکێ سیستمێکی ئاڵۆزی چاودێریکردنی ئینتەرنێتی پێشخستووە؛ هێندەش کارایە کەوا مرۆڤ دووچاری سەرسوڕمان دەکات.

پارتی کۆمۆنیست هێز و کاتێکی گەلێك زۆر لە نیگەرانیی تایبەت بە سەقامگیریی کۆمەڵایەتی و ناڕەزایی میللیدا تەرخان دەکات. بێگومان ئەمەیش ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی گرفتێك بووەتەوە کەوا ڕەهەندی بێسنوور و نادیاریکراو و بێ چارەسەری هەیە. ئەمە لەگەڵ دراوسێیە باشوورییەکەی چیندا بەراورد بکە. چەندان پرسی جۆراوجۆر هەن کە سیاسییەکانی هیند نیگەران دەکەن- گرنگترینیان دۆڕانە لە هەڵبژاردنەکان- بەڵام زۆر بەدەگمەن لەهەمبەر ڕوودانی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی یان ڕزگاربوون لە خودی سیستمەکە دووچاری نیگەرانی دەبن. ئەوان لە ئەگەری سەرهەڵدانی خۆپیشاندان و مانگرتنەکان دووچاری تۆقین نابنەوە، بەڵکو بە بەشێکی سروشتیی گفتوگۆیەکی ئاسایی نێوان دەستەڵاتدار و جەماوەری لێکدەدەنەوە. هەروەها ئەو حکوومەتانەی لە شەرعیبوونی خۆیان دڵنیان، لە ڕێکخراوێکی وەك Falun Gong ناکەونە گومانەوە کەوا ئەندامەکانی لەپێناو مەشقکردنی تایبەت بە هەناسەدان کۆدەبنەوە.

زۆرێك لە نووسەرانی ئەمریکی لە بانگەشەیەك پەلە دەکەن و باوەڕیان وەهایە چین نادروستیی ئەو بیرۆکەیە دەسەلمێنێ کەوا ئەوە پیشان دەدات کە ڕیفۆرمەکانی ئابووری دەبنە هۆی ڕیفۆرمی سیاسی!یان سەرمایەداری دەبێتە

هۆی سەرهەڵدانی دیموكراسی. لەوانەیە ئەوە بەدیاریكەوێ كە چین لەو دەستوورەدا دەرهاویشتە بێت، بەڵام جاری زۆر زووە پێشبینیی ئەمە بكەین. دەستوور و بنەمایەكە لە گشت شوێنەكاندا و هەر لە ئیسپانیاوە بگرە تا دەگاتە یۆنان و كۆریای باشوور و تایوان و مەكسیك، راستیی خۆی سەلماندووە ئەویش ئەوەیە كە ئەو وڵاتانەی پشت بە ئابووریی بازاڕ دەبەستن و هیوای نوێخوازییان هەیە، كاتێك دەگەنە قۆناغی داهاتی مامناوەندی (لە نێوان ٥.٠٠٠ و ١٠.٠٠٠ دۆلاردا) لە ڕووی سیاسییەوە دەست بە گۆڕانكاری دەكەن. جا لەبەرئەوەی دەرامەت لە چیندا هێشتا لەژێر ئەو ئاستەدایە، زۆر ناكردەییە بڕیاری لەسەر ئەوە بكرێ كە ئەم وڵاتە بنەما و دەستوورەكەی شكاندووە. شتێكی بەڵگەنەویستە كە چین لە پانزە ساڵی داهاتوودا ڕووبەڕووی تەنگوچەڵەمە و بەرەنگاریی گەورە دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەمە مانای ئەوەش نەبێت كە لە ماوەی شەو و ڕۆژێكدا چین دەبێتە وڵاتێكی دیموكراسیی لیبراڵیی وەك نۆرمی خۆرئاوایی. وەها چاوەنواڕ دەكرێ وڵاتی چین یەكەمجار بۆ سیستمێكی تێكەڵاوی هاوشێوەی زۆرێك لە وڵاتانی خۆرئاوایی سەدەی نۆزدەیەم و وڵاتانی خۆرئاوای ئاسیا لە حەفتایەكان و هەشتایەكاندا پێش بكەوێ كە بەشداریی میللی و ڕەگەزەكانی دەستهەڵاتی باوكانە و دەستەبژێریان لەگەڵ یەكتریدا ئاوێتە كردبوو. دەبێ ئەوە بزانین كە ژاپان یەكێكە لە پێگەیشتووترین سیستمی دیموكراسیی خۆرهەڵاتی ئاسیا كە تیایدا حزبی حوكمڕان ماوەی شێست ساڵە دەستهەڵاتی لەدەست نەداوە.

لە كۆتاییەكانی ساڵی ٢٠٠٦دا لە ضین وین جیاباوی سەرۆكوەزیرانی چینیان پرسی -- لەنێو كۆبونەوەی لەگەڵ شاندێكی سەردانیكاری ئەمریكی- كە ئاخۆ مەبەستی سەركردەكانی چین لە وشەی دیموكراسی چی بوو كاتێك باسیان لەوە

کرد کە چین بەرەو دیموکراسییەت دەچێت. وین ئەوەی بۆ ڕاڤەکردن کە لە سێ ڕەگەز و پێکهاتە پێکدێت: " هەڵبژاردن، سەربەخۆیی دادگەیی، سەرپەرشتیکردنی بناغەی هاوسەنگیی دەستەهەڵاتەکان". جۆن سۆرنتۆنی بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە دەستگەی گۆڵدمان ساکس و شارەزا لە کاروباری چین کەوا سەرۆکایەتیی شاندەکەی دەکرد، بۆ ئەو سێ لایەنەی لەسەرەوە باسکرا، دەستی بە گەڕان و بەدواداچوون کرد و بینی ڕووگەگیری و ئاراستەیەکی (کەم) بەرەو هەڵبژاردنەکانی هەرێمی و زۆرێك لە ڕێکارەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی و ئاراستەگرییەکی زیاتر بەرەو چاکترکردنی سیستمی یاسایی هەیە. لە ساڵی ١٩٨٠دا، دادگەکانی چین ٨٠٠,٠٠٠ پرسیان وەرگرت، لە ساڵی ٢٠٠٦دا دە هێندەی ئەو ژمارەیەی سەرەوەیان وەرگرت. بەڵام ئەو دوا وێنە و دەرئەنجامەی کەوا سۆرنتۆن وەدەستی هێنا– لە وتارێکی بابەتیدا نووسی و لە گۆڤاری فۆرین ئەفێرز بڵاوبوویەوە– باسی لە سیستمێك دەکرد کە زۆر بەهێواشی بەڵام بەشێوەیەکی هەڵکشاو بەرەو زۆرێك لە بەرپرسیاریەتی و کرانەوە دەچێت.

بەڵام لەوانەیە هەنگاوەکانی هەڵکشاو بەس نەبن. لەسەر کۆمۆنیستەکانی دەستەهەڵاتداری چین پێویستە ڕێوشوێنەکانی مارکسی مامۆستایان بخوێننەوە یانیش دووبارە چاوی پێدا بگێڕنەوە. ڕاستە کە کارڵ مارکس ئابووریناس و ئایدۆلۆژیستێکی خراپ بوو، بەڵام زانایەکی بەهرەمەندی کۆمەڵایەتی بوو. لە یەکێك لە تێبینییە سەرەکییەکانیدا هاتووە کە کاتێك جڤاکێك بونیادە ئابوورییەکەی دەگۆڕێت، ئەوا ئەو سیستمە سیاسییەش گۆڕانی بەسەردا دێت کەوا لەسەری بونیاد نراوە. هەروەها مارکس جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کاتێك جڤاکەکان زیاتر بەرەو دیموکراسییەت دەچن، زیاتر پاڵپشتیی لە ئابووریی بازاڕ دەکەن. مێژووش سەلمێنەری ئەو پەیوەندییەی نێوان ئابووریی بازاڕ و

دیموکراسییەتە. چوونکە جگە لەو وڵاتانەی کەوا دەوڵەمەندییان بەهۆی نەوتەوەیە، تەنیا یەك دەوڵەت لە جیهاندا هەیە کە ئاستێکی خۆرئاواییانەی پێشکەوتنی ئابووریی بەخۆیەوە بینیوە، کەچی هێشتا نەگەیشتووەتە پیادەکردنی دیموکراسییەتێکی تەواو، ئەویش سەنگافوورەیە. بەڵام سەنگافوورە کە دەوڵەتێکی بچووکە دەستەبژێرێکی دەستەڵاتداری هەیە کە لە ڕووی هێزەوە زۆر نائاساییین- دەرهاویشتنەکە بە نائاسایی دەمێنێتەوە. زۆرێك لە سەرکردەکان هەوڵیان دا ئەو شتانە دووبارە بکەنەوە کەوا لی کوان یو ئەنجامی دا، واتا زیادکردنی سامان و وەدیهێنانی مۆدێرنیتە و پاراستنی هەژموونی سیاسیش لە یەك کاتدا، بەڵام تاکو ئێستەیشی لەگەڵدا بێت کەسێك لەوانە سەرکەوتنیان وەدەست نەهێناوە. لەگەڵ ئەمەیشدا، سەنگافوورە زۆر بەخێرایی دەگۆڕێت، چوونکە جڤاکەکەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەکرێتەوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو لە هەندێك لایەندا (بەتایبەتیش لایەنی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی) لە گشت جڤاکەکانی خۆرهەڵاتی ئاسیا کراوەترە. بە تەماشاکردنێکی دەیان دەوڵەت لەماوەی دەیەکانی پێشکەوتنیاندا، لە کۆریای باکوورەوە بگرە تا دەگاتە ئەرژەنتین و تورکیا، مرۆڤ نموونەیەکی دووبارە دەدۆزێتەوە: ئەو ئابوورییەی کە پشتی بە خواستەکانی بازاڕ بەستووە و لە دەرامەتدا دەگاتە ئاستی مامناوەندی، لە درێژ مەودادا دەبێتە دیموکراسییەکی لیبراڵی. ڕەنگە ئەمەیش- وەك زۆرێك لە توێژەرەوەکان ئاماژەیان بۆی کردووە- لە زانستی سیاسیدا گشتاندنێکی متمانەداری گرنگترە.

زۆرێك لە نەوەی گەنجی سەرکردە لە چیندا لەو تەگەرە و کۆسپە تێدەگەن کەوا ڕووبەڕووی وڵاتەکەیان بووەتەوە و بەنهێنی باس لە پێداویستیی ئەوە دەکەن کە سیستەمەکانی سیاسی توندوتیژییەکەیان کەمتر بکەنەوە. ڕۆژنامەوانێکی گەنج کە

پەیوەندییەکی پتەوی بە سەرکردایەتیی یەکینەوە هەیە، بە منی گوت: "کەسانی زیرەکتر لە حزبدا بیر لە ریفۆرمی ئابووری ناکەنەوە، بەڵکو بیر لە ریفۆرمی سیاسی دەکەنەوە". هەندێك وەزیر لە سەنگاپوورە جەخت لەوە دەکەنەوە کە بەرپرسانی چینی زۆریك لە کاتی خۆیان بۆ شیکردنەوەی ئەو سیستمە سیاسییە تەرخان دەکەن کەوا لە لایەن لی کوان یو بونیادنراوە، هەروەها حزبی کۆمۆنیست لەپێناو هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە چۆنییەتیی سەرکەوتنی ئەو دوو وڵاتە لە بەرهەمهێنانی دەستهەڵاتێکی دیموکراسی کەوا یەك حزب هەژموونی بەسەردا هەیە، شاندێکی ناردووەتە یابان و سوید. ئەوان سیستمی سیاسی و بنەمایەکانی هەڵبژاردن و ئەو ئیمتیازە فەرمی و نافەرمییانە دەپشکنن کەوا حزب هەیەتی، هەروەها تاوتوێی ئەو تەگەرانەش دەکەن کەوا رکابەرانی کەمبەختتر لە بردنەوە ناچارن تێیبپەڕێنن. هەرچۆنێك بێت، جا ئەگەر ئەمە تەنیا چەند مەشقێکی ساختە بێت یانیش چەند هەوڵێکی هەمبەر دۆزینەوەی رێگەی نوێی پاراستنی دەستهەڵاتەکەیان بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاماژە بەوە دەکات کە حزب درك بەوە دەکات کە پێویستی بە گۆڕانە. وەلێ ئەو تەگەرە و بەرەنگارییەی رووبەرووی چین دەبێتەوە تەکنۆکرانی نییە، بەڵکو تەگەرە و بەرەنگارییەکی سیاسییە، پرسەکە دووبارە رێکخستنەوە و مشتومالکردنی دەستهەڵات نییە، بەڵکو وازهێنانە لە دەستهەڵات! وێرانکردنی بەرژەوەندییەکانی تایبەت و هەڵوەشاندنەوەی تۆڕەکانی چاودێری و وازهێنان لە ئیمتیازەکانی باو و ناسراوە. هیچ یەکێك لەمانەیش واتای وازهێنان لە دەستهەڵات ناگەیەنێ- بەلای کەمەوە هێشتا نا- بەڵام واتای تەنگکردنەوەی بازنەی ئەو کۆنترۆڵە و دەستهەڵاتە و رۆڵ و توانایەکانیەتی. پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: هەرچەندە ئەو هەموو مەشقە نوێیەی بەڕێوەبردن دەکرێ، ئایا حزبی

کۆمۆنیستی چینی ئامادەیە ئەو دەستپێشخەرییە بکات کەوا قەڵەمبازێکی گەورەیە بەرەو پێشەوە؟

لە ڕاستیدا، زۆربەی ئەو دەستەڵات و سیستمە دیکتاتۆرییانەی کەوا ئابوورییەکەیان نوێبووەتەوە- تایوان و کۆریای باشوور و ئیسپانیا و پورتوگال - لەبەردەم ئەو گۆڕانکارییانە خۆیان ڕاگرت کەوا لە دوای ئەو نوێگەراییە هاتن و بەشێوەیەکی سەقامگیرتر و ڕەواتر لێی دەرچوون. یەکێتیش پێشتر ڕووبەڕووی چەندان گرفت و بەرەنگاری بوویەوە و لە خۆگونجاندن لەگەڵیدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا. جا ئەگەر دەستەڵات و سیستمەکە بەشێوەیەکی باشیش ئەو وەرچەرخانە بەڕێوە نەبات، ئەوا شڵەژانی سیاسی ناتوانێ لەبەردەم گەشەکردنی چیندا ببێتە ڕێگر. ئەوجا بەبێ ڕەچاوکردنی ئایندەی واقیعیە سیاسییەکەی، شیمانەی ئەوە ناکرێ چین لەسەر گۆڕەپانی جیهانیدا پاشەکشە بکات. بۆ نموونە لە دوای شۆڕشی فەڕەنسیدا، فەڕەنسا بەچەند قەیرانێکی سیاسیدا گوزەری کرد کەوا دوو سەدە بەردەوام بوو و دوو ئیمپراتۆر لەو ماوەیەدا بەدوای یەکتریدا و دواتریش دەستەڵاتێکی دیکتاتۆرییانەی نیمچە فاشی و چوار کۆمار هاتن. بەڵام لەنێو جەرگەی شڵەژانەکانی سیاسیدا لە ڕووی ئابوورییەوە گەشەی کرد و وەک یەکێک لە دەوڵەمەندترین وڵاتانی جیهان مایەوە.

لەوانەیە یەکێک لە هۆیە کرۆکییەکانی بەردەوامبوونی ڕێنسانس و ڕابوونی چین پەرۆشییە زۆرەکەی بێت بۆ سەرکەوتن. لە سەدەی بیستەمدا و دوای سەدان ساڵ لە هەژاری، چین داڕووخانی ئیمپراتۆری و جەنگێکی ناوەخۆیی و شۆڕشی بەخۆیەوە بینی، لە کۆتاییشدا کەوتە ژێر ڕەحمەتی تۆرمە دۆزخییە کۆمۆنیستییەکەی ماو. چین بەهۆی سیاسەتی قەڵەمبازی گەورە بەرەو پێشەوە ۳۸ ملیۆن مرۆڤی لە دەست دا! لە وەرچەرخان بۆ بەڕێوەبردنێکی بەکۆمەڵی

هاوکارییانە collectivization ئەزموونێکی دڕندانە بوو. دواتر خۆی لەنێو گۆشەگیریدا نقومکرد و لە ماوەی شۆڕشی ڕۆشنبیریدا توێژە پیشەییە دانپێدانراو و ئەکادیمییەکەی خۆی بەتەواوی لەنێوبرد. لەگەڵ هاتنی حەفتایەکانیشدا، چین هیچ هۆیەکی وەهای لەبەردەستدا نەبوو سەری خۆی پێ بەرزبکاتەوە- بەپێچەوانەی هیند کە دەکرێ شانازی بە دیموکراسییەتەکەی خۆی بکات هەرچەندە گەشەکردنە ئابوورییەکەی هێولشە- تا ئەو کاتەی ڕیفۆرمەکانی دینگ هاتنە ئاراوە. ئێستەیش، سەرکردە و پیاوانی کاری چینی و گەلەکەشی بەشێوەیەکی گشتی حەزێکی هاوبەشیان هەیە، ئەویش پاراستنی ڕەوتی چوونەپێشەوەیە و دەستدرێژی نەکردنە بۆسەر سێ دەیە لە گەشەکردن و سەقامگیرییەکی ڕێژەیی.

## شاردنەوەی ڕووناکییەکەی

هەر شتێك لەسەر ئاستی نێوەخۆیی چیندا ڕوویدات، دەتوانێ لەسەر ئاستی نێونەتەوەییدا ژیان ئاڵۆز بکات. چوونکە قەبارەی هێزەکەی — لە ڕووی سیاسی و ئابووری و سەربازییەوە- ئەوەی یەکلایی کردووەتەوە کەوا کاریگەرییەکەی لە سنوورە سروشتییەکەی خۆی زۆر تێدەپەڕێ. وڵاتی وەها بەتوانیاش هەموو ڕۆژێك لەدایك نابێت. چوونکە ئەو وڵاتانەی کە لە ئێستەدا توانادارن- ویلایەتەکانی یەکگرتوو، بریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا و ڕووسیا- ماوەی دوو سەدەیە نەگۆڕاون. زلهێزەکان بە ژنە گۆرانیبێژانی ئۆپێرا دەچن: دێنە سەر تەختەی شانۆی جیهانی و لەگەڵ چەند هەراوزەنایەکی گوێکەرکەردا لێی دەچنە دەرەوە. تۆ بیر لە سەرهەڵدان و ڕابوونی ئەڵمانیا و یابانی سەرەتای سەدەی بیستەم بکەرەوە، یان داڕووخانی ئیمپراتۆریەتی هابسبۆر و ئیمپراتۆریەتی

عوسمانی لە هەمان ماوەدا. لەم دوو ڕووداودا چەندان قەیرانی جۆراوجۆر لە بەلقان و خۆرهەڵاتی نێوەڕاستی شلەژاوی هەنووکەییدا ڕوویان دا.

لە ساڵەکانی دوایدا ئەم نموونەیە بەتەواوی بەڕێوە نەڕۆیشت، چوونکە ژاپان و ئەڵمانیای ئێستە بوونەتە دووەم و سێیەم گەورە هێزی ئابووری لە جیهاندا، بەڵام لە ڕووی سیاسی و سەربازییەوە تا ئاستێکی زۆر بە ئەنبەڵی ماونەوە. تاکو ئێستە، شین بە کەمێك هەراوزەناوە گەیشتە ئەو پێگە هەنووکەییەی خۆی. چین لە ماوەی دەیەی یەکەمی پێشکەوتنیدا– هەشتاییەکان– سیاسەتێکی ڕاستینی دەرەوەی نەبوو. یان ئەگەر بمانەوێ وردتر بین، ستراتیژییەتی گەشەکردنی ستراتیژێکی سەرەکی بوو. پەکین پێی وابوو کە پەیوەندیی باش لەگەڵ ئەمریکادا کلیلی پێشکەوتنیەتی، بەشێك لە هۆیەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چین دەیویست بگاتە بازاڕە زەبەلاحترەکان و تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووتر لە جیهاندا. لە ئەنجوومەنی ئاسایشدا چین دەنگی بۆ بەرژەوەندیی ئەمریکا دەدا یانیش لەهەمبەر ئەو پڕۆژە بڕیارانەی کەوا ئەمریکا پێشنیازی دەکردن خۆی لە بەکارهێنانی مافی ڤیتۆ بەدوور دەگرت. لە سنوورێکی فراوانتریشدا، بەپێی وەسفەکەی دینگ چین سەری خۆی بە نزمی دەهێشتەوە ئەمەیش وەك هەوڵێك بوو بۆ " شاردنەوەی ڕووناکییەکەی خۆی". تا ئێستەیشی لەگەڵدا بێت ئەم سیاسەتە – سیاسەتی دەستوەرنەدان و ڕووبەڕوونەبوونەوە– تا ئاستێکی زۆر بەرز بەردەوامە. جگە لەو شتانەی کە پەیوەندییان بە تایوانەوە هەیە، پەکین حەز بەوە دەکات خۆی لەهەموو ململانێیەکی هەمبەر وڵاتانی دیکە بەدووربگرێ. چوونکە هێشتا بیرکۆیی خۆی تەنیا لەسەر گەشەکردن چڕکردووەتەوە. باشترین نموونەش بۆ ئەم مەسەلەیە ئەو وتارە بوو کەوا سەرۆك هیۆ جینتاو لە کۆنگرەی حەڤدەیەمی حزب لەساڵی ٢٠٠٧دا خوێندییەوە و دوو کاتژمێر و نیوی خایاند،

تیایدا بە وردی و دوورودرێژییەکی زۆرەوە تیشکی خستە سەر پرسەکانی ئابووری و دارایی و پیشەسازی و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی، بەڵام بەتەواوی سیاسەتی دەرەوەی فەرامۆش کرد.

زۆرێک لە دیبلۆماسییە دێرینەکانی چین کاتێک باس لە زیادبوونی هێز و هەژموونی وڵاتەکەیان دەکرێ تووڕە دەبن. وو جیانمینی سەرۆکی کۆمکاری کاروباری دەرەوە لە چین و باڵیۆزی پێشوو لە ویلایەتەکانی یەکگرتوودا دەڵێت:" مەسەلەکە دەمتۆقێنێ. هێشتا هەر وڵاتێکی هەژارین، وڵاتێکی تازە گەشەسەندووین. نامەوێ خەڵك بەشێوەیەکی زێدەڕۆیانە بیر لە ئێمە بکەنەوە". بەهەمانشێوە و ڕەوت کسینگهای فانگی جێگری سەرۆکی بازاڕی شانگهای بۆ پشکەکان دەڵێ:" تکایە بیر لە تێکڕای دەرامەت و بەرهەمی نیوەخۆیی بۆ هەر تاکێکی ویلایەتەکانی یەکگرتوو بکەرەوە کە بیست و پێنج جار لە تێکڕای نیوەخۆیی ئێمە زۆرترە. هێشتا ڕێگەیەکی زۆرمان لەبەردەمە". ئەم تووڕەبوونە لە میانەی گفتوگۆیەکی زۆر گرنگ لەنێو چیندا پەیدابوو کە ئەوەرەکەی تایبەت بوو بەو ڕێگەیەی کەوا لەسەر پەکێن پێویستە لە بنەمای سیاسەتە دەرەکییەکەی بیگرێتەبەر. لەو ماوەیەدا، واتا لە ساڵی ٢٠٠٢دا زینگ بیجیان کە ئەو کات جێگری سەرۆکی خوێندنگەی مەرکەزیی حزب بوو، لەپێناو گوزارشتکردن لە نیازی چین بۆ هەڵکشانێکی هێمنانە لەسەر پەیژەی جیهانیدا زاراوەی هەڵکشانی پەیژەیی داهێنا. کاتێك زینگ قسەی کرد خەڵك گوێیان گرت، چوونکە سەرۆکی پێشوو هەر سەرۆك هیۆ جینتاو بوو. کاتێك سەرۆك جینتاو و ون جیاباو ئەم دەستەواژەیەیان بەکاریان هێنا پاڵپشتییەکی فەڕمی لێ کرا. بەڵام دواتر بەکار نەهاتەوە.

زۆرێك لە شیكەرەوەكانی خۆرئاوا پێیان وابوو كە گرفتەكە لە دەستەواژەكەدا، واژەی پەیژەییە، چوونكە بژارەكانی چینی لەهەمبەر تایواندا كۆتوبەند دەكرد. بەڵام لە ڕاستیدا سەبارەت بەم مەسەلەیە دابەشبوونێكی گەورەی نێوەخۆیی لەگۆڕێدا نەبوو. چوونكە چین پێشتر و ئێستەیش تایوان بە پرسێكی نێوخۆیی دادەنێ و پێی وایە تەواو مافی ئەوەی هەیە هێز بەكاربێنێت، جا ئەگەر دوا بژاری بەردەستیشی بێت. لی زینگ گوتی" لینكۆڵن لەپێناو پاراستنی یەكیەتی جەنگێكی بەڕێوەبرد، لەگەڵ ئەمەیشدا، دەتوانیت بڵێیت كە ویلایەتەكانی یەككگرتوو بەشێوەیەكی پەیژەیی هەڵدەستایەوە". بەڵام هەندێك گەورە سەركردەی چین سەبارەت بە وشەیەكی دیكەی دەستەواژەكە نیگەران بوون، ئەویش واژەی هەڵكشان و وەسەركەوتن بوو. هەندێك دیبلۆماسیی سەرەكی لە بیرۆكەی گەڕان بە سەرانسەری جیهاندا و قسەكردن سەبارەت بە هەڵكشانی چین، هەستیان بە ترس كرد. هەروەها بەشێوەیەكی دیاریكراو سەبارەت بەوە نیگەران بوون كە هەندێك لە ڕەخنەگرانی نێو ولایەتەكانی یەككگرتوو هەڵكشانی چین وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر وڵاتەكەیان بزانن. لەبەرئەوە، لی كوان یو ئەوەی بۆ پەكین پێشنیاز كرد لەجیات هەڵكشان و وەسەركەوتن باس لە هەڵسانەوە بكات، سەركردەكانی حزب لە ماوەی حەسانەوەیان لە كۆمەڵگەی كەشتیاریی بیدامی لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٢دا سەبارەت بە واژەكە بیرۆبازییان كرد. لەو كاتییەوە باس لە پێشكەوتنی پەیژەیی دەكەن. سەبارەت بەم مەسەلەیە زینگ دەڵێ:" بیرۆكەكە هەر هەمان شتی جارانە. تەنیا واژەكە گۆڕاوە". ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەو گۆڕانە گرنگیدان و تەقیەكردنێكی چین پیشان دەدات بۆ ئەوەی لە كاتی پێشكەوتنە خێرایەكەیدا هیچ گرفتێك دروست نەكات.

سیستم و دەستەهەڵاتەکە کار بۆ ئەوە دەکەن لەوە دڵنیابن کە گەلی چینیش لە ستراتیژەکە تێبگەن. لە ساڵی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧دا تەلەفزیۆنی چینی زنجیرەیەکی دوانزە بەشی بەناونیشانی ڕابوونی گەلانی مەزن پێشکەشکرد، ئەوە ڕوونبوو کە ئامانج لەو بەرنامەیە ڕۆشنبیرکردنی گەلە. بەڵام، لەبەر سروشتی سیاسییانەی بەرچاوی بابەتی زنجیرەکە، مرۆڤ دەتوانێ لەوە دڵنیابێت کەوا زۆر بە وردی وردبینی بۆ کراوە بۆ ئەوەی ئەو ڕا و بۆچوونانە پێشکەش بکات کەوا حکومەت حەز دەکات بۆ خەڵکی پەخش بکات. زنجیرەکە فووڵ و زیرەکانە بوو و بەشێوازی بی بی سی و پی بی سی پێشکەش کرا و ڕووماڵی ڕابوونی نۆ هێزی مەزنی کرد –هەر لە پورتوگال و ئیسپانیاوە بگرە تا دەگاتە یەکیەتیی سۆڤیەت و ویلایەتەکانی یەکگرتوو– هەروەها لەنێو ئەو بەرنامانەدا چەندان چاوپێکەوتن لەگەڵ شرۆڤەکاران و پسپۆڕانی سەرجەم ناوچەکانی جیهان کرابوو. ئەو بەشانەی تایبەت بوون بە وڵاتەکان زۆر ناکانە و ورد و هاوسەنگ بوون. باسیش لە بابەتی ڕابوونی یابان کرا– ئەمەیش لە وڵاتی چیندا بابەتێکی هەستیارە– باسکردنەکەش زۆر دەستپاکانە و دادوەرانە بوو و هیچ هەوڵێکیشی تیادا نەدەبیندرا هیستریای نەتەوەیی هەمبەر هێرشەکانی یابان بۆ سەر چین بورووژێندرێ، هەروەها لە میانەی پێشکەشکردنی ئەڵقەکاندا چەندان جار ستایشی ڕابوونی ئابووریی یابان کرا کە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ئەو وڵاتە بەخۆیەوەی بینیوە. هەندێک لەو خاڵانەی کەوا جەختیان لەسەر کرایەوە زۆر سرووشبەخش بوون. چونکە لە ئەڵقەکانی تایبەت بە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا بەنموونە، سەبارەت بە ڕێکخستن و ماڵیکردنی پرسی سەرمایەداری بەشێوەیەکی زۆر ورد و دوورودرێژ باس لە بەرنامەکانی ڕۆزڤێڵت و فرانکلین و ڕۆزفێلت کرا و تیشک خرایە سەر ڕۆڵی دەوڵەت لە سەرمایەداریدا. هەروەها هەندێک ڕاڕای پێشبینیکراوی بێدەنگی هەبوون و جێگەی کەموکورتی

بوون، بۆ نموونە لە ئەڵقەکەی تایبەت بە یەکیەتیی سۆڤییەت تەولوی تیرۆر و تۆقاندن و کردەکانی پاکتاوکردن و مەسەلەی بەندیخانەی گولاگ لادرابوون یانیش باس نەکرابوون. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، دانپێدانانی سەرسوڕهێنەریش هەبوون، لەوانە ستایشکردنی سیستمی دەستهەڵاتی نوێنەرایەتی لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو و توانای بریتانیا بۆ وەدیهێنانی ئازادی و شەرعییەت و سەقامگیریی سیاسیی نێو هەردوو وڵات.

بەڵام پەیامی سەرەکیی زنجیرەکە ئەوەی پیشان دەدا کە ڕێگەی هەر گەل و نەتەوەیەك بەرەو مەزنی، لە پێشکەوتنە ئابوورییەکەیدا خۆی حەشارداوە، بەڵام ئامانج و بەرتەمابییە سەربازی و ئیمپراتۆری و دوژمنکارانەکان، وڵاتان بەرەو ڕێگەی داخراو دەبەن. چەندان جار ئەم خاڵەیان ڕوونکردەوە و تیشکیان خستەسەر. چوونکە ئەڵقەی کۆتایی کەوا بە ڕوونی باس لە پەندە وەرگیراوەکانی نێو زنجیرەکە دەکات: ڕێگە کرۆکییەکانی گەیشتن بە پایەی زلهێزی: پتەویی نەتەوەیی و سەرکەوتنی ئابووری و تەکنۆلۆژی و سەقامگیریی سیاسی و هێزی سەربازی و داهێنانی ڕۆشنبیری و بەکێشکردن بوو. ئەوەی کۆتایی واتا بەکێشکردن، وەها ڕاڤە کرا کە بەکێشکردنی هزری گەلێکە و شتێکە بە چەمکی هێزە نەرمەکانی جۆزێف نای پابەند کرا کە یەکێك بوو لەو توێژەرانەی کەوا لە زنجیرەکەدا گفتوگۆی لەگەڵدا کرا. دواتر ئەڵقەی کۆتایی بە ڕاگەیەندراوێك کۆتایی پێهێندرا کە هەر گەلێك لەم جیهانە نوێیەدا، ناتوانێ باشتربوونە کێبڕکێکارییەکەی خۆی بپارێزێ تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کەوا مەعریفە و توانای تەکنۆلۆژی هەبێت و لەپێناو بەردەوامبوون لە داهێناندا بیخاتەگەڕ. بەکورتی، ڕێگەی بەرەو هەرزموون بە بازاڕەکانەوە دەڕوات نەك بە ئیمپراتۆرییەکانەوە.

**ئاین و سیاسەتی دەرەوە**

ئایا شێوازی بیرکردنەوەی چین سەبارەت بە جیهان بەشێوەیەکی تایبەت چینییە؟ نەخێر، لە زۆربەی لایەنەکاندا وەها نییە، ئەو پەند و وانانەی لە مێژووی زلهێزەکاندا وەرگیراون هەمان ئەو وانە و پەندانەن کەوا زۆرێک لە خۆرئاواییەکانیش وەریانگرتووە؛ ئەدی چۆن؟! لە کاتێکدا زۆرێك لەو کەسانەی کەوا لە زنجیرەکاندا گفتوگۆیان لەگەڵدا کرا توێژەری خۆرئاوایی بوون؟ شێوازی بیرکردنەوەی چینی هەمان ئەو تێگەیشتنە پیشان دەدات کەوا لە رابردوویەکی نزیکدا بووەتە پاڵنەری پشت رەفتاری هەریەکە لە یابان و ئەڵمانیا. پەیوەندییەکانی چین لەگەڵ جیهاندا پەیوەندیی کردارین و لەسەر بنەمای هەلومەرج و بەرژەوەندییەکان و بۆچوونیان لەهەمبەر خۆیان وەك وڵاتێکی گەشەسەندوو بونیادنراوە. چوونکە لەگەڵ ئەو سێبەرە گەورەیەی کەوا چین خستوویەتییە سەر جیهان، بەڵام چین درك بەوە دەکات کە هێشتا وڵاتێکە و سەدان ملیۆن هەژاری هەیە. لەسەر ئەم بنەمایەوە، گرنگیدانە دەرەکییەکانی – بەزۆری– تایبەتن بە گەشەپێدان. کاتێك لەسەر چەند پرسێکی وەك مافی مرۆڤ لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ، ئەوا هەندێك بەرپرسی گەنجی چینی دانی پێدا دەنێن کە بەلایانەوە گرنگ نییە. بێگومان ئەو هەستە بەو درکە پتەو دەبێت کە مافی مرۆڤ لە دەرەوە، پەیوەندیی بەو شتانەوە هەیە کەوا لە ناوەوەدا هەن. ئەگەر چین رەخنە لە دیکتاتۆرییەتەکەی بۆرما دەگرێ، ئەدی سەبارەت بە جوداخوازەکانی نێوخۆی خۆی چی دەڵێت؟

کۆنفۆشیوس لە سەردەمی رۆشنگەریدا زۆر بەناوبانگ بوو. بەپێی بۆچوونی نیدهام، کار و بەرهەمەکانی کۆنفۆشیۆس: " لە لایەن گشت رێبەرانی مەزنی شۆرشی فەرەنسیدا زۆر بەپەرۆشی دەخوێندرایەوە– فۆلتێر، رۆسۆ، دالیمبێرت، لیدیرۆت و ئەوانی دیکە". لەنێوان سالانی ١٦٠٠ و ١٦٤٩دا لە ٣٠ بۆ ٣٥

ناونیشانی بەدیاردەکەوت کەوا لە گشت دەیەیەکدا لە ئەورووپا پەیوەندیی بە چینەوە هەبوو، لەنێوان سالآنی ۱۷۰۰ و ۱۷۰۹دا ٥۹۹ کتێب سەبارەت بە چین نووسراون. ئەم بلاوبوونەوە و قولێدانە لە چاپ و نووسینەکانی تایبەت بە چین، لەگەلّ کۆتاییهاتنی جەنگی سی سالەکە (۱٦۱۸–۱٦٤۸) هاوکات بوو، چوونکە ئاین هۆی بەرپابوونی خوێنرشتنێکی بێوێنە و رژانی دەریایەك خوێن بوو. زۆرێك لە لیبرالیی‌ەکانی ئەورووپا کۆنفۆشیۆسییەتیان کردە ئایکۆنێك، چوونکە کۆنفۆشیۆسییەت پشتی بە یاسای سروشتی دەبەست. بەلاّم ڤۆلتێر لە کتێبەکەیدا (فەرهەنگی فەلسەفی) زۆر بەسادەیی وەها وەسفی کردووە: " بێ خورافات، بێ ئەفسانەی پووچ، هیچ یەکێك لەو باوەڕانەی تیادا نییە کەوا لۆژیك و سروشت سووکوڕیسوا دەکەن". دواتر ئەمانوێل کانت کۆنفۆشیۆسی بە " سوکراتی چین" ناوبرد. لیبینزیش- کە فەیلەسووفێکە و بۆشایی نێوان ئایندارى و عەلمانییەتی فراوانتر کردووە- زۆرتر تێپەڕیوە و گوتوویەتی: " ئێمە پێویستمان بە شاندی تەبشیریی چینی هەیە، بەلّکو فێرمان بکەن چۆن سوود لە ئاینی سروشتی وەربگرین و پیادەی بکەین....".

بیرمەندە سەرلیستەکانی ڕۆشنگەری کۆنفۆشیۆسییەتیان شکۆدار کردووە، چوونکە لە کاروبارەکانی مرۆڤیدا وەك ڕێبەرێك پشت بە لۆژیك دەبەستێت. لێرەوە ئەم بیردۆزە پێشکەوت: هەرچەندە ئەورووپا لە ڕووی زانستی و تەکنۆلۆژییەوە پێشکەوتوو بوو، بەلاّم چین " سیستەمێکی پێشکەوتووتری ئاکاری و ڕێکخستنێکی زۆر سەرکەوتووانەتری مەدەنییانەی هەبوو" (کە پشت بە کارامەیی و شایستەیی دەبەستێت، نەك چاودێری و گرنگیپێدان)، هەروەها پشت بە (فەلسەفەی کرداری دەبەستێت)". کۆی ئەمانەیش زۆر سەرکەوتووانە پەیڕەیەکی باش ڕێکخراوی کۆمەلاّیەتی و سیستەمێکی پلەبەندیی کۆمەلاّیەتییان

بەرهەمهێنا. ترۆپکی عاشقبوون بە ڕۆشنبیریی چینی لەگەڵ تێزەکەی ڤۆلتێر وتارێك سەبارەت بە ئاکار (Essai sur les moeurs) ەوە هات کە لە ساڵی ١٧٥٩دا دەرچوو، تۆماس فۆکسی توێژەری ئەڵمانی دەڵێ:" ڤۆلتێر چینی کردە دوڵەتێکی چاکەخواز و فازڵ سیاسی و دۆخێکی ئایدیایانەی دەستهەڵاتێکی ڕۆشنگەرانەی ڕەها؛ ئاوێنەی چین لەپێناو ووروژاندنی پیشاندنی ڕەخنەی خودی لەنێو پاشایانی ئەورووپادا بەرزکرایەوە". لە ساڵی دواتردا، فەریدریکی مەزن کە لەنێو پاشایانی ئەورووپی لەهەموویان ڕۆشنگەرتر و ڕۆشنبیرتر بوو، ڕاپۆرتی میهپۆی نووسی کەوا کۆمەڵێك نامە بوون و باڵیۆزێکی خەیاڵیی چینی لە ئەورووپا بۆ ئیمپراتۆریەتی چینی هەناردبوو، مەبەستی فریدریك بەراوردکردنی دەمارگیریی کڵێسای کاسۆلیکی و ئەقڵانییەتی چینی بوو.

بەزۆری خۆرئاواییەکان لە تێگەیشتنی جیاوازیی نێوان پێگەی ئاین لە چین و خۆرئاوادا دووچاری زەحمەتی دەبنەوە. تەماشای ئەزموونی ئەو موبەشیرە پورتوگالییەی نێو خۆرهەڵاتی دوور بکە کە ناوی ماتیۆ ریچی بووە، مێژنووسی مەزن جۆناسان سپێنس لە ڕۆژە سەرەتایەکانی خۆی لە چین — لە هەشتایەکانی سەدەی شانزەیەمدا— گواستوویەتییەوە، ئەمەیش هەوڵێکە بۆ ئەوەی خۆی وەك کەسێکی بەڕێز بناسێنێ، ریچی قژ و ریشی تاشیوە و خۆی بە عەبای پیاوانی بۆنی پێچاوەتەوە. ریچی تەنیا دوای تێپەڕبوونی چەندان ساڵ ئەوجا زانیویەتی کە ئەم ڕەفتارەی چەندە سەرلێشێوانە بوو، چوونکە ڕاهیبەکان و پیاوانی ئاینی لە چیندا ڕێزێکی زۆریان لێ نەگیراوە. لەبەرئەوە، چووەتە سەر کورسی و چەند کەسێك لەسەر شانی خۆیان هەڵیان گرتووە یان لەسەر شان هەڵیان گرتووە و بەمشێوەیە سەفەری کردووە، " هەروەك چۆن پیاوانی پایەبەرز لەسەر ئەنجامدانی ئەم کردەوەیە ڕاهاتوون". بەپێی ئەو نێوەڕۆکەی کە لە نامەکەی

ریچی بۆ کلاودیۆ ئەکوافیفای سەرۆکی کۆمەڵەی یەسووعی هاتووە و لە ساڵی ١٥٩٢ دا نووسراوە" ناوی بیانییەکان و قەشەکان بە ئاستێك لە چینێدا بەدناو و کەموکورت بوونە کە ئێمە پێویستمان بەو هۆکارانە و چەندان هۆکاری دیکە هەیە بۆئەوەی وەهای پیشان بدەین کە قەشەی سووکوچرووك نین". لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٥٩٥دا، پۆشاکی رەهبانی و گشت ئێکسسوارەکانی دیکەی داکەند کەوا دەبوونە لەمپەر لەبەردەم کارە تەبشیرییەکەیدا و لە جیاتیدا پۆشاکی نوێژەرەوەی کۆنفۆشیۆسی لەبەرکرد. ریچی لەسەرەتدا رقی لە کۆنفۆشیۆس دەبوویەوە چونکە باوەڕی بە خودا و بەهەشت و نەمریی رووح نەبوو، هەروەها لە نامەیەکدا کە بۆ یەکێك لە هاوڕێیانی ناردووە نووسیویەتی کە قوتابخانەی کۆنفۆشیۆسی " پەرستگەی راستینی رۆشنبیران بوو". بەڵام لە کۆتاییدا ئەوەی بۆ روونبوویەوە کە هەرچەندە کۆنفۆشیۆس لە هەمبەر ئەو پرسانەی کەوا پەیوەندییان بە خودا و ژیانی دوایی هەبووە بەرگریی لە " هەڵوێستێکی توندوتیژی بێلایەنانە دەکرد" بەڵام لەهەمبەر چاکەکاری و ئاکار و دادپەروەریدا هەستێکی بەهێزی هەبووە. جا ریچی هەر وەك دژخی کەسییەتییەکانی دیکەی رۆشنگەری، گەیشتە ئەو باوەڕەی کە لەسەر خۆرئاوا پێویستە لە کۆنفۆشیوسیەتەوە فێربێن.

پەیوەندیی ئاین بە سیاسەتی دەرەوە چییە؟ لە رووی مێژووییەوە، ئەو وڵاتانەی کەوا بە مەسیحییەت و ئیسلام کاریگەربوون پاڵنەرێکیان بۆ بڵاوکردنەوەی را و بۆچوونەکانیان و رێنوێنیکردنی خەڵك بۆ ئاینەکەی خۆیان پێشخستووە. ئەم گیانە تەبشیرییەش لە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانی جۆراوجۆری وەك بریتانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتوو و فەرەنسا و ئیرلندا رەوونە. سەبارەت بە بریتانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتوو- لەوانەیە بەهۆی هەژموونە بەهێزەکەیانەوە بێت-

هەستی پرۆنستانتی جێپەنجەی خۆی لە قوولایی سیاسەتەکانی دەرەکی جێهێشتووە، بەتایبەت لە کاروباری نێودەوڵەتیدا. بەڵام چین لەپێناو بەرگری لەخۆکردندا پێویستی بە بڵاوکردنەوەی هیچ شتێك نییە بۆ هیچ کەسێك. هەر لەبەرئەوەی چین لە ڕێگەیدا بەرەو ئەوەی ببێتە هێزێکی جیهانی ئەوا مەبەستە مێژووییەکەی خۆی وەدیهێناوە. لەبەرئەوە، کاتێك پەکین لە هەمبەر مافی مرۆڤدا هەڵوێستی ساردوسڕە، مانای ئەوە نییە کە سیستمێکی سەرکوتکاری هەیە یان گۆشەنیگایەکی توندوتیژی واقیعیی لەهەمبەر بەرژەوەندییەکانی خۆیدا هەیە- هەرچەندە ئەمە رۆڵی خۆی دەگێڕێ- بەڵکو مانای ئەوەیە کە چینییەکان بەشێوەیەکی جیاواز لەو پرسانە دەنواڕن، نەك بەپێی چەند پێوەرێکی داماڵراوی هەڵە و ڕاستی، بەڵکو بە هەستێکی کردارییەوە کەوا سەرچاوە لە چوارچێوەی فەلسەفەیەکی ڕێنوێنیکارەوە دەگرێ.

زۆربەی جار پیاوانی کاری خۆرئاوایی تێبینیی دەکەن کە هاوتا چینییەکانیان گرنگییەکی زۆر بە بنەما و یاسا و گرێبەستەکان نادەن. هەستکردنی ئەوان بە بنەما ئەخلاقییەکان زیاتر لە فەلسەفەی ئاکاریی هەلومەرجیدا نزیکە، بۆ نموونە: ئەگەر پیاوێکی کار یان بەرپرسێکی چینی باوەڕی وەهابوو کە یاسا کرچوکاڵ و خراپە، ئەوا پشتگوێی دەخات یان بەدەوریدا دەخولێتەوە یان زۆر بەسانایی پێشنیازی نووسینی گرێبەستێکی نوێ دەکات. ڕێزگرتن لە هێزەکانی داماڵراو لە ئەقڵییەتی کردارییانەی چینیدا بەجۆرێك لە جۆرەکان پرسێکی سەیرە. هەروەها پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و متمانە لە پابەندبوونەکانی سەر کاغەز گرنگترە. باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بۆ ماوەی چەندان ساڵ نەیتوانی چین ناچار بکات یاسایەکانی موڵکییەتی هزریی تایبەت بەخۆی پیادە بکات، تەنیا دوای ئەوەی هەندێك کات هەوڵی خۆی بۆ دروستکردنی

پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی چیندا وەگەڕخست و لە میانیدا ئەوەی ڕوونکردەوە کەوا بۆ پێشخستنی سیستمی ئابووری و فێرکاری لە چیندا دەیەوێ یارمەتییان بدات. گەرچی کەمینەیەکی زۆرکەمی چینییەکان بەڕاستی ئەو بیرۆکەیان گرتەخۆ کە پێی وایە بنەما و یاسا و گرێبەستەکان لە شیکردنەوەی هەلومەرجییانەی پرسێك گرنگترین، ئەوە مانای ئەوەیە کە لەوانەیە پێشکەوتنی سیاسی و یاسایی لە چیندا ڕەوتێکی بازنەییتر و ئاڵۆزتر لەوە بگرێتەبەر کەوا مرۆڤ پێشبینیی دەکات.

کەلتووری ڕۆشنبیرییانەی چینیش بە ڕۆڵی خۆی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان کاریگەریی لە نزیککارییەکانیدا هەیە. ڕۆبێرت ویلەر لە زانکۆی بۆستندا دەڵێت:" چینییەکان لە هەستکردنیان بەهێز و کاریگەریدا پشت بە بیرۆکەی وزەی تشی یان چی qienergy دەبەستن. تشی یان چیش کرۆکی هاوسەنگیی ژینگەیە و ڕەگەزی نێو جەستەیە کەوا بەهۆی دەرزییەکانی چینی و گژوگیاکانەوە گەمەی پێ دەکرێ. بەشێکە لە ڕێگە و شێوازێکی فراوانتر بۆ تێگەیشتن لە جیهان وەك کۆمەڵێك هێزی کارلێککەر و تێکچڕژاوی ئاڵۆزە، هەروەها بەهۆی سیستمێکی سادە و گونجاو و هارمۆنیك وەك سیستمی هێز و کاریگەری کارناکات... هەروەها ڕەنگە کاریگەریی لەسەر سیاسەتی دەرەوەشدا هەبێت. بێگومان لەوانەیە ئەم لۆژیکە زێدەڕۆیانە بێت، نەك هەر ئەمە، لەوانەیە زۆر پووچیش بێت، بەڵام کاتێك سەبارەت بە بیرکردنەوەی چینییەکان لە گەڵیان دەپەیڤیت، زۆر بەخێرایی درك بەوە دەکەیت کە چەمکەکانی وەك وزەی تشی لە ئەقڵییەتی ئەواندا شتێکی کرۆکییە. سیاسەتی دەرەوە بە زۆرێك لە هێزەکانی جیهانی کاریگەر دەبێت، بەڵام بێگومان بۆچوونێکی سەرەکی لە هەمبەر جیهاندا

هەیە کەوا ڕێگەی تێککاری و ڕەفتار و کاردانەوەی خەڵك ڕێکدەخات، بەتایبەتیش لە قەیرانەکاندا.

بەلام ڕۆشنبیری لە بۆشاییەوە نایەت. هەروەها ڕابردوو و ترشی DNA چینی بە مێژووە نوێیەکەی کاریگەر دەبن! کاریگەریی خۆرئاوا و وێرانکارکردنی بەشێکی گەورەی کەلتوورەکەی لەلایەن کۆمۆنیزم و ئەو بۆشاییە ڕووحییەی لێیەوە هەڵقولا، هەروەها هەوڵە هەنووکەییەکانی بۆ گونجاندنی دابونەریتەکانی لەگەڵ نوێگەرایی لەمەدا کاریگەریی هەیە. چوونکە کاتێك لەگەڵ ئابووریزانانی چینی قسە دەکەیت، ئەوان بۆ بەرهەمهێنانی گەشەکردنی ئابووری یان وەستاندنی هەڵئاوسان، ڕێگەی کۆنفۆشیوسیت پێنابەخشن. ئەگەر بانکی مەرکەزیی چینی - کەوا زۆر هاوچەرخانە و نوێ دێتەبەرچاو و لەسەر نۆرمی خۆرئاواییە- لەسەر پێیەکانی خۆی هەڵنەستابایەوە کاتێك ویلایەتەکانی یەکگرتوو داوای لێکرد سەرلەنوێ دراوی خۆی هەڵسەنگێنێتەوە، ئەمە ئاماژەیەکە بە هەستی شانازیکردنی نەتەوەیی زیاتر لەوەی ئاماژە بە پاشخانی دیاریکراوی ڕۆشنبیری بکات. (کەی دواجار بووە کەوا ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەترسی یەکێك لە حکومەتەکانی بیانی سیاسەتی ئابووریی خۆی گۆڕیبێت؟) لە ڕاستیدا، چینییەکان لە زۆر بواردا ئەقڵییەتی خۆرئاوایی دەگرنەبەر. هەندێك شرۆڤەکاری سیاسەتی دەرەوەی چینی خۆیان بە کۆنفۆشیۆسییەکانی مەسیحی ناو دەبەن، لەمەشدا مەبەستیان ئەوە نییە کەوا پێشانی بدەن هەڵگەڕاینەتەوە یان بوویتنە ئنجیلی، بەڵکو ئەوان کەسانی چینیی ڕوانگە خۆرئاوایین، هەوڵ دەدەن ڕێژەیەکی زۆرتری هەستکردن بە مەبەست و بەها ببەخشنە سیاسەتەکانی چینی. لە کۆتاییشدا چین، وەك گشت ولاتانی نا خۆرئاوایی، ئاوێتەیەکی

ڕۆشنبیریی تایبەت بەخۆی هەیە- چەند بەشێکی خۆرهەلاتی و هەندێکیشی خۆرئاوایی- بۆ ئەوەی لە سەدەی بیست و یەکدا سەرکەوێ و گەشە بکات.

## لەوە گەورەترە بشاردرێتەوە

گرفتە گەورەکەی چین پەیوەندیی بە تایبەتمەندییەکانی ڕۆشنبیرییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە لایەنەکانی گشتیی هێزەوە هەیە. چین وەها لە خۆی دەنواڕێ کەوا گەلێکە و بڕیاری ئەوەی داوە بەشێوەیەکی دروست ڕابێت، هەروەها ڕەفتاریشی بە خاکەڕایی و دەستوەرنەدان و پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ هەمووانداا دەناسرێتەوە. بەڵام لە ڕابردوودا زۆرێك لە وڵاتانی گەشەسەندوو و ڕابوو پێیان وابوو کە پاڵنەری باشیان هەیە؛ لەگەڵ ئەمەیشدا بوونە هۆی ئەوەی سیستەمەکە دووچاری شڵەژان و تێکچوون بکەن. ڕۆبێرت گیلپنی زانای سیاسی، تێبینیی ئەوە دەکات کە کاتێك هێزی گەلێکی دیاریکراو زیاتر دەبێت، ئەوا " حەز دەکات هەژموونەکانی خۆی بەسەر چواردەوریدا زیاتر بکات. جا لە پێناو زیادکردنی ئاسایش و سەقامگیرییە تایبەتەکەیدا، هەوڵ دەدات هەژموونەکانی سیاسی و ئابووری و هەرێمی فراوانتر بکات. هەروەها هەوڵی گۆڕینی سیستەمی نێو دەوڵەتی دەدات بۆ ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندییە تایبەتەکانیدا بگونجێت". لێرەدا خاڵی سەرەکی و کرۆکی ئەوەیە کە زلهێزەکان لە گشت قۆناغەکانی مێژوودا باوەڕیان وەها بووە کە پاکترین نیازیان هەیە؛ بەڵام پێویستی و زەروورەت ناچاری کردوون لە پێناو پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانەی کەوا بەردەوام لە فراوانبووندان، ڕێوشوێنی پێویست بگرنەبەر. جا لەبەرئەوەی چین لە ڕووی هێزەوە وڵاتی دووەمی جیهانە، ئەوا بەرژەوەندییەکانی تا سنوورێکی زۆر مەزن فراوان دەبێت.

لە کۆتاییدا، لەوانەیە نیاز و مەبەستەکانی چین هیچ پەیوەندییەکی بەو شتانەوە نەبێت کەوا لە ئایندەدا ڕوو دەدەن. چوونکە لەم جیهانە شلەژاوەی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا، هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان نیاز و مەبەست و دەرئەنجامەکانەوە نییە (هیچ وڵاتێك نەبوو کەوا پێشبینیی جەنگی جیهانیی ساڵی ١٩١٤ بکات). مەسەلەکە زیاتر بە بازاڕێك دەچێت کەوا گشت کۆمپانیایەکان هەوڵ دەدەن بەهۆی بەرزکردنەوەی نرخەکانەوە تیایدا قازانجەکانیان زیاتر بکەن، بەڵام دەرئەنجامەکە بۆ کۆی سیستەمەکە تەولو پێچەوانەیە: واتا دابەزینی نرخ. بەهەمانشێوە، لە سیاسەتی نێو دەوڵەتیشدا– سیستمێکی دیکەی بەبێ یەك دەستهەلاتی ڕەها– نیاز و مەبەستەکانی وڵاتان بەردەوام لەگەڵ دەرئەنجامەکەدا ناگونجێت. لێرەوە ئەو وتە بەنرخە ڕۆمانییە هات: " ئەگەر ئاشتیت ویست خۆت بۆ جەنگ ئامادە بکە".

بەڵام سەبارەت مۆرکی ئاشتیخوازانەی ڕابوونی چین ئەوا لە میانی چەند مۆنتاژێك لە کردلری چینی و کاردانەوەکانی وڵاتانی دیکە و کاریگەریی ئەو کارلێکە لەسەر کۆی سیستمەکەوە دیاری دەکرێ. چین لەبەر قەبارەکەی هیوای ئەوە دەخوازێت بچێتە سەر گۆڕەپانی جیهانی بەبێ ئەوەی کەس بیبینێ، بۆ نموونە: گەڕانی چین بەدوای وزە و مادەی خاو شتێکە و هەموو کەسێك دەیزانێ. چین زۆر بەخێرایی گەورە دەبێت و وزە و گشت جۆرەکانی کاڵایەکان بەکار دەبات و پێویستی بە سەرچاوەیەکی جێگیر هەیە. هەندێك وڵاتی دیکە هەن نەوت دەکڕن، ئەدی بۆ چین هەمان کار ناکات؟ گرفتەکە خۆی لە قەبارەی چین حەشاردراوە. چوونکە چین لە سنوورێکی زۆر فراواندا کار دەکات بەشێوەیەك ئەمە دەبێتە هۆی گۆڕانی گەمەکە، جا ئەگەر حەز لێ بکات یان نا.

له ڕاستیدا، تێگەیشتنی چین له هەمبەر بەرژەوەندییەکانیدا دەگۆڕێ. هەروەها ئەوەی گەنجیش بەباشی درك بە هێزی نوێی چین دەکات. هەندێك له چاودێرانی چینیش لەهەمبەر ئەو بەهێزبوونە ڕۆژ بەڕۆژەی ئەو وڵاتە هەست بە نیگەرانی دەکەن. ئەمەش ئەو شتە بوو کە لی کوان یو له ساڵی ٢٠٠٥دا لەو وتارەی کەوا له زانکـۆی فـۆدان لەچـین خوێندبوویـەوە، لـە میـانی کۆمـەڵێك هۆشـدارییدا بەشێوەیەکی زۆر بە باقوبریق ئاماژەی پێکردبوو، ناوبراو لەو وتـارەدا نیگـەرانیی خۆی له هەمبـەر سـەرکردایەتیی هەنووکەیی چـین و ئەنانـەت ئـەوەی دواتـریش دەربڕی؛ مەبەست ئەو ئەوەیە کە له زەمـەنی سـەقامگیری و خۆشـگوزەرانی و هەژموونـە گەشەسـەندووەکەی چیندا لـەدایك دەبێـت، نـاوبراو گـوتی:" دەبـێ زەرووڕەتی دڵنیاییکردنـەوەی جیهان لـە گـەنجانی چینی بگەیەنـدرێ کـە چـین نابێتـە هێزێکـی ئەگـەرە دروسـتکار". هـەروەها لی کـوان بەشـێوەیەکی شـارلوە ئاماژەی بەوە کرد کە ئەوەی وەهای کردووە سەرکردەکانی چین پارێزگـەری لـە خاکەڕاییەکەی خۆیان بکەن، یادەوەرییە تاڵەکانی هەڵەکانی ماوتسی تۆنگ بـوو؛ کە بریتی بوون له هەڵگیرساندنی شۆڕشەکان له دەرەوە و قەڵەمبازە گەورەکەی بەرەو پێشەوە و ئەو شۆڕشە ڕۆشنبیرییەی کە بووە هـۆی مردنـی نزیکـەی چل ملیـۆن چـینی. " زۆر گرنگـە گـەنجانی چـینی – کـە لـە قۆنـاغی ئاشـتی و گەشـەکردنێکی وەهـادا دەژیـەن کـەوا ڕابـردووی شـڵەژاوی چـینی هـەرگیز بەخۆیەوەی نەبینیوە – ئەو هەڵە و کەموکورتییانە بزانن کەوا چین بەهۆی ئامانج و بەرتەماییە لە ئەندازە بەدەرەکانی و توندڕۆیی ئایدۆلۆژی ئەنجامی دا".

لە ئێسـتەدا، هێشـتا سیاسـەتی دەرەوەی چـین بەشـێوەیەکی هەمـەکی لەسـەر کاروبارەکانی بازرگانیـدا چڕکراوەتەوە، هەرچـەندە ئەمـەیش نیشـکی خـۆی بـۆ شـوێنەکانی دیکـە دەنێـرێ، بۆنموونـە لـە ئـەفریقیا: چـین کـار بـۆ بونیادنـانی

پەیوەندیی ئابووری دەکات، چوونکە کیشوەری ئەفریقیا سامانێکی زۆری سروشتیی هەیە کە چین پێویستی پێی هەیە بۆ ئەوەی گەشەبکات. چین و زۆرێک لە حکومەتەکانی ئەفریقیا پێشوازییەکی گەرمیان لە دروستکردنی پەیوەندیی نوێی ئابووری کرد؛ بەشێوەیەکی بەشەکی لەبەرئەوە بوو کە هیچ پەیوەندییەکی رابردوویی ئیستعمارانە یان مێژوویەکی پڕ لە گرفت لەنێوانیاندا نییە کەوا پرسەکان ئاڵۆزبکات. لەبەرئەوە، ئاڵوێری بازرگانی لە نێوان هەردوو لادا بەرێژەی ٥٠٪ ی ساڵانە گەشەدەکات، هەروەها وەبەرهێنانەکانی چین لە کیشوەرەکەدا بەخێراییەکی گەلێ زۆر زیاد دەکات. گەشەکردنی ئابووریی لە زۆرێک لە وڵاتانی ئەفریقیدا ژمارەی پێوانەیی تۆمار دەکات، زۆربەی ئەو گەشەکردنانەش دەگەڕێنەوە بۆ پەیوەندییەکی باش لەگەڵ چیندا. بەڵام هەندێک لە وڵاتانی کیشوەرەکە وەها لەپەیوەندییەکە دەڕوانن کە جۆرە خراپ سوود وەرگرتنێکە و لە هەژموونە نوێیەکەی چین ناڕازین، لەبەرئەوە چین هەوڵی ناقەتیرووکێن دەدات بۆئەوەی نیازپاکیی خۆی پیشان بدات. لە تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦ دا، سەرۆک هیو جینتاو سەبارەت بە پەیوەندیی چینی ئەفریقی لووتکەیەکی بەڕێوەبرد. هەر چل و هەشت وڵات کەوا پەیوەندیی دیبلۆماسییان لەگەڵ چیندا هەیە، لەو لووتکەیە ئامادەبوون، زۆربەشیان لە لایەن سەرۆکەکانیانەوە یان سەرۆکوەزیرەکانیانەوە نوێنەرایەتی کرابوون. ئەمە گەورەترین لووتکەی ئەفریقی بوو کە لە دەرەوەی کیشوەرەکەدا بەڕێوەبچێت. لەو کۆبوونەوەیەدا، چین بەڵێنی دا کە لە ماوەی دوو ساڵدا یارمەتییەکانی دوو هێندە بکاتەوە، پێنج ملیار دۆلار بە قەرز و پاڵپشتی بدات، بۆ هاندان و پاڵپشتیکردنی وەبەرهێنانی چینیش لە ئەفریقادا سندووقێک بەبەهای ٥ ملیار دۆلار دامەزرێنێ و لە زۆرێک قەرزی خۆی خۆشبوو کە دەبووایە بدرابایەوە چین، هەروەها توانایەکی زۆرتر بۆ گەیشتن بە بازاڕی چینی فەراهەم بکات و مەشق بە

پانزەهەزار کەسی دانیپێدانراوی ئەفریقی بکات و لە شوێنە جیاجیایەکانی کیشوەرەکەشدا نەخۆشخانە و خوێندنگەی نوێ بونیاد بنێ. وەك پێدەچی ئەمە کاریگەرییەکی زۆری لە سەرۆکوەزیرانی ئەسیوبیا کرد کەوا هانی دا زۆر بەگوڕوتاوەوە بڵێت: "چین سەرچاوەی ئیلهامبەخشی هەموومانە".

چ کەموکورتی و هەڵەیەك لە بونیادنانی ئەو جۆرە پەیوەندییانەدا هەیە؟ هیچ، مەسەلەکە تەنیا هەر ئەوەیە کە چین بەچوونی بۆ ئەفریقیا ئەو بۆشاییە ئابووری و سیاسی و سەربازییە پڕدەکاتەوە کەوا پێشتر بریتانیا و فەرەنسا و ویلایەتەکانی یەکگرتوو پڕیان دەکردەوە. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا مانای بەرپابوونی بەریەککەوتن و ناکۆکی دەگەیەنێ، چوونکە گشت زلهێزەکان لەپێناو ڕەواجدان بە بەرژەوەندییەکانیان و بۆچوونی خۆیان کار دەکەن لەوەی کە چ شتێك باشە لە ئەفریقیادا ئەنجام بدرێ. چین وەها پاساو بۆ ڕەفتارەکانی خۆی (لەو کیشوەرەدا) دەبینێتەوە کە بەهیچ جۆرێك دەست لە کاروبارەکانی نێوخۆیی ئەو وڵاتانە وەرنادات؛ واتا بێلایەن و سوودبەخشە. بەڵام ئایا ئەمە ڕاستە؟ مۆزیس نەییم، سەرنووسەری گۆڤاری فۆرین پۆلیسی، چیرۆکێك سەبارەت بە حکوومەتی نەیجیری دەگێڕێتەوە کەوا داوستانی دەکرد بۆ ئەوەی لەپێناو سیستمی بانکەکان لەگەڵ بانکی نێودەوڵەتیدا لەساڵی ۲۰۰۷ ٥ملیۆن دۆلار قەرزی دەستکەوێ. بانکەکە سووربوو لەسەر ئەوەی کە پێش ئەوەی قەرزەکەی بدرێتێ، دەبێ حکوومەت ڕیفۆرم لە بەڕێوەبەرایەتییە گەندەڵەکەی شەمەندەفەرەکاندا بکات. ڕێککەوتنامەکە هێندەی نەمابوو واژۆ بکرێ، بەڵام حکوومەتی چینی هاتە نێو مەسەلەکە و قەرزێکی ۹ملیار دۆلاری بۆ نەیجیریا پێشنیاز کرد بۆئەوەی سەرلەنوێ سیستمی هێڵی ئاسنی بەشێوەیەکی هەمەکی بونیاد بنێتەوە، قەرزەکەش بەبێ هیچ داواکاری و مەرجێك و بەبێ داواکاری بۆ

ئەنجامدانی ریفۆرم پێشنیاز کرا. نوێنی شاندی بانکی نێودەوڵەتی لە ماوەی چەند رۆژێکدا نێردرایە وڵاتەکەی. بێگومان پێویست ناکات بڵێین کە زۆرێک لە پارە و دارییەکانی چین دەچێنە سەر ئەکاونتە بانکییەکانی هەندێك گەورە بەرپرسی ئەیجیری.

بەکەی خۆی رووبەرووبووەوە کە وەها باشترە بەشێوەیەکی راستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ حکومەتەکاندا بکات، چونکە ئەو حکومەتانە بەشێوەیەکی بەردەوام ئەو سامانە سروشتییانەیان هەیە کەوا چین پێویستی پێیان هەیە. هەروەها ئەنجامدانی رێککەوتننامە و گرێبەست ئاسانتر دەبێت کاتێك مامەڵە لەگەڵ یەك دەستەهەڵاتی مەرکەزیدا دەکات، بەتایبەت ئەگەر ئەو حکومەتە بێزێندراو بێت و هیچ شوێنێکی دیکە نەبێ پەنای بۆ ببات تەنیا وڵاتی چین نەبێت. لەبەرئەوە چین پلاتین و ئاسن لە زیمبابۆی دەکرێت و چەك و ئامێرە بێتەلەکانی تەشویش دەفرۆشێتە رۆبێرت مۆگابی- هەرچەندە لەلایەن یەکیەتیی ئەورووپا و وڵاتە یەکگرتوودا ئابلۆقەی خراوەتە سەر- کە لەپێناو ترساندن و دەستگیرکردن و کوشتنی بەرهەڵستکارە نێوخۆییەکان بەکاری دەهێنێ. دەبێ ئەوەش بزانین کە چین لە ئەنجومەنی ئاسایشدا پشتیوانە هەرە گرنگەکەی مۆگابییە.

دەستوەردان و تێوەگلانی چین لە سوودانیدا لە دەستوەردانەکەی نێو زیمبابۆی زۆر گەورەترە. چین هەر لە ساڵی ١٩٩٩ بە بەهای سێ ملیار دۆلار وەبەرهێنانی لە کێڵگەکانی نەوتی ئەویدا کردووە. هەروەها کۆمپانیایەکانی چین لە دوو یەکەی هەرە گەورەی نەوتیی سوداندا گەورەترین پشکیان هەیە، لە هەمان کاتیشدا چین ٦٥٪ی هەناردەی نەوتی سوودان دەکرێ. پارێزگەری لە هاوپەیمانییە سەربازییەکەی خۆی لەگەڵ سووداندا دەکات، پێشدەچێ چەکیشی پێ دابێت —

هەرچەندە لە لایەن نەتەوەکانی یەکگرتووە و کۆنوبەند خراوەتە سەر کردەی فرۆشتنی چەك بەسوودان- کە دواجار لەسەر دەستی میلیشیایەکانی پشتگیرکاری حکومەتی دارفور کۆتایی هات. زۆرجار بەرپرسانی چینی ئەوە دووپات دەکەنەوە کە پەیوەندییەکی پتەوی سەربازییان لەگەڵ سووداندا هەیە و دەیانەوێ بە هەمانشێوەش پارێزگەریی لێ بکەن. جێگری وەزیری دەرەوەی چین لە ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی وڵاتەکەی زۆر ڕوون و ڕاشکاو بوو کاتێك گوتی:" کار کارە. ئێمە هەوڵ دەدەین سیاسەت لە کار جیا بکەینەوە. دووەمیش، پێم وایە کە دۆخی نێوەخۆیی سوودان شتێکی نێوەخۆییە و ئێمە لە پێگەیەکدا نین هیچ شتێکیان بەسەردا بسەپێنین".

ئەگەر چین لەسەر گۆڕەپانی جیهاندا یاریزانێکی بچووك بووایە، ئەوا کەس گرنگییەکی زۆری بەو شتانە نەدەدا کەوا لە سوودان یان زیمبابۆی ئەنجامیان دەدات، بۆنموونە: کوبا- لەگەڵ ئەو هەموو زانیارییانەی لەهەمبەریدا دەیزانین- پەیوەندییەکی فراوانی لەگەڵ هەردوو وڵاتدا - سودان و زیمبابۆیدا- هەیە و کەسیش گرنگیی پێنادات. ئەم پەیوەندییانەی چین لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە پێشکەوتنێکی هێواش و پشتپێبەستوو (اتکالی) هێواشی پێدەبەخشێ، لە دووڕەوداشدا خولی سیستمە خراپەکان و ئەو گرژییە کۆمەڵایەتییانە درێژتر دەکاتەوە کەوا کیشوەری ئەفریقیی کردووەتەوە پرۆشی بەردەم ڕەشەبا. لە هەمان کاتیشدا، ئەم جۆرە پەیوەندییانە وەها لە گەلانی ئەو وڵاتە ئەفریقییانە دەکەن بەهەمان لێنواڕ بنوارنە چین کە بەدرێژایی چەندان ساڵ بەهۆیەوە لە وڵاتانی خۆرئاواییان دەنواڕی، هەرچەندە حکوومەتەکانی ئەم گەلانە بەچاوی پێز و باشەوە لە چین دەنوارن.

لە ڕاستیدا، یەکێك لە هۆیەکانی جەختکردنەوەی پەکین لەسەر ئەفریقیا ئەوەیە کە ژمارەیەك لە ولاتانی ئەفریقی پەیوەندیی دۆستانەیان لەگەڵ تایواندا هەیە. حەوت دەوڵەت لە کۆی بیست و شەش دەوڵەت کە پەیوەندییان لەگەڵ تایواندا هەیە نیشتە لە ئەفریقیادان، بەلام شەشیان (بە باشووری ئەفریقاشەوە) لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا دانپێدانانەکەیان لە تایبییەوە گواستوەتەوە پەکین، ئەمەیش بەهۆی پێشنیازە پڕ لە دانابییەکانی پێشکەشکردنی یارمەتییەوەیە.

بەلام چین زۆر کارامەترە و هێزی نەرم و هۆکاری باشتری دیبلۆماسی لە ئاسیادا بەکاردێنێ، ئاسیاش ئەو شوێنەیە کەوا چین زۆربەی کات و وزە و گرنگیدانەکانی بۆ تەرخان دەکات. پەکین بەهۆی دیبلۆماسییەتە کارامەکەی، لەماوەی دوو دەیەی ڕابردوودا یارمەتیی ڕێکخستنی شۆڕش و وەرچەرخانی نێو هەڵوێستەکانی داوە. لە هەشتایەکاندا چین تەنیا پەیوەندییەکیشی لەگەڵ زۆرێك لە ولاتانی خۆرهەلاتی ئاسیادا نەبوو، بە کۆریای باشوور و ئەندۆنیسیا و سەنگافوورەشەوە. بەلام لە ساڵی ٢٠٠٧دا چەند مانۆڕێکی هاوبەشی سەربازی لەگەڵ کۆبەندی ولاتانی باشووری خۆرهەلاتی ئاسیادا ASEAN ئەنجام دا. یەکێك لە ڕاپرسییەکان بەڵگەی ئەم گۆڕانەی نێو هەڵوێستەکان زۆر بەڕوونی پیشان دەدات، چوونکە ئەوانەی کە ڕاپرسییەکەیان لەسەر ئەنجام درا کاتێك پرسیاریان لێ کرا کە متمانەیان بە کامە دەوڵەت هەیە هێزی جیهانی هەبێت، ئەوا کەسانی نێو تایلەند و ئەندۆنیسیا - کە دوو هاوپەیمانی تەقلیدیی ئەمریکان- چینیان لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو پێ باشتر بوو. تەنانەت لە ئوستورالیاشدا، هەڵوێستە باشەکانی هەمبەر چین و ویلایەتەکانی یەکگرتوو یەکسانە.

بادەوەریبە شۆڕشگێڕییەکانی سیاسەتی دەرەوەی چین- کە لە ڕووی کردارییەوە واتای بەکارهێنانی جیاوازی و ناکۆکییەکانی چینی دەگەیاند لەپێناو

وروژاندنی گرفتەکاندا- تا ئەم دواییانەش لە خەیاڵەکاندا مابوون. داگیرکردنی ڤیێتنام لە لایەن چینەوە، هەروەها بانگەشەکانی بە هەبوونی ماف لە دەریای باشووری چیندا و کێشە سنوورییەکانی لەگەڵ ڕووسیا و هیند بۆچوونێکی وەهای دروستکرد کە چین هاوسێیەکی هەراسانکار و وروژێنەری گرفتەکانە. بەلام پەکین لەگەڵ هاتنی کۆتاییەکانی نەوەدەکاندا سیاسەتێکی دەرەوەی تەواو جیاوازی هەرێمیی گرتەبەر، ئەم سیاسەتەش لەو کاتەدا زۆر ڕوون بوو کە ڕۆڵی چین لە دوای قەیرانی ساڵی ی۱۹۹۷ خۆرهەلاتی ئاسیا زۆر بونیادنەرانە بوو. لەو کاتییەوە، پەکین لە بەکارهێنانی هێزە سیاسی و ئابوورییەکانی زۆر کارامەبوو کە بەشێوازێکی زۆر دانبەخۆداگرتووانە و پشوودرێژانەی زۆر کارا ڕەفتاری کردووە. ڕێبازێکی نەرمتری سیاسییانەی گرتووتەبەر، هەروەها گرێبەست و ڕێککەوتننامەی زۆر چاوتێرانەی یارمەتیی پێشکەشکردووە (ئەو یارمەتییانەشی بەزۆری لە یارمەتییەکانی ویلایەتەکانی یەکگرتوو باشتربووە)، هەروەها بەپەلە ڕێککەوتنێکی بۆ بازرگانیی ئازاد لەگەڵ ASEANدا مۆرکردووە. پێشتر خۆی لە کۆمەڵەکان و بەیەکگەیشتنەکانی هەمەلایەن بەدوور دەگرت، بەلام بەمدواییانە لە زۆرترین کۆنفرانس و یانە و کۆمەڵەدا بەشداری دەکات- تەنانەت یەکێکی تایبەت بەخۆی پێکهێناوە کە لووتکەی خۆرهەلاتی ئاسیایە و بەئەنقەست ویلایەتەکانی یەکگرتووی لێ دەرهاوێشتووە. ئێستەش چین لە وڵاتانی باشووری خۆرهەلاتی ئاسیادا پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکرێ، تەنانەت گلۆریا ئەرۆیۆی سەرۆکی فلیپین و لایەنگری ڕووکەشانەی ئەمریکا، بەئاشکرا ڕایگەیاند: " ئێمە شادومانین چین ببێتە خوشکی گەورەمان".

ئەم گۆڕانە لە پەیوەندییەکانی پەکین لەگەڵ حکوومەتەکانی وڵاتانی هاوسێیدا دەبیندرێ، بۆنموونە ڤیێتنامییەکان خۆشەویستییەکی تایبەتیان بۆ چین نییە،

یەکێك لە بەرپرسانی چین بەمنی گوت: " ئێمە بەشێوەیەکی باش دەبینین. چین بۆماوەی هەزار ساڵ ڤێتنامی داگیرکرد. لەو کاتیشەوە سێزدە جار هێرشی بۆ کردووین". بەلام دانی بەوەشدانا کە چین" ئامادەییەکی مەزنی هەیە، گەورەترین سەرچاوەمانە"؛ واتا لەسەر حکوومەتەکانی ئەو ناوچەیە و گەلانی پێویستە بەشێوەیەکی پراگماتیکی پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ چیندا هەبێت. بەهەرحاڵ، ئەو کتێبخانانەی کەوا لە ڤێتنامدا سەردانیانم کردن بەشێوەیەکی بەرجەستە چەندان کۆمەڵە وتاری سەرکردە چینییەکانی وەك دینگ زیا و بینگ و زیمین و هیو جینتاو دەخەنە ڕوو.

پێش سەردانەکەم بۆ ڤێتنام، لەکاتی سەردانە فەرمییەکەی سەرۆکوەزیرانی چینی وین جیاباو لە ساڵی ٢٠٠٧دا چووبوومە تۆکیو، لەوێدا قسەیەکی هاوشێوەی ئەوەی سەرەوەم گوێ لێبوو. جیاباو خۆی لەوە دوورگرت بچێتە قووڵایی خاڵە ڕۆژوزەوەندە پڕ لە گرژییەکانی نێوان هەردوو وڵات و لەجیات ئەوە جەختی لەسەر لایەنە ئەرێنییەکان کردەوە؛ واتا جەختی لەسەر پەیوەندییە گەشەسەندووە ئابوورییەکەی نێوانیان کردەوە. بەلام کەمکردنەوەیەی ئەم گرژییە فشۆڵە و لە سیاسەتی دەرەوەی پەکیندا ئاماژە بە مەترسییەکی سەرەکی دەکات، ئەویش هەوڵدانیەتی بۆ بەکارهێنانی هەستوسۆزی نەتەوەیی لەپێناو مەبەستە تایبەتەکانی خۆیدا.

لە ڕابردوودا چین سووربوو لەسەر ئەوەی پەیوەندیی لەگەڵ یاباندا بەگرژی بهێڵێتەوە. ئەو ئابڕووبەری و کارە قێزەونانەی یابان لە جەنگدا ئەنجامی دا و نوودلبوونی لە دانان بە گوناهەکانی بەشێکی زۆری گرفتەکەی ئەوکات بوو. بەلام وەها پێدەچوو کە چین زۆر بەچالاکییەوە کار بۆ زیاترکردنی ئەو گرفتە بکات، گەورەکردنی گرفتەکەش بەڕێگەیەك ئەنجام دەدرا کە بریتیبوو لە

باسکردنەوەی ڕەفتاری یابان لە جەنگدا لەو کاتانەی کەوا پێویستی پێی مەبووایە، هەروەها پۆزشەکانی یابانی ڕەتدەکردەوە و ولنەی مێژووی نێو خوێندنگەیەکانیشی زۆر بەتوندی جەختیان لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکردەوە. لە نیسانی ساڵی ٢٠٠٥دا حکومەتی چینی لەهەمبەر پرۆگرامە مێژووییەکانی خوێندنگەکان زەمینەی بۆ ناڕەزایی دژ بە یابان خۆشکرد، ئەم ناڕەزاییانە بوونە خۆپیشاندانی گەورەی میللی و کاری تێکدەرانە، هەروەها بەردبارانکردنی باڵیۆزخانەی یابانی و داواکاری بۆ نەکرینی کاڵای یابانی.

لەڕووی ستراتیژییەوە بۆ پەکین لۆژیکی نییە کە وەك پێشوو لە هەمبەر تۆکیودا وەك ڕابردوو توندڕۆ بێت، بەتایبەت کە سیاسەتی ڕابوونێکی ئاشتیانەی گرتبووەبەر. چوونکە ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی هاوسێیەکی ڕکابەر و دژ بۆ خۆی پەیدابکات، هاوسێیەك سوپایەکی تۆقێنەر و ئابوورییەکی وەهای هەیە ئێستەیشی لەگەڵدا بێت سێ جار لە ئابووریی چین مەزنترە. لەبەرئەوە ئاقڵی و دانایە چین ستراتیژێك پیادە بکات کەوا یابان بەچەند پەیوەندییەکی ئابووری و هاوکارییەکی گەورەتر و گەیشتن بە بازاڕەکانی یابان و وەبەرهێنان و تەکنۆلۆژییە تایبەتەکەی ببەستێتەوە تا ئەو کاتەی لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا بەرزەفتی دەکات. نەك هەر ئەمە بەڵکو بۆ ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکان بەڵگەیەکی زۆر بەهێز هەیە، چوونکە یابان- هەرچەندە بەشێوەیەکی میسالییانە ڕەفتاری نەکردووە- بەڵام چەندان جار لەبەرانبەر دوژمنکارییەکەی کاتی جەنگ داوای لێبووردنی کردووە و زیاتر لە ٣٤ملیار دۆلاری وەك یارمەتی لەپێناو گەشەکردندا بەخشیوەتە چین(ئەمەیش شتێکە و چینییەکان هەرگیز باسیان نەکردووە). ئەوە ڕوونە کە حەزی ئاشتبوونەوە لەگەڵ یابان لەو کاتەوە سەری هەڵدا کە جیاباوی سەرۆکوەزیران لە ساڵی ٢٠٠٧دا سەردانی یابانی کرد، بەلام

ڕەنگە ئەوەش درێژە نەکێشێت، چوونکە گرفتێکی چینی هەیە لەبەردەم ئەمەدا دەبێتە لەمپەر. لەبەرئەوەی حزبی کۆمۆنیست دوای وازهێنانی لە کۆمۆنیستی، بۆ پاراستنی یەکێتیی چین لایەنی نەتەوەیی وەك خەڵەتاندنێك بەکارهێنا، هەستی هاوچەرخانەی نەتەوەیی چینیش بە دوژمنایەتکردنی یابان دەناسرێتەوە. لەبەر ئەم هۆیە، هێشتا ماو لە چیندا پاڵەوانە؛ چوونکە بەدژی یابانییەکان جەنگاوە و وڵاتەکەی یەکخستووە.

حکوومەتی چینی بەشێوەیەکی گشتی شیمانەی ئەوە دەکات کە دەتوانێت سۆزی خەڵکی بەرزەفت بکات، بەڵام لەمڕۆژگارەدا ئەم متمانەیە لەدەست دەدات. چوونکە دەوڵەتێکی دیموکراسی نییە، ئەوا شارەزایی لەم بوارەدا کەمە. بە ناگایی و دوولییەکی زۆرەوە ڕەفتار لەگەڵ هەستوسۆزی گەلەکەیدا دەکات، هەروەها لەوەش دڵنیا نییە ئاخۆ دەبێ هانی بدات یان سەرکوتی بکات، ئەمەیش هەمووی لە ترسی دەرئەنجامەکانە، بۆنموونە: حکوومەتی چینی نازانێ لە هەمبەر کۆمەڵەیەکی وەك هاوپەیمانیی نیشتمانیدا چی بکات، ئەم کۆمەڵەیە نەتەوەپەرستی توندڕۆن و لە چالاکییەکانیاندا پشت بە ئینتەرنێت دەبەستن. هەر ئەو کۆمەڵەیەش بەرپرسی ڕێکخستنی خۆپیشاندانەکانی دژ بە ئەمریکابوون دوای ڕووداوی فڕۆکەی EP-3 ی ساڵی ٢٠٠١ و خۆپیشاندانەکانی دژ بە یابان لە ساڵی ٢٠٠٥، حکوومەت ڕێگەی بۆ هەردوو خۆپیشاندان خۆشکرد، بەڵام دواتر بۆی ڕوونبوویەوە لەوە زۆر توندوتیژتربوون کە پێشبینیی دەکرد. بەڵام ئەم دوو ڕووداوە، وەك پێدەچێ، پاڵیان بە دەسەڵاتەوە نا سەرلەنوێ بیربکاتەوە، چوونکە بەمدواییانە پەکێن پاڵپشتیی خۆی بۆ هێزی نەتەوەیی کەمتر کردووەتەوە و کار لەسەر ئەو هێزانە دەکات کەوا دیبلۆماسیتر و سیاسییانەترن.

بەلام سەبارەت بە تایوان ئەگەری مەترسیداری ڕوودانی قەیرانێکی دەرەکی و هەڵچوونێکی گەورەتری نێوەخۆیی نەتەوەیی لە ئارادایە. چوونکە پەکین لە هەمبەر تایواندا نەرم نەبووە، هەروەها هەندێك سیاسەتمەداری تایوانیش لە هەمبەر چیندا نەرم نەبوون؛ وەك باروونە و ئەگەری تەقینەوەی هەیە، یەکێك لە نموونەی ئەو تەقینەوانە پێشنیازەکەی چین چوییبیانی سەرۆکی تایوانی بوو سەبارەت بە ئەنجامدانی گشتپرسییەك بۆ سەربەخۆبوونی تایوان لە ساڵی ٢٠٠٢دا کە بووە هۆی سەرهەڵدانی شەپۆلێکی گەورەی تووڕەیی. چین لە زۆربەی کاتەکاندا پلانێك دەگرێتەبەر کەوا مەبەستی ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانە لەگەڵ پارتی ئۆپۆزسیۆنی سەرەکی لە تایوان و نقومکردنی بە ئاشتی و هێمنی. بەلام، ئەمەش بەبەردەوامی نییە. چوونکە لە ساڵی٢٠٠٥دا پەکین یاسایەکی دەرکرد کەوا دژی جیابوونەوە بوو و هەڕەشەی لە تایوان دەکرد کە ئەگەر بەهەر شێوەیەك بیەوێ چین تووڕە بکات، ئەوا هێزی سەربازی بەدژی بەکاردەهێنێ. لە ئەنجامی ئەمەدا و — لەبەر چەند هۆیەکی دیکە— یەکیەتیی ئەورووپا پلانەکەی خۆی بۆ لادانی ئابلۆقەی سەپێندراوی چەك بەسەر چین دواخست.

پرسی تایوان نموونەیەکی گرنگ و زیندوو لەسەر چۆنییەتیی ئیدارەدانی باڵنەرەکانی ئابووری پیشان دەدات بۆ تەواوبوونی حەزەکانی سیاسیی نەتەوەیی، جا هەرچەندە لەیەکیش دووربن. ئەقڵانییەتی دروستکردنی بڕیار لە سیاسەتی ئابووریدا ناتواندرێ لەبواری سیاسیدا بەئاسانی پێڕەو بکرێ؛ چوونکە مێژوو و هەستوسۆزەکانی کەرامەت و شانازیکردن و تووڕەییش ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕن. لە ساڵەکانی دواییدا پەکین گۆڕا و ڕێبازێکی داناپانەتری لە هەمبەر تایواندا پیادە کرد کە ئاستی دوژمنایەتییەکەی کەمتر بوو (تەنانەت لە هەمبەر یابانیشدا)، چوونکە درکی بەوە کرد کەوا کات لە بەرژەوەندیی ئەودا تێدەپەڕێ.

بۆبێ چەندان هەنگاوی زیرەکانەی هەڵێنا کەوا پشتگیری لە سەربەخۆیی تایوان دەکرد لەسەر زەویی خۆیدا؛ گرنگترینیان دابەزاندنی فەرمانە(رسووماتەکانی گومرگ بوو لەسەر ئەو بەروبوومە کشتوکاڵییانەی لە هەرێمێکی تایوانی دەهاتن و لە گشت شوێنەکانی دیکە زیاتر حەزی بە سەربەخۆیی تایوان دەکرد. بێگومان لە هەمان کاتیشدا، سوپای چینی زۆر بەخێرایی گەشەی دەکرد، لەگەڵ ئامانجێکی ستراتیژیدا کەوا بریتی بوو لە وەدیهێنانی سەرکەوتنی خێرا لە هەر ململانێیەك کە لەوانەیە سەبارەت بە تایوان هەڵبگیرسێت. بە واتایەکی دیکە، گەشەکردنی ئابووری و جیهانگەرایی پاڵیان بە پەکینەوە نا پلان بۆ تەواوکردنی رەوت و کاروانەکەی خۆی دابنێ، لە هەمان کاتیشدا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسی و سەربازی هێز تۆکمەتر و پێشکەوتووتر بکات.

## ئەژدیها و هەڵۆ

گرنگیی پەیوەندییەکانی چین لەگەڵ وڵاتانی جیهاندا زۆر کەم و بچووك دەبێت ئەگەر بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەك وڵاتدا بەراورد بکرێ کە ئەویش ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە. با بەشێوەیەکی دیکە بیرۆکەکە ڕوونتر بکەینەوە، هەر گرفتێکی شیمانەکراو کە لەوانەیە چین ڕووبەڕووی ببێتەوە، ئەگەر نەبێتە هۆی تێوەگلانی ویلاتەکانی یەکگرتوو ئەوا هیچ گرنگییەکی نییە. بەبێ تێوەگلانی ئەمریکی، لەوانەیە جەنگ لەگەڵ تایواندا خوێناوی و تراژیدی بێت، بەڵام دەرئەنجامەکەی جیهانیی فراوانی نابێت تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کە ببێتە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی چینی- ئەمریکی. هەروەها ئەو گرفت و ئەگەرەیەی کە لە چاوی ئەمریکادا ناوی وڵاتی چینە، بەبەراورد لەگەڵ وڵاتانی دیکەی دژ بە ئەمریکا ناوەرۆکی گەورەتری هەیە. سیاسەتی دەرەوەی چینی بەدرێژایی سێ دەیە بۆ ڕازیکردنی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ئەرخان

کرابوو، ئەمەیش لەبەر چەندان هۆبوو، یەکەم: بەشێکبوو لە ستراتیژیەتی دژ بە یەکیەتیی سۆڤییەت، دواتر حەزکردن بە چوونە نێو بازارەکان و ریفۆرم، دواتر سەرلەنوێ شیاندنەوەی ولاتەکە دوای ڕووداوەکەی گۆرەپانی تیانانمین، دواتریش وەدەستهێنانی ئەندامییەتی لە ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانی، لە کۆتاییشدا ئۆلۆمپیادەکانی پەکین. بەڵام دەستەبژێری گەنج لە ئێستەی چیندا متمانەی ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر دەبێت کە ولاتەکەی پێویستی بەوە هەیە لە زۆر لایەنەوە وەك ڕکابەرێکی واشنتۆن خۆی ببینێ. بەڵام لە واشنتۆندا، بەردەوام ئەو کەسانە هەن کەوا چین بە هەڕەشەیەکی هاتووی سەر نموونە باڵایەکان و بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ئەمریکی دادەنێن. مەبەستم لەوە ئەوە نییە بڵێم کە جەنگێك بەرپا دەبێت، یان تەنانەت ململانێیەکیش دروست دەبێت، بەڵکو مەبەستمە ئاماژە بە ئەگەری ڕوودانی گرژیی نێوان هەردوو ولات بکەم. ئەوجا چۆنییەتیی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەم گرژییەدا، دیاریکەری ئایندەی پەیوەندییەکانیان و ئاشتیی جیهانییە.

لە ئێستەدا، بڕیار و قسەی هەرە بەرز لە پەکین و واشنتۆن بەیەکەوە لە دەستی هێزەکانی تەولوکردنە (التكامل). پەیوەندیی ئابووریی ئەمریکیی– چینی پەیوەندییەکی دوولایەنەی ئاڵوێرکراوە. چوونکە چین لەپێناو ساغکردنەوەی کالاکانی پێویستی بە بازاڕی ئەمریکی هەیە، ویلایەتەکانی یەکگرتووش لەپێناو قەرز وەرگرتن پێویستی بە چین هەیە؛ هاوکوف و هاوشانێکی تایبەتە بە زەمەنی جیهانگەرایی بۆ ویرانکردنێکی دوولایەنەی ئاڵوێرکراوی سەردەمی ئەتۆمی. (جگە لە هێزەکانی سەقامگیری، هەردوو بارخانەی (الترسانه) ئەتۆمیی ئەمریکی و چینی ڕۆڵێکی بەرپەرچدەرەوەشیان هەیە) ڕاستیی هەبوونی جیهانێکی گلۆبالیزەکراو کە چین و ئەمریکا ناچار بکات بچنە نێو

هاوپەیمانییەکەوەبەهۆی جوگرافیایەکی سیاسییانەوە تەگەرەی بۆ دروست دەبێت. لەبەرئەوە، ئیدارەی بۆش سەبارەت بە پرسی تایوان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر زۆر نەرم بوو. هەرچەندە جۆرج دەبلیۆ بۆش لەڕووی ئایدۆلۆژییەوە دوژمنکارانەترین سەرۆکی ئەمریکی بوو کە مامەڵەیان لەگەڵ پەیوەندییەکانی ئەمریکی – چینی کردبێ، هەرچەندە تەواوی قۆناغی سەرۆکایەتییەکەی لە ستایشکردنی دیموکراسییەت و ئیدانەکردنی دیکتاتۆرییەتدا بەسەربرد و بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی دەکرد، بەڵام سەبارەت بە پرسی تایوان چەندان جار پشتیوانی لە چین کرد و هۆشداریی دەدایە تایوان کە هەوڵی جیابوونەوە نەدات، هیچ سەرۆکێکی دیکەی ئەمریکی پێشتر کارێکی وەهای نەکردووە. لەبەرئەوە دەبینین پەکین لەو ئیدارەیە ڕازییە، هەرچەندە وتارەکانی بۆش سەبارەت بە ئازادی زۆر بوون و خودی سەرۆك بۆش چاوی بە دالایی لاما کەوت.

واشنتۆن و پەکین دانایی تەواویان هەیە کە وایان لێ دەکات هەوڵی هاوکاریکردنی یەکتری بدەن. ململانێ لە نێوان زلهێزەکان شتێکە و جیهان لە کاتی کۆتاییهاتنی جەنگی ساردەوە بەخۆیەوەی نەبینیوە. جا ئەگەر قەدەر وەها بێت بگەڕێتەوە، ئەوا ئەو گرفتانەی لە ئێستەدا نیگەرانمان دەکەن– تیرۆر، ئێران، کۆریای باکوور– بە بەراورد لەگەڵ ئەو شتانەی کە لەوانەیە ڕووبدەن، پرسگەلێکی زۆر سادە دەبەن. ئەمە مانای ڕوودانی کێبڕکێکردنە لەسەر خۆ پڕچەککردن و ململانێیەکانی سنووری و پێشبڕکێیەکان لەنێوان وڵاتانی هاوپەیمان و ئەو وڵاتانەی پشتیان بە وڵاتانی لەخۆیان گەورەتر بەستووە، هەروەها پەیدابوونی ململانێی لۆکاڵی و لەوانەیە لەو شتانەش زیاتر بێنە ئاراوە. هەروەها جوولەی بێشەوەی نوێگەریی ئابووری و سیاسی خێراییەکەی کەمتر دەبێتەوە، ئەگەر

هەر بەتەواویش نەوەستێ. لە ڕاستیدا، چین بەبێ هیچ جۆرە سیناریۆیەکی تۆقێنەر پەیوەندییەکانی ئەو هێزانە ئاڵۆز دەکات کەوا لەسەر ئەرزی واقیعدا بوونیان هەیە، بۆنموونە: ئەگەر ویلایەتەکانی یەکگرتوو و یەکیەتیی ئەورووپا هەڵوێستی کرۆکیی تەواو جیاواز لەهەمبەر ڕابوونی چین بگرنەبەر، ئەمە فشارێکی بەردەوام لەسەر هاوپەیمانیی خۆرئاوایی دەسەپێنێ بەشێوەیەك گرژییەکانی هەمبەر عێراق وەها لێ دەکات وەك دەمەقاڵێیەکی پووچ بێتە بەرچاو. بەڵام ڕوودانی ململانێیەکی جدیی چینی ئەمریکی، ڕوخسارەکانی سەردەمی نوێ دیاری دەکات و دەیکاتە شوێنێکی دیکە کە زۆر لە کامڵبوون و بازرگانی و جیهانگەرایی بەدووربێت.

هەندێك کۆمەڵەی ئەمریکی هەن- کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە پارێزکارە نوێیەکان و هەندێك بەرپرسی پەنتاگۆن پێکهاتوون- لەهەمبەر هەڕەشەی چین زەنگی هۆشداری لێ دەدەن و بەشێوەیەکی تایبەتیش ئاماژە بە لایەنە سەربازییەکەی مەترسییەکە دەکەن. بەڵام ڕاستییەکان پاڵپشتی لە پرسەکەیان ناکات. بەدڵنیاییەوە چین سوپاکەی فراوانتر و گەورەتر دەکات، چوونکە گوژمەی بەرگریی چین بە ڕێژەی ١٠٪ ی ساڵانە زیاد دەکات، بەڵام تاکو ئێستەبشی لەگەڵدا بێت بەشێکی کەمی ئەو پارەیە خەرج دەکات کەوا ئەمریکا لەو بوارەدا خەرجی دەکات؛ لە باشترین دۆخەکاندا تەنیا لە ١٠٪ ئەو پارەیە خەرج دەکات کەوا پەنتاگۆن بۆ سوپاکەی تەرخانی دەکات. ویلایەتەکانی یەکگرتوو ١٢ هەڵگری فڕۆکەی هەیە کە بە وزەی ناوەکی کار دەکەن و هەر یەکێکیان دەتوانن ٨٥ فڕۆکەی هێرشبەری جەنگیی هەڵگرن، بەڵام ئەندازیارانی دەریاوانیی چین ئێستە کار بۆ ئەوە دەکەن یەکەم هەڵگری فڕۆکە بونیاد بنێن. چین بیست مووشەکی ئەتۆمی هەیە کە بەپێی مەزەندەکانی پەنتاگۆن دەتوانن

بگەنە کەنارەکانی ویلایەتەکانی یەکگرتوو، بەلام ئەم چەکە " بچووک و بێهێزانە...... دەکرێ بکەونە بەر هێرشێکی کتوپڕ و دەستپێشخەرانە". لە بەرانبەریشدا ویلایەتەکانی یەکگرتوو نزیکەی ۹.۰۰۰ کلاوەی خاوەکی ئامادە و نزیکەی ٥.۰۰۰ سەرە مووشەکی ستراتیژیی هەیە.

چینییەکان دەزانن کە ئەرازووی سەربازی شکاوەتەوە. لەسەر ئەم بنەمایەوە، بەرەنگارییەکانی چین، کەوا کار بۆ وەدیهێنانی هاوسەنگیی سەربازی دەکات، هیچ کاتێک وەك بەرەنگارییەکەی یەکیەتیی سۆڤیەتی لێ نایەت. بەلام بەشێوەیەکی لۆژیکی بە زلهێزێکی نا یەکسان دەمێنێتەوە. ئێستە هەوڵ دەدات ئەو رێگەیانە بدۆزێتەوە و پێشیان بخات کەوا دەبنە هۆی لاوازکردنی لەپێشدانەوە سەربازییەکەی ئەمریکا، وەك تەکنۆلۆژیای خۆزا (الفضاء) ئەو تەکنۆلۆژیایەی کەوا پشت بە ئینتەرنێت دەبەستێ. بەلام لەمەیش گرنگتر ئەوەیە کە هەوڵ دەدات هێزە ئابوورییەکەی و کارامەییە سیاسییەکەی بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی بهێنێتەدی، بەبێ ئەوەی پەنا بباتە بەر هێزی سەربازی. چین نایەوێ هێرش بکاتە سەر تایوان یان داگیری بکات، بەڵکو دەیەوێ لە هێز و دەستهەلاتی بزووتنەوەی سەربەخۆخوازیی تایوانی کەم بکاتەوە تا شەکەتی دەکات.

لە کاغەزێکدا بەناونیشانی کۆبەندیی پەکین- کە بەشێوەیەکی سەرەکی جەخت لەسەر چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ بەرپرسان و ئەکادیمییە بەناوبانگەکانی چینیدا دەکاتەوە- جۆزیف کۆوپر رامۆ وێنەیەکی جوانی سیاسەتە نوێیەکەی دەرەوەی چین پیشان دەدات. " لەجیات بونیادنانی هێز لەسەر شێوازی ئەمریکی، کە پڕە لە جەك و بلرچوونی ئەوانی دیکە لەهەمبەر جیهاندا قبوول ناکات، هێزە گەشەسەندووەکەی چین جەخت لەسەر نۆرمە تایبەتەکەی و هێزی سبستمە

ئابوورییەکەی و بەرگرییە توندوتۆڵەکەی لە سەرەوەرییە نەتەوەییەکەی دەکاتەوە". رامۆ وەها وەسفی دەستەبژێری چینی دەکات بەوەی کە هێزە هەڵکشاوەکەی وڵاتەکەی لەگەڵ سیاسەتێك کەوا کەمتر دەستوەردان دەکات، وەهای لێ دەکات ببێتە هاوبەشێکی سەرنجراکێش، بەتایبەت لە جیهانێکدا کە وەها لە ویلایەتەکانی یەککگرتوو دەنواڕدرێ کەوا دەستبەسەرداگر و هەژموونداار و لووتبەرزانەیە. رامۆ دەڵێ:" مەبەستی چین ململانێ نییە، بەڵکو خۆ دوورگرتنە لە ململانێ. هەروەها سەرکەوتنی ڕاستین لە پرسەکانی ستراتیژیدا پێویستی بەوە هەیە بە کارامەییەوە ڕەفتار لەگەڵ دۆخێکی دیاریکرلو بکرێت بەشێوەیەك بێ سێ و دوو دەرئەنجامەکە لە بەرژەوەندیی چیندا بێت. ئەمەیش لە هزری صن زی بیرمەندی کۆنی بواری ستراتیژی وەرگیراوە بەوەی کە " گشت جەنگێك پێش ئەنجامدانی دەبردرێتەوە یان تیایدا دەدۆڕێنیت".

لە بەرانبەریشدا، ویلایەتەکانی یەککگرتوو دەزانێ چۆن ڕەفتار لەگەڵ پێشکەوتنێکی تەقلیدیانەی سەربازیی سیاسیدا بکات. چوونکە لە کۆتاییدا، ئەمە سروشتی هەڕەشەی سۆڤییەتی و هەڵکشانی نازییەکان بوو بۆسەر عەرشی دەستەهەڵات. ویلایەتەکانی یەککگرتوو باکراوندێکی هێزی و ئامراز- چەك و گرێبەست و ڕێککەوتنامەی بارمەتیدەر و هاوپەیمانی-ی وەهای هەیە کە توانای ئەوەی پێدەبەخشێ ڕووبەڕووی ئەو پێشکەوتنە ببێتەوە. جا ئەگەر چین بە لووتبەرزی و هەژموونەوە ڕەفتاربکات و هاوسێیەکەی تووڕە بکات و جیهان بترسێنێ، ئەوسا ویلایەتەکانی یەککگرتوو دەتوانێ بە کۆمەڵێك سیاسەت وەڵامی بداتەوە کەوا سوود لە کردەیەکی هاوسەنگکردنی سروشتی وەربگرێ کەوا پاڵ بە یابان و هیند و ئوسترالیا و ڤیتنام - لەوانەشە وڵاتانی دیکەشەوە- بنێ لەپێناو کۆتوبەندکردنی هەژموونی هەڵکشاوی چینی هاوکاریی یەکتری بکەن.

بەلام، ئەدی ئەگەر چین پابەندی ستراتیژە ناپەکسانەکەی بوو؟ ئەدی ئەگەر ئابووری و پەیوەندی و ڕەفتارەکانی بەشێوەیەکی میانڕەو و هێمن فراوانتر بکات و بەهێواشی بواری هەژموونەکەی فراوانتر بکات؟ ئەدی ئەگەر وەك هەوڵێك بۆ کەمکردنەوەی ئارامی و دانبەخۆداگرتنی ئەمریکییەکان، بەرەو لایەکانی ئاسیا بەهێواشی پاڵی بە واشنتۆنەوە نا؟ ئەدی چی دەبێت ئەگەر پێگەی ئەلتەرناتیڤی ئەمریکایەکی لووتبەرز و ترسێنەری بزخۆی داگیرکرد؟ ئەمریکا لەگەڵ سیناریۆیەکی لەمشێوەیەدا چۆن ڕەفتار دەکات؟ جۆرێك لە جەنگی سارد، بەلام ئەمجارە لەگەڵ جڤاکێکی زۆر زیندووی ئابووری کە لە ڕووی دانیشتووانەوە ژمارەی لە هەموو ولاتانی دیکە زۆرترە؟ گەلێك کە خۆی وەك نموونەیەکی بینەوا و بێدەستەلاتی سۆسیالیزمی دەولەت پیشان نادات و هێزی خۆی لە دەستوەردانە بێسوودەکانی سەربازیدا بەفیڕۆ نادات؟ ئەمەیش بۆ ویلایەتەکانی یەککرتوو بەرەنگاری و گرفتێکی نوێیە ؛ گرفتێك کە پێشتر هەرگیز ڕووبەڕووی نەبووەتەوە و تا ئاستێکی زۆر بەرز خۆی بۆ ئامادە نەکردووە.

کاتێك دەستەبژێری سیاسەتی ئەمریکی بیر لە چۆنییەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ چین دەکەنەوە، هێزێکی دیکەی هەلکشاوی گەشەسەندووی نزیك چین فەرامۆش ناکەن کەوا خەریکە دەگاتە کاروانی پێشکەوتنی چین، ئەویش هیندستانە.

## ٢-هاوپەیمان

لە پاییزی سالی ١٩٨٢ بە فڕۆکەیەکی سەر بە هێلی ئاسمانیی هیندی سەفەرم کرد و لە فڕۆکەخانەی سانت کروز لە بۆمبای بەرەو بەکێك لە زانکۆیەکانی ولایەتەکانی یەککرتووی ئەمریکا ڕۆیشتم. دەیەی پێشوو بۆ هیند دەیەیەکی زۆر توندونیژ بوو، چوونکە بە خۆپیشاندانی ناڕەزایی میللی و ئاژاوەگێڕی و

بزووتنەوەکانی جوداخواز و بزاڤەکانی یاخیبوون و هەڵپەساردنی دیموکراسی دەناسرایەوە. لە سەرووی کۆی ئەمانەشەوە ئابوورییەکی خرلپی هەبوو کە گەشەکردنێکی کەم و هەڵئاوسانێکی کەڵەکەبووی لەخۆیدا کۆکردبووەوە. گەشەکردنی ئابووری بەتۆزقاڵ پێش گەشەکردنی دانیشتووان کەوتبوو. لەو کاتیدا کەسێکی ئاسایی هیندی بەپێی تێکڕای زیادبوون لە تێکڕای بەرهەمی نێوەخۆیی بۆ هەر تاکێك، پێویستی بە پەنجا و حەوت ساڵ هەبوو بۆ ئەوەی دەرامەتی خۆی دوو هێندە بەرز بکاتەوە. جا لە سایەی ئەو واقیعە خراپەدا، زۆرێك لە هیندییەکانی بەهرەمەند و بەرتەمایەکان باوەڕیان وەهابوو کە ئایندە راستەقینەکەیان تەنیا لەوەدا دەبیننەوە وڵاتەکەیان بەجێبهێڵن. لەبەرئەوە، نزیکەی ٧٥٪ی دەرچووانی پەیمانگەکانی تەکنۆلۆژیای هیندی لە هەشتایەکاندا بەرەو ئەمریکا کۆچیان کرد.

بەڵام دەیەی کۆتایی لە ساڵی ١٩٩٧ وە تەولو پێچەوانەی ئەو دەیەیە بوو. چوونکە هیند تیایدا لە قۆناغێکی پڕ لە سەقامگیری و ئاشتی و خۆشگوزەرانیدا ژیا. هەروەها ئاگری جوداخوازییەکان و ئاراستە دوژمنکارییە نەتەوەییەکان کەمبوونەوە. چەندان حکومەتی نەتەوەیی و هەرێمی بەبێ هیچ گرفتێك بەدوای یەکتریدا هاتن. تەنانەت پەیوەندییەکانی پڕ لە گرژی و بەردەوامەکان لەگەڵ پاکستاندا گەرمی و سارێژبوونەوەیکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. لە کۆی ئەمانەش گرنگتر- کە بناغەی کۆی ئەم دیاردانە بوو- ئەو وەرچەرخانە بوو کەوا ئابووریی هیندی بەخۆیەوەی بینی، چوونکە لە کۆی دەیەکەدا گەشەکردنێکی بە ڕێژەی ٦.٩٪ ی بەخۆیەوە بینی، لە نیوەی دووەمیشدا ڕێژەکەی ٨.٥٪بوو. جا ئەگەر تێکڕای دووەم بپارێزرێ و وەك خۆی بمێنێتەوە، ئەوا هیندییەکی ئاسایی لە ماوەی کەمتر لە دە ساڵ دەرامەتی خۆی دوو هێندە

دەکاتەوە. لە ئێستەوە واپێدەچێ کە کاریگەریی کەڵەکەیی ئەم چالاکییە نوێیەی ئابووری تەواو ڕوون بێت، چوونکە ژمارەی ئەو هیندییانەی کەوا لە دەیەی ڕابردوودا لە توێخی هەژاری دەرچوون لە ژمارەی ئەو کەسانە زۆر زۆرترە کەوا لەماوەی پەنجا ساڵی پێشوودا هەبوون.

جیهان ئەمە دەبینێ. لە کۆڕبەندی ئابووریی جیهانیدا کەوا ساڵانە لە داڤۆسی سویسرا بەڕێوەدەچێ، ئەستێرەیەکی نەتەوەیی هەیە ؛ وڵاتێك لە کۆبوونەوەی سەرکردەکانی جیهاندا بەهۆی زیرەکییەکی بێ وێنە بەرجەستە دەبێت کەوا سەرۆکوەزیران یان وەزیری دارایی پێشانی داوە، یان بەهۆی ڕووداوێکی سەرنجڕاکێشی بواری ڕیفۆرمەوە خۆی سەلماندووە.

لەو دوانزە ساڵەی کەوا تیایاندا چوومە کۆڕبەندی داڤۆس، هیچ وڵاتێك ئەفسوونی لە ئەقڵی ئامادەبووان نەکرد یان بەسەر گفتوگۆیەکەدا زاڵ نەبوو وەك ئەوەی هیند لە ساڵی ٢٠٠٦دا پیشانی دا. مەسەلەکەش هەر تەنیا بەند نییە بە یەك کۆنگرەوە. چوونکە جیهان ئێستە خۆشەویستی و سۆزێکی وەها بە هیند پیشان دەدات کە هەرگیز لە پێشووتردا ئەمە نەبیندراوە. سەرکردەکانی وڵاتانی بیانی یەك لە دوای یەك دەچنە هیند و پەیمانی دروستکردنی پەیوەندیی قووڵتر و بەهێزتر لەگەڵ وڵاتێکدا دەبەستن کەوا پێشتر زۆر نامۆ و جیاواز بوو.

لەگەڵ ئەمەیشدا زۆربەی چاودێرانی بیانی هێشتا لەو دەرئەنجام و بۆچوونانە دڵنیانین کەوا لە ڕابوونەکەی هیند هەڵیدەهێنجن. ئایا دەبێتە چینێکی دیکە؟ ئەدی ئەمە لەڕووی ئابووری و سیاسیدا چ واتایەك دەگەیەنێ؟ ئەگەر هیند دەوڵەمەندتر بوو، لەگەڵ چین ڕووبەڕووی پێکدادان دەبنەوە؟ ئایا وەك هاوپەیمانێك لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەنوڕێ؟ ئایا شتێك بەناوی بۆچوون و

روانگەی هیندۆسییانە لەهەمبەر جیهاندا بوونی هەیە؟ لە راستیدا لەوانەیە بیانییەکانی سەرگەردان هەست بە کەمە ئارامی و حەسانەوەیەك بکەن کاتێك دەزانن خودی هیندییەکانیش لەو وەلامدانەوەی ئەو پرسیارانەدا دلنیانین. چوونکە لە ئێستەدا هیند پرە لە گوروتاو بۆ ئەوەی بیرێکی مکوڕ و قووڵ بکاتەوە.

بەلام گوروتاوەکە لە کۆربەندیی ئابووریی جیهانیدا کاری خۆی کرد. هەر لەگەڵ ئەوەی لە زیورخدا لە فرۆکە دابەزیت، یەکسەر تابلۆی راگەیاندنەکان و ریکلامەکان دەبینیت کەوا هەولی مەزنکردنی شکۆی هیند دەدەن! تەنانەت بۆ پیشاندانی مەزنکردنی شکۆی هیند شاری داڤۆس بە لافیتە داپۆشرابوو. لەسەر یەکێك لە پاسەکانی نێوخۆیی نووسرابوو: " دەولەتی دیموکراسی، خاوەن بازاری ئازاد، لە هەموو ولاتانی دیکە خێراتر لە گەشەکردندا". هەروەها ئەگەر بچیتە ژوورەکەت شالێکی دروستکراو لە خوریی پاشمینا و ئامێرێکی ipod دەبینیت کە گۆرانیی بۆلیوۆدیی لەسەرە؛دیاریی شاندی هیندین. کاتێکیش دەچیتە ژوورەکانی کۆبوونەوەکان، بەزۆری گوێت لە دەنگێکی هیندی دەبێت کە دەنگی یەکێك لە دە بەرێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیایە هیندی- جیهانییەکانە. هەروەها بەرپرسانی حکوومیش هەن، تیمی خەونەکانی هیند؛ هەر هەموویان زیرەك و رەوانبێژن، هەموشیان خەریکن ریکلام بۆ بەهای ولاتەکەیان بکەن. هەروەها رووداوە سەرەکییە کۆمەلایەتییەکە لە کۆربەندییەکەدا نمایشێکی سەرسامکاری کۆمەلێك کچی جوانی هیندی بوو کەوا لەسەر ریتم و ئاوازی زیندووی بەردەم باکگراوندێکی شینی بریقەداری ئاج مەحەل خەریکی نمایشی هونەری بوون. کلاوس شوابی سەرۆکی کۆربەندییەکە مێزەر و شالێکی بریقەداری هیندی لەسەر بوو و خۆراکی تیکا بە گۆشت مریشکی دەخوارد و لەگەڵ مایکل

دیلدا سەبارەت بە ئایندەی ولاتەکە قسەی دەکرد. دروشمەکە دەیگوت" هیند لە هەموو شوێنێکە". بەڕاستیش وەهابوو.

ئەم ستراتیژە سەرکەوتووەی بازاڕکاری سەرلەنوێ و چار لە دوای چار بەکارهێندرابەوە. لە شەستەمین ساڵیادی سەربەخۆیی هیند سەرانسەری نیویۆرک ئاهەنگ و سیمیناری وەهابوون کەوا دەیانویست شوێنپێی سەرکەوتنی ئابووری و ڕۆشنبیری و سیاسیی هیند هەلگرن و ستایشی بکەن. هەروەها دروشمی بۆنەیەکە India@60 بوو کە پیشاندەری لایەنە ڕێکخەرەکەی بوو، ئەوانیش کۆمپانیایەکانی تەکنۆلۆژیی هیندی بوون. ڕووداوەکە هێندە جیاواز بوو و لە ساڵیادی پەنجایەمین زۆر گەورەتر و ڕازاوەتربوو کەوا پێش دە ساڵ لەمەوبەر بەڕێوەچوو و بە ئاهەنگێکی غەمناکانەی پێشوازیکردن لە کۆنسۆلگەریی چیندا ئەنجام درا و تەنیا شەربەتی میوەجاتی تیادا پێشکەش کرا چوونکە شەراب لە لایەن گاندییەوە قەدەغە کرابوو، هەروەها لە ساڵیادی پەنجایەمیندا وناریکیش پێشکەش کرا کەوا شانازی هەمەڕەنگیی هیند دەکرد، بەڵام ئەو ڕووداوەی دوایی شتێکی زۆر مەزن و سەرنجڕاکێش و جیاواز بوو. هیند لە ماوەی پانزە ساڵی ڕابردوودا لەڕووی خێرایی گەشەکردن لە جیهاندا -لە دوای چین- ولاتی دووەم بوو، وەهاش پێدەچێ کە لەسەر ڕێگەیەکی ڕاست و دروست بڕوات کەوا لە دەیەی داهاتوودا ئامادەی دەکات لەو گەشەکردنە چالاکە بەردەوام بێت. ڕێك وەك دۆخی چین، تەنیا قەبارەی چین کە ملیارێك مرۆڤ دەبن واتای ئەوە دەگەیەنێ کە هەر لەگەڵ ئەوەی دەستی بە پێشکەوتن کرد، ئەوا سایەیەکی مەزن دەخاتە سەر جیهان.

بەڵام لەو کاتەی کە ڕابوونی چین بووەتە ڕاستییەکی هەستپێکراو، ئەوا ڕابوونی هیند تا ئێستەیش پرسێکە و پەیوەندیی بە ئایندەوە هەیە، چوونکە تێکڕای

بەرهەمی لۆکاڵی بۆ هەر تاکێك لە ئێستەدا دەگاتە ٩٦٠ دۆلار. بەڵام ئەم ئایندەیە هەر لە ئێستەوە گرنگییەکی زۆری پێ دەدرێ. توێژینەوەکەی گۆڵدمن ساکس BRIC ئەوە پیشان دەدات کە لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠١٥دا ئابووریی هیند یەکسان دەبێت بە قەبارەی ئابووریی ئیتالیا، هەروەها لە ساڵی ٢٠٢٠ دا لە ئابووریی بریتانیا نزیك دەبێتەوە. لەگەڵ هاتنی ساڵی٢٠٤٠دا هیند لە پەیژەی گەورەترین ئابووریی جیهانیدا، شانازی بە داگیرکردنی پێگەی سێیەم دەکات. هەروەها لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٥٠ دا دەرامەتی تاك تیایدا بە بیست جار لەوەی ئێستەی زیاتر دەبێت. ڕاستە کە ئەم پێشبینییانە هەندێکجار فێڵ لە مرۆڤ دەکەن و بەزۆریش ململانێیەکان لە کۆتاییدا نامێنن، بەڵام ئەوەی لێرەدا شایانی وەبیرهێنانەوەیە ئەوەیە کە گەشەکردنی ئێستەی هیند زۆر لەوە بەرزترە کەوا شرۆڤەکە شیمانەی بۆ دەکات و وڵاتەکە – کە ئەمەیش لە هەموویان گرنگترە- توانای دیموگرافیی جێی ئومێدی هەیە. چوونکە لەو کاتەی جیهانی پیشەسازی پیر دەبێت، ئەوا هیند لە هەبوونی گەنج و تولازێکی زۆر واتا کرێکاران بەردەوامە. هەروەها لەو کاتەی کە چین بەهۆی سیاسەتە سەرکەوتووەکەی لە دیاریکردنی ژمارەی منداڵ یان سیاسەتی یەك منداڵدا ڕووبەڕووی کەمبوونەوەی نەوەی گەنج بووەتەوە، ئەوا هیند لە ڕووی ڕێژەی گەنجەوە دۆخی هەڵئاوسانی هەیە. چوونکە سیاسەتی پێشووی تایبەت بە ڕێکخستنی خێزان شکستی هێناوە (لێرەدا پەند و وانەکە ئەوەیە کە پلانەکانی کۆمەڵایەتی دەرئەنجامی نەویستراو و نا ئەنقەست دروست دەکەن). جا ئەگەر دیموگرافیا قەدەرێك بێت، ئەوا ئایندەی هیند دەستەبەر و گەشە.

لە ڕاستیدا، تەنانەت واقیعی هەنووکەیی هیند جێگەی سەرسامییە. ڕێژەی هەژاری لە ئێستەدا بە ڕێژەی سەدا پەنجا لەهی بیست ساڵ لەمەوبەر کەمترە.

هەروەها کەرتە تایبەتەکەشی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر چالاك و کارایە، چوونکە قازانجی وەها وەدەستدێنێ کە لەنێوان ١٥ و ٢٥ ٪ی ساڵانەیە. هەروەها هێزی کەرتی تایبەت هەر تەنیا لەو کۆمپانیایانە کورت نابێتەوە کەوا پشت بە ڕامەزراندنی دەرەکی دەبەستن وەك کۆمپانیای ئینفۆسیس کە؛ گرنگترین کۆمپانیای نێو ویلایەتەکانی یەکگرتووە (لەنێو زۆرێکیاندا) بە ئابووریی هیندیەوە گرێدراوە. چوونکە قازانجەکانی کۆمەڵەی تاتا- کە قەبارەیەکی کۆمپانیایی بەرفراوانە هەموو شتێکی وەك ئۆتۆمبێل و پۆڵا و بەرنامەدارکردنەکان (البرمجیات) و سیستەمەکانی ڕاوێژکاری بەرهەم دەهێنێ - لە ١٧.٨ ملیار دۆلارەوە بووەتە ٢٢ ملیار دۆلاری نێو ساڵی ٢٠٠٦ (٢٣ لە سەدا). هەروەها قازانجەکانی کۆمپانیای ڕیلاینس ئاند ستریز کە گەورەترین کۆمپانیایەکانی هیندییە لەنێوان هەردوو ساڵی ٢٠٠٤ و ٢٠٠٦دا دوو هێندەی لێ هاتووە. هەروەها تێکڕای داهاتەکانی کەرتی تایبەت لە دروستکردنی پارچە گۆڕاوەکانی ئۆتۆمبێل- کە لە سەدان کۆمپانیای بچووك پێکهاتووە- لە کەمتر لە ٦ ملیار دۆلاری ساڵی ٢٠٠٣ و بۆ ١٥ ملیار دۆلاری ساڵی ٢٠٠٧ بەرزبووەیەوە. هەروەها لە ماوەی سێ ساڵی دواتردا کۆمپانیای جەنەڕاڵ مۆتۆرز بەتەنیا پارچە گۆڕاوەکانی دەستکردی هیندی

بەبەهای یەك ملیار دۆلار هاوردە دەکات. هەروەها ژمارەی ملیاردێرەکانی هیند لە ئێستەدا لە ژمارەی ملیاردێرەکانی هەر وڵاتێکی دیکەی ئاسیایی زۆرترە، هەر هەموشیان بە هەوڵی تایبەتی خۆیان سەروەت و سامانەکانی خۆیان کۆکردووەتەوە.

## لە خوارەوە بۆ سەرەوە

لەلای ئەم خاڵەوە، هەر کەسێك پێشتر سەردانی هیندی کردبێ لە ئێستەدا رووچاری سەرسوڕمان دەبێتەوە. لەوانەشە بپرسێ: " هیند؟ بە فڕۆکەخانە ڕووخاو و ڕێگە پڕ لە کەندوکۆسپەکان و گەڕەکە فراوانە هەژارەکانی و لانییە دەستکورتەکانی؟ ئایا باس لەو هیندە دەکەیت؟" بەڵێ، ئەمەیش هیندە. هەرچەندە ئەو وڵاتە چەندان ناوچەی هاوشێوەی سیلیکۆن ڤالیی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیجیریایەك لەخۆی دەگرێ کە سێ هێندەی نەیجیریایە؛ واتا زیاتر لە ۳۰۰ ملیۆن کەس ڕۆژانە بە کەمتر لە دۆلارێك دەژیەن. بەڵێ نیشتمانی ٤٠٪ ی هەژارانی جیهانە و لە ڕووی ژمارەی تووشبووانی بە نەخۆشیی ئیدز بە وڵاتی دووەم دادەندرێ. بەڵام، ئەگەر هیند هەژار و نەخۆشیش بێت، خۆ هیندێکی ناسراو و باوە، بەڵام وێنەی جووڵاو دەلالەتێکی زۆرتری لە وێنەی جێگیر و وەستاو هەیە. هیند دەگۆڕێت. ڕاستە کە هێشتا هەژاریی تیادا ماوە، بەڵام هێزی ئابووریيە نوێیەکەی لە هەموو شوێنێکدا شتەکان دەگۆڕێ. تەنانەت لە گەڕەکە هەژارە فراوانەکانیشدا دەتوانیت هەست بەمە بکەیت.

سەبارەت بە زۆرێك لە سەردانیکەران، هیند بە وڵاتێکی جوان نایەتە بەرچاو. پیاوانی کاری خۆرئاوایی دەچنە هیند و پێشبینی دەکەن کە کۆپییەکی نیکەی وڵاتی چین ببینن. بەڵام وەها نییە، چوونکە گەشەکردنی چین لە لایەن حکوومەتێکی بەهێزەوە سەرپەرشتیی دەکرێ. کاتێکیش پەکین بڕیار دەدات کە وڵاتەکە پێویستی بە فڕۆکەخانەی نوێ و ڕێگەی ئۆتۆبانی هەشت سایدی و کۆمەڵگەی بریقەداری پیشەسازی هەیە، ئەوا لە ماوەی چەند مانگێکدا دروستیان دەکات. چین کۆمپانیایەکانی فرە ڕەگەز بەکێش دەکات، لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا مۆڵەت و شوێنە گشتییەکانی بۆ دەستەبەر دەکات. بەکێك لە بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکانی ئەمریکی باس لەوە دەکات کە چۆن بەرپرسانی

چینی لەگەڵی چوونەتە ئەو شوێنەی کەوا پێشنیازیان کردووە شوێنگە نوێیە زەبەلاحەکەی لێ بونیاد بنرێ. شوێنەکە باش بوو و لەگەڵ گشت پێوەرەکانیدا دەگونجا؛ تەنیا گرفتێکی هەبوو کە پڕ بوو لە تەلار و خەڵك. بەڕێوەبەرە ئەمریکییەکە ئەم خاڵە بۆ خانەخوێیەکەی ڕوون دەکاتەوە، خانەخوێیەکەش زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات و دەڵێ:" نۆ، نیگەران مەبە، ئەم تەلار و خەڵکە لە ماوەی هەژدە مانگدا لێرە نامێنن". بەڕاستیش ئەمە ڕووی دا. بەلام هیند حکوومەتێکی بەتوانای نییە کە بتوانێ لەپێناو هەندێك وەبەرهێنی بیانیدا خەڵك بگوازێتەوە شوێنێکی دیکە. هەروەها لە نیودەلهی و مۆمبایدا ئەو ژێرخانە بوونی نییە کەوا لە پەکین و شانگهایدا هەیە، هیچ شارێکی هیندی ئەو ڕێکخستنە مەدەنییەی نییە کەوا چین پێی دەناسرێتەوە. کاتێك پرسیارم لە فیلاسرلو دیشمۆخی وەزیری بەرپرسی گرنگترین پیشەسازیی هیند کرد لەوەی کە ئاخۆ هیند دەتوانێ لە پێشخشتنی مەدەنیدا سوود لە ئەزموونی چینی وەربگرێ، وەلامی دایەوە:" بەڵێ، بەلام بەشێوەیەکی سنووردار. کاتێك خەڵکێك دەیانەوێ باربکەنە شارەکان پێش ئەوەی ڕێگەیان پێ بدرێ ئەوا چین داوای بەڵگەیان لێ دەکات کە ئاخۆ هیچ کاروپیشەیەکیان هەیە. ئەمەیش ئەوەیان بۆ دەستەبەر دەکات ملیۆنەها خەڵك پەیدا نەبن کەوا بەدوای کاردا بگەڕێن و لە گەڕەکە هەژارنشینەکاندا کۆببنەوە و بەگشت شارەکەدا بسووڕێنەوە. من ناتوانم ئەمە بکەم. دەستووری هیند ئازادیی نیشتەجێبوونی دەستەبەرکردووە. ئەگەر کەسێك بێت و لە مۆمبای بەدوای کارێکدا بگەڕێ، ئەوا بۆ ئەنجامدانی ئەمە تەواو ئازادە".

گەشەکردن لە هیندا بەهۆی حکوومەتەوە نییە، بەڵکو بەبێ حکوومەتە. بەڵکو تا ئاستێکی زۆر گەشەکردنێکی پڕ لە هەرلوزەنا و هەڕەمەکییە، لە خوارەوە بۆ

سەرەوە ڕەوتی خۆی دەگرێت. بەڵام ئەو تایبەتمەندییە سەرەکییانەی کەوا وڵاتەکە پێیان دەناسرێنەوە خۆی لە کەرتێکی تایبەتی ڕاستین و مافی موڵکایەتی و مافە پتەوەکانی گرێبەست و دادگەیە سەربەخۆییەکان و حوکم و سەرەوەریی یاسادا دەبینێتەوە (تەنانەت ئەگەر زۆرجاریش پێشێل بکرێ). هەروەها کەرتی تایبەتی هیندی بڕبڕەی پشتی گەشەکردنەکەیەتی. لە چیندا کۆمپانیای تایبەت پێش بیست ساڵ لەمەوبەر بوونیان نەبوو، بەڵام زۆرێك لەو کۆمپانیایانە سەدساڵ لەمەوبەر لە هیند هەبوون. ئەوجا بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان بەسەر ئەم ئەگەرانەدا زاڵ دەبێت و سەرکەوتووانە لەگەڵ بیرۆکراسیدا ڕەفتار دەکات و خۆی لە ژێرخانێکی خراپ بەدوور دەگرێت و قازانج وەدەستدێنێ. ئەگەر نەشتوانێ بەهۆی خراپیی ڕێگەکانی گشتی و سەرەکی کاڵای زەبەلاح هەنارده بکات، ئەوا خزمەتگوزارییەکان و پرۆگرامسازییەکان هەنارده دەکات. گۆرشاران داسی بەڕێوەبەری جێبەجیکاری پێشووی کۆمپانیای پرۆکتەر ئاند گامبڵ بە گاڵتەوە دەڵێت: " حکوومەت شەوانە دەخەوێت و ئابووریش گەشە دەکات".

تایبەتمەندییە هەرە ورووژێنەرەکە لە هیند سەرمایە مرۆییەکەیەتی؛ واتا ژمارەیەکی زەبەلاح و زیادبووی بەڵێندەران و بەڕێوەبەران و کەسانی شارەزا لە بازرگانیدا هەن. ژمارەشیان بەخێراییەکی هێندە زۆر گەشە دەکات کەوا زۆر لە خەیاڵکردنی هەر کەسێك گەورەترە، ئەمەیش بەشێوەیەکی بەشەکی بۆ زانینی زمانی نوێگەری دەگەڕێتەوە، واتا زمانی ئینگلیزی کە ڕوونبووەتەوە گرنگترین شتێکە بریتانیا لەدوای خۆیدا بەجێیهێشتبێ. بەهۆی ئەو زمانەوە نوێنەی بەڕێوەبەران و بەڵێندەران ئاگاییان لەسەر دوا شێوازی بازرگانیی خۆرئاوایی هەیە بەبێ ئەوەی پێویستیان بە وەرگێڕ یان ڕێبەری ڕۆشنبیری هەبێت. ئەوان

سەبارەت بە کۆمپیوتەر و بیردۆزەکانی بەڕێوەبردن و ستراتیژی بازاڕدۆزی و دوا داهێنانەکانی زانست و تەکنۆلۆژیا شت دەخوێننەوە، ئەوان تێر پووز و پەوان بە جیهانگەرایی قسە دەکەن.

دەرئەنجامەکە ئەوەیە کە هیند وڵاتێکە لە گشت وڵاتانی دیکەی گەشەسەندوو جیاوازترە. تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی هیند لە سەدا پەنجای خزمەتگوزاری و سەدا ٢٥ پیشەسازی و سەدا بیست و پێنج کشتوکاڵی پێکدێت. دوو وڵاتی دیکە کە لەم لایەنەوە بە هیند دەچن پورتوگال و یۆنانن؛ ئەوان دوو وڵاتن کە قۆناغەکانی یەکەمی پیشەسازیی گشتیان تێپەڕاندووە و ئێستە دەچنە نێو ئابووریی دوای پیشەسازی. هیند لە بواری پیشەسازی و کشتوکاڵدا لەو دوو وڵاتە پاشکەوتووترە، بەڵام لە بواری خزمەتگوزارییەکاندا لە پێش ئەم دوو وڵاتەیە؛ مۆنتاژ و زنجیرەیەکی مەمە چەشنە کە ناکرێ هیچ کەسێك پلانی بۆ دابنێت. هەروەها ئەوەی سەری مرۆڤ دەسوڕمێنێ ڕۆڵی بەکاربەرە لە گەشەکردنی هیند. زۆربەی چیرۆکەکانی سەرکەوتنی ئاسیایی لەو ڕێکارە حکومییانە سەرچاوەیان گرتووە کەوا خەڵك ناچار دەکەن کردەی پاشکەوت ئەنجام بدەن، ئەوجا سەرمایە کەڵەکەبووەکە و ئەو سیاسەتانەی هیندن کەوا بۆ وەدیهێنانی گەشەکردن پاڵپشتیی لە بازاڕ دەکەن. بەڵام لە هیند، بەکاربەر مولکە. گەنجانی داتپێدانراو لە هیند پێویستیان بەوە نییە تا کۆتایی تەمەنیان چاوەڕێ بکەن بۆ ئەوەی خانوویەك بۆ خۆیان بکڕن. ئەوان قەرزی بواری خانووبەرەیان دەست دەکەوێ. هەروەها دروستکردنی پلیتەکانی متمانە و باوەڕپێکراو (الاعتماد) ساڵانە بەڕێژەی ٣٥٪ گەشە دەکات. هەروەها بەکاربردنی کەسی لە هیند دا ڕێژەی ٦٧٪ ی تێکڕای بەرهەمی نێوەخۆ پێکدەهێنێت، کە لەوەی چین (٤٢٪) و هەر وڵاتێکی دیکەی ئاسیایی بەرزترە. تاکە وڵاتێك کەوا لە

بەکاربردندا لەپێش هیندە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە کە رێژەی بەکاربردنی ٧٠٪یە.

هەرچەندە ژێرخانی هیندی بەرەو باشتر دەڕوات و پلان بۆ نوێکردنەوەی فڕۆکەخانەکان و رێگەکانی گشتی و بەندەرەکان و هند دەکرێت و زیادەکارییان بۆ دەکرێت، بەلام هیند وەك چین نایەتە پێش چاو. لەوانەیە حکومەتەکانی دیموکراسی سەرلیستبوونی دیاریکراو بۆ گەشەپێدانی دوورمەودا وەدیبهێنن، بەلام حکومەتەکانی دیکتاتۆری لە دوورمەودادا دەتوانن بەکاراییەوە پلان بۆ ئەو پرۆژە زەبەلاح دابنێن و جێبەجێشی بکەن کە پەیوەندییان بە ژێرخانی ئابوورییەوە هەیە. ئەمەیش روونە جا ئەگەر تۆ چین لەگەل هیند یانیش لەگەل بریتانیا بەراورد بکەیت. نۆرمان فۆستەری ئەندازیاری تەلارسازی بەمنی گوت کە ئەو کات و ماوەیەی بۆ تاوتوێکردنی لایەنی ژینگەیی پرۆژەی دروستکردنی یەك تەلار- دەرچەی پێنجەم- لە فڕۆکەخانەی هیسرۆ تەرخان کرا، بۆ کۆتایی هێنان بە بونیادنانی فڕۆکەخانەیەکی نوێی نێو پەکین بەسبوو، هەرچەندە لە هەر پێنج دەرچەکەی فڕۆکەخانەی هیسرۆ گەورەترە.

بەلام هەندێك پسپۆڕ جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەو رێبازەی چین لەسەری دەڕوات چەندان سوودی روون و بەرچاوی هەیە. یبین یاشینگ لە پەیمانگەی ماساچوست بۆ تەکنۆلۆژیا ئەوە بەدیاردەخات کە کۆمپانیایەکانی هیندی بەشێوەی بەشەکی بەکارامەییەکی زیاتر لە کۆمپانیایەکانی چینی سەرمایەی خۆیان بەکاردێنن، چوونکە سەرچاوەیەکی بێسنووریان نییە. هەروەها لەگەل پێوەرەکانی نێودەولەتی گونجاوە و بەشێوەیەکی باشتر لە کۆمپانیایەکانی چین بەڕێوەدەبرێن. هەرچەندە هیند لەدوای چین ریفۆرمەکانی دەستپێکردووە، بەلام ژمارەیەکی یەکجار زۆرتر کۆمپانیای جیهانی

بەرهەمهێناوە، وەک" تاتا، ئنفۆسیس، ڕانباکسی، وریلاینس. تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێبازە بەشێوەیەکی ڕوونتر لەسەر ئاستەکانی دونیادا بەدیاردەکەوێ. کۆمپانیایەکانی هیند لە پێنج ساڵی ڕابردوودا پشکی شێریان لە خەڵاتەکانی دیمینگ بەرکەوتووە کەوا پایان ساڵانە وەک ڕێزلێنانێك لە داهێنانەکانی کارگێڕیدا دەیانبەخشێت، لەمەیشدا لە پێش گشت کۆمپانیایەکانی دیکەی وڵاتانی دیکەیە بە خودی یابانیشەوە. هەروەها شەفافیەت و لێهاتوویی کەرتی ئابووری لە هیند، لە کەرتە ئابوورییەکانی وڵاتانی گەشەسەندووی ئاسیایی کەمتر نییە (بێگومان بە دەرهێنان و دەرهاوێشتنی سەنگافوورە و هۆنگ کۆنگ)

پوودای کوتاکی دامەزرێنەری کۆمپانیای گەشەسەندووی خزمەتگوزارییەکانی دارایی دەڵێ: " ئامارەکان وێنەیەکی ڕوونی ئەو گۆڕانانە پیشان نادەن کەوا لە ئەقڵییەتدا ڕوویان داوە، ئەو هیندەی کە من تیایدا گەورەبووم وڵاتێکی دیکەیە. ئەو کەسانەی کەوا لە ئێستەدا کاریان لەگەڵدا دەکەم زیاتر متمانەیان بەخۆیان هەیە و زیاتر پەرۆشی ئەو کارانەن کەوا دەتوانن لێرە ئەنجامی بدەن". هەروەها لە ئێستەدا ئەو شیمانە کۆنە خەریکە نەمێنێت کە پێی وایە هەر بەرهەمێك لە هیند دروستکرابێت واتا پلە دووە. کۆمپانیایەکانی هیندی پشکەکانی خۆیان لە کۆمپانیای خۆرئاوایی دەکڕن، چوونکە پێیان وایە کە دەتوانن بەشێوەیەکی باشتر بەڕێوەی ببەن. وەبەرهێنانەکانی هیندی لە بریتانیا لە هەردوو ساڵی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧دا لە وەبەرهێنانەکانی هەمان ئەو دوو ساڵەی بریتانی گەورەتر بوو.

ئەم ڕاستییە هەر بەتەنیا لە جیهانی کاردا نییە، چوونکە هیندی مەدەنی لێوانلێوە لە گوڕوتاو. دیزاینەرانی پۆشاك و نووسەر و هونەرمەند هەن، هەر هەموشیان باس لە گەشەپێدان و فراوانکردنی بەرهەمەکانیان دەکەن بۆ ئەوەی بیانگەیەننە سەرانسەری جیهان. ئەستێرەکانی بۆلیوودیش بە زیاترکردنی ژمارەی

کەسانی دەرەوەی هیند، جەماوەری نێوخۆیی زیاتر دەکەن. تەنانەت یاریزانانی کریکیت لە ئێستەدا لەپێناو بەکێشکردنی جەماوەر لە دەرەوە کار بۆ چاکترکردنی گەمەکە دەکەن. وەك ئەوەی ملیۆنان کەس کتوپڕ ئەو کلیلانەیان دۆزیبێتەوە کەوا توانا و وزەکانیان دەردەپەڕێنێ. یان بەپێی گوزارشتەکەی پیاوێکی بەناوبانگی هیندی کە دەڵێ: " کاتێك لە کۆنەوە دەچینە نێو نوێ، کاتێك سەردەمێك کۆتایی دێت، کاتێك گەلێك دەرچەیەك دەدۆزێتەوە کەوا ماوەیەکی زۆرە چەپێندراوە، ئەوا ساتێك دێت، بەلآم ئەو ساتە لە مێژوودا دەگمەنە،".

ئەم چەند وشەیە کە ئەوەیەکی دیاریکراوی هیند وەك ناوی خۆیان ئەزبەریان کردووە، لە لایەن جواهیر لال نەهرۆی یەکەم سەرۆکوەزیرانی هیند- لە نیوەشەوی پانزەی ئابی ساڵی ۱۹٤۷- و لەو کاتەدا گوترلوە کە بریتانییەکان لە هیند دەستهەڵاتیان دایە دەست ئەنجوومەنی دەستووری. ئەمڕۆ ئامارەی بە لەدایکبوونی هیند دەکرد وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بەلآم ئەوەی ئێستە دەگوزەرێ لەدایکبوونی هیندە وەك جڤاکێکی سەربەخۆ: زیندوو و هەمەچەشن و کراوە و چالاك و لەسەرووی ئەمانەشەوە ئامادەیی گۆڕانی تیادایە. هیند ڕێگەیەکی هێندە جیاوازی گرتووتەبەر کە نەك تەنیا لە ڕێگە کۆنەکەی جیاوازە، بەڵکو لە ڕێگەی گشت وڵاتانی دیکەی ئاسیاییش جیاوازترە. هیند دەوڵەتێکی هێمنی ڕێکوپێك و نیمچە دیکتاتۆری نییە کە بەپێی پلانە دارێژراوەکە بکرێتەوە، بەڵکو دەوڵەتێکی دیموکراسیی پڕ لە هەراوزەنایە کە لە کۆتاییدا ئازادیی ئابووری بەخشیوەتە گەلەکەی.

ڕۆژنامەکانی هیندی بەڕوونی ئەو گۆڕانە پیشان دەدەن. لە ڕابردوودا، هەواڵەکانی حکوومەت لاپەڕەکانی داپۆشیبوو، هەروەها بەزۆریش بەشێوەیەکی

کۆددار دەنووسران و باسیان لە کار و چالاکییەکانی حکوومەت و پارتەکانی سەرەکی و دەستە و دامەزراوەکانی کارگێڕی دەکرد. خەڵکانێکی زۆر کەم هەبوون لە نووسینەکان تێدەگەیشتن، بەڵام خەڵکانی دیکە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە تێی دەگەن و لە ڕاستیشدا هیچ تێنەدەگەیشتن. بەڵام ڕۆژنامەوانیی هیندی لە ئێستەدا لە دۆخێکی ڕاستینی پێشکەوتن و گەشەکردندا دەژیەت (بۆ گەشەکردنی ڕۆژنامەوانیی نووسراو گۆڕەپانێکی دەگمەنە) و پڕە لە سەربردەی پیاوانی کار و ڕابوونەکانی تەکنۆلۆژی و دیزاینەری پۆشاک و کۆمەڵگەکانی بازاڕکردن و بێگومان باسی بۆلیۆدیش کەوا لە ئێستەدا لە هۆلیۆد زیاتر فیلم بەرهەم دەهێنێ. هەر تەنیا ڕۆژنامەوانی نییە کەوا گۆڕانی بەسەردا هاتبێت، بەڵکو تەلەفزیۆنی هیندش کەوتووەتە نێو ئەم گۆڕانەوە، چوونکە نزیکەی هەر مانگ جارێك کەناڵێکی نوێ پەیدا دەبێت بە کەناڵە هەواڵییەکانیشەوە. لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٠٦دا هیند زیاتر لە بیست کەناڵی تەواو هەواڵیی هەبوو.

شتێك هەیە کە لە نمایشکردنێکی سەرسامکار زیاترە. با باسێکی چۆنییەتیی ڕەفتارکردن لەگەڵ کارەساتی تسۆنامی بکەین کەوا لە ساڵی ٢٠٠٥دا ڕووی دا؟ حکوومەت سەبارەت بە یارمەتی و کۆمەکەکانی بیانی، کارێکی کەمێك زیاتر لە هەماهەنگی دەکرد، چوونکە لە ساڵی ٢٠٠٥دا پێشنیازەکانی کۆمەکە دەرەکییەکانی ڕەت دەکردەوە (ئەمەیش نیشانەیەکی دیکەی عیزەتی نەفسی نەتەوەیی بوو). بەڵام گۆڕانکارییە سەرسوڕهێنەرترەکە لە شوێنێکی دیکەوە هات. هیندییەکان بەنهێنی ڕێژەی ٨٠ ملیۆن دۆلاریان بۆ هەوڵەکانی ڕزگارکردن بەخشی. لە کاتێکدا کۆکردنەوەی ئەم ڕێژە زۆرە لە دوای بوومەلەرزە بەهێزەکەی گواجارات کە بە پلەی ٧,٩ ڕیختەر بوو پێویستی بە ساڵێکی تەواو هەیە. تەنانەت واپێدەچێ کارەکانی خێرخوازیش گۆڕانیان بەسەردا هاتبێ (لە

ئاسیادا بە گشتی کەمە، کاتێکیش دەوڵەمەندەکان کاری خێرخوازی دەکەن، دەیبەخشنە پەرستگە و پیاوانی ئاینی)، بۆنموونە: بریمجیی ملیاردێری مەزن کە یەکێکە لە دەوڵەمەندترین پیاوانی هیند، ڕایگەیاند: بەشێکی زۆری سامانەکەی بۆ دەستگەیەکی خێرخوازی بەجێدەهێڵێت. هەروەها ئەنیل ئاغارواڵ کە ملیاردێرێکی دیکەیە، پلانی خۆی بۆ بەخشینی ملیارێك دۆلار ڕاگەیاند بۆ ئەوەی زانکۆیەکی نوێ لە ئۆریسا دروست بکرێ کە لە هەموو شوێنەکانی دیکەی هیند هەژارترە. هەروەها چەند کۆمەڵەیەکی دیکەی قازانجنەویست هەن کە بەشداری لە هەردوو کەرتی چاودێریی تەندروستی و پەروەردە و فێرکردندا دەکەن، ئەم کۆمەڵانە چەند بەرپرسیاریەتێکیان خستووەتە سەر شانی خۆیان کە لە ڕاستیدا بەرپرسیاریەتیی دەوڵەتن. ئێستەیش نزیکەی ٢٥٪ی خوێندنگەکان و ٨٠٪ی سیستمی تەندروستی دەکەوێتە دەرەوەی کەرتی حکوومی. هەروەها کۆمپانیای ئینفۆسیس بۆ پرۆگرامسازییەکان لەپێناو دروستکردنی نەخۆشخانە و خانەی نادااران و خوێندنگە و کتێبەکانی خوێندنگەییدا، دەستی بە دامەزراندنی دەستگەیەکی تایبەت بەخۆی کردووە.

کۆی ئەو کارانە بە شتێکی باو دێنە بەرچاو. چوونکە هیند - کە یەکێکە لە هەژارترین وڵاتانی جیهان- بەشێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر لە یەکێك لە لایەنەکانی سەرەکیدا وەك دەوڵەمەندترین وڵاتی جیهان - ویلایەتەکانی یەککرتووی ئەمریکا- دێتە بەرچاو، ئەویش ئەوەیە کە جڤاکی هەردوو وڵات هەژموونی خۆیان بەسەر دەوڵەتدا سەپاندووە. ئاخۆ ئەو نۆرمە لە هیندیشدا سەرکەوتنی خۆی دەسەلمێنێ وەك ئەوەی لە ویلایەتەکانی یەککرتوودا سەلماندوویەتی؟ ئایا دەکرێ جڤاك شوێنی دەوڵەت پڕبکاتەوە؟

### پێویستبوونی حکوومەت

زۆرجار ڕەخنەی توند لە حکوومەتی هیندی دەگیرێ، بەلام بەلای کەمەوە لە لایەنێکدا سەرکەوتنێکی مەزنی وەدەستهێناوە؛ دیموکراسییەتی وەدەستهێناوە. بەڕاستی دیموکراسییەتی هیند دەرهاویشتە و دەگمەنە. چوونکە هیند ماوەی شێست ساڵە دەستهەلاتی دیموکراسیی پاراستووە. جا ئەگەر ئەم پرسیارە بکرێت: " هیند دوای بیست و پێنج ساڵ چۆن دێتە بەرچاو؟" ئەوا وەلامەکە زۆر بەڕوونی بەمشێوەیە دەبێت: " هەر وەك ئێستە دەبێت؛ دەوڵەتێکی دیموکراسی". ڕاستە کە دیموکراسییەت (شعوبییەت) بەرهەم دەهێنێ و هەوڵی ڕازیکردنی خەڵك دەدات و لە جوولەدا هێواشە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا سەقامگیرییەکی درێژخایەن دێنێتە ئاراوە.

سیستمی سیاسی لە هیند بەزۆرێك لەو دامو دەستگەیانە قەرزدارە کەوا بریتانییەکان لە دوو سەدەی ڕابردوودا دایانمەزراند. لە زۆرێك لە ناوچەکانی ئاسیا و ئەفریقیا ئامادەیی بریتانی بەشێوەیەکی ڕێژەیی کاتی بوو، بەلام لە هیندستاندا چەند سەدەیەکی خایاند. چوونکە بریتانیا هیندی بە گەوهەری تاجە ئیمپراتۆرییەکەی دادەنا، لەبەرئەوە چەندان دەستگەی بەردەوامی حکوومی لە سەرانسەری ئەو ولاتەدا دامەزراند، لە دادگەکانەوە بگرە تا دەگاتە زانکۆ و دەستە و دامەزراوەکانی کارگێڕیێ. بەلام لەوانەش گرنگتر، لەوانەیە ئەوەبێ کە هیند بەختی هەبوو پارتی کۆنگرەی هەبوو- کە بووە هۆی سەربەخۆبوونی- و هەروەها ئەوەی یەکەمی دوای سەربەخۆییش بەختێکی دیکەی هیند بوو، کەوا گرنگیی بە باشترین دابونەریتی بریتانی دا و دابونەریتەکانی کۆنی هیندیشی لەپێناو پتەوکردنیان نوێکردەوە. ڕاستە کە لەوانەیە پیاوانی وەك جەواهیر لال ئەمڕۆ بەباشی لە ئابووریی ولاتەکەیان تێنەگەیشتبن، بەلام هەر هیچ نەبێ لە ئازادیی سیاسی تێگەیشتن و زانیان چۆن پارێزگەری لێ بکەن.

ئەو بنەما سیاسی و دامەزراوەییەی کە پێشوەخت لە هیند هەبوو، سەروەت و سامانێکی گرنگبوون. بەدڵنیاییەوە، ئەم دەستگەیانە بەهۆی گەندەڵییەکی بەربڵاو و قۆرغکردنی دەستهەڵاتی سیاسی هێندە داخوران و گەیشتنە ئاستێك لە هەندێ کاتدا بەتەواوی شێوان. بەڵام هیند لە ڕووی تیۆرییەوە بونیادێکی هاوچەرخانەی کارگێڕیی زۆر چاکی هەیە. دادگە و سیستمی کارگێڕی و لیژنەی تیۆرییانەی سەرپشککراو و سەربەخۆی هەیە. ئەم بنەمایە سەرەکییەش چەندان سوودی هەیە، ئەوجا خراپ بەکارهێنانی دەستهەڵات چەندەش بەرزبێت، بۆ نموونە: هیند ناچار نییە بانکێکی سەربەخۆی مەرکەزی دابهێنێت، چوونکە پێشوەخت بانکێکی وەهای هەیە. هەروەها پێویستی بە دامەزراندنی دادگەکانی سەربەخۆ نییە؛ زۆر بەسانایی دەتوانێ دادگەکانی خۆی پاك بکاتەوە. جگە لەمانەیش، هەندێك لە لیژنەکانی هیندیی وەك لیژنەی نیشتمانی بۆ هەڵبژاردنەکان، زۆر دەستپاك و کارامە و ڕێزلێگیراون.

بەڵام، ئەگەر حکومەتی هیندی لە هەندێك لایەنیشدا سەرکەوتنی وەدەستهێنابێ، لە زۆر لایەنی دیکەشدا شکستی هێناوە، بۆنموونە: هیند لە پەنجایەکان و شێستەکاندا هەوڵی دا بەهۆی بەرهەمهێنانی نموونەیەکی تێکەڵاوی ئابووری -کە تێکەڵەیەك بێت لە سەرمایەداری و کۆمۆنیزم- خۆی نوێبکاتەوە. دەرئەنجامەکە ئەوە بوو کەرتێکی تایبەت هاتە ئاراوە کەوا بەچەند یاسایەك کۆتوبەندکراو بوو، هەروەها کەرتێکی گشتیی گەندەڵ و بێ کارامەیی و شارەزاییش دروستبوو. بێگومان دەرئەنجامەکە خراپ بوو، لەگەڵ مانی حەفتایەکانیشدا کاتێك هیند زیاتر بەرەو سۆسیالزم چوو بووە کارەساتێکی گەورە. لە ساڵی ١٩٦٠دا تێکڕای بەرهەمی لۆکاڵی هیندی بۆ هەر تاکێك لە هی چین زۆرتر بوو و دەگەیشتە ٧٠٪ی تێکڕای داهات و بەرهەمی کۆریای باشوور؛

لە ئێستەشدا لە پێنج یەکی تێکڕایی بەرهەم و داهاتی چینی کەمترە بۆ هەر تاکێك، هەروەها بە بیست جار لە تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی کۆریای باشوور کەمترە.

لەوانەیە ئەوەی لە هەموو شتێکی دیکە زیاتر ببێتە هۆی بێهیوایی، دەرئەنجامی هیند بێت لە لیستی گەشەپێدانی مرۆیی نەتەوەکانی یەکگرتوو کە نەك ولاتان تەنیا بەپێی دەرامەت هەڵناسەنگێنێ، بەڵکو لە هەمان کاتدا بەپێی تەندروستی و فێرکردن و چەند پێوەرێکی دیکەشەوە هەڵسەنگاندیان بۆ دەکات. لەو لیست و داتایەدا هیند لە کۆی ١٧٧ ولاتدا پلەی ١٢٨ی مینی هەیە؛ لە دوای سووریا و سریلانکا و ڤێتنام و کۆماری دۆمینیکانەوە دێت. ڕێژەی زانینی خوێندن و نووسین لەنێو ریزی ژناندا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و هێدمەیی نزمە و لە ٤٨٪ کەمترە. هەرچەندە نووسین و وتاری زۆر هەن کەوا باس لە یارمەتیدانی هەژاران دەکەن، بەڵام حکوومەتی هیندی کارێکی زۆری بۆیان نەکردووە ئەگەر بێتو لەگەڵ ولاتانی دیکەی هەژار بەراورد بکرێ. هەروەها وەبەرهێنانی لە بوارەکانی خزمەتکردنی مرۆڤ — لە تەندروستی و فێرکردنیدا— زۆر زۆر کەمە، کاتێکیش پارە و دارایی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکرا، ئەوا بەدەگمەن بەشێوەیەکی ڕاستودروست خەرج دەکرا. ڕاجیف گاندیی سەرۆکوەزیران لە هەشتایەکاندا گوتی کە لە کۆی هەر دە ڕووپییەکدا شیمانە دەکرێ تەنیا یەك ڕووپییەی لێ خەرج کرابێ و درابێتە کەسێکی هەژار.

ئایا سەبارەت بەو گرفتانە دەکرێ گلەییەکە ئاراستەی دیموکراسیەت بکرێتەوە؟ بەتەواوەتی نەخێر. چوونکە سیاسەتەکانی نادروست و بەڕێوەبردنی خراپ دەبنە هۆی شکست جا ئەگەر بەرپرسەکانی سەرکوتکار و تاکڕەوبن یانیش دیموکراسی. لەگەڵ ئەمەیشدا، چەند لایەنێکی دیاریکراوی دیموکراسی هەن کە

دەکرێ گرفت دروست بکەن، بەتایبەتیش لە وڵاتێکدا کە دووچاری هەژاری و دەرەبەگایەتی و نەخوێندەواری بووبێتەوە. دیموکراسیەت لە هیند بەزۆری گوزارشت لە ویست و ئیرادەی زۆرینە ناکات، بەڵکو دەربڕی کەمینەیەکی ڕێکخراوە و بریتین لە دەرەبەگەکان و تائیفەکانی بەهەژموون و جووتیارانی دەوڵەمەند و یەکیەتی و کۆمەڵەکانی حکوومی و دزانی نێوخۆیی. (نزیکەی پێنج یەکی ئەندام پارلەمانانی هیندی بە تاوانی جۆراوجۆر تاوانبارکراون، لەوانە بردنی دارایی و پارەوپووڵی گشتی، دەستدرێژی سێکسی، کوشتن) ئەم کەمینە ڕێکخراوانە لە زۆربەی هاووڵاتییان دەوڵەمەندترن، هەروەها ماڵ و موڵکی دەوڵەت بە تاڵان دەبەن بۆ ئەوەی لە دۆخی خۆیاندا بمێننەوە، بۆنموونە: پارتی کۆمۆنیستی هیندی لەپێناو سوودمەندبوونی هەژاران نییە کەوا بانگەشە بۆ گەشەکردنی ئابووری دەکات، بەڵکو بۆ پاراستنی دۆخە بەرێژە تایبەتمەند و باشەکەی کرێکارانی سەندیکایی و کەسانی سەر بە پارتەکەیە. لە ڕاستیدا چەپی هیندی تا ئاستێکی زۆر دژی ئەو سیاسەتانەیە کەوا بەمدواییانە لە کەمکردنەوەی هەژاریی گشتیدا سەرکەوتنی وەدەستهێناوە.

بەڵام دیموکراسییەت دەتوانێ هەڵەکان ڕاست بکاتەوە، هەروەك چۆن لە یەکێك لە پرسە کرۆکییەکاندا کردی. لە نەوەدەکاندا ئەوژمێکی نەتەوەیی هیندۆسی، هیندی گرتەوە و لە میانی پارتی بهاراتیا جاناتا BJP هەژموونی بەسەر ژیانە سیاسییەکەی هیند پەیداکرد. پارتی ناوبراو ناکۆکیی نێوان هیندۆس و موسڵمانەکانی گەشکردەوە و لەمەیشدا سوودی لە ڕاستییەکی ڕوونی سیاسی وەرگرت، ئەویش بێدەسەڵاتی و بێ هەژموونیی موسڵمانەکان بوو (گەرچی ئەو ناوچانەی هیندی بریتانی کەوا موسڵمانان تیایدا زۆرینە بوون، بوونە پاکستان و بەنگلادیش، موسڵمانەکانی زۆربەی ناوچەکانی هیندیش بوونە کەمینەیەکی لاواز

و ببینین). بەڵام خۆشکردنی ئاگری ڕق و توندونیژی لە لایەن پارتی BJPدا دەرئەنجامی پێچەوانەی لێ کەوتەوە. لە ساڵی ٢٠٠٤ دا حکوومەتی عەلمانی بەسەرۆکایەتیی مانموهان سینگی وەزیری پێشووی دارایی کە لە هاوینی ساڵی ١٩٩١دا ئابووریی هیندی کردەوە، بەتەواوی گەیشتە دەسەڵات. ئەمەیش لەو کاتەدا ڕووی دا کەوا سۆنیا گاندی ڕێبەرایەتیی هاوپەیمانییەکەی بەرەو سەرکەوتن کرد و لەجیات ئەوەی پۆستەکە بۆخۆی ببات (سینگ)ی وەک سەرۆکوەزیران دەستنیشان کرد. بەمشێوەیە سیستمی دیموکراسیی پڕ لە هەراوزەنا و زۆربەی جاریش گەندەڵ، پیاوێکی کردە سەرۆکوەزیرانی حکوومەتەکەی کەوا زۆر زیرەک و دەستپاک بوو و هیچ گومانێکی لەسەر نەبوو، هەروەها شارەزاییەکی قووڵیشی هەبوو. سینگ – بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی ئۆکسفۆرد وەدەستهێنابوو– بەڕێوەبەری پێشووی بانکی مەرکەزیی هیندی و وەزیری پلان و دارایی بوو. هەروەها ئەو تایبەتمەندییانەی کەوا ئەو پیاوە هەیبوو، لە فراوانیی ئەقڵ و قووڵیی ئەخلاق، هەر لە زەمەنی ئەهرۆوە لە لای هیچ سەرۆکوەزیرانێکی دیکەی هیندی نەبوو.

بەڵام بەهرە و کارامەییە دەگمەنەکانی سینگ و کەسییەتییەکەی پارمەتییەکی نۆری وڵاتەکەیان نەدا. خێرایی ڕیفۆرمەکان هیوای نیازپاکەکانی بەبادادا. چوونکە لە تەوژمە سەرەتاییەکەی ڕیفۆرمەکان لە نەوەدەکانەوە، حکوومەتی هیندی لە نیودەلهی و ویلایەتەکان بەیەکەوە هیچ دەستپێشخەرییەکی بەسوودی بۆ گەشەکردن پێشکەش نەکرد، وەک دروستکردنی ناوچەی گەورەی ئابووری و پڕۆژەی تایبەت بە ژێرخانی ئابووری. بەڵکو لە هەندێ کاتدا هەندێك بەرنامەی نوێی پێشنیاز کرد و بەو بەرنامانە دەچوون کەوا لە ڕابردوودا سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان وەدەست نەهێنابوو. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئاگرێ بەرپرسیارییەتیی تەواوی

ئەم ئیفلیجییە بخرێتە سەر شانی حکوومەت. هەروەها گۆڕینی پارتی فەرمانڕەوا نابێتە هۆی وەدیهێنانی ڕیفۆرمی وەک ئەوەی چین. هەرچەندە ڕیفۆرمەکانی ئابووری گەشەکردنێک بەرهەمدەهێنێ، بەڵام هەڵوەشانەوەشی لێ پەیدا دەبێت. ئەوانەش کە لە کردەی گۆڕانکارییەکە زیانیان بەرکەوتووە بە دەنگێکی بەرزتر لە دەنگی ئەو کەسانە هاوار دەکەن کە سوودمەند بوون. جا ئەگەر سیاسەتی هاوپەیمانییەکانیش بخەیتە سەر ئەمانە– کەسێک لە شوێنێکدا بەردەوام دەتوانێ ڕیفۆرمێکی پێشنیازکراو بوەستێنێ– ئەوا بۆ هێواشکردنەوەی جوولە و بزاوتنەکە ڕاچێتەیەکی میسالیت دەکەوێتە بەردەم، هەنگاوێک بۆ پێشەوە و سێ چارەیەک هەنگاو بۆ دواوە. ئەمە بەهای دیموکراسییەتە.

بەهەرحاڵ، هیچ ڕێگەیەکی دیکە نییە، چوونکە دیموکراسییەت قەدەری هیندە. وڵاتەکە بە ئاستێک هەمەچەشن و ئاڵۆزە کە ناتواندرێ بە ڕێگەیەکی دیکە حوکمی بکرێ. لەسەر سیاسییە زیرەکەکانی هیند ئەوە دەمێنێتەوە کەوا دیموکراسییەکە بۆ بەرژەوەندیی وڵاتەکەیان بەکاربێنن. ئەمەیش لە ڕاستیدا بەشێوەیەک لە شێوەکان ڕوودەدات. چوونکە حکوومەت بەمدواییانە لە بواری فێرکردن و تەندروستیی ناوچەکانی گوندنشیندا دەستی بە وەبەرهێنان کردووە، هەروەها جەختی لەسەر چاکترکردنی توانای بەرهەمی کشتوکاڵیش کردووەتەوە. دەکرێ لە هەندێک کاتدا ئابووریی باش ببێتە هۆی سیاسەتێکی باش! یان بەلای کەمەوە، ئەمە ئەو شتەیە کەوا هیند هیوای بۆ دەخوازێت. بەڕاستیش دیموکراسییەت لە ساڵی ١٩٩٢ وە فراوان بووە بۆئەوەی دەنگێکی زۆرتر بداتە گوندنشینەکان تاکو کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوەببەن، بەمەرجێک ئەنجومەنەکانی گوند ٣٣٪ی کورسییەکانیان بدەنە ئافرەتان. لەبەرئەوە لە ئێستەدا ملیۆنێک ئافرەت لە گوندەکانی هیند هەن کەوا دەتوانن لە کردەی

هەڵبژاردنەکانـدا بەشـداربن، ئەمـەیش دەرفـەتی ئـەوەیان پێدەبەخشـێ داوای فێربـوون و چـاودێرییەکی باشـتری تەندروسـتی بکـەن. جگـە لەمانـەیش، لـە ئێستەدا کار بۆ فرلوانکردنی ئازادیی زانیارییەکان دەکرێ بەو هیوایەی ئەمە وەها لە خەڵکەکە بکات لەسەر حکوومـەتێکی باشـتر سووربن، ئـەوجا لـە ئاسـتی سـەرکردەکان بێـت یـانیش لـە ئاسـتی بەڕێوەبـەرانی نێوخـۆیی بێـت. ئەمـە گەشەپێدانێکە کە لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەسـتپێدەکات، چوونکە جڤاگ پـاڵ بە دەوڵەتەوە دەنێت.

جا ئایا دەوڵـەت وەڵامدانـەوەی دەبێـت؟ ئـەو دەوڵەتـەی کە لـەکاتی حـوکمی بریتانیـدا بونیـادنراوە و لـە سـەردەمی سۆسـیالیزمی هیندیـدا فـرلوان بـووە، لـە ئێستەدا پـڕە لـەو بیرۆکراسییانەی کـەوا عاشقی توانا و ئیمتیـازە پووچـەکانی خۆیانن، ئـەو سیاسـییانەش لـەنێو ئـەو دەوڵەتـەدا زۆرن کـەوا چێـژ لـە توانـا و دەستهەڵاتـەکانی شوانانەی (الرعوی) خۆیان وەردەگرن. هەندێك کەسـی دیکـەش هـەن کـەوا هێشـتا دڵسـۆزی حزبەکـانی سۆسـیالزم و هاوکـاریی نێـوان وڵاتـانی جیهانی سێیەمن. لـەم بیردۆزانـەدا زۆرێـك لـەو ڕۆشـنبیر و ڕۆژنامەوانانـە دەچنـە ریزیانەوە کەوا لە ساڵی ١٩٦٨ وە و هەر لەو کاتەی لە زانکۆیەکان بوون بەباشـی مەشقیان لەسەر دوا حزبەکانی ڕادیکالیدا کردووە. ئەو دەستەبژێرانەی کـۆن بـە گۆڕانی هیند هەڕەشەیان لێ دەکرێ، لەبەرئـەوە هـەوڵ و کۆششـی خۆیـان چڕتر دەکەنـەوە. زۆرێـك لـە چـینی دەسـتهەڵاتداری هینـد لـەو جڤاکـە هاوچـەرخە بازرگانییە کراوەیەدا هەست بە ئاسـوودەیی ناکـەن کـەوا لـە چـوار دەوریانـدا لـە گەشەکردندایە.

لە کۆتاییدا، ئەوەی گرنگە حکوومەتە. چوونکە تەنانەت کۆمپانیایـەکانی تایبـەت لە هیند بەبێ بازاری پشکەکان گەشەیان نەدەکرد کـەوا زۆر بەباشـی ڕێکخـراون،

هـەروەها سیستمێکی دارایی هەیە کەوا بە شەفافیەت و توانای بڕیاردان و جێبەجێکردن دەناسرێتەوە! هەر هەمووشیان چەند وەزیفەیەکی حکوومین. هەروەها پیشەسازیی سەرکەوتوو و بەقازانجی پەیوەندییەکانی بێتەل بەهۆی یاسایە دانابەکانی حکوومەتەوە دامەزراوە و ئەو کۆتوبەندە یاساییانەی کەم کردووەتەوە کەوا پێشتر دەستوپێی پیشەسازیی دەبەست. هەر حکوومەتیش بوو کەوا پەیمانگەکانی تەکنۆلۆژیای لە هیند دامەزراندووە. کەرتی تایبەت لە هیند ناتوانێ چارەسەری قەیرانی ئیدز و دابەزینی ئاستی پەروەردە و فێرکردن لە گوند و گرفتەکانی ژینگەیی بکات. بەڵام زۆربەی هیندییەکان حکوومەتەکەی خۆیان بە ناشایستە یان گەندەڵ! زۆرجاریش بە هەرلووکی دەزانن. لەوانەشە هەستەکانی دژ بە خاوەن پۆستەکان لە ماوەی سێ دەیەکەی ڕابردوودا لە هەڵبژاردنەکانی هیند هێزێکی زۆر کاریگەر بێت. چوونکە ئێستەشی لەگەڵدا بێت هیندییەکان کەسانی بێسوود فرێ دەدەنە دەرەوەی بازنەی دەستهەڵات بەو هیوایەی کە حکوومەتەکەیان باشتر بێت. دەنگدەرانیش لەمەدا مافی خۆیانە، چوونکە ئەگەر حوکمڕانی باشتر نەبێت، ئەوا وڵاتەکە هەرگیز سوود لە وزە و توانابەکانی وەرناگرێ.

لەوانەیە ئەمە لە ئێستەدا دژبوونە سەرەکییەکەی هیند بێت. جڤاکەکەی کراوە و بەگوێوتاو و باوەڕبەخۆبووە و ئامادەیە ڕووبەڕووی جیهان بێتەوە، بەڵام دەوڵەتەکەی - چینە دەستهەڵاتدارەکەی- لە هەمبەر ئەو واقیعانەدا دوودڵ و بەتەقیە و بەگومانە کەوا لە چواردەوریدا دەگۆڕێن. ڕوونی ئەم گرژییە لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا لە گشت بوارەکانی دیکە ڕوونتر دیارە. ئەو بەرپرسیاریەتییەش کەوا بەردەوام لە فراوانی و گرنگبووندایە بەردەوام

دەبینـدرێ، بەرپرسـیاریەتیی دەستنیشـانکردنی ئـەو ڕێگەیـەش زۆر ڕوون و بەرچاوە کەوا بەهۆیەوە هیند ئاوێتەی جیهان دەبێت.

## کوێر و بێ ددان

هیند لـە دوای وەدەسـتهێنانی سـەربەخۆیی زۆر پەرۆشـی ئـەوەبوو لەسـەر گۆڕەپانی جیهانیدا ڕۆڵـی هـەبێت، ئـەم ئامـانج و بەرتەماییەشی لـە بریتانیا بۆ مابوویـەوە کـەوا بەشـێکی زۆری ئیمپراتۆرییەتەکـەی خـۆی لـە نیودەلهییـەوە بەڕێوەدەبرد. چوونکە بریتانیا لەو دەیانەی کەوا دوای جەنگی یەکـەمی جیهـانی هاتن لە هیندەوە عێراقی بەڕێوەدەبرد. هەروەها سەربازانی هیندی بوون کەوا لە خۆرهـەڵاتی نێوەڕاسـت و شـوێنەکانی دیکـەدا هێرشـە ئیسـتیعمارییەکانی بەریتانیایان جێبەجێ کرد. هەروەها نووسینگەی هیند لە دەسـتهەڵاتی جیهانیـدا چەقێکی هەستیاری هـەبوو- گرنگترین درێژبوونـەوەی ئیمپراتۆریـەتی بریتـانی بوو- هیندییەکان لەو سەردەمیدا چاودێریی گەمەی زلهێزەکانیان دەکرد و هـەر لەو هێزە مەزنەشەوە فێری گەمەکە بوون.

جەواهیر لال نەهرۆ، یەکەم سەرۆکوەزیرانی هیند بۆ وەرگرتنـی ئـەم میراتـە زۆر گونجاو بوو. چوونکە وەك هەر جەنتڵمانێکی ئینگلیزی لە زانکۆی هارۆ و کامبرێج زانستی وەرگرت و زۆری سـەفەرکرد و زۆری خوێنـدەوە و لەسـەر کاروبارەکـانی جیهانی بەچڕوپڕی نووسی. سەبارەت بە مێژووش زانیارییەکی بێهاوتـای هـەبوو. چوونکە لە یەکێك لە قۆناغە دووروودرێژەکانی ژیانیـدا لـە بەندیخانـەکانی هینـدی بریتانی بەسەربرد- ئەمجارەیان لە ساڵی ١٩٣٠- ١٩٣٣ - زنجیرە نامەیـەکی بـۆ کچەکەی نووسی کەوا تیایدا مێژووی سەرلەبەری جیهانی کورتکردبوویـەوە، واتـا مێژووی ٦٠٠٠ پ.ز تا دەگاتە ئەو کاتەی کەوا تیایدا ژیاوە. هەروەها لەو نامانەیدا

بە دوورودرێژی باسی لە ڕابوون و کەوتنی ئیمپراتۆرییەکان و لێکدانەوەی جەنگ و شۆڕشەکان و ژیاننامەی پاشا و کەسایەتییەکانی دیموکراسی کردبوو؛ کۆی ئەمانەیشی نووسیبوو بەبێ ئەوەی پشت بە هیچ سەرچاوە و شۆڕشێك ببەستی. لە ساڵی ١٩٣٤دا ئەم نامانە کۆکرانەوە و لە کتێبێکدا بەناوی (لمحات من تاریخ العالم) بڵاوکرانەوە و دەستخۆشی و ناوبانگێکی جیهانییانەی وەدەستهێنا، چوونکە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز وەها وەسفی کردبوو بەوەی کە یەکێکە لە سەرنجڕاکێشترین کتێبەکان.

لەبەرئەوە، سەیر نییە ئەگەر نەهرۆ لە سیاسەتی دەرەوەی هیندیدا ببێتە کەسییەتییەکی بێوێنە. بەدرێژایی ماوەی پۆستەکەی وەك سەرۆکوەزیران– لە ساڵی ١٩٤٧ بۆ ساڵی ١٩٦٧ – خۆی وەزیری دەرەوەش بوو. کیە. بیی. مێنن. مینۆنی سکرتێری وەزارەتی دەرەوەی هیند (یەکێك لەو کەسە یەکەمانەی کەوا ئەم پۆستەی وەرگرتووە) لە ژیاننامە کەسییەکەی خۆیدا دەڵێت: " هیچ نەریتێکی تایبەتمان نەبوو بۆی بگەڕێینەوە و بیکەینە مەرجەعی خۆمان، چوونکە هیند سیاسەتێکی دەرەوەی تایبەت بەخۆی نەبوو تا ئەو کاتەی سەربەخۆیی خۆی وەدەستهێنا. تەنانەت ئێمە بۆ توێژینەوەی مێژوویش بەشێکمان نەبوو تا ئەو کاتەی خۆم دامەزراند... لەبەرئەوە سیاسەتەکانمان وەك پێویست پشتی بە مەزەندەی یەك پیاو دەبەست، ئەویش جەواهیر لال نەهرۆی وەزیری دەرەوە بوو". ئەمەیش مانای ئەوەیە کە یەکەم سیاسەتی دەرەوەی هیند پشتی بە بنەما و حوکمەکانی نەهرۆ بەستبوو کە لە واقیعدا تایبەتمەند بوو. چوونکە نەهرۆ کەسێکی میسالی بوو و باوەڕی بە پێوەرەکانی ئەخلاقی هەبوو. پشتگیریی بێلایەنیی دەکرد و دژی جەنگی سارد بوو. ئەدی چۆن لە کاتێکدا ماهاتما گاندیی مامۆستای ئاشتیخوازێکی کەللەڕەق بوو؟!.

ماهاتما بەردەوام دەیگوت: " (ئەگەر هاتوو) چاو بەچاو و ددان بە ددان بێت، ئەوا زۆر بەخێرایی جیهان کوێر و بێ ددان دەبێت". جا ستراتیژەکەی؛ ستراتیژی ڕەتکردنەوەی توندوتیژی لە ڕووخاندنی ئەو ئیمپراتۆریایەدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا کەوا هەرگیز خۆری لێ ئاوا نەدەبوو. ئەمڕۆ وەك قوتابییەکی ماهاتما، لەسەر دروستکردنی ڕێبازێکی نوێدا سوور بوو کەوا لە کاروبارەکانی نێودەوڵەتیدا پابەندی ئەم نموونەیە بێت.

ئەمڕۆ سیاسەتی دەرەوەی هیندی بە هێزی ئەبستراکت جێگیرکرد نەك بە ڕێناندنێکی ستراتیژی بۆ بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی. ئەو ڕقی لە هاوپەیمانی و پەیماننامەکان دەبوویەوە و بە بەشێکی بنەمایە کۆنە واقیعییەکانی سیاسەتی دادەنا، هەروەها گرنگی بە پرسەکانی سەربازی نەدەدا. چوونکە داوای لە لۆرد ماونتباتنی هاوڕێی کرد – کە دوا دەستهەڵاتداری بریتانی بوو و بۆماوەیەکی کورت وەك سەرۆکی دەوڵەتی هیند دەستبەکاربوو– بەڕێوەبەرایەتیی بەرگری ڕێکبخات، هەروەها تەنیا بۆ ئەوە هەندێك دەستوەردانی کرد کە لێنەگەڕی هیچ ڕێنمایی و ڕاسپاردەیەکی بچێتە نێو کەوا هێزێکی زیاد لە پێویست بداتە سوپای سەربازی، ئەمەیش ئەو شتەبوو کەوا بونیادی ئیمپراتۆریەتی بریتانیای بیر دەهێنایەوە. کاتێکیش ماونتباتن پێشنیازی ئەوەی کرد سەرۆك ئەرکانێکی بەهێزی بەرگری هەبێت، ئەمڕۆ ئەم ڕێنماییەی ڕەتکردەوە، چوونکە وەزیرێکی مەدەنی دەویست وەك سەرۆکی باڵا. دوای هەفتەیەك لە کاری حکوومەتە نوێیەکەیدا سەردانی وەزارەتی بەرگری کرد و زۆر لەوە تووڕە بوو کە بینی هەندێك ئەفسەری سەربازیی لەوێدا کار دەکەن (هەر وەك چۆن لە گشت وەزارەتەکانی بەرگریی جیهاندا باوە). لەو کاتەوە، گشت فەرمانبەرانی هێزەکانی چەکدار کەوا لە گەڕەکی باشوور لە نیودەلهیدا کار دەکەن، پۆشاکی

مەدەنی لەبەردەکەن. هەروەها وەزیری بەرگری فی کیە کریشنا مینۆن- کەوا ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی نەهرۆدا پۆستەکەی پڕکردبوویەوە، هەروەها ڕاوێژکارە متمانەپێکراوەکەی- لە نەهرۆ کەمتر گرنگی بە کاروبارەکانی سەربازی دەدا، چوونکە جەنگەکانی دوورمەودای ئایدۆلۆژیی نێو پارلەمانی لە پلانی ستراتیژی پێ باشتر بوو.

سیاسەتی دەرەوەی هیندی لە دەیەکانی یەکەمیدا تایبەتمەندییەکی خەیاڵییانەی هەبوو؛ چوونکە پڕبوو لەو وتارانەی کەوا باسیان لە ئاشتی و نیازەکانی پاك دەکرد. زۆرێك لە چاودێرانی خۆرئاوایی پێیان وابوو ئەو هەڵوێستە تەقیەکارانەیە تەنیا پەردەیەکی دووکەڵینە و گەلێك لە پشت خۆیدا دەشارێتەوە کەوا بۆ وەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانیان هەوڵێکی ئاقلانەیان هەیە. بەلام، لە هەندێك جاردا، ئەوەی دەیبینی هەر ئەو ڕاستییە. چوونکە نەهرۆ لە زۆرێك لە ڕەفتار و مامەڵەکانیدا حەزی بەوە دەکرد تەما و هیوا لەسەر گشت حیساباتێکی دیکە دابنێ، بۆنموونە: کاتێك هۆشداری درا کە لەوانەیە وڵاتی چینی کۆمۆنیستی هەوڵ بدات تیبیت بخاتە نێو چوارچێوەی خۆیەوە، باوەڕی بەمە نەکرد، بەڵکو گوتی کە ئەمە دەبێتە سەرکێشییەکی دەبەنگانە و ناکرداری. تەنانەت دوای ئەوە کاتێك لە ساڵی ١٩٥١دا تیبیت بووە هی چین، نەهرۆ هەوڵی نەدا سەرلەنوێ هەڵسەنگاندن بۆ بەرژەوەندییەکانی چینی بکات کە بەدرێژایی سنووری باکووری هیند درێژ دەبێتەوە. ئەوجا لەجیات ئەوەی سەبارەت بە سنوورێکی (کێشە لەسەر) لەگەڵ چین دانوستان بکات، بەشێوەیەکی یەکلایەنە و وەك باوەڕبوونی بە دروستییەکەی هەڵوێستی هیندی ڕاگەیاند. لەبەرئەوە کاتێك چین لە ساڵی ١٩٦٢دا هیندی داگیر کرد و ململانێیەکەی بەیەکجاری لە بەرژەوەندیی خۆیدا یەکلا کردەوە، نەهرۆ شۆك بوو و لە یەکێك لە وتارەکانیدا لەبەردەم گەلدا

گوتی:" ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ ئەم جیهانە هارچەرخەدا پچڕابوو و لە کەشێکی دەستکردی ئەوتۆدا دەژیاین کە خۆمان دامانهێنابوو". ئیدی لەو کاتەوە نەهرۆ وەك جاران نەمایەوە و دوای دوو ساڵ، لە نووسینگەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد.

هەرچەندە وتارەکە لە زۆربەی کاتەکاندا بەشێوەیەکی میسالییانە مایەوە، بەڵام سیاسەتەکانی هیند لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا زیاتر بەرەو واقیعبوون چوو. ئەوەی لە مەسەلەکەشدا گرنگ بوو ئەوەبوو کە بەشێوەیەکی زۆر تایبەت لە سەردەمی کچەکەی نەهرۆدا – ئەندیرا گاندی– واقیعیتر و دانایانەتر بوو. کردەیەکی هێمنانەی پێگەیشتن بۆ دەستەبژێری سیاسەتی دەرەوەی وڵاتەکە هەبوو. لەگەڵ ئەمەیشدا، نیودەلهی لەو کاتیدا هێشتا هەر نەیدەتوانی لە جیهاندا ڕۆڵێکی فراوانتر بگێڕێ. ڕاستە کە نەهرۆ و ئەندیرا دوو کەسییەتیی جیهانی بوون، بەڵام هیند لە سایەی هەلومەرجی توندوتیژ و دژواری وەها کاری دەکرد کەوا جوولە و بزاوتەکانی کۆتوبەند کردبوو. چوونکە ململانێ لە ناوچەی هاوسێیدا– لەگەڵ پاکستان و چین و سریلانکا– هەر بە کۆتوبەندکراوی مایەوە و پانتایەکی تەنگەبەری هێشتەوە. لە جەنگی ساردیشدا، ئاقیبەتی ئەوەبوو وەك هاوپەیمانێکی شلوشەویی یەکیەتیی سۆڤیەت بمێنێتەوە، واتا لەگەڵ لایەنە دۆڕاوەکەی ئەو ململانێیە درێژەدا بوو. لەکۆی ئەمانەیش گرنگتر ئەوەبوو کە کارکردی ئابوورییانەی هیندی لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەچوو، ئەمەیش سەرچاوە و هێزی بەکێشکردن و پێگە و هەژموونەکەی کەمکردەوە.

بەڵام بەپێی ڕا و بۆچوونی سی. ڕاجا موهان، زۆربەی ئەو هەلومەرجانە لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا گۆڕاوە. جەنگی سارد کۆتایی هات، هێندیش وردەوردە گەشە دەکات، هەروەها پەیوەندیی لەگەڵ هاوسێیەکانی– لە چینەوە بۆ پاکستان و

یۆنانی یان یۆنانی بچووك لە (لە دەقە عەرەبییەکەدا نووسراوە یۆنان) - بەشێوەیەکی بەرچاو باش بووە. دەرئەنجامەکەش ئەوەیە کە هیند لە جیهاندا رۆڵێکی گەورەتر دەگێڕێت. هەروەها وەها پێشبینی دەکرێ کە لە کۆتاییدا دەبێتە زلهێزێکی دیکە. گرنگترین لایەنەکانی ئەم رۆڵەش پەیوەندییە هەرە باشەکەیەتی لەگەڵ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا.

## هەڵو و مانگا

لەوانەیە زۆربەی ئەمریکییەکان سەریان سوڕبمێنێ کاتێك دەزانن کە هیند دەوڵەتێکە لە هەموو دەوڵەتەکانی دیکەی دونیا زیاتر پشتگیری لە ئەمریکا دەکات! بەلای کەمەوە لە یەك پێوەردا. چوونکە لە توێژینەوەیەکدا کەوا ڕیکخراوی پۆ Pew بۆ هەڵوێستەکانی جیهانی ئەنجامی داوە و لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٥دا بلاو کرایەوە، بەشدارانی شانزە دەوڵەت پرسیاریان لێ کرا ئاخۆ بۆچوونێکی باشیان لە هەمبەر ئەمریکادا هەیە؟ ئەوا رێژەی ئەو هیندیانەی کەوا بە بەڵێ وەلامیان دابوویەوە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو (٧١٪) بوو، لە دوای خودی ئەمریکییەکان پێگەی دووەمیان داگیرکردبوو، چوونکە رێژەی ئەو کەسانەی کە لە ولاتەکەی خۆیان ڕازی بوون ٨٣٪بوو. هەرچەندە رێژەکان لە ڕاپرسییەکانی دیکەدا کەمتر بوون، بەلام دەرئەنجامە سەرەکییەکە هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە: هیندییەکان زۆر لە ئەمریکا ڕازین و لە هەمبەریدا هەستێکی تایبەتیان هەیە.

لەوانەیە یەکێك لە هۆیەکانی ئەم حەز و هەستە تایبەتە ئەوە بێت کە حکوومەتی هیندی بۆماوەی چەند دەیەیەك هەوڵی دا بەزۆر هەستەکانی دوژمنایەتی بناخنێتە دەروونی هاوولاتییەکانی. (کاتێك هەوڵیان دەدا پاساو بۆ ئەو

ئەمامەنییانە بهێننەوە کەوا هیند لە حەفتاپەکاندا تیایدا دەژیا، سیاسییەکان بەزۆری باسیان لە دەستێکی شاراوە و دەرەکی دەکرد- مەبەستیان دەستوەردانی سی ئای ئەی یان دەستوەردانی ئەمریکی بوو بەشێوەیەکی گشتی- تەنانەت ئار. کەی. لاکسمان وێنەکێشی وێنە کارتۆنییەکان دەستی بە کێشانی دەستی ڕاستین کردبوو کە دابەزیبوویە خوارەوە بۆ ئەوەی ببێتە هۆی دروستکردنی جۆرەها هەراوزەنا و وێرانکاری).

بەلام لەمە گرنگتر ئەو ڕاستییە کەوا هیندییەکان باش لە ئەمریکا تێدەگەن، چوونکە جڤاکەکەی کراوە و پڕ لە هەراوزەنایە و سیستمێکی دیموکراسیی وەهای هەیە کە هەرگیز پێشبینی ناکرێ، ڕێك وەك جڤاك و سیستمە دیموکراسییەکەی خۆیانە. تەنانەت سیستمە سەرمایەدارییەکەشیان بەو سەرمایە ئەمریکییە دەچێت کەوا بۆ هەمووان کراوەیە. هەروەها زۆرێك لە هیندییەکانی مەدەنی بەباشی ئاشنای ئەمریکان و بە زمانی ئەمریکی قسان دەکەن و کەسێك دەناسن کەوا لە ئەمریکادا دەژیەت، لەوانەیە ئەو کەسە یەکێك بێت لە کەسانی نزیکی خۆیان.

لوبیی هیندی لە ئەمریکا پردی پەیوەندیی نێوان هەردوو ڕۆشنبیرییە. زۆرجار کردەی کۆچکردنی هیندییەکان بەرەو ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بە بەفیڕۆچوون و کۆچکردنی مێشکەکان وەسف دەکرێ، بەلام دروستترە بۆ هەردوو وڵات بە سوودی مێشکەکان لێکی بدەینەوە. هیندییەکان لە دەرەوەی وڵاتی خۆیاندا ڕۆڵێکی کاریگەر و گرنگییان لە گرانەوەی وڵاتی دایکدا بینیوە. چوونکە کاتێك دەگەڕێنەوە وڵاتەکەیان پارە و هێزی وەبەرهێنان و پێوەری نێودەوڵەتییان لەنێو جانتادایە، لەگەڵ ئەمانەیش گرنگتر هەستکردنیانە بەوەی کە هیندییەکان دەتوانن هەموو شتێك وەدەستبێنن (ئەندام پارلەمانێکی هیندی

لە ڕووداوێکدا لە ئەندیرا گاندیی سەرۆکوەزیرانی پێشووی هیندی پرسی و گوتی:" بۆچی وەها دێتە بەرچاو کە هیندییەکان لە گشت شوێنێکدا سەرکەوتن وەدەستدێنن تەنیا لە ولاتەکەی خۆیان نەبێت؟") ئەو سەربردانەی باس لەو هیندییانە دەکات کەوا لە ئەمریکا دەگەنە بەرزترین پلەکانی سەرکەوتن، دەتوانن لە هینیشدا هەمان سەرکەوتن وەدەستبێنن، چوونکە لە هیندیشدا هەست بە شانازی دەکەن و حەزی وەدیهێنانی هەمان شتیان هەیە. بەلام سەبارەت بە ئەمریکییەکان، ئەزموونە ئەرێنییەکەیان لەگەڵ هیندییەکانی نێو ئەمریکادا وەهای لێ کردوون بە ئەرێنییەکی هاوشێوە بنوارنە ڕۆشنبیری و کەلتووری هیندی.

زۆربەی ولاتان پەیوەندیی وەهایان لەگەڵ یەکتریدا هەیە کەوا بەزۆری لەنێو بازنەی حکومەتەکانیان ناچێتە دەرەوە. بەلام هەندێکجار پەیوەندییەکان نەک هەر لەنێوان حکومەتەکاندا پێش دەکەون، بەڵکو لەنێو جڤاکەکانیشدا پێشکەوتن بەخۆیانەوە دەبینن. ئەمریکاش پەیوەندییەکی گەورەتری ستراتیژی لەگەڵ دوو ولاتدا پێشخستووە، ئەوانیش بریتانیا و دواتریش ئیسرائیله. لە هەردوو دۆخدا، پەیوەندییەکانیان فراوان و وردبوو، لە سنووری تەنیا پەیوەندیی نێوان دوو بەرپرسی حکوومی دوورتر دەڕۆیی. لەبەرئەوە ئاساییە کە ئەم دەوڵەتانە بەهۆی ئەمەوە بەبەردەوامی ببنە هاوبەشی یەکتری.

پەیوەندییەکی لەمجۆرە لەنێوان ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا و هیند دا نیمچە حەتمییە؛ بەلای کەمەوە لە ئاستێك لە ئاستەکاندا. چوونکە پەیوەندیی نێوان ئەو دوو جڤاکە زیاتر و زیاتر تێکدەچڕژێ و قووڵتر دەبێتەوە، ئەوجا ئەگەر هەردوو ولات پەیماننامەی نوێ مۆربکەن یانیش نا. بەلام، ئەمە ئەو واتایە ناگەیەنێ کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو و هیند لەسەر گشت پرسەکانی سیاسیدا

هاوڕان. چوونکە لە کۆتاییدا، ڕۆزفلت و چەرچل لەکاتی هاوپەیمانیە پتەوەکەیان لە سەردەمی جەنگدا سەبارەت بە چەند پرسێك ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە- گرنگترین ناکۆکیش پرسی سەربەخۆیی هیند بوو- دواتر ئەمریکا بەهۆی قەیرانی ساڵی ١٩٥٦ سوێسەوە هاوپەیمانیی خۆی لەگەڵ بریتانیا ڕاگرت. هەروەها ڕۆناڵد ڕیگان- کە بەرگریکارێکی سەرسەخت بوو لە ئیسرائیلییەکان- ئەو هێرشەی ئیسرائیلی بۆ سەر لوبنان شەرمەزارکرد کەوا لە ساڵی ١٩٧٨دا ڕووی دا. واشنتۆن و نیودەلهی دوو هێزی گەورەن و پابەندی و گرنگیدانی ئاڵۆزی دەرەکی و بەرژەوەندیی جیاوازیان هەیە، لەبەرئەوە بەدڵنیاییەوە سەبارەت بە چەند پرسێکی سیاسی ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە. جگە لەمەیش، ئەوان بەپێچەوانەی ئەمریکا و بریتانیا سەبارەت بە جیهان بۆچوونی جیاوازیان هەیە. بە واتایەکی دیکە، مێژوو و ئاین و ڕۆشنبیریی هیندی، دەبێتە لەمپەر لە هەڵبژاردنی بۆچوون و ڕوانگەی ئەولو ئەمریکی لە هەمبەر جیهاندا.

## بۆچوون و ڕوانگەی هیندۆسی لە هەمبەر جیهاندا

هەرچەندە لەنێوان هەردوو وڵاتدا کێبڕکێیەکی گەشەسەندوو هەیە، بەڵام هیند زیاتر و زیاتر لە چین نزیك دەبێتەوە، هەر هیچ نەبێ سەبارەت بە چوونی هەردوو وڵات بۆ سەر گۆڕەپانی جیهانی. هیند خۆی لەو قەناعەتە بەدوورگرتووە کە تەنیا هەق و ئەخلاق بکاتە بەرنامەی کار کەوا پێشتر سەردەمی ئەهرلی پێ دەناسرایەوە، هەروەها خۆی لەو تێکۆشان و ئامادەکارییەش بەدوورگرتووە کەوا ماوەی ئەندیرا گاندیی پێدەناسرایەوە و سەرلیستیی باڵای نەتەوەیی بەخشیبوویە گەشەپێدان و کرۆکی کاروبارە دەرەکییەکانی و سیاسەتە

نێوخۆییەکەی. ئەوە یەکێکە لە ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوەی هیندی (ئاشتی و سەقامگیری لەپێناو گەشەپێدان)، کە چەندان جار سەرۆکوەزیران مانمۆهان سینگ رایدەگەیاند و هاوشێوەی ئامانجێکی دیکەیە کەوا لە هیند راگەیەندراوە. سیاسییەکانی هیند ئێستە لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر درك بەو بەرەنگاری و گرفتە قووڵانە دەکەن کەوا رووبەڕووی پێشکەوتنی جڤاکێکی گەورەی وەك هیند دەبێتەوە- بەتایبەتی ئەگەر جڤاکێکی دیموکراسی بێت کە فشارەکانی نێوخۆیی بەخێرایی و قووڵییەوە کاریگەرییان دەبێت- لەبەرئەوە ئەوان بەئەولوەتی جەخت لەسەر پرسەکانی نێوخۆیی دەکەنەوە، چوونکە لە ئێستەدا وەها دەنوارنە کاروباری دەرەوە، وەك بڵێی ئامرازێکی یارمەتیدەرە بۆ ئەو گرنگیدانە سەرەکییانە. ئەو دژبوونەی کە لە هیند هەیە و خۆی لە وڵاتێکی هەژار و لە هەمان کاتیشدا زلهێزێکدا دەبینێتەوە، چالاکیی هیند لە دەرەوە کوتوبەند دەکات. ئەمەیش بەشێوەیەکی تایبەت مانای ئەوەیە کە هیند حەز ناکات وەها تەماشای بکرێت کەوتووەتە نێو ستراتیژی هاوسەنگیی دژ بە چین؛ چینێك کە ڕۆژ بەڕۆژ دەبێتە هاوبەشە سەرەکییە بازرگانییەکەی.

هەروەها ڕۆشنبیری و کەلتوورێکی هیندی هەیە کەوا ڕوانگەی تایبەتی کرۆکیی خۆی و دونیابینیی تایبەت بەخۆی هەیە. هیندۆسەکان وەك کۆنفۆشیوسییەکان، باوەڕیان بە خودایەکی پاك و تەنیا نییە. هەر خانەوادەیەك نوسخە تایبەتمەندە هیندۆسییەکەی خۆی دادەڕێژێت. دەتوانیت ڕێز لە هەندێك باوەڕ بگریت و ڕقت لە هەندێکی دیکەیان بێتەوە، هەروەها دەتوانیت متمانە و باوەڕت بە هیچ شتێك نەبێت. دەتوانیت کەسێکی گژوگیاخۆر بیت یانیش گۆشت بخۆیت. دەتوانیت نوێژ بکەیت و نوێژیش نەکەیت. هەر یەکێك لەو بژاردانە option ئەوە دیاری ناکەن ئاخۆ تۆ هیندۆسیت یان نا. هیچ هەڵگەڕانەوەیەك نییە و کەس بە بێدین و

خوانەناسی تۆمەتبار ناکرێ، چوونکە هیچ کۆمەڵەیەکی کرۆکیی باوەڕدار یان بنەما و ڕێباز و ئەرك و سوننەت و ڕاسپاردەیەکی ئاینی بوونی نییە و داوای هیچ شتێکت لێ ناکرێ، هیچ شتێکیش حەرامکراو نییە.

لەوانەیە سێر مونیر مونیر- ویلیامز، مامۆستای سانسکرێتی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەنێوان سالآنی ١٨٦٠- ١٨٩٩- یەکەم خۆرئاوایی بێت کەوا بەشێوەیەکی هەمەگیر هیندۆسییەتی خوێندبێ. مونیر کە لە بۆمبای لەدایکببوو، لە زانکۆی ئۆکسفۆرد پەیمانگەیەکی هیندی دامەزراند کە دواتر بووە مەڵبەندی مەشقی سەرکردەکانی دەستەڵاتداری بریتانی لە هیندا. هەروەها کتێبەکەی بەناوی هیندۆسی کەوا چاپی یەکەمی لە ساڵی ١٨٧٧دا دەرچوو، چەند دەقێکی سانسکرێتیی کۆنی تیادابوو، هەروەها شارەزاییە نایابە کردارییەکەی لەهەمبەر هندۆسییەت لەو کتێبەدا بەتەواوی ڕەنگی داوەتەوە. ناوبراو وەك ڕوونکردنەوەیەك نووسیوویەتی:

((هیندۆسییەت) هەرەمووی لێبوردەییە... لایەنی ڕووحی و مادیی، ناوەکی و دەرەکی، خودی و بابەتی، ئەقلانی و نائەقلانی، پاك و چەپەڵی تیادایە. دەکرێ بە شەشپالوویەکی زەبەلاح بچوێندرێ... لایەنێکی هەیە کە بۆ کەسانی کردارییە، لایەنێکی دیکەی هەیە بۆ ئەخلاقییەکانی توندڕۆ، هەروەها یەکێکی دیکەش بۆ کەسانی خۆپارێز لە گوناه و پارسا و خەیاڵییەکان، لایەنێکیش بۆ هەستی و شعورییەکان، یەکێکی دیکەش بۆ ئەو کەسانەی کە دەم لە فەلسەفە دەکوتن و بۆ ڕامارەکانیش چەندان خاڵی تیادایە. هەروەها ئەوانەی بە سرووتەکانی ئاینی ئاسوودە دەبن، تیایدا مەبەستی خۆیان بە نێروپڕی دەدۆزنەوە، هەروەها ئەوانەی نکۆڵیی لە توانای کردارەکان دەکەن و بوونی باوەڕ بە پێویست و مەرج دەزانن، پێویستیان بەوە نییە لە دەرەوەی سنوورەکەیدا بهێننەوە، هەروەها

ئەوانەی خوویان بە شتەکانی هەستییەوە گرتووە لەوانەیە سەلیقە و چێژی خۆیانی لێ تێر بکەن، هەروەها ئەو کەسانەشی بێبەش نەکردووە کەوا چێژ و خۆشی و شادومانی لە تێرامان و پەیوەندیی نێوان مادە و ڕووح و مەنەڵی بوونێکی سەربەخۆ و بناغەی مرۆڤ دەبینن، لەوانەیە عیشقە تیۆرییەکەی خۆیانی پێ تێر بکەن. ئەم توانای فراوانبوونە بێسنوورە تەنانەت لەنێو ڕیزی هەر یەکێك لەو ڕێبازانەدا دەبێتە هۆی دابەشبوونێکی بێسنووری تائیفی.

باشترین نموونە بۆ تواناییەکانی هیندۆسی ئەو ڕێگەیەیە کەوا بوزییەتیشی گرتەخۆ. چوونکە هەرچەندە بوزا هیندییە و بوزییەتیش لە هیند دامەزراوە، بەڵام بوزییەت لە ئێستەدا بەشێوەیەکی کرداری لە هیند بوونی نییە. ئەمەیش لە ئەنجامی چەوساندنەوە نەبوو، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە. هیندۆسییەت پەیامی بوزییەتی بەتەواوی هەڵمژی و زۆر بەسانایی بووە بەشێك لە هیندۆسییەت. ئێستەیش، ئەگەر بتەوێ بوزییەکان بدۆزیتەوە، دەبێ کاروانەکەت لە شوێنی لەدایکبوونی بوزییەتەوە دەستپێبکەیت و هەزاران میل ببڕیت و بەرەو کۆریا و ئەندونیسیا و یابان بچیت.

نیراد چودهۆریی نووسەری بەنگالی بەهۆی زۆریی ئالۆزییەکانی هیندۆسییەتەوە دووچاری ئالۆزی بوو، چوونکە لە یەکێك لە کتێبەکانیدا نووسیوویەتی: " هەرچەند مرۆڤ زیاتر وردەکارییەکانی هیندۆسییەت بخوێنێتەوە، زیاتر دووچاری سەرگەردانی دەبێت. هێندە ئالۆزە کە مرۆڤ ناتوانێ لەهەمبەر گرێیەکە بەگشتی بیرۆکەیەکی ئەقڵانی پێکبهێنێ، نەك هەر ئەمە بەڵکو زۆر ناکردەییە کە بتواندرێ بە کاردانەوەیەکی لۆژیکییانە لێی بچینە دەرەوە". هیندۆسییەت بە مانا ئیبراهیمییەکەی ئاین، ئاین نییە، بەڵکو فەلسەفەیەکی ئازادە، فەلسەفەیەکە د

وەلامی پێ نییە بەڵکو تەنیا پرسیارە. لەوانەیە تاکە بنەمای سەرەکیی نێو هیندۆسییەت لێڵی و ناڕۆشنی بێت.

بەهەرحاڵ، کۆی ئەمانە لەهەمبەر جیهانی واقیعیدا چی دەگەیەنن؟ هیندۆسییەکان کەسانی تەواو کردارین. ئەوان زۆر بەئاسانی دەتوانن لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا خۆ بگونجێنن. لەبەرئەوە دەبینین کە پیاوانی کاری هیندی- ئەوانەی هێشتا بەپلەیەکی باڵا هەر هیندۆسین- دەتوانن لە هەر ژینگەیەکدا سەرکەوتن وەدەستبێنن کەوا ڕێگە بە بازرگانی بدات، جا ئەگەر لە ئەمریکا بن یانیش ئەفریقیا و خۆرهەڵاتی ئاسیا. هەر لەگەڵ ئەوەی بتوانن لەپێناو پەرستش و ئیزامان شتێکی بچووک لە گۆشەیەکی ماڵەکەیان دابنێن، ئەوا ئەرکە هیندۆسییەکەی خۆیانیان بەجێهێناوە. هیندۆسییەتیش وەك بوزییەت هانی ژیانکردن دەدات لەگەڵ ناکۆکی و جیاوازییەکان، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هانی مرۆڤ دەدات هەڵیشی بمژێ.

ئەی سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە؟ ئەوە ڕوونە کە هیندییەکان لە کرۆکی خۆیاندا لە خۆرئاواییەکان و تەنانەت لە ئەنگلۆ- ئەمریکییەکانیش زیاتر ئاشنای لێڵی و نا دڵنیایین (نا یەقینی). زۆر ئەستەمە کەوا هیندییەکان وەك هەڵمەتەکانی خاچپەرستی لە سیاسەتی دەرەوە بڕوانن یان ڕێنوێنیکردنی خەڵکی بەرەو دیموکراسیەت بە ئامانجێکی بەرزی نەتەوەیی بزانن. بڕێ و لێگەڕێ خەڵکیش بۆخۆیان بژین! ئەمە ئەقڵییەت و دونیابینیی هیندۆسییە. هەروەها هیندییەکان ڕقیان لە بەڵێندانە پابەندکار و ئاشکرایەکانی تایبەت بە ئاراستەگرییە سەرەکییەکانی وڵاتەکەیانە. لێرەوە، هیند بەوە ئاسوودە نابێت وەك هاوپەیمانی سەرەکیی ئەمریکا لە ئاسیدا بدرێتە قەڵەم یان وەك لایەنێك لە پەیوەندییەکی نوێی تایبەتدا هەژمار بکرێ. لە ڕاستیدا، لەوانەیە ئەم

رفبوونەوەیە لە پۆلێنکاریی روون و کرچوکاڵی (دۆست یان دوژمن) دا خەسڵەتێکی گشتیی ئاسیاییانە بێت. چوونکە لەوانەیە ئاتۆ بۆ کۆمەڵێك وڵاتی خۆرئاوایی هاوپەیمانێکی میسالی بێت – هاوپەیمانێکی فەرمیی دژ بە فراوانخوازییەکانی سۆڤییەتی کە دەستکە و دامەزراوەی خۆی هەیە و مەشقی سەربازی ئەنجام دەدات– بەلام زۆرینەی وڵاتانی ئاسیایی بەرپەرچی ئەو میکانیزمە روونانە دەدەنەوە کەوا ئامانجیان وەدیهێنانی هاوسەنگییە. لەوانەیە هەموویان هەوڵ بدەن خۆیان لە چین بپارێزن، بەلام کەسیان دان بەوەدا نانێن. ئەمە سیاسەتی هێزە کەوا بوێریی ئەوەی نییە ناوی خۆی ئاشکرا بکات، جا ئەگەر بەهۆی رۆشنبیرییەوە بێت یانیش بەهۆی هەلومەرجە هەنووکەییەکەوە بێت.

بەلام – هەر وەك دۆخی چین– هەر دەبێ ترشیی ناوەکیی هیندی (دی ئێن ئەی) لەگەڵ مێژووی هاوچەرخدا تێکەڵ بکرێ. کاتێك هیند لە ئەزموونێکی بێهاوتای خۆرئاواییدا ژیا بەشێك بوو لە ئیمپراتۆریەتی بریتانی؛ بە فێربوونی زمانی ئینگلیزی و گرتنەبەری رێبازی دەستگە سیاسی و یاساییەکانی بریتانی و بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی ئیمپراتۆریەت. ئێستەیش هزرەکانی لیبراڵی وەها چوونەتە نێو هزری هیندییەوە کە لە زۆر لایەندا بوونەتە شتێکی لۆکاڵی. هەروەها بێزاری سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسیەت کەوا لە ئێستەدا باڵی بەسەر خۆرئاوادا کێشاوە، لە نیوەدەلهی و مۆمبای و چیندا کەشێکی لەباری بۆخۆی دۆزیوەتەوە. هەروەها رۆژنامە و رێکخراوەکانی ناحکوومیی هیندی هەمان ترس و هۆشداری دەوروژێنن کەوا هاوشێوە خۆرئاواییەکانیان دەیانوروژێنن. هەروەها ئەو رەخنانەی کەوا ئاراستەی سیاسەتی حکوومەتی دەکەنەوە رێك هاوشێوەی ئەو رەخنانەیە کەوا لە لەندەن و پاریس و واشنتۆندا

دەیانبینیت. بەلام ئەمە تەنیا بەسەر ئەو دەستەبژێرەدا پیادە دەبێت کەوا لە هیند بە زمانی ئینگلیزی دەپەیڤن- هێشتا هەر کەمینەن لەو ولاتەدا- هەروەها زیاتر بە جیهانە خۆرئاواییەکەیان ئاسوودە دەبن لەوەی خۆیان. (لە پیاوێکی کاری رۆشنبیری هیندی، یان شرۆڤەکارێك یان زانایەك بپرسە، ناوی دوا کتێب چی بووە کەوا بە زمانێکی نا ئینگلیزی خوێندبێتیەوە). سەبارەت بە ماهتماگاندی، دەتوانین بلێین کە سیفەتەکانی هیندی بەسەر کەسییەتیەکیدا زالبوون. بەلام هێزەکانی تایبەت بە سیاسەتی دەرەوە تێکەڵەیەك بوو لە رەتکردنەوە و شەرمەزارکردنی توندوتیژیی هیندۆسی و رادیکالیزمی خۆرئاوایی، کەوا کرداریبوونێکی زیرەکانە دەیرازاندەوە و لەولەیە بە پاشخانی ئەو خانەوادەیەوە کاریگەر بووبێت کەوا سەر بە چینێکی بازرگان بوون. کاتێکیش نەهرۆ رایگەیاند کە دوا ئینگلیزە حوکمی هیند بکات، لەبەرئەوە ئەو قسەیەی کرد چوونکە هەستی دەکرد کە ولاتەکەی پێش دەکەوێت و رەگە کەلتووری و رۆشنبیرییەکانی بە روونییەکی زیاتر خۆی بەدیاردەخات و لە ئایندەدا هیند لە لایەن هیندییەکانی رەسەنترەوە حوکمی دەکرێ. ئەم کاریگەرییە یەکتربڕە هیندی و خۆرئاواییە خۆی لە جیهانێکی زۆر نوێ و هاوچەرخ و خێرا گۆڕاودا بەدیاردەخات کەوا تیایدا هێزەکانی ئابووری و سیاسی لە هەندێك جاردا بەرەو ئاراستەی جیاواز بەکێش دەکرێن.

## وزەی ئەتۆمی

رێککەوتنی پێشنیازکراوی ئەتۆمیی نێوان ئەمریکا و هیند، نموونەیەکی باشی ململانێی نێوان بۆچوونێکی تەواو ئابوورییانەی هەمبەر جیهانگەرایی و سیاسەتی هێز پیشان دەدات. واشنتۆن لە سالی ٢٠٠٧دا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هیند بۆ ئاستێکی بەرزتری هاوکاری و دانوستان بەرزکردەوە کە گەیشتە ئاستی

ڕێککەوتنێکی ئەتۆمی. لەوانەیە ڕێککەوتنامە و پەیماننامەی ئەتۆمی پرسێك بێت کە تەنیا بە شارەزایانی سیاسییەوە تایبەتمەند بێت، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر لەمە گەورەترە. ئەگەر سەرکەوتن وەدەستبێنێ، ئەوا سەرلەبەری دیمەنە ستراتیژییەکە دەگۆڕێت. چوونکە بەشێوەیەکی زۆر بەهێز و بەردەوام هیندستان وەك یاریزانێکی سەرەکی دەخاتە سەر گۆڕەپانی جیهانی و پێگە ئەتۆمییە نهێنییەکەشی ئاسایی دەبێت و بناغە و پایەی هاوبەشییەکەی لەگەڵ ویلایەتەکانی یەکگرتوودا جێگیرتر و بەهێزتر دەبێت. هەروەها هیند لەگەڵ ئەندامانی دیکەی یانەی ئەتۆمی، وەك: ئەمریکا، بریتانیا، فەرەنسا، ڕووسیا و چین، دەخاتە نێو تایەکی یەکسانی تەرازووە.

بەپێی پەیماننامەی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ئەتۆمی، هەر دەوڵەتێك لە ساڵی ١٩٦٨دا چەکی ئەتۆمیی هەبووبێت، ئەوا دەوڵەتێکە و چەکیی ڕەوای ئەتۆمیی هەیە، هەروەها هەر دەوڵەتێکیش لە دوای ئەو مێژووەوە ئەو چەکانەی پێشخستبێ، دەوڵەتێکە و یاسای پێشێلکردووە (ئەمە گرنگترین بڕگەی گشت دەرهاوێشتەکانە). هیندیش کە لە ساڵی ١٩٧٤دا بۆمبی ئەتۆمیی تەقاندووەتەوە، گرنگترین دەوڵەتە و تاکە هێزی پێشبینیکراوی جیهانییە کە لە دەرەوەی پەیماننامەی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ئەتۆمییە. ئیدارەی بۆش یاساوی ئەوەی هێنایەوە زیادکردنی هیند بۆ نێو پەیماننامەکە بۆ مانەوەی پێویستە. هەروەها لەبەر چەند هۆیەکی هاوشێوەش بوو کە موحەممەد بەرادعیی سەرۆکی ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی (بەرپرسی چاودێریکردن و جێبەجێکردنی پەیماننامەکە)، پاڵپشتیکارێکی سەرسەختی ڕێکەوتننامەی هیندۆ- ئەمریکی بوو. لە ڕاستیدا هەرچەندە سیستمی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ئەتۆمی بە چلۆرێکی (جرعە) تەندروستانەی واقیعی کاری بۆ

هێزکردنێکی میسالییانە کردووە. ئەمەیش بەسەر ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا پیادە دەبێت، کەوا لە سەرانسەری جیهاندا بانگەشەی ئەوە دەکات کە پێشخستنی کڵاوی دیکەی ناوەکی پرسێکی مەترسیدار و نا ئەخلاقییە، بەڵام خۆی هەزاران چەکی ئەتۆمیی هەڵگرتووە.

سەبارەت بە هیند، ڕێکەوتننامە ئەتۆمییەکە بەشێتێکی زۆر سانا پوخت کراوەتەوە: ئایا هیند بە چین دەچێت یان بە کۆریای باکوور؟ نیوەدەوڵەی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دەبێ جیهان هیندستان وەك هێزێکی ناوەکی پەسندبکات، لەبەرانبەریشدا هیند پابەند دەبێت بەوەی کە تا ئەوپەڕی توانا بەرنامە ئەتۆمییەکەی خۆی بکاتە شتێکی بێ زیان و دەستەبەرکراو. پێش ئیدارەی بۆش، سیاسەتی ئەمریکی بەشێوەیەکی بێهودە بۆ ماوەی چەند دەیەیەك هەوڵی دا بەرنامەی چەکی ئەتۆمیی هیندی بوەستێنێ، هیندیش بۆ ماوەی سی و سێ ساڵ لەژێر باری فشاری سزایەکانی ئەمریکادا دەیناڵاند بەبێ ئەوەی دەستبەرداری هەڵوێستی خۆی بێت– تەنانەت کاتێك لە ئێستەش هەژارتر بوو– هەر کەسێك لە هیند تێبگات دەزانێ کە ئەو وڵاتە پێش ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە بەتەواوی دەستبەرداری چەکە ئەتۆمییەکانی بێت، بە بەختیارییەکی زۆرترەوە چەند ساڵێکی دیکەش بەڕێ دەکات.

بە بۆچوونی ئابوورییانە، ڕێککەوتنی ئەتۆمی بۆ هیند زۆر پێویست نییە. ڕاستە کە توانای ئەوە بەو وڵاتە دەبەخشێت کە بگاتە تەکنۆلۆژیای مەدەنیی ئەتۆمی و دابینکردنی پێداویستییەکانی وزە، بەڵام ئەمە تەنیا بەشێکی بچووکی ڕەوتی تێکرای پێشکەوتنیەتی. لەوانەشە شتە هاندەرەکانی جیهانگەرایی نیودەوڵەی هان بدەن لەهەمبەر ئەم مەسەلەیەدا ولز لە بەفیڕۆدانی کاتی خۆی بهێنێ و زیاتر جەخت لەسەر پێشخستن بکاتەوە و ئەم گرنگیدانانە بۆ ماوەیەکی دیکە

دوابخات. لە کۆتاییدا، زۆر جۆر شێوەی وزەی ئەلتەرنانیف هەن، یابان و ئەڵمانیا بۆ گەیشتن بە پلەی زلهێزیی خۆیان سەرکەوتنیان وەدەستهێناوە بەبێ ئەوەی پەنا ببەنە بەر چەکی ئەتۆمی.

بەڵام بەرنەمایی و ئامانجە ئەتۆمییەکانی هیند پەیوەندیی بە شانازیکردنی نەتەوەیی و ستراتیژێکی جیۆسیاسییەوە هەیە. چوونکە زۆرێك لە سیاسییەکان و دیبلۆماسییەکانی هیند زۆر لەو ڕاستییە بێزارن کە دەڵێ هیند بەبەراورد لەگەڵ چین و ڕووسیا و هێزی دیکەی ئەتۆمی، بەردەوام لە پلەی دووەمدا دەمێنێتەوە. لەو وڵاتانەی باسمانکردن هیچ کارگە و یەکەیەکی ئەتۆمی ناکەونە بەر هیچ جۆرە سیستمێکی چاودێریکردنەوە، لە کاتێکدا هیند بەلای کەمەوە بەشێکی زۆری بەرنامە ئەتۆمییەکەی دەخاتە بەرچاوی ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی. هیند بەوە زۆر نیگەران دەبێت کە لەگەڵ چین یەکسان نەبێت. چوونکە بەرپرسانی هیندی زۆر بەهێمنی ئاماژە بەوە دەکەن کە چین لە بڵاوکردنەوەی ئەتۆمیدا مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە، ئەویش بەشێوەیەکی تایبەت لە میانی پاکستانەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا پلان بۆ ئەوە دادەنێت تەکنیکی مەدەنییانەی ئەتۆمی ببەخشێتە چین. بەڵام هەرچەندە هیند وڵاتێکی دیموکراسی و شەفافە و سەبارەت بەقەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ئەتۆمی دۆسیەیەکی پاك و بێگەردی هەیە، بەڵام ماوەی سی و سێ ساڵە لەم جۆرە هاوکارییە بێبەش کراوە.

سەبارەت بەم مەسەلەیە، جیهانگەرایی و جوگرافیای سیاسی لەسەر ئاستی جیاوازدا کار دەکەن. زۆرێك لە لایەنگرانی ئەمریکا بۆ داماڵینی چەکی ئەتۆمی- کەوا هیند (لە پرسی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ئەتۆمیدا بەئایاتوڵا ناویان دەبات "- دژی ڕێککەوتنامەکەن یانیش تەنیا لەو کاتەدا ڕەزامەندی لەسەر

دەردەبڕن کە هیند بەرهەمهێنانی مادەی دوولەتبوونی ناوەکی (انشطارية) دیاری بکات. (واپێدەچێ چین بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆمی وەستاندبێ، هەروەک چۆن زلهێزی دیکە هەمان کاریان کردووە، بەلام بڕیارەکە خۆبەخشانە و خۆویستانەیە، بەشێکی زۆری هۆیەکە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێشتر بە مادەی دوولەتبوونی ناوەکی تقوم بووە). بەلام هیند هەر ڕێکارێکی ناچارکارانە بە هەڵپەساردنێکی لایەنگرانەی ئەتۆمی دادەنێ. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاش ئەم ڕاستییە ستراتیژییەی خستۆتە نێو حیساباتەکانی خۆیەوە. چوونکە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دژی هەبوونی یەك دەولەتی هەژموونداره کەوا ئەورووپا و ئاسیا کۆنترۆڵ بکات. جا ئەگەر هیند ناچار بکرێ هێزە ناوەکییەکەی خۆی کۆتوبەند و سنووردار بکات- بەبێ ئەوەی کۆتوبەندی هاوشێوە بخاتە سەر چین- ئەوا دەرئەنجامەکە دەبێتە هۆی نەبوونی هاوسەنگی و ئەمەیش لە بەرژەوەندیی چین تەولو دەبێت. لێرەوە پرسیارەکەی ڕۆبێرت بلاکویلی باڵیۆزی پێشووی ولایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە هیند خۆی زەق دەکاتەوە و ڕاستییەك دەخاتە بەرچاو کاتێك دەپرسێ: چ شتێك لە بەرژەوەندیی دوور مەودای ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادایە پشتگیری لە ڕێکارێك بکات کەوا بەهۆیەوە چین لە ئاسیادا ببێتە تاکە هێزی هەژموونداری ناوەکی؟

ئەوەی لە مەسەلەکەدا شتێکی سەیرە ئەوەیە کە ئەگەرەی ڕاستین لەبەردەم ڕێککەوتننامەکە لە واشنتۆنەوە دروست نەبووە، بەلکو لە نیوەدەلهییەوە دروستبووە. چوونکە هەندێك سیاسی و ڕۆشنبیری بەرجەستەی هیند ئەو خستنەڕووە ڕەتدەکەنەوە کەوا بەدرێژایی ئەمەن یەکجار پێشکەش دەکرێ، ئەمەیش پالی بە یەکێك لە کۆمێنتەرانی کەنالی NDTV هیندییەوە نا بلێت: "واپێدەچێ ئێمە نازانین چۆن بلێین بەلێ". چوونکە لەو کاتەی سەرۆکوەزیرانی

هیندی و هەندێك گەورە بەرپرسی دیکەی حکوومەت ئەو دەرفەتەیان بینی کەوا رێککەوتننامەکە دەیبەخشێتە هیند، ئەوا حوکمەکانی کۆن و پێشوەخت و چارەسەرەکانی شکستخواردوو چاوی هەندێکیان کوێرکرد. زۆرێك لە دەستەبژێری هیندی بە گۆشەنیگای ئەمرۆییانە دەیانڕوانیە جیهان کە ئەویش بریتیبوو لە ؛ هیند وەك ولاتێکی هەژار و چاکەخواز و لە ولاتانی جیهانی سێ و خاوەن سیاسەتێکی بێلایەن و گۆشەگیرانەی دەرەوە (رەنگە هەندێکیشیان شکستخواردووشی بخەنە سەر). ئەوان دەزانن چۆن لە جیهانێکی وەهادا کاردەکەن؛ سوالّی بەخشش لە کێ دەکەن و لە سەنگەریدا دەجەنگن. بەلاّم لە جیهانێکدا کە تیایدا هیند هێزێکی مەزنە و بە متمانەوە لەسەر گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا هەنگاوهەڵدێنێ، لە دانانی یاسایەکاندا بەشدار دەبێت و نەك تەنیا هەر پێی کاریگەر نابێت، بەڵکو دەبێتە هاوبەشی بەهێزترین ولات لە مێژوودا، ئەمە پێشنیازێکی نوێ و جێگەی نیگەرانییە. سەدان جار کۆمێنتەری لەو جۆرە ئەو جۆرە پرسیارانەیان کردووە: " بۆچی ئێستە ویلایەتەکانی یەکگرتوو ئەمجۆرە لوتف و خۆشخوو ییە لەهەمبەر ئێمەدا دەنوێنێ؟" لە سالّی ۲۰۰۷دا هێشتاکە بەدوای دەستی دەرەکی و شاراوەدا دەگەڕان.

بەرپرسەکانی چین توانیان زۆر بەکارامەیی و لێهاتوویەکی بەرزەوە سەرلەنوێ بیر لەو رۆڵە نوێیەی ولاتەکەیان بکەنەوە وەك هێزێکی جیهانی. بەلاّم دەستەبژێری هیندی هەتا ئێستە خۆی وەها پیشان نەداوە کە رکابەری هاوسێیەکەیەتی. هەرچۆنێك بێت، بەبێ رەچاوکردنی ئەو رەوتەی کەوا رێککەوتننامە ئەتۆمییەکە دەیگرێتە بەر، ئەوا تەنگوچەڵەمەکانی تێپەڕاندنی بە نێو نیودەلهییەوە ئەو گرتوبەندە سەرەکییانەی بەکارهێنانی هێزی هیندی لە سالّەکانی داهاتوودا زەق دەکاتەوە. هیند ولاتێکی بەهێزە بەلاّم حکوومەتەکەی

بێهێزە. ناتوانێ هێزە نەتەوەییەکەی خۆی لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەکەیدا بەکاربێنێ.

## زاراوەی جوگرافی

دەتوانیت درک بەوە بکەیت کە هیند وڵاتێکی سەیرە ئەویش نەك لە میانی تێبینیکردنی ئەو کەسانەی ماریان خۆشدەوێ، بەڵکو لە میانی چاودێریکردنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانییەوە: لە چ وڵاتێکی دیکەدا لە سایەی گەشەکردنی ئابووریدا جەماوەریبوونی خۆت لەدەست دەدەیت؟ لە ساڵی ٢٠٠٤دا هاوپەیمانیی پارتی BJPی حوکمڕان چووە نێو هەڵبژاردنەوە کە باهۆزی توندی ئابووری پاڵی پێوەدەنا، چوونکە وڵاتەکە بە ڕێژەی ٩٪ گەشەی دەکرد، بەڵام BJP لە هەڵبژاردنەکەدا شکستی هێنا. کۆمەڵێك ڕۆشنبیری لۆکاڵی- کە زۆربەیان لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە سۆسیالیستی بوون- ئەمەیان وەها لێکدایەوە کە ڕابوون و پێشکەوتنەکە پووچ و بەتاڵ بووە، هەروەها گەشەکردنیش بەشێوەیەکی پلەبەپلە بەڕێوە نەچووە، هەروەها پارتی حوکمڕان ڕاستیی هیندی بیرچووەتەوە. بەڵام ئەگەر بە چاوێکی پشکێنەرانەوە بنواڕینە واقیع، زۆر بەسانایی بۆت ڕوون دەبێتەوە کە ئەم لێکدانەوەیە دروست نییە. چوونکە لە ئەوەندەکاندا ڕێژەکانی هەژاری لە هیندستاندا زۆر بەخێرایی و بەژمارەی هێندە گەورە لە دابەزیندا بوو کە بۆ هەموو کەسێك ڕوون و ڕەوان بوو. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەم مەسەلەیە لە دوای ساڵی ٢٠٠٤ یش هەر بەردەوام بوو. چوونکە هاوپەیمانیی پارتی کۆنگرە (کە ئەو کات جڵەوی دەستهەڵاتی گرتە دەست) بە ڕێژەی ٨٪ زیاتر بۆ ماوەی سێ ساڵ ڕێژەی گەشەکردنی پاراست، بەڵام لە کۆی ئەو هەڵبژاردنە هەرێمییانەدا سەرکەوتنێکی زۆر کەمی وەدەستهێنا کەوا لە ماوەی دەسهەڵات وەرگرتندا ئەنجامی دەدا، هەرچەندە سەبارەت بە تێکچوونی

یەکسانی و دابەشکردنی سامان چەند پاڵنەرێکی شەرعی هەبوون، ئەدی بۆچی ئەمە لە هیندا نابینین؟

وتەیەکی بەناوبانگی تۆماس (تیپ) ئۆنێل ی وتەبێژی پێشووی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکی هەیە کە دەڵێ: " سیاسەت هەر هەمووی لۆکاڵییە". دەکرێ لە هیند ئەم وتەیە لەسەر بەرد بنووسرێ. چوونکە هەڵبژاردنەکان لە هیند هەرگیز هەڵبژاردنی نەتەوەیی نین، بەڵکو هەڵبژاردنی لۆکاڵی و هاوکاتانەی هەرێمین بەبێ ئەوەی هیچ بابەتێکی هاوبەشیان لە نێواندا هەبێت.

ئەمەنی هەمەڕەنگیی چین دەگاتە چوار هەزار ساڵ، ئەمەیش لەنێو کەلتوور و دابونەریت و زمان و ڕۆشنبیریی هیندیدا ڕەگی داکوتاوە. وڵاتێکە ١٧ زمان و ٢٢،٠٠٠ شێوەزاری هەیە، بۆ ماوەی چەندان سەدەی دووروودرێژیش لە سەدان میرنشین و مەملەکەت و وڵات پێکهاتبوو. کاتێک بریتانییەکان لە ساڵی ١٩٤٧ هیندیان بەجێدەهێشت، حکوومەتی نوێ ناچار بوو سەبارەت بە ڕێکەوتنامەی تاکانە لەگەڵ ٥٠٠ دەستەبەڵاتداردا بەهۆی بەرتیل و هەڕەشەوە دڵنوستان بکات و هەندێکجاریش پەنای بۆ بەکارهێنانی هێزی سەربازی دەبرد، ئەمەیش لەپێناو چوونە نێو یەکیەتیی هیندی بوو. لە دابەشبوونی پارتی کۆنگرەی نیشتمانیی هیندی لە حەفتایەکانەوە، هیچ پارتێکی هیندی دەرفەتی هەژموونێکی نەتەوەییانەی بۆ نەڕەخسا. هەروەها کۆی ئەو حکوومەتانەی کەوا لە دوو دەیەی دواییدا پێکهاتن، بریتیبوون لە هاوپەیمانییەک کەوا لە پارتەکانی هەرێمی پێکهاتبوون بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی هاوبەشیان لەنێواندا هەبێت. ڕوشیر شارما کە وەبەرهێنانەکانی دەستگەی مۆرگان ستانلی لە بازارە گەشەسەندووەکاندا بەڕێوە دەبرد، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە زۆرینەی بیست و هەشت ویلایەتەکەی

هیند لەپێناو پارتەکانی هەژموونداری هەرێمییەوە دەنگیان دا، بێگومان ئەمەیش لەسەر حیسابی ئەو پارتانە بوو کەوا بە نەتەوەیی ناودێر کرابوون.

باشترین نموونە بۆ ئەمە ئەو شتە بوو کە لە ویلایەتی ئوتار پرادیش ڕووی دا کە گەورەترین ویلایەتی هیندە (ئەگەر سەربەخۆ بووایە، ئەوا بەهۆی ژمارەی دانیشتووانەکەیەوە شەشەمین وڵاتی مەزن بوو لە جیهاندا). لە کاتی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا، دوو پارتی نەتەوەیی لەسەر بنەمای ئەو پرسەی کەوا بە پرسە مەزنەکانی نەتەوەییان دانابوو، خۆیان کاندیدا کرد. پارتی BJP بەشێوەیەکی کارا و کەرموگوڕ کاری بۆ بووژاندنەوەی لایەنی نەتەوەییانەی هیندۆسییەت کرد، بەڵام پارتی کۆنگرە جەختی لەسەر تایبەتمەندییە عەلمانییەکان دەکردەوە و شانازی بەو ڕێژە گەشەکردنە دەکرد کەوا وڵاتەکەی وەدەستی هێناوە. بەڵام هەردوو پارت پلەی سێیەم و چوارەمیان وەدەستهێنا و لە دوای دوو پارتی دیکەی لۆکاڵی هاتن کەوا جەختیان لەسەر پرسە تەواو نێوخۆییەکان دەکردەوە؛ ئەمەیش لەپێناو بەخشینی دەستەهەڵاتێکی زۆربوو بە چینە نزمەکانی کۆمەڵایەتی. بەڵام ئەوەی لە ئۆتار برادیشدا وەدیهات لەوانەیە لە باشوور و ئەنانەت مۆمباشدا سەرکەوتن وەدەستنەهێنێ. چوونکە موسڵمانانی هیندی لە چەند ویلایەتێکدا گرنگییەکی گەورەیان هەیە، بەڵام لە هەندێک ویلایەتی دیکەدا ئامادەییان نییە. هەروەها ئەو سەرکردە سیاسییانەی کەوا هێز و هەژموونیان لە ویلایەتی تامیل نادۆدا هەیە، لە هیچ شوێنێکی باکووردا لایەنگریان نییە. ویلایەتی بنجابیش ڕۆشنبیرییەکی تایبەتی سیاسییان هەیە کە پەیوەندیی بە پرسەکانی سیخ و پەیوەندییەکانی هیندۆ- سیخییەوە هەیە. هەروەها سیاسییەکانی ڕاجستان لە کارناتاکادا هیچ بەکێشبوون و هەژموونێکی مەعنەوییانەی سیاسییان نییە، چوونکە هەردوو ویلایەت بە دوو زمانی جیاواز

دەپەیڤن. دەکرێ مەسەلەکە بە بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن لە سەرانسەری ئەورووپا بچوێنین کەوا تیایدا لەگەڵ دەنگدەران لە پۆڵۆنیا و فەڕەنسا و ئیرلەندا باس لە یەك پرس بکرێ. جارێك وینستۆن چەرچڵ گوتی کە هیند "تەنیا زاراوەیەکی جوگرافییە، بەبێ ئەوەی وەك ئەورووپا کەسییەتییەکی سیاسی هەبێت". ڕاستە کە چەرچڵ سەبارەت بە هیند زۆر جار بەهەڵەدا چووە، بەلام لەم خاڵە بەتایبەت بۆچوونەکەی دروست بووە.

ئەم جیاوازی و دوو کەرتبوونە سوودی زۆری هەیە، بۆ نموونە: هەمەچەشنی و وزە کۆمەلایەتییەکەی پتەو دەکات و نایەڵێ خۆڕادەستکردنە دەست دیکتاتۆر بێتەکایەوە. کاتێك ئەندیرا گاندی لە حەفتایەکاندا هەوڵی دا حکوومەت بەشێوەیەکی ناکرەوانە و سەرکوتکارانە و مەرکەزییانە بەڕێوەبیات، هەوڵەکەی بە ئاسانی سەری نەگرت، بەڵکو لە شەش هەرێمی هیندیدا چەند بزاڤێکی یاخیبوونی ورووژاند. لە دوو دەیەی ڕابردوودا، هەستی پەیوەستبوونی هەرێمییانە لە هیند بووژایەوە و وڵاتەکە سیستەمە سروشتییەکەی خۆی دۆزییەوە. لە وڵاتێکی زۆر هەمەچەشندا تەنانەت توندڕەوی نەتەوەیش دەبێتە شتێکی زەحمەت. لەبەرئەوە، کاتێك پارتی BJP دەبەوێ شۆڤێنیزمی هیندۆسی دژ بە کەمینەی موسڵمانی هیندی بووروژێنێ، ئەوا بەزۆری دەبینێ کە چینە نزمە کۆمەلایەتییەکانی هیندۆسی و هەروەها هیندییەکانی باشوور لە هەمبەر ئەم گوتارەدا هەست بە بێزاری و نیگەرانییەك دەکەن کەوا بە ناچارکارانە و لوونەرزانە دێتە بەرچاو.

بەلام لە هەمان کاتیشدا ئەم هەمەچەشنی و دووکەرتبوونە، کاری دەوڵەتی هیندی ئاڵۆز دەکات. کۆتوبەندەکانی دەیەی ڕابردوو دیاردەیەکی تیژتێپەڕ نییە کەوا لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا نەمێنێ، بەڵکو گوزارشتێکە لە ڕاستییە

بونیادییەکەی نێو سیاسەتی هیندی. ئەم کۆتوبەندانەش وەها دەکات کە زۆر زەحمەت بێت حکومەت بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی دیاری بکات و ولات بۆ پالپشتیکردنی ئامادە بکات و دواتریش لەپێناو وەدیهێنانی ئامانجەکانیدا کۆمەلێك سیاسەت جێبەجێ بکات، جا ئەگەر لە بواری ریفۆرمی ئابووری یانیش سیاسەتی دەرەوە بێت. هەروەها سەرۆکوەزیران ناتوانێ بەهەمان شێوەی ئەمرۆ سەرکردایەتیی دەستەلاتی نەتەوەیی بکات، لەوانەیە هەر سەرۆکوەزیرانێکی داهاتووش جارێکی دیکە نەتوانێ ئەمە بکاتەوە. چوونکە ئەم پۆستە لە سەرکردەی بالاوە بووەتە تەنیا سەرۆکی ئەنجوومەنێك و پارتی دەستەلاتداریش بووەتە تەنیا پارتێك کەوا سەرکردایەتیی هاوپەیمانییەکی لەبەردەستە و لە دژبەری هاوشێوە و یەکسانی خۆی پێکهاتوون. بەزۆریش حکومەتی مەرکەزی رادەستی ئیمتیاز و دەستەلاتی حکومەتە هەرێمی دەبێت کەوا رۆژ بەرۆژ متمانە و سەربەخۆییەکەی زیاتر دەبێت. ئەمەیش لە رووی ئابوورییەوە واتای بەردەوامبوونی سەرکەوتن دەگەیەنێ، هەرچەندە کردەی رێکخستن کەمە و ریفۆرمەکان لاوەکین و چالاکی و ئەزموونەکان لەسەر ئاستی ویلایەتەکانن. هەروەها سەبارەت بە سیاسەتی دەرەکی، ئەو واتایە دەگەیەنێ کە وەرچەرخانێکی گەورە لە شێواز و تۆرم رووی نەداوە و کەمە پابەندبوونێکی گەورە هەیە و رۆلێکی کەم چالاکتری لەسەر گۆرەپانی نێودەولەتیدا هەیە. راستە کە هیند لە جاران پتر رۆلێکی گەورەتری نێودەولەتی دەگێرێ و هەژموون بەسەر باشووری ئاسیادا پەیدا دەکات، بەلام نابێتە ئەو هێزە جیهانەی کەوا هەندێك هیوای بۆ دەخوازن و هەندێکیش لێی دەترسن. ئەمە لە ئایندەیەکی نزیکدا روو نادات.

ئەگەر پێشتر جۆرە کێبڕکێیەك لەنێوان هیند و چیندا هەبووبێت، بەڵام ئێستە کۆتایی هاتووە. چوونکە قەبارەی ئابووریی چین سێ هێندەی قەبارەی ئابووریی هیندیە و ئێستەیشی لەگەڵدا بێت بەخێراییەکی زۆرتر گەشە دەکات. ئەمەیش واتای ئەوەیە کە هیند لە ڕووی ئابوورییەوە ناتوانێ پێش هیند بکەوێ تەنیا لەو کاتەدا نەبێ کە وەرچەرخانی مەزن و جێگیر بۆماوەی چەند دەیەیەك لە ڕەوتی هەردوو وڵاتدا بێتە ئاراوە. بەڵام سیناریۆیە ڕێتێچووەکە ئەوەیە کە چین بە هەوایەکی باش هەر لەپێش هیند دەمێنێتەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا دەبێ ئەوە بزانین کە هێشتا هیند دەتوانێ سوود لە تایبەتمەندییەکانی وەك ئابوورییەکی زەبەلاح و گەشەسەندوو، دیموکراسیەتێکی سیاسی و نموونەیەکی پڕشنگداری عەلمانیەت و لێبوردەیی و زانیارییەکی قووڵی خۆی لە هەمبەر خۆرئاوا و خۆرهەڵات و پەیوەندیی تایبەتی خۆی لەگەڵ ئەمریکادا وەربگرێ.

دەکرێ ئێستەی هیند بە ئەمریکای کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم بەراورد بکرێ. چوونکە لەو ماوەیەی ئاماژەمان بۆی کرد، کۆتوبەندە نێوخۆییەکانی ئەمریکا لە هەڵکشانی ئەو وڵاتە بۆ سەر شانۆی جیهانی بە ئاستێکی زۆر بەرز تەگەرەی خستە بەردەم ئەمریکا. چوونکە لەگەڵ ساڵی ١٨٩٠دا ئەمریکا لە ڕووی ئابوورییەوە پێش بریتانیا کەوتبوو، بەڵام لەسەر ئاستی دیپلۆماسی و سەربازیدا بە هێزی پلە دوو دادەندرا. ڕیزبەندی سوپاکەشی لە دوای بولگاریا لەنێو ڕیزی سوپای جیهانیدا لە پلەی چواردەیەمدا بوو. هەروەها قەبارەی چەکە دەریاییەکانی هەشتیەکی قەبارەی چەکی دەریایی ئیتاڵی بوو، هەرچەندە هێزە پیشەسازییەکەی لەو کاتەدا بە سێزدە جار گەورەتربوو. هەروەها لە هەندێك کۆبوونەوە و کۆنگرەی نێودەوڵەتیدا بەشداری کرد، دیپلۆماسییەکانیشی لە کاروباری جیهانیدا یاریزانی بچووك بوون. هەروەها واشنتۆن شارۆچکەیەکی

بچووك بوو گرنگیدانەكانی زۆر تەنگەبەر بوون و حكوومەتەكانی بەدەستهەلاتی سنووردار دەناسرانەوە، بەشێوەیەكی گشتیش وەك پۆستێكی گرنگ و كرۆكی لە سەرۆكایەتی نەدەڕواندرا. بێگومان ئەمریكا لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەیەمدا وڵاتێكی بێهێزبوو، ئەم واقیعەش پێویستی بە چەندان دەیە و گۆڕانی مەزنی نێوخۆیی و قەیرانی قووڵی نێودەوڵەتی هەبوو بۆ ئەوەی بگۆڕدرێت، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ویلایەتی واشنتۆنی ئەمریكی گەشەبكات و ببێتە مەركەزی و لەپێش گشت ویلایەتەكانی دیكەی دایەوە. سەرۆكەكانیش لە ثیۆدۆر رۆزفلتەوە تا دەگاتە وودرۆ ویلسۆن دەستیان بە ناساندنی ئەمریكا كرد وەك هێزێكی جیهانی.

لە كۆتاییدا، بناغەی هێزی ئەمریكی – جڤاكە زیندووەكەی ئەمریكا- خاڵی بەهێز و بێهێزی ئەمریكا بوو. چوونكە ئەو جڤاكە بوو كە ئابوورییە زەبەلاحەكەی ئەمریكای دروستكرد، بەلام لە هەمان كاتیشدا هەڵكشان و پێشكەوتنی خاوكردەوە و ڕەوتەكەی گۆڕی و بەشداری و كاراییەكەی لە شانۆی جیهانیدا بەردەوام فشۆڵكرد. لەوانەیە هیندیش ئەزموونێكی هاوشێوە بەڕێوەببات، چوونكە جڤاكێكی هەیە كە دەتوانێ بەشێوەیەكی زۆرباش وەلامی ئەو دەرفەتانە بداتەوە كەوا جیهانە گلۆبالیزەكراوەكە پێی دەبەخشێت؛ جڤاكێك لە ئابووری و كۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا گەشەدەكات و باڵا دەكات. بەلام سیستمی سیاسی لە هیند لاوازە و دەكرێ بپڕدرێت و دەستی تێوەر بدرێ، لەبەرئەوە هێشتا ئامادەیی ئەوەی تیادا نییە ڕۆڵە شایستەكەی لە جیهاندا بگێڕێ. لەوانەیە زنجیرەیەك قەیران گۆڕی ئەو واقیعانە بگۆڕێت، بەلام بەبێ ئەوەی هێمە بە سیستمەكە بكات، ئەوا جڤاكی هیندی لە گەمە جیهانییە نوێیەكەدا پێش دەوڵەتەكەی كەوتووە.

ئەم ململانێیەی نێوان جڤاك و دەوڵەت تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت هێشتا لە ئەمریکادا هەیە. لێرەدا لەو کاتەی دەبینە گرنگترین و تاکە یاریزانی سەدەی بیست و یەك، پێویستە ئەوەمان لەبیر بێت پرسیار بکەین کە کاردانەوەی خودی ئەمریکا لە هەمبەر جیهانی دوای ئەمریکادا چۆن دەبێت.

## هەژموونی ئەمریکی

لە ٢٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٧دا نزیکەی چوارسەد ملیۆن مرۆڤ لە سەرانسەری جیهاندا – چارەکە دانیشتووانێکی سەر گۆی زەوی– ئەو ڕۆژەیان کردە پشوو، چوونکە ئەو ڕۆژە لەگەڵ شێستەمین ساڵیادی ڤیکتۆریای شاژن و چوونی بۆ سەر تەختی پاشایەتی هاوکات بوو. ئاهەنگەکە بەبۆنەی یۆبیلی ئەڵماسیی ماوەی پێنج ڕۆژ لەسەر وشکایی و دەریادا بەردەوام بوو، بەڵام نمایشی سەربازی و ئاهەنگی یادکردنەوەی سوپاس لە ٢٢ی حوزەیران بوونە ترۆپکی ئاهەنگەکە. سەرۆکوەزیرەکانی ئەو موستەعمەرە بریتانیاییانەی کەوا خودموختارییان وەرگرتبوو، هەر هەموویان ئامادەبوون، هەروەها میر و دۆق و باڵیۆز و نوێنەرانی شوێنەکانی دیکەی جیهانیش لەوێ ئامادەبوون. ڕیزبەندی و نمایشە سەربازییەکە لە پەنجا هەزار سەرباز پێکهاتبوو کەوا ئەسپسوارەکانی هوزار لە کەنەدا و یەکەی سوارچاکانی باشووری ویڵزی نوێ و تیپی سەربازانی تفەنگ کورت لە ناپۆلی و سەربازانی عەلی جەمال لە بیکانیر و سەربازانی بۆرخا لە نیپاڵ و چەندەها و چەندەهای دیکەی تیادابوو. ئەو کات و ساتە، بەپێی وەسفکردنی یەکێك لە مێژوونووسان، ساتێکی ڕۆمانی بوو.

ئاهەنگەکە کە بەبۆنەی یۆبیلی ئەڵماسیی بوو لە گشت گۆشە و کەلەبەرەکانی ئیمپراتۆرییەکەدا بە چەندان نمایشی زەبەلاح دەناسرایەوە. "لە حەیدەر ئاباد"دا لە هەر دە تۆمەتبارێکی بەندکراودا یەکێکیان ئازادکران". جیمس مۆریس دەنووسێت، " ئاهەنگێکی سەمایی زۆر مەزن لە ڕانگۆندا هەبوو، هەروەها خوانی نیوەڕۆ لە کۆشکی سوڵتان لە زنجبار ئامادەکرابوو، هەروەها ڕێوڕەسمی درووود و سڵاوێك بەڕێوەچوو کە کەشتییەکانی جەنگی لە کەنداوی نیلدا بەهۆی نمایشێکەوە پێشکەشیان کرد، هەروەها نمایشێکی کۆرس لە هابی فالی لە هۆنگ کۆنگدا بەڕێوەچوو". هەروەها لە بانگالۆر پەیکەرێکیان بۆ شاژن سازکردبوو، لە شاکاباتنامدا تەلارێکی نوێ بۆ شارەوانی دروست کرا. لە سەنگافوورەشدا پەیکەرێك بۆ سێر ستامفۆرد ڕافلز لە نێوەڕاستی شاری بادلنگ سازکرا، نافوورەیەکیش لەنێوەڕاستی باغچە گشتییەکانی شانگهای دروستکرا (گەرچی ئەو موستەعمەرەش نەبوو). هەروەها دە هەزار منداڵ لە شەقامەکانی ئۆتاوادا ڕێپێوانیان دەکرد و ئاڵای بریتانیایان ڕادەشەقاند.

لە لەندەندا ئارنۆڵد توینبیی گەنج تەمەنی هەشت ساڵ بوو، لەسەر شانی مامی دانیشتبوو و زۆر بە گوڕوتاوەوە چاودێریی نمایشەکەی دەکرد. ئەم توینبییە کە دواتر بووە بەناوبانگترین مێژوونووسی سەردەمی خۆی، ئەوە باس دەکات کە چاودێریکردنی مەزنی و شکۆداریی ئەو ڕۆژە وەهای لێ کردبوو هەست بکات کە خۆر " لەنێوەڕاستی ئاسماندا ڕاوەستا و و جێگیرە.... کەشەکەم بیردێتەوە، زۆر باش و خۆش بوو. ئەوە ئێمەین لەسەر تروێپکی جیهاندا دەوەستین، بۆیەش گەیشتینە ئەو تروێپکە بۆئەوەی تا هەتایە لەسەری بمێنینەوە. بێگومان شتێك هەیە پێی دەگوترێ مێژوو، بەڵام مێژوو شتێکی ڤێزەونە و بۆ گەلانی دیکە پەند

دەدات. ئێمە زۆر بە ئاسوودەییەوە لە دەرەوەی کۆی ئەو شتانەین، من دڵنیام".

بەلام بێگومان، مێژوو بۆ بریتانیا ڕووی دا. ئەو پرسیارەش لەهەمبەر زلهێزەکان لە زەمەنی ئێمەدا ئەوەیە: ئاخۆ مێژوویەك بۆ ئەمریکاش ڕوو دەدات؟ ئایا لە ئێستەدا ڕوودەدات؟ وێکچوونێکی سەد لەسەد نییە، بەلام بریتانیا لە ترۆپکی شکۆی خۆیدا نزیکترین گەلە لە چاخی نوێ دەگاتە ئەو شوێنەی کەوا لە ئێستەدا ئەمریکا پێیگەیشتووە. لەبەرئەوە، لەسەرمان پێویستە ئاگاییمان بخەینە سەر ئەزموونی بریتانیای مەزن کاتێك بیر لەوە دەکەینەوە کە ئاخۆ هێزەکانی گۆڕانکاری کار لە ئەمریکا دەکەن و چۆن؟

زۆرێك لە دووبارەبوونەوەی هاوچەرخانەی گرفتە مێژووییەکانی بریتانیا هەن، بۆ نموونە: دەستوەردانە سەربازییە نوێیەکانی ئەمریکا لە سۆماڵ و ئەفغانستان و عێراقدا ڕێك هاوشێوەی دەستوەردانە کۆنەکانی سەربازیی بریتانیان لە هەمان ئەو شوێنانەدا. گرفتی سەرەکیی ستراتیژیش ئەوەیە کە ئەمریکا وەك بریتانیای پێشوو لەسەر گۆڕەپانی جیهانیدا تاکە پاریزانێکی ڕاستینی جیهانییە، هێندەش ڕێکچوون کە سەران دەسوڕمێنن. بەلام، چەند جیاوازییەکی کرۆکیش لەنێوان بریتانیای ئەو کات و ئەمریکای ئێستەدا هەن. چوونکە بریتانیای کۆن لە کاتی هەوڵدانی بۆ پاراستنی پێگەی خۆی وەك مەزنترین هێز، بەرەنگاربوونەوە و ئەگەرە هەرە گەورەکەی ئابووری بوو نەك سیاسی، بەلام لە ئەمریکادا پێچەوانەکەی ڕاستە.

## کاریگەریی بریتانیا

لە جیهانی ئەمڕۆدا، زۆر زەحمەتە ئەگەر تەنیا وێنای مەزنیی ئیمپراتۆریەتی بریتانیش بکەین. چونکە ئەو ئیمپراتۆریەتە لە لوتکەی شکۆی خۆیدا چارەیەکی گۆی زەویی داپۆشیبوو و چارەیەکی ژمارەی دانیشتووانی سەرگۆی زەویشی لەخۆی گرتبوو. تۆڕی لەندەن لە موستەعمەرەکان و زەوی و بنکە و شوێنەکانی دیکەدا سەرتاپای گۆی زەویی داگرتبوو، ئیمپراتۆریەتەکەش بەهۆی دەریاوانیی پاشایەتییەوە دەپارێزرا کەوا لە مێژوودا مەزنترین هێزی دەریایی بوو. لە کاتی ئاهەنگێڕان بەبۆنەی یۆبیلی ئەلماسییەوە، نمایشی نزیکەی ١٦٥ کەشتی کرا کەوا چل هەزار دەریاوان و سێ هەزار تۆپهاوێژ لە بۆرتسمۆس، زەبەلاحترین گردبوونەوەی کەشتیگەلی دەریاوانیبوو لە مێژوودا[*].

بەدرێژایی چارەگە سەدەیەکی پێش ئەم بۆنەیە، ئیمپراتۆریەتەکە بەهۆی ١٧٠,٠٠٠ میلی دەریایی لە کێبلی درێژکراوە بەنێو زەریاکاندا ٦٦٢,٠٠٠ کێبلی هەوایی و داپۆشراوی ژێرزەوی هەبوو، کەشتییەکانی بریتانی پێشخستنی یەکەم تۆڕی پەیوەندیی جیهانییان بەهۆی تەلەگرافەوە ئاسان کرد. هەروەها هێڵەکانی شەمەندەفەر و کەناڵەکان (گرنگترینیان کەناڵی سوێس) بوون کە توانای بەردەوامی و پەیوەندیی سیستەمەکەی پتەوتر کرد. بەهۆی گشت ئەمانەوە، ئیمپراتۆریەتی بریتانی یەکەمین بازاڕی ڕاستینی جیهانی دامەزراند.

ئەمریکییەکان باس لە توانای بەکێشکردنی ڕۆشنبیری و هونەرەکانمان دەکەن، بەڵام هێزی نەرم لە سەدەی نۆزدەیەمەوە لەگەڵ بریتانیادا دەستیپێکرد. چونکە بەهۆی ئیمپراتۆریەتەکەوە، زمانی ئینگلیزی وەک زمانێکی جیهانی بڵاوبووبوەوە کەوا لە دوورگەکانی کاریبییەوە تا دەگاتە قاهیرە و لە کێپ تاونەوە

(*) ئەستەمە بە وردی خەملاندن بۆ ئەم ژمارەیە بکرێت، چونکە لێکۆڵەرەکان پێوەری جیاوازیان بەکارهێناوە (مارکێتەی هێزی کڕین، نرخی ئاڵوگۆڕی ساڵی ١٩٨٥، و هیدیکە).

تا دەکاتە کالکۆتا قسەی پێ دەکەن. ئەدەبی ئینگلیزی لە گشت شوێنێکدا بووە شتێکی باو؛ شەکسپیر و شارلۆک هۆڵمز و ئەلیس لە ولاتی سەیروسەمەرەدا، ڕۆژە خوێندنگەییەکانی تۆم براون و چیرۆك و کەسییەتییە بریتانییەکان لەهی هەر گەلێکی دیکە زیاتر بوونە بەشێکی ڕەگداکوتاوتری ڕۆشنبیریی نێو دەوڵەتی.

هەروەها بەهایەکانی ئینگلیزیش بە هەمانشێوە بڵاوبوونەوە. کلاودفیلیزی مێژوونووس جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا بریتانیا و ئیسپانیا دوو هێزی ئیمپراتۆریی زەمەنی خۆیان بوون و هەوڵیان دا هزر و دابونەریتەکانی خۆیان بۆ موستەعمەرانە خۆرئاواییەکان بگوازنەوە. ئیسپانیا دەیویست ریفۆرمی دژ بدۆزێتەوە (ئەویش بزووتنەوەیەکی ریفۆرمی بوو کەوا کڵێسای کاسۆلیکیی ڕۆمانی لە ساڵی ١٥٤٥دا لەپێناو ڕووبەڕووبوونەوەی زیادبوونی هێزی پرۆتستانتی لە ئەوروپا بەڕێوەی دەبرد) لە جیهانی نوێدا پێگەیەکی بۆ بدۆزێتەوە، بریتانیاش دەیویست فرە ئاینیی و سەرمایەداری گەشە بکەن. وەك دواتریش ڕوونبوویەوە، هزرەکانی بریتانی سەلماندی کەوا لە هزرەکانی ئیسپانی جیهانیترە. لە ڕاستیدا، جۆر و شێوەکانی کار و خۆشڕابواردنی هاوچەرخ بەهای یەکەم گەلی پیشەسازی – لە جیهاندا– لەخۆیدا ئاوێتە کردووە. لەوانەیە بریتانیا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا سەرکەوتووترین هەناردەکاری ڕۆشنبیرییەکەی بووبێت. لە ئێستەدا ئێمە باس لە خەونی ئەمریکی دەکەین، بەلام پێش ئەمە شێواز و نۆرمی ژیانکردنی ئینگلیزی هەبوو؛ نۆرمێك بوو بەدواداچوونی بۆ دەکرا و سەرسامییەکی مەزنی بۆ خۆی ڕاکێشابوو و لە گشت ناوچەکانی جیهانیشدا لاسایی دەکرایەوە، بۆنموونە: هزرەکانی گەمەی خاوێن و بەهایەکانی وەرزشی و ئارەزوومەندییەکان لەلایەن دکتۆر تۆماس ئارنۆلدی مامۆستای بەناوبانگ و بەڕێوەبەری خوێندنگەی ڕۆگبی (ئەو شوێنەی کەوا ڕووداوەکانی ڕۆمانی ڕۆژە

خوێندنگەییەکانی تۆم براونی تیابدا ڕووی دابوو) کاریگەرییەکی زۆری لە دی کوبێرتینی بارۆنی فەڕەنسی کردبوو کەوا لە ساڵی ١٨٩٦دا داهێنەری گەمە نوێیەکانی ئۆلۆمپییەکان بوو. لەبەر ئەم هۆیە، ئیان بوروما ی نووسەر بەشێوەیەکی گونجاو وەها وەسفی گەمەکانی ئۆلۆمپی کردبوو کە " بیرۆکەی خەیاڵییانەی گوندێکی ئینگلیزییە".

کۆی ئەمانە لە ساڵی ١٨٩٧دا دانی پێدا نەندرابوو، بەڵام زۆربەشیان وەها بوون. چوونکە بریتانییەکان تاکەکەس و وڵات نەبوون کە بەراوردی نێوان ئیمپراتۆرییەت و ڕۆمایان کردبوو، ڕۆژنامەی لوفیگارۆی فەڕەنسی ڕایگەیاندبوو کە خودی ڕۆما" هاوتا و هاوشانێکی بۆ پەیدابووە، ئەگەر نەڵێین پێشبیشی کەوتووە، ئەویش ئەو هێزەیە کەوا حکومی خەڵک دەکات و بەرژەوەندییەکانیان لە کەنەدا و ئوستورالیا و هیند و دەریایەکانی چین و میسر و نێوەڕاست و باشووری ئەفریقیا و لە زەریای ئەتڵەسی و دەریای نێوەڕاستدا بەڕێوەدەبات". تەنانەت ڕۆژنامەی کروز – زیتونگ لە بەرلین کەوا بەزۆری بیروبۆچوونەکانی دەستەبژێری ئەرستۆکراتی برۆسیی دژ بەئینگلیزی تیادا ڕەنگ دەداتەوە، ئیمپراتۆرییەکەی وەها وەسفکردبوو کەوا لە ڕووی کردارییەوە زۆر پتەوە. هەروەها لەپشت زەریای ئەتڵەسییەوە، نیویۆرک تایمز بە شێوەزارێکی زۆر بەگوڕوتاوەوە ئامارەی بەوە کردبوو کە:" ئێمە بەشێکین، بەشێکی گەورە، لە بریتانیای مەزن کەوا وەها پێدەچێ زۆر بە ئاسانی بۆ ئەوە هەڵبژێردرابێت هەژمون و دەستهەڵاتی بەسەر سەرتاپای گۆی زەویدا هەبێت".

## لێژبوونەوەی گرۆڵەی بریتانیا

پێگەی شکۆدارکراوی بریتانیا زۆر لەوە فشۆڵتر بوو کە خۆی پیشان دەدا و بانگەشەی دەکرد. چوونکە تەنیا دوای دوو ساڵ لە ئاهەنگی یۆبیلی ئەڵماسیدا، مەملەکەتی یەکگرتوو چووە نێو جەنگەوە، ئەویش جەنگێك بوو کەوا بەرای زۆربەی توێژەرانەوە ئەو ساتە بوو تیایدا هەژموونە جیهانییەکەی بەرەو داڕووخان و لێژبوونەوە دەستیپێکرد. لەندەن لەوە دڵنیابوو کە بەبێ هەوڵ و ئەقەلایەکی گەورە سەرکەوتن وەدەستدێنێ. ئەدی چۆن؟! لە کاتێکدا سوپای بریتانی ماوەیەکی کەمبوو کە لە جەنگێکی هاوشێوەدا لەگەڵ دەروێشەکان لە سوداندا سەرکەوتنی وەدەستهێنابوو، هەرچەندە ژمارەیان دوو هێندەی ئەوان بوو. چوونکە سوپای بریتانی لە جەنگی ئوم درماندا و تەنیا ٤٨ سەربازی خۆی لەدەست دا، بەڵام تەنیا لە ماوەی پێنج کاتژمێردا ٤٨.٠٠٠ جەنگاوەری لە ریزی دەروێشەکاندا کوشت و بریندارکرد. زۆرێك لە بریتانییەکان وەهایان زانی جەنگی دژ بە بۆرییەکانیش Boers – کە لە ڕەچەڵەکێکی هۆڵەندین و لە باشووری ئەفریقیادا دەژیەن– بەهەمانشێوەی جەنگی دەروێشەکان سانا دەبێت، یان بەپێی گوزارشتی یەکێك لە ئەندام پارلەمانەکان "ئەوە ئیمپراتۆرییەتی بریتانیە لە بەرانبەر ٣٠.٠٠٠ جووتیاردا".

بریتانیا بەهۆی چەند هۆیەکی بەڕووکەش ئەخلاقی جەنگەکەی هەڵگیرساند کە گوایە بەرگریکردنە لە مافەکانی دانیشتووانی باشووری ئەفریقیا کە بە زمانی ئینگلیزی قسەیان دەکرد و لە لایەن کۆچبەرە هۆڵەندییە دەستەلاتدارەکانەوە؛ بۆیرسەکانەوە – وشەی Boer بە هۆلەندی و ئەفریقی ولاتای جووتیار دەگەیەنێ– بەشێوەیەکی خراپ ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرا. بەڵام، لە هەمان کاتدا ئەوەش لە دەرەوەی ئاگایی لەندەن نەبوو کە باشووری ئەفریقیا لە ساڵی ١٨٨٦وە زێڕی لێ دۆزراوەتەوە و ڕێژەی چارەکە زێڕی هەموو جیهانی بەرهەم

دەهێنا. بەهەرحاڵ ئەفریکاییەکان هێرشێکی دەستپێشخەرانەیان ئەنجام دا و جەنگ لە ساڵی ١٨٩٩دا دەستیپێکرد.

هەر لە سەرەتاوە کاروبار و هەلومەرجەکان بۆ بریتانیا خراپ کەوتنەوە. ڕاستە کە بریتانیا پیاوێکی زۆرتر و چەکی باشتری هەبوو و باشترین جەنەڕاڵەکانی دەنارد (لەوانە لۆرد کیچینەری پاڵەوانی جەنگی ئوم دورمان)، بەڵام بۆیرسەکان لە بەرگریکردندا زۆر خۆڕاگر و توندبوون، خاکەکەشیان باش دەناسی، هەروەها لەلایەن دانیشتووانانی سپییپێستەوە پاڵپشتییەکی گەورەیان لێ دەکرا، تەکتیکی سەرکەوتووانەی جەنگی پارتیزانییان گرتەبەر کەوا پشتی بە جووڵەی ئەشسوورکانە و خێرایی دەبەست. کاتێکیش بریتانییەکان بینیان کە پێشکەوتوویە سەربازییە زەبەلاحەکەیان لە گۆڕەپاندا سوودێکی ئەوتۆیان پێنەبەخشین، سەرکردەکانیان پەنابردە بەر شێواز و ڕێگەی دڕندانە؛ گوندەکانیان سووتاند، خەڵکی سڤیلیان بەرەو سەربازگەکانی دەستگیرکردن برد (کە لە جیهاندا وێنەی نەبوو)، سەربازێکی بێشوماریان هێنایە سەر گۆڕەپانی جەنگ. لە کۆتاییدا، ٤٥٠.٠٠٠ سەربازی بریتانی لە باشووری ئەفریقیا دژی میلیشیایەك دەجەنگان کەوا ژمارەی جەنگاوەرانیان ٤٥.٠٠٠ بوو.

ڕاستە کە بۆیرسەکان نەیانتوانی بەیەکجاری بەرپەرچی بریتانییەکان بدەنەوە و لە ساڵی ١٩٠٢دا خۆیان ڕادەستکرد، بەڵام بریتانیا لە ڕوانگەیەکی فراوانترەوە جەنگەکەی دۆڕاند. ٤٥.٠٠٠ پیاوی کردە قوربانی، هەروەها نیو ملیار پاوەندی خەرجکرد، پانتایی بڵاوبوونەوەی سوپاکەی هێندە فراوانکرد کە هێندەی نەمابوو بەنەرلوی ڕووچاری کارەساتیان بکاتەوە، هەروەها دەستەوەستانییەکی گەورە و گەندەڵییەکی زەبەلاح لەو جەنگەدا ئاشکرابوو. جگە لەمانەش، ئەو تەکتیکە دڕندەییانەی کەوا لە جەنگەکەدا پێڕەوی کردن لەبەردەم هەموو

جیهاندا وێنەکەی ناشرین کرد. لە نیشتمانیشدا، کۆی ئەمانە بوونە هۆی ئاشکرابوون و پاشان دروستبوونی دووبەرەکی سەبارەت بە ڕۆڵی جیهانییانەی بریتانیا. لە دەرەوەشدا، گشت زلهێزەکانی دیکە- فەرەنسا، ئەڵمانیا، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا- دژی کردارەکانی لەندەن بوون، لۆرانس جیمسی مێژوونووس سەبارەت بە بریتانییەکانی ساڵی ١٩٠٢ نووسی ئەوان "" بەبێ هاوڕێ بوون".

ئێستە با بەخێرایی بێینەوە نێو ساتی ئێستە کە تیایدا زلهێزێکی زەبەلاح هەیە، لە ڕووی سەربازییەوە تێکناشکێ، لە ئەفغانستاندا سەرکەوتنێکی سانا وەدەستدێنێ، دواتر ڕوو لە شتێکی دیکە دەکات کە پێی وایە دژ بە ڕژێمی دابڕاوی سەدام حوسەین لە عێراق جەنگێکی دیکەی ئاسانە. دەرئەنجامەکەش ئەوەبوو کە سەرکەوتنی سەرەتا خێرابوو، بەڵام دواتر ململانێیەکی درێژ و تاڵ و پڕ لە هەڵەی سیاسی و سەربازیی بەدواداهات و ڕووبەڕووی دژایەتی و نارەزاییەکی توندی نێودەوڵەتی بوویەوە. بێگومان وێکچوونەکە ڕوونە: ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بریتانیایە و جەنگی عێراقیش جەنگی بویرسە؛ بەدرێژاییش پێدەچێ ئایندەی ئەمریکا غەمۆکانە بێت. ئەوجا بەبێ ڕەچاوکردنی دەرئەنجامەکە لە عێراق، تێچووی جەنگەکەش زۆر گران بوو. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا شەکەت بوو، سوپایەکەشی توانا و بڕستی لەبەر بڕا، وێنەکەیشی ناشرین بوو. هەروەها وڵاتانی ناحەزی وەك ئێران و فەنزوێلا و زلهێزەکانی وەك ڕووسیا و چین، لە ئێستەدا سوود لە سەرقاڵبوون و قەدەرە خراپەکەی واشنتۆن دەبینن. ئەمەیش هەمان بابەتە وێکچوو و بارەکەیە، واتا بابەتی داڕووخان و لێژبوونەوەی گرۆلەی ئیمپراتۆرییەتی بریتانی کە سەرلەنوێ خۆی بەدیاردەخاتەوە. واپێدەچی مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوە.

مەرجەندە ویکچوونەکان روونبن، بەلام بەراستی هەلومەرجەکان ویکناچبن. مێژوونووسان سەدان کتێبیان نووسیوە و ئەوە راڤە دەکەن کە ئەگەر لەندەن چەند سیاسەتێکی دیاریکراوی دەرەوەی پێرەو بکردبایە دەیتوانی قەدەری خۆی بگۆڕێ. هەندێکیان دەڵێن، تەنیا ئەگەر خۆی لە جەنگی بویرس بەدووربگرتبایە وەهای بەسەر نەدەهات. هەندێکی دیکەیان دەڵێن ئەگەر لە دەرەوەی ئەفریقیا بووایە وەهای لێ نەدەقەوما. بەلام نیال فریگیسون بەگاڵتە و لاقرتێیەوە دەڵێت ئەگەر بریتانیا بەشداریی لە جەنگی یەکەمی جیهانی نەکردبایە، ئەو قورەی بۆ نەدەگیرایەوە (ئەگەر بریتانیا بەشداریی نەکردبایە، لەوانەبوو جەنگی جیهانی رووی نەدابووایە)، لەوانەیە بیتوانیبایە پێگەی خۆی وەك گەورەترین هێز بپاراستبووایە. لە راستیدا، جۆرە راستییەك لەو لۆژیکە شیمانەییەدا هەیە(چوونکە جەنگی یەکەمی جیهانی بەراستی بریتانیای مایەپووچ و قەللۆش کرد)، بەلام بۆئەوەی شتەکان بخەینەوە سەر رەوتە دروستە مێژووییەکانی خۆیانەوە، لەسەرمان پێویستە لە چەند گۆشەیەکی جیاوازە لەو مێژووە بنوارین. سەیر نییە کە بریتانیا دووچاری دارمان و لێژبوونەوە بوویەوە، بەلکو ئەوەی سەیرە مانەوەی هەژموونەکەیەتی بەدرێژایی ئەو ماوەیە. هەروەها تێگەیشتن لەو رێگەیەی کەوا بەهۆیەوە بریتانیا گەمەی بە کارتەکانی بەردەستی کرد- کە لەگەڵ گوزەرکردنی کاتدا لاواز و بێهێز دەبوو- لەوانەیە بۆ تێشك خستنە سەر رێگەی داهاتوویی ئەمریکا یارمەتیدەرێك بێت.

## هەڵکشانە سەیر و دەگمەنەکەی هێزی بریتانی

بریتانیا بۆ ماوەی چەندان سەدە بە وڵاتێکی دەوڵەمەند مایەوە (لە زۆربەی ئەو قۆناغەشدا وەك مەزنترین هێز مایەوە)، بەلام لە هیچ نابوورییە لە ئەوروپا زیاتر نەیتوانی وەك مەزنترین هێز بمێنێتەوە. زۆربەی جار لە بەستنەوەی

لووتکەی مەزنایەتیی بریتانیا بە ڕووداوە گەورەکانی ئیمپراتۆریەت – وەك یۆبیلی ئەلماسی– هەڵە دەکەین کەوا بە نیشانەکانی هێز دادەندرا. بەڵام دەبێ بزانین کە باشترین ساڵەکانی بریتانیا ئەوانەی پێش ساڵی ۱۸۹۷ بوون. ترۆپکی مەزنایەتیی بریتانیا نزیکەی نەوەیەك بەر لەم مێژووە و لە ساڵی ١٨٤٥ تا ساڵی ۱۸۷۰ بوو. بریتانیا لەو کاتیدا زیاتر لە ۳۰٪ تێکڕای بەرهەمی جیهانیی بەرهەم دەهێنا. هەروەها بەکاربردنی وزەش لە لایەن بریتانیەوە نزیکەی ١٥٥ جار لە بەکاربردنی پرووسیا زۆرتر بوو. هەروەها بەرپرسی خمسی ئالوێری بازرگانیی جیهانی و دوو پێنجیەکی ئالوێرە پیشەسازییەکەی بوو. کۆی ئەم شتانەی لەدەستبوو و ژمارەی دانیشتووانیشی تەنیا ۲٪ی تێکڕای دانیشتووانی گۆی زەوی بوو!.

لە ساڵی ۱۸۲۰دا کاتێك ژمارەی دانیشتووان و کشتوکاڵ دوو هۆکاری دیاریکەر و سەرەکیی تێکڕای بەرهەمی نێوەخۆیی بوو؛ ئابووریی فەڕەنسا لە ئابووری بریتانیا گەورەتر بوو. لەگەڵ هاتنی حەفتایەکانی سەدەی نۆزدەیەمیشدا، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە زۆربەی پێوەرەکانی پیشەسازیدا لەگەڵ بریتانیا یەکسان بوو؛ دواتر لە سەرەتایەکانی دەیەی هەشتایەکاندا بەپێش بریتانیا کەوت، دواتریش ئەڵمانیا پاش پانزە ساڵ هەمان شتی کرد. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانیشدا، ئابووریی ئەمریکا دوو هێندەی ئابووریی بریتانیای لێ هاتبوو. هەروەها ئابووریی هەریەکە لە فەڕەنسا و ڕووسیاش لە ئابوورییەکەی گەورەتربوون. لە ساڵی ۱۸٦۰دا بریتانیا ٥٣٪ی ئاسنی جیهانی بەرهەمدەهێنا (لەو کاتیدا ئەمە ئاماژەیەك بوو بۆ هێزێکی زەبەلاحی پیشەسازی)، بەلام لە ساڵی ۱۹۱٤دا کەمتر لە ۱۰٪ی بەرهەمهێنا.

چەندان ڕێگەی پێوانی هێز هەن. لەندەن لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە ڕووی سیاسییەوە هێشتا پایتەختی جیهان بوو. چوونکە لەو ماوەیەدا فەرمانەکانی لەندەن لەگشت شوێنەکانی جیهاندا – تەنیا ئەورووپا نەبێت- بالآبوو. هەروەها نەدەکرا کەس دژی بڕیارەکانی بوەستێتەوە یان لە زۆربەی دۆخەکاندا نارەزایی دەربڕێ. بریتانیا لە قۆناغێکدا ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی پێکهێنابوو کە پێش سەرهەڵدانی هێزی نەتەوەیی بوو، لەبەرئەوە بەرزەفتکردنی شوێنە دوور و لەیەك دوورەکان و پاراستنی ئەو هەژموون و کۆنترۆڵە نەگەرەیەکی کەمی دەهاتە بەردەم. هەروەها هیچ هێزێکی هاوتای هێزە دەریاییەکەی نەبوو و بۆ ماوەی زیاتر لە سەد ساڵ هەر بەو جۆرە مایەوە. بریتانیا بەهۆی درێژبوونەوە ئیمپراتۆرییەکەی، لەسەر کەرتی بانکی و گواستنەوەی کالآ و دابینکردن و وەبەرهێنانەکان لە جیهاندا هەر بە هەژموونداری مایەوە. لەندەنیش هێشتا هەر مەڵبەندی بەڕێوەبردنی ئابووری جیهانی بوو و هێشتا هەر پاوەند دراوێکی یەدەگی جیهانی بوو. هەتاکو ساڵی ١٩١٤ ئەو قەبارە سەرمایەیەی کەوا بریتانیا لە دەرەوە وەبەرهێنانی پێ کردبوو، دوو هێندەی ئەو سەرمایەیە بوو کەوا فەرەنسا وەبەرهێنانی پێ کردبوو، هەروەها پێنج هێندەی سەرمایەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بوو. داهاتەکانی ئەو وەبەرهێنانانە و کاری دیکەی شاراوەی بازرگانی، بەشداریییەکی ڕۆڵی لە پەردەپۆشکردنی داڕووخان و لێژبوونەوەی بریتانیادا کردبوو.

بەڵام لە ڕاستیدا ئابووریی بریتانی دادەبەزی. لەو ڕۆژگارانەدا، پیشەسازی و دروستکردن بەرپرسی زۆربەی ئابووریی نەتەوەیی بوو، هەروەها ئەو کالآیانەی کەوا بریتانیا بەرهەمی دەهێنان زیاتر ڕابردوویان دەنواند نەك ئاینده. لە ساڵی١٩٠٧دا بریتانیا چوار هێندەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا پایسکیلی

بەرهەمهێنا. بەڵام ئەمریکا دوانزە هێندە ژمارەی ئەو ئۆتومبێلانەی بەرهەمهێنا کەوا بریتانیا بەرهەمی دەهێنان. هەروەها بۆشاییەکە لە پیشەسازیی کیمیایی و بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی زانستی و چەندان بواری دیکەدا بەباشی دەبینرا. بەشێوەیەکی گشتی، ڕێژەی گەشەکردنی بریتانی لە ٢.٦ ٪ لە ترۆپکی هێزی خۆیدا دابەزی و بووە ١.٩ ٪. لەگەڵ هاتنی ساڵی ١٨٨٥یش لە دابەزین بەردەوام بوو. بەڵام ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا و ئەڵمانیا بە ڕێژەی ٥٪ گەشەیان دەکرد. بەمشێوەیە، دوای ئەوەی بریتانیا یەکەمین شۆڕشی پیشەسازی دەستپێکرد، بەڵام ئیدی وەك جاران ئەو کارامەییەی نەبوو کە توانای پێ ببەخشێت بەرەو دووەم شۆڕشی پیشەسازیی ببات.

کەسانی پسپۆڕ کەمێك دوای دەستپێکردنی لێژبوونەوەی بریتانیا تاوتوێی هۆیەکانی ئەو لێژبوونەوەیان کرد. هەندێکیان جەختیان لەسەر هۆکارەکانی جیۆسیاسی کردەوە، هەندێکی دیکەشیان جەختیان لەسەر هۆکارە ئابوورییەکان کردەوە، وەك کەمیی وەبەرهێنان لە دروستکردنی کارگە و ئامرازی نوێ و خراپیی پەیوەندییەکانی کار و نەبوونی کارامەییەکانی بازاڕدۆزی. هەروەها ئەوەشیان بۆ ڕوونبوویەوە کە سەرمایەدارانی بریتانی چەقبەستوو و مۆدێل کۆنە. چوونکە پیشەسازییەکانی بریتانی وەك پرۆژەی قەبارە بچووك لەگەڵ پیشەکارە کارامەکان دادەمەزرا نەك وەك کارگەی گەورە و ڕێکخراوی وەك ئەوانەی کەوا لە ئەڵمانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتوودا دامەزران. چەند ئاماژەیەکیش بۆ هەبوونی گرفتی گەورەتری ڕۆشنبیری و کەلتووریش دەکرا. چوونکە بریتانیای دەوڵەمەند ئیدی وەك جاران گرنگی بە ئەندازیاری و پەروەردەی کردەیی نەدەدا و مادەی زانست و جوگرافیای پشتگوێ خست و گرنگی بە ئەدەب و فەلسەفە دەدا. هۆی ئەمەیش بۆ چینی ئەرستۆکراتیی خاوەنزەوی دەگەڕێتەوە کەوا سۆزگی

دەربەگانەی جڤاکی بریتانیایان دەپاراست. چوونکە ئەو دەستەبژێرە ڕقی لە پیشەسازی و تەکنۆلۆژیا دەبوویەوە بە ئاستێك کە پیشەسازە سەرکەوتووەکان خۆیان لە دیمەن و قیافەی ئەرستۆکراتییەکاندا پیشان دەدا- خانووی لادێییانە و ئەسپ- هەروەها هەر شوێنەوارێکیان دەشاردەوە کەوا ئاماژە بە سەرچاوەی دارایییەکانیان بکات. لەجیات ئەوەی منداڵەکانیان کیمیا و ئەندازەی کارەبایی بخوێنن، لە هەردوو زانکۆی ئۆکسفۆرد و کامبرێدج کاتەکانی خۆیان لە لووشدانی مێژوو و ئەدەبی کۆنی ڕۆمانی و گریکی بەسەر دەبرد.

لەوانەیە هیچ یەکێك لەم کەموکورتییانە شتی گەوهەری و کرۆکی نەبووبن، چوونکە پۆل کنیدی دەڵێت:" هەژموونی بریتانیا لە سەدەی نۆزدەیەمدا دەرئەنجامی زنجیرەیەك هەلومەرجی نائاسایی بوو. جا بە لەبەرچاوگرتنی هۆکارەکانی هێزی وەك جوگرافیا و ژمارەی دانیشتووان و سامانەکانی سروشتی، ئەوا بریتانیا دەیتوانی پێشبینیی وەدیهێنانی ۳ بۆ ٤٪ تێکرای بەرهەمی جیهانی بکات، بەڵام پشکەکەی بۆ دە هێندەی ئەم ژمارەیە بەرزبوویەوە". لەبەر ئەم هۆیە، کاتێك ئەو هەلومەرجانە بەرەو نەمان چوون! هەروەها کاتێك وڵاتانی دیکەی خۆرئاوایی دەگەیشتنە کاروانی دروستکردن و پیشەسازی، هەروەها کاتێك ئەڵمانیا بووە یەك و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاش دابەشبوونی خۆی بۆ باکوور و باشوور چارەسەرکرد، هەردەبوایە بریتانیا لێژبێتەوە. لیۆ ئەمیری پیاوی دەوڵەتی بریتانی لە ساڵی ۱۹۰٥ وە ئەم وێنەیەی زۆر بەڕوونی بینیبوو، ناوبراو دەپرسێ: چۆن ئەم دوورگە بچووکانە دەتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەردەم چەند دەوڵەتێکی وەك ویلایەتەکانی یەکگرتوو و ئەڵمانیا خۆیان ڕابگرن کەوا بە هەنگاوی خێرا دەڕۆن بۆ ئەوەی ببنە ئیمپراتۆریای مەزن و دەوڵەمەند؟ چۆن ئێمە دەتوانین بە چل ملیۆن مرۆڤ کێبڕکێ لەگەڵ چەند

ولاّتێکدا بکەین کەوا قەبارەیان نزیکەی دوو هێندەی قەبارەی ئێمە دەبێت؟"

ئەم پرسیارە لە ئێستەدا لە لایەن زۆرێک لە ئەمریکییەکانەوە سەبارەت بە ڕووبەڕووبوونەوەکەی ئەمریکا لەهەمبەر هەڵکشان و گەشەکردنی چیندا دەکرێت.

## سیاسەتێکی باش، ئابوورییەکی خراپ

بریتانیا لەوەدا سەرکەوتنی وەدەستهێنا کەوا بۆ ماوەی چەند دەیەیەک لە دوای نەمانی هەژموونی ئابوورییەکەی، پێگەی خۆی وەک یەکەمین زلهێزی جیهان بپارێزێ. ئەمەیش بەهۆی ڕوانگەیەکی دانایانەی ستراتیژی و دیبلۆماسییەتێکی باشەوە بوو. کاتێک لەندەن بینی کە تەرازووی هێز گۆڕانی بەسەردا دێت، پێشوەخت بڕیارێکی هەستیاری ستراتیژی دا کەوا یارمەتیدەری بوو بۆ ئەوەی ماوەی چەند دەیەیەک تەمەنی هەژموونی خۆی درێژ بکاتەوە: ئەوەی هەڵبژارد کە لەجیات ئەوەی ململانێ لەگەڵ ئەمریکادا بکات، خۆی لەگەڵ هەڵکشانەکەی بگونجێنێ. بەمشێوەیە، لە ماوەی چەند دەیەیەکی کەمی دوای ساڵی ١٨٨٠، لەندەن لە مەسەلە دوای مەسەلە لەبەردەم واشنتۆنی متمانەبەخۆ و گەشەسەندوو وردە وردە سازشی کرد. بێگومان، بۆ بریتانیا ئاسان نەبوو لەو موستەعمەراتانەدا دەستبەرداری هەژموونی خۆی بێت کەوا لەپێناویاندا دوو جەنگی بەڕێوەبرد (جەنگی شۆڕشگێڕی و جەنگی ١٨١٢)، هەروەها لەگەڵ جوداخوازانیشدا لە جەنگە نێوخۆییەکەیدا هاوسۆزیی نواند. لە کۆتاییشدا بریتانیا بۆ بەرژەوەندیی موستەعمەراتەکانی پێشووی، بەتەواوی سازشی لە

نیوە خۆرئاواییەکەی گۆی زەوی کرد، هەرچەندە لەوێدا بەرژەوەندیی زۆر گەورەی هەبوو*.

بیرۆکە ستراتیژییەکە بەراستی دەرەوشاوە و بەرز بوو. چوونکە ئەگەر بهاتبایە بریتانیا دژ بە هەڵکشانی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بوەستابایەوە- جگە لە گشت پابەندییەکانی دیکەی- ئەوا گشت دارایی و سامانی خۆی لەدەست دەدا. لەگەڵ ئەو هەموو هەڵەیەی کەوا لە ماوەی نیوەی سەدەی دواتردا کردی، ئەوا ئامانج لە ستراتیژەکەی لەندەن سەبارەت بە واشنتۆن- ستراتیژێك بوو کەوا گشت حکومەتەکانی بریتانیا هەر لە دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا پێوەی پابەندبوون- کۆکردنەوەی هێزی خۆی بوو لەسەر بەرە هەستیارەکانی دیکە. لە ئەنجامی ئەمەیشدا، سەروەری و سەرداریی خۆی لەسەر دەریایەکاندا پاراست و بەهۆی پێنج کلیلەوە هەژموونی بەسەر ڕێڕەو و ڕەوتە ئاوابیەکان هێشتەوە کە زۆرجار دەگوترێ ئەم پێنج کلیلە جیهان دادەخەن، ئەوانیش: سەنگافوورە، کیبی ئەفریقی، ئەسکەندەرییە، گەرووی جەبەل تاریق، گەرووی دوفر.

بریتانیا کۆنترۆڵە ئیمپراتۆرییەکەی و هەژموونە جیهانییەکەی – لەگەڵ هەبوونی بەرهەڵستییەکی بەرێژە کەم- بۆ ماوەی چەندان دەیە پاراست. چوونکە لە بەکالاکردنەوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، بریتانیا زیاتر لە ۱.۸ ملیۆن میلی چوارگۆشە زەوی و ۱۲ ملیۆن ملکەچی نوێی بۆخۆی برد کە زۆربەیان لە خۆرهەڵاتی نێوەڕاستدا بوون. لەگەڵ ئەمەیشدا، بۆشایی نێوان ڕۆڵە سیاسییەکەی و توانایە ئابوورییەکەی لە گەورەبوون و فراوانبوونی بەردەوامدا

*ئامانیل ڕیچمی موزدەهێن (مبطس) کەوا لە سەدەی شانزەیەمدا کانزایەرەکانی بۆ ئیمپراتۆری چینی هێنا.

بوو. چوونكە لەو كاتەى ئيمپراتۆرييەكەى لە پێشوودا سەرچاوەى قازانج بوو، بەلأم لە سەدەى بيستەمدا بووە بارێكى زۆرگران بەسەر خەزێنەى بريتانياوە. هەروەها ئەو كاتە بۆ نەريتى نرخ گران گونجاو نەبوو. لەبەرئەوەى ئەو كات ئابوورى بريتانيا لە پاشەكشەدا بوو و جەنگى يەكەمى جيهانيش زياتر لە ٤٠ مليار دۆلارى تێچووبوو، هەروەها قەرزەكانى بريتانيا — كە رۆژگارێك قەرزدەرى سەرەكى بوو— گەيشتە ١٣٦٪ تێكڕاى بەرهەمى نێوەخۆيى. هەروەها بەرزبوونەوەى قەرزى حكومەت بۆ دە هێندە واتا نۆرە و جارەكانى (دفعات) سوود، لەگەڵ هاتنى نيوەى دەيەى دووەمى سەدەى بيستەمدا، نيوەى خەزێنەكە بۆ خۆى رادەكێشێ. بريتانيا ويستى لە ئاستە سەربازييەكەى جارانى خۆى بمێنێتەوە، بۆيێ دواى جەنگى يەكەمى جيهانى كەشتيگەلى ئەڵمانياى بە نرخى هەرزان كڕى، هەروەها بۆماوەيەكى كورت پێگەى خۆى وەك گەورەترين هێزى دەريايى پاراست. بەلأم لەگەڵ هاتنى ساڵى ١٩٣٦ خەرجيى بەرگرى ئەڵمانيا سێ هێندەى خەرجيى بريتانيا زيادى كرد. هەر لە هەمان ئەو ساڵەشدا كە تيايدا ئيتاڵيا هێرشى كردە سەر ئەسيوبيا، مۆسۆلينيش ٥٠،٠٠٠ سەربازى لە ليبيا دانا، ژمارەى سەربازانى مۆسۆلينيش دە هێندەى ژمارەى ئەو سەربازە بريتانيانە بوو كەوا كەناڵى سوێسيان دەپاراست. ئەم هەلومەرجانە و هەروەها يادەوەرييەكانى جەنگى جيهانى كەوا بووە هۆى كوشتنى ٧٠٠،٠٠٠ بريتانى، وەهاى لە حكومەتەكانى بريتانيا كرد لە دەيەى سييەكاندا نيازە پاكەكانيان پێ باشتر بێت و بەوە رازيبن خۆيان لە پێكدادان لەگەڵ هێزە فاشييەكە بەدووربگرن.

لێرەدا گرفتەكانى دارايى كاريگەرييان لە ستراتيژييەكان كرد، باشترين نموونەش بۆ ئەمە بڕيارى گۆڕينى سەنگافوورە بوو بۆ بنكەيەكى زەبەلاحى دەريايى.

بریتانیا سەنگافوورەی– جەبەل تاریقی خۆرهەلاتی– بە قورگی شووشە ستراتیژییەکەی نێوان هیند و زەریای هێمن دەزانی، لەبەرئەوەی دەتوانێ جوولەکردنی یابان بەرەو خۆرئاوا بوەستێنێ. (بریتانیا بڕاوی پاراستنی هاوپەیمانییەکەی لەگەڵ تۆکیودا هەبوو– زۆرێك لە ئەرمی– بەلام ویلایەتەکانی یەکگرتوو و ئوسترالیا رەتیان کردەوە). ستراتیژەکە شتێکی لۆژیکی بوو، بەلام بریتانیا لەبەر دۆخە ناسەقامگیرە داراییەکەی، پارەی پێویستی نەبوو بۆ ئەوەی گوژمەی بۆ تەرخان بکات. چوونکە حەوزەکانی پڕچەککردنی کەشتییەکان زۆر بچووك بوون و جێگەی ئەو کەشتیگەلانەی تیادا نەدەبوومەوە کەوا بتوانن ڕووبەڕووی یابانییەکان ببنەوە، هەروەها سووتەمەنیش بەپێی پێویست نەبوو، خۆ قایمکردنەکانی بواری بەرگریش زۆر سادە بوون. لەبەر ئەم هۆیانە، کاتێك هێرشی یابانی دەستپێکرد، سەنگافووره لە ماوەی یەك هەفتەدا کەوت.

دواتر جەنگی دووەمی جیهانی هەلگیرسا بۆ ئەوەی دوا بزمار لە تابووتی هێزی ئابووری بریتانی بدات (لە سالی ۱۹٤٥دا تێکرای بەرهەمی نێوەخۆیی ویلایەتەکانی یەکگرتوو دە هێندەی تێکرای بەرهەمی بریتانی بوو). بەلام، تەنانەت لەو کاتیشدا بریتانیا بەشێوەیەکی کاریگەری ئەوتۆ مایەوە کەوا ببووە جێگەی سەرسوڕمان، بەلای کەمەوە بەشێوەیەکی بەشەکی بەهۆی وزەی دەرهاوێشتە و ئەو بەرتەماییانەوە بوو کەوا وینستۆن چەرچل پێی دەناسرایەوە. کاتێك ئەوە ڕەچاو دەکەیت کەوا ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا زۆربەی تێچووە ئابوورییەکانی هاوپەیمانانی دەدا و پووسپاش بەرگەی زۆربەی هێزەکانی دەگرت، ئەوا مەسەلەکە ویستێکی دەگمەنی لە بریتانیا دەخواست کە هەر بە یەکێك لەو سێ زلهێزە بمێنێتەوە کەوا لە دوای جەنگدا چارەنووسی جیهانیان دیاری کرد. لە ڕاستیدا وێنەی ڕۆزفلت و ستالین و چەرچل لە کۆنگرەی

یاڵتا لە شوباتی ساڵی ١٩٤٥دا کەمێك سەرلێشێوێنەرە، چوونکە سێ زلهێز نەبوون بەڵکو دوو هێزی مەزن هەبوون لەگەڵ سەرکێشێکی سیاسیدا کەوا توانی خۆی و وڵاتەکەی لە گەمەگەدا بهێڵێتەوە، هەروەها بەهۆی ئەوەوە بریتانیا بۆ ماوەیەکی زۆری نێو سەدەی بیست زۆرێك لە رەگەزەکانی زلهێزییەکەی خۆی بهێڵێتەوە.

بەڵام بێگومان ئەمە بەبێ نرخ و بەخۆڕایی نەبوو؛ چوونکە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە بەرانبەر ئەو قەرزەی کەوا بەخشییە لەندەن، لە دوورگەی کاریبی و کەنەدا و زەریای هیندی و زەریای هێمندا دەستی بەسەر دەیان بنکەی بریتانیادا گرت. سەبارەت بەم پرسە یەکێك لە ئەندام پارلەمانەکانی ئەوکات گوتوویەتی:" با ئیمپراتۆریەتی بریتانی بدرێتە قەرزدەرێکی ئەمریکی؛ تاکە هیوامان".لەو کاتەی کە جۆن مینارد کینیزی زانای ئابووریزان زیاتر ڕق و قینی هەڵسابوو کاتێك وەسفی یاسای Lend-Leas Actی کردبوو و گوتبووی کە هەوڵێکە بۆ دەرهێنانی هەردوو چاوی ئیمپراتۆرییەتی بریتانی. بەڵام ئەو چاودێرانەی کەوا لایەنی سۆزییان کەمتر بوو بە مەسەلەیەکی بێ چەندوچۆنیان دانابوو کە هەردەبێ بکرێ. ئارنۆڵد توینبیی مێژوونووس – کە ئەوکات ببووە مێژوونووسێکی بەناوبانگ– وەها دڵی ئەمریکییەکانی دابوویەوە بەوەی کە " دەستی ئەمریکا لە دەستی ڕووسیا و ئەڵمانیا و یابان زۆر نەرمتر و میهرەبانترە، پێم وایە کە ئەمە بژارە بەردەسەکانە".

خاڵی کرۆکی ئەوە بوو کە بریتانیا وەك هێزێکی مەزن بەهۆی کارکردە خراپە سیاسییەکەیەوە دانەڕووخا، بەڵکو بەهۆی بەڕێوەبردنێکی خراپی ئابوورییەوە بوو. چوونکە هەژموونێکی مەزنی جیهانیی هەبوو، بەڵام ئابوورییەکەی لە ڕووی بونیادییەوە لاواز بوو. هەروەها پەنابردنی بۆ چارەسەری نادڵنیایانە مەسەلەکەی

زیاتر نێك دا؛ ئەو لەسەر پێوەری زێڕ پایەدار و جێگیر نەبوو، هەروەها فەرمانە (رسوومات)ی ئیمپراتۆریی سەپاند و بەهۆی جەنگەوە کەوتە ژێر باری قەرزی گەورە. دوای جەنگی دووەمی جیهانیش، بەرنامەیەکی ئابووریی سۆسیالیزمییانەی گرتەبەر – پلانی بیفبریدج– هەروەها کۆتوبەندی توندوتیژ و زەحمەتی خستە سەر بەشە فراوانەکانی ئابووری، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی کە رۆڵەکە لە شێستەکان و حەفتایەکاندا بکەوێتە نێو لێژی چەقبەستنەوە (الركود)، تا ئەو کاتەی کەوا مارگرێت تاتشەر لە هەشتایەکاندا بارمەتیی بووژانەوەی ئابووریی بریتانیای دا.

بەکورتی، بریتانیا بە کارلەبییەکی سەرنجڕاکێشی سیاسی و سەرسامکار گەمەی بە کارتە بێهێزەکانی سیاسی کرد، هەرچەندە پێگە ڕێژەییە ئابوورییەکەی ماوەی حەفتا ساڵ لە لێژبوونەوەدا بوو. ئەم مێژووەش وانەی زۆر گرنگ دەداتە ویلایەتەکانی یەکگرتوو.

## پێشەنگبوونی ئەمریکا لە دوورمەودادا

بەڵام، زۆر پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە شەقڵی سەرەکیی لێژبوونەوەی بریتانیا– داڕووخانێکی ئابووریی کە هەرگیز نەدەکرا چارەسەر بکرێ– لەمڕۆدا بەسەر ویلایەتەکانی یەکگرتوودا پیادە نابێت. چوونکە پێشەنگبوونی ئابوورییانەی بریتانیا تەنیا چەند دەیەیەکی خایاند، بەڵام پێشەنگیی ئەمریکا زیاتر لە ۱۳۰ ساڵی خایاند. چوونکە ئابووریی ئەمریکا لە نیوەی هەشتایەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە پێگە و پلەی مەزنترین ئابووریی جیهان داگیر دەکات، ئێستاکەش و هەتا ئەمڕۆگارەش هەر لە هەمان پێگەی جاراندایە. هەروەها ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەوکاتییەوە لە تێکڕای بەرهەمی جیهانیدا پشکێکی

جێگیر و نەگۆڕی پاراستووە، ئەمەیش مەسەلەیەکە و جێگەی سەرسوڕمانە. چوونکە بە دەرهاوێشتنی کۆتاییەکانی چلەکان و پەنجایەکان- کاتێك وڵاتانی دیکەی پیشەسازی وێرانبوون و پشکی ئەمریکا بۆ ٥٠٪ بەرزبوویەوە- ویلایەتەکانی یەکگرتوو بۆ زیاتر لە سەدەیەك بەرپرسی چاریەکێکی بەرهەمی جیهانی بوو (٣٢٪ لە ساڵی ١٩١٣ و ٢٦٪ لە ساڵی ٢٠٠٧)*. شتێکی ڕێتێچووە کە ڕێژەکە لە هەردوو دەیەی داهاتوودا دابەزێت بەڵام بە پلەیەکی زۆر نا. چوونکە زۆربەی مەزەندەکان ئاماژە بەوە دەکەن قەبارەی ئابووریی ئەمریکی لە ساڵی ٢٠٢٥دا یەکسان دەبێت بە دوو هێندەی قەبارەی ئابووریی چین سەبارەت بە بەهای تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی لە بازاڕی nominal GDP (بەڵام بۆشاییەکە لە هەمبەر ڕێژەی هێزی کڕین بچووکتر دەبێتەوە).

دەکرێ تێبینیی جیاوازیی نێوان ئەمریکا و بریتانیا بکەین لە باری گوژمە سەربازییەکانیانەوە. بریتانیا هەژموون و کۆنتڕۆڵی بەسەر دەریاکاندا بڵاوکردبوویەوە؛ بەڵام لەسەر زەوی نا. چوونکە سوپای بریتانی هێندە بچووك بوو کە ئۆتۆ فۆن بسمارکی ڕاوێژکاری ئەڵمانی جارێك بە گاڵتەوە گوتبووی ئەگەر بریتانییەکان هێرش بکەنە سەر ئەڵمانیا، زۆر بەسانایی داوا لە پۆلیس دەکرێت دەستگیریان بکات. بەڵام ئەو پێشەنگایەتییە دەریاییە بریتانییە- قەبارەی هێزی دەریاوانی لە دووەم و سێیەم هێزی گەورەترین دوو سوپای دەریایی

---

*) ئەم ژمارانە پشت بە تێکڕاییەکانی خەرجکردنی دراو دەبەستن لە بازاڕدا، بەبێ ئەوەی پێوەرەکانی بژێوی هەژمار بکرێن. بەڵام سەبارەت بە هاوکێشەی بەهای کڕین ژمارەکان بەمشێوەیەن: ١٩٪ لە ساڵی ١٩١٣، ٢٧٪ لە ساڵی ١٩٥٠، ٢٢٪ لە ساڵی ١٩٧٣ و ٢٢٪ لە ساڵی ١٩٩٨دا، ١٩٪ لە ساڵی ٢٠٠٧دا. ئەم ژمارانەش ئاماژە بە هەمان نموونە دەکەن کە ئەویش سەقامگیربوونی هێزی ئابووریی ئەمریکییە لەسەر ڕێژەی ٢٠٪ی تێکڕای بەرهەمی جیهانی.

جیهان بەیەکەوە گەورەتر بوو- لەسەر حیسابی گەنجینەکەی بوو کەوا بەشێوەیەکی ترازیدی دووچاری لەبەرڕاڵیشتن (استنزاف) و بەفیڕۆدان کرابوو. بەڵام سوپای ئەمریکا- لە بەرانبەردا- لە گشت ئاستەکاندا کۆنترۆڵی تەواوی هەیە- دەریا و زەوی و ئاسمان و خۆزا- لە هەر چواردە دەوڵەتەکە بەیەکەوە زیاتر خەرج دەکات، چوونکە بەرپرسی زیاتر لە ٥٠٪ خەرجیی سەربازیی جیهانییە. هەندێك کەس وەها دەمەتەقێ دەکەن کە گوایە ئەم پێوەرەش لە بەرانبەر وڵاتانی دیکەی جیهاندا لە بەهای لەپێشدانەوە و پێشەنگایەتی و پێشکەوتنی سەربازیی ئەمریکی کەم دەکاتەوە، چوونکە ئەم پێوەرە بردنەوە و لەپێشدانەوە زانستی و تەکنۆلۆژییەکەی ڕەچاو نەکردووە. ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە توێژینەوەکانی بەرگری و پێشخستندا گوژمەیەکی وەها خەرج دەکات کە زۆر زۆرترە لە گوژمەی گشت وڵاتانی دیکەی جیهان بەیەکەوە. زۆر گرنگە لێرەدا ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە ئەم خەرجییە زەبەلاحەی هەبووە بەبێ ئەوەی دووچاری مایەپووچبوون و قەڵلاچۆشی ببێت. خەرجیی بەرگریی لەم ڕۆژگارەدا ٤.١٪ تێکڕای بەرهەمی نێوخۆییە، واتا زۆر کەمترە لە ڕێژەی قۆناغەکانی جەنگی سارد. (لە سەردەمی دەسەڵاتی ئایزنهاوەردا، بۆ ١٠٪ی تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی بەرزبوویەوە). نهێنییەکەش لە ڕێگەی بزێوتدایە، چوونکە کاتێك قەبارەی تێکڕای بەرهەمی نێوەخۆیی ئەمریکی زیاتر و زیاتر گەورە دەبێت، خەرجییەکان - ئەوانەی کە پشتیان دەشکاند ئەگەر هاتبا و هەلومەرجەکان جیاوازبووان- کەمن یان دەکرێ بەرگەیان بگیرێ، بۆنموونە: لەوانەیە جەنگی عێراق پرۆژەیەکی بێزار و بیارچاکانە یانیش کارەسات بێت- ئەمە بەندە بە ڕوانگەی تۆوە- بەڵام لە هەردوو بڕخدا ویلایەتەکانی یەکگرتوو مایەپووچ نابێت. ڕاستە کە خەرجیی جەنگ زۆر گرانە، بەڵام تێچووەکەی لە ئەفغانستان و عێراق بەیەکەوە - ١٢٥ ملیار دۆلارە لە ساڵێکدا- ئەمەیش لە ١٪

تێکڕای بەرهەمی نێوخۆیی ویلایەتەکانی یەکگرتوو کەمترە. بەڵام خەرجیی جەنگی ڤێتنام لە ساڵی ١٩٧٠دا ١,٦٪ی تێکڕای بەرهەمی ئەمریکی بوو و زیاتر لە دەیان هەزار سەربازی ئەمریکی لەو جەنگەدا گیانیان لەدەست دا.

توانای سەربازییانەی ئەمریکی هۆی بەهێزیی ویلایەتەکانی یەکگرتوو نییە، بەڵکو دەرئەنجامیەتی. هۆیەکەش بریتییە لە بنکەی ئابووری و تەکنۆلۆژیی ویلایەتەکانی یەکگرتوو کە هێشتا هێزێکی زەبەلاحی هەیە. بێگومان ویلایەتەکانی یەکگرتوو ڕووبەڕووی بەرەنگاری و گرفتی گەورەتر و قووڵتر و فراوانتری وەها دەبێتەوە کە زۆر لەوانەی ڕابردووی گەورەترن، هەروەها گومانیشی تیادا نییە کە سەرهەڵدان و پەیدابوونی (ئەوانی دیکە) واتای ئەوەیە کە ئەمریکا لە تێکڕای بەرهەمی جیهانیدا پشکی کەم دەبێتەوە، بەڵام ئەمە هەرگیز بە لێژبوونەوەکەی بریتانیای سەدەی بیستەم ناچێت، کاتێک ئەوەی کۆتایی ڕێبەرایەتیکردنی داهێنان و وزە و پیشەسازی لەدەست دا. ئابووریی ئەمریکی هەر بە زیندوویی و دینامیبەتەوە دەمێنێتەوە، هەروەها ویلایەتەکانی یەکگرتوو هەر بە پێشەنگی شۆڕشەکانی داهاتووی زانست و تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی دەمێنێتەوە مادام دەتوانێ ئەو تەگەرە و بەرەنگارییانە لەخۆ بگرێت و لەگەڵیان بگونجێت کەوا ڕووبەڕووی دەبنەوە.

### ئایندە لێرەیە

کاتێک هەوڵ دەدەم ڕاڤەی ئەوە بکەم کە ئەمریکا لە جیهانی نوێدا بەچ شێوەیەک چارەسازی بۆ پرس و کاروبارەکانی خۆی دەکات، هەندێکجار دەڵێم: "تەماشای چوار دەوری خۆتان بکەن". ئایندە پێشوەخت لێرەیە. جیهانگەرایی لە ماوەی بیست ساڵی ڕابردوودا فراوانی وقووڵییەکی زۆری بەخۆیەوە بینی. چوونکە

ولاتانی بەرهەمهێنی كالاَ ژمارەیان زۆرتر بووە، هەروەها تەكنۆلۆژیای پەیوەندییەكان مامەڵەكان ساناتر دەكەن، سەرمایەكان لە جوولەكردن بە گشت شوێنەكانی جیهاندا ئازادن. هەروەها ویلایەتەكانی یەكگرتوو بەشێوەیەكی زۆر گەورە سوودی لەو پێشكەوتنانە بینیوە. چوونكە ویلایەتەكانی یەكگرتوو بەهۆی وەبەرهێنانەكانەوە سەدان ملیۆن دۆلاری پێكەیشتووە؛ ئەمەیش بۆ ولاتێك شتێكی دەگمەنە كە سەرمایەیەكی گەورەی تایبەت بەخۆی هەیە. كومپانیاییەكانی بەسەركەوتنێكی گەورەوە چوونەتە نێو چەندان ولاَت و پیشەسازیی نوێ. هەروەها تەكنۆلۆژیا و مامەڵەی نوێی بەكارهێناوە، كۆی ئەمانەیش لەپێناو زیادكردنی قازانجەكانی بووە، هەروەها هەرچەندە بەهای دۆلار لە دوو دەیەی رابردوودا بەرزبوونەوەی بەخۆیەوە بینیوە، بەلاَم هەناردەكانی ئەمریكی هەر بە خۆراگری ماونەتەوە.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە كە تێكڕای گەشەكردن لە تێكڕای بەرهەمی نێوخۆیی بەدرێژایی بیست و پێنج ساڵ بەرێژەیەكی كەم ٣٪ی تێپەراندووە؛ ئەمەیش بەرێژەیەكی گرنگ لە هی ئەورووپا زۆرترە (لە یاباندا تێكڕایەكە لە هەمان ئەو ماوەیەدا گەیشتە ٢.٣٪). هەروەها گەشەكردنی توانای بەرهەمهێنان – ئەكسیری ئابووریی نوێ لە دەیەی كۆتاییدا – رێژەی ٢.٥٪ تۆماركردووە، جارێكی دیكە بە خاڵێكی ئەولوی سەدی لە تێكڕای ئەورووپا بەرزترە. بەپێی گرێبەندی ئابووریی جیهانی، لە نێستەدا ولایەتەكانی یەكگرتوو وەها پۆلێن دەكرێ كە ئابوورییەكەی لە گشت ئابوورییەكانی دیكەی جیهان كێبڕكێكارترە. ئەم پۆلینكردنانەش ساڵانە و هەر لە ساڵی ١٩٧٩ وە دەردەچن و پێگەی ویلایەتەكانی یەكگرتووش جێگیرە، گەرچی هەندێكجار لەبەرانبەر ولاتانی بچووكی وەك باكووری ئەورووپا؛ سوید و دانیمارك و فنلەندا دەخلیسكێ –

ژمارەی دانیشتووانی هەرسێ ولات بەیەکەوە بیست ملیۆنە، واتا لە ژمارەی دانیشتووانی ویلایەتی تکساس کەمترە). لەوانەیە ڕەوتی گەشەکردنی پیشەنگانەی ئەمریکی وەها بێتە بەرچاوت کە بەرەو لێژبوونەوە دەچێت، لەوانەشە بۆ ولاتێکی پیشەسازیی پێشکەوتوو لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمی داهاتوودا ئەمە بە سروشتیتر بێتە بەرچاو، بەلام خاڵە گرنگەکە ئەوەیە کە ئەمریکا ئابوورییەکی دینامیی زۆر پلەبەرزی هەیە کە هێشتاش پێگەی خۆی دەپارێزێ، هەرچەندە قەبارەیەکی زۆر گەورەی هەیە.

تۆ تەماشای پیشەسازییەکانی ئایندە بکە. باوەڕەکان وەهان کە تەکنۆلۆژیای ورد- زانستێکی پیادەکارییە و لەسەر ئاستی ئەتۆمی یان بەشێکیدا پەیوەندیی بە بەرزەفتکردنی مادەوە هەیە - ئەوا سمینە (اختراقات) زانستییەکان لە ماوەی پەنجا ساڵی داهاتوودا سەرکردایەتی دەکات. چوونکە لە کاتێکی دیاریکراوی ئایندەدا- یان وەها بەمن دەڵێن- خانەوادەکان بەرهەمەکان لە مادەی خاو دروست دەکەن، هەروەها کۆمپانیایەکانی زۆر بەسانایی ئەو تێکرایانە دادەهێنن کەوا گەردیلەکان دەکەنە کالا. جا ئەگەر ئەمە زێدەڕۆییی بێت یانیش جۆرێک پێشبینیکردن بێت، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو بەتەواوی هەژموونی بەسەر ئەم بوارەدا هەیە. چوونکە ئەمریکا لە ڕیزی ئەو سێ دەوڵەتەی ڕاستەوخۆ دوای ئەو دێن (ئەڵمانیا، بریتانیا، چین) بەیەکەوە، ژمارەیەکی زۆرتری مەڵبەندەکانی توێژینەوەی تایبەت بەو زانستەی هەیە، زۆرێك لە مەڵبەندە نوێیەکانیشی جەخت لەسەر بابەتی تەنگی خاوەن توانایەکی بەرز دەکەنەوە بۆ ئەوەی بیانکەنە چەند پیادەکارییەکی کردارییانەی بازاڕدۆزی- وەك مەڵبەندی تەکنۆلۆژیای وردی سەر بە هەردوو زانکۆی نیمۆری - جۆرجیا و تایبەت بە زانستی لووی (لورام) جینی و

پێشبینیکراوەکان. هەروەها گوژمەی تەرخانکراوی حکوومی بۆ توێژینەوەکانی تایبەت بە تەکنۆلۆژیای ورد لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەگاتە دوو هێندەی گوژمەی نزیکترین کێبڕکێکار کە ئەویش یابانە. جا لەو کاتەی کە چین و یابان و ئەڵمانیا بە پشکێکی باشی ئەو وتارانە بەشداری دەکەن کەوا باس لە مادە وردەکان و بابەتە ئەندازیارییەکان دەکەن، ئەوا ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بڕوانامەی مافی داهێنان لە بواری تەکنۆلۆژیای ورد بەڕێژەیەک دەردەچوێنێ لە کۆی ئەو بڕوانامانە زۆرترە کەوا کۆی جیهان دەری دەکات، ئەمەیش ئاماژە بە هێزی دەگمەنی ئەمریکا دەکات بۆ گۆڕینی بیرۆکەی ئەبستراکت بۆ بەرهەمی کرداری.

دەستگەی لۆکس بە سەرۆکایەتیی مایکل هۆلمان داتابێسێکی بۆ هەڵسەنگاندنی تێکڕای توانای کێبڕکێکاریی وڵاتان لە بواری تەکنۆلۆژیای ورد دامەزراند. شیکردنەوەکانی هەر بە تەنیا ئەیانڕوانیە چالاکی لە بواری تەکنۆلۆژیای ورد، بەڵکو لە داهێنانی زانستیدا تەماشای توانای دروستکردنی گەشەکردنیشی کرد. ئەوەی بۆ روونبوویەوە کە هەندێك وڵات کەوا لە توێژینەوەکاندا گوژمەیەکی زۆر خەرج دەکەن، ناتوانن زانستەکەیان بکەنە بازرگانی. چوونکە ئەم وڵاتانەی نێو بورجی عاجی گوژمەیەکی زۆر گەورە لە پێناو توێژینەوەدا خەرج دەکەن، هەروەها وتاری زانستی لە گۆڤارەکاندا بڵاو دەکەنەوە و مافەکانی دروستکردن و داهێنانیشیان هەیە، بەڵام لەبەر هۆیەك ناتوانن کۆی ئەمانە بکەنە کاڵای بازرگانی و هێز. لەو وڵاتانەی کەوا سەر بەم گرووپەن، چین و فەرەنسا و بریتانیان. لە کاتێکدا ٨٠٪ وەبەرهێنانە ئابوورییە زۆر مەترسیدارەکان لە بواری تەکنۆلۆژیای ورد دا بۆ کۆمپانیایەکانی ئەمریکی دەچێت.

ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا هەژموونی بەسەر پیشەسازیی تەکنۆلۆژیای بایۆلۆژیشدا هەیە؛ واتا بەکارهێنانی سیستەمەکانی بایۆلۆژی لە بەرهەمهێنانی بەرهەمی پزیشکی و کشتوکاڵی و پیشەسازی. لە ساڵی ٢٠٠٥ دا کۆمپانیا تایبەتمەندە ئەمریکییەکانی بواری تەکنۆلۆژیای بایۆلۆژی، زیاتر لە ٣.٢ ملیار دۆلاریان لەسەر شێوەی گوژمەیەکی سەرەڕۆیانە وەرگرت، لە کاتێکدا کۆمپانیایەکانی ئەورووپی تەنیا نیوەی ئەم گوژمەیەیان وەرگرت. هەروەها دەرکردنەکان (اصدارات)ی پشکەکانی دوای سەرەتایی Post – IPO لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا حەوت هێندەی ئەوەی ئەورووپا بوو. هەرچەندە دەرکردنە سەرەتاییەکانی پشك IPOs لە ئەورووپا لە ساڵی ٢٠٠٥دا داراییەکی زۆرتری پێگەیشت، بەڵام دەرکردنی سەرەتایی بۆ پشکەکان چالاکییەکی زۆر وەرچەرخاو و گۆڕاوە، چوونکە لە ساڵی ٢٠٠٤دا بەهای دەرکردە سەرەتاییەکانی پشکەکان لە ئەمریکادا چوار هێندەی ئەوەی ئەورووپا گەورەتر بوو. هەروەها لە بواری تەکنۆلۆژیای وردیشدا کۆمپانیایەکانی ئەمریکا لە وەرچەرخاندن و گۆڕینی هزرەکان بۆ بەرهەمی قازانجبەخشی بازرگانی زۆر کارامە و لێهاتوون، چوونکە قازانجی پیشەسازییەکانی بایۆتەکنۆلۆژی لە ساڵی ٢٠٠٥دا گەیشتە نزیکەی ٥٠ ملیار دۆلار، واتا پێنج هێندە لەوەی ئەورووپا گەورەتر بوو، هەروەها هاوتای ٧٦٪ تێکڕای قازانجەکانی جیهانییە*.

* بێگومان ئەو زانیارییانەی کەوا لە کۆمپانیاکانی گشتی وەرگیراون، تەنیا بەشێکی وێنەکە پیشان دەدەن، چونکە زیاتر لە سێ چارەکی کۆمپانیاکانی بایۆتەکنۆلۆژی لە جیهاندا (کە ژمارەیان ٤،٢٠٣ کۆمپانیایە) کۆمپانیای تایبەتن. ئەوروپا ٤٢٪ی کۆی کۆمپانیا تایبەتی هەیە و (لە بەرانبەردا ئەمریکا ٣١٪ی هەیە). بەڵام ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە کۆمپانیا گشتییەکانی بایۆتەکنۆلۆژی پشکی شێری بەردەکەوێ کە دەکاتە ٥٠٪ و ئەوروپاش تەنیا ١٨٪ بەردەکەوێ. لەوانەیە ئەمەش بەڵگەیەکی پێگەیشتنی بازاڕی ئەمریکی بێت.

بێگومان پیشەسازی و دروستکردن (التصنیع) بەشێوەیەکی پلە بە پلە لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو دوور دەکەوێتەوە بەرەو جیهانی گەشەسەندوو دەچێت و ئەمریکا دەکاتە ئابووریی خزمەتگوزارییەکان. ئەمەیش زۆرێک لەو ئەمریکی و ئەورووپییانە دەترسێنێ کەوا دەپرسن ئەگەر هاتوو گشت شتێک لە وڵاتی چیندا دروست بکرێ، وڵاتەکەیان چی دروست دەکات؟ بەڵام لە ڕەوتی ئابوورییەکی جیهانیدا هەردەبێ وەها لە پیشەسازی و کردەی دروستکردنی ئاسایییانە بڕوانرێ کەوا تیایدا وڵاتانی وەک چین دەبنە بەشێکی گرنگی زنجیرەی پڕکردنی بازاڕ لەو جۆرە کاڵایانە؛ بەڵام هەر وەک بەشێک دەمێنێتەوە.

جیمس فالۆس نووسەری گۆڤاری ئەتلانتیک مونسلی ساڵێکی لە چیندا بەسەر برد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە و بە وردی چاودێریی ئەو هێزە زەبەلاحەی دروستکردن و پیشەسازی بکات، هەروەها سەبارەت بە پرسی چۆنییەتی بتەوکردنی تەوزیفی دەرەکیی لێکدانەوەیەکی باوەڕپێهێنەری سەبارەت بە توانای کێبڕکێکردنی ئەمریکی پێشکەشکرد؛ پیاوانی کاری چینی زۆر بەباشی لەم لێکدانەوەیە تێدەگەن. زۆربەی ئەمریکییەکان بە پسپۆڕ و شارەزاییە ئیدارییەکانیشەوە، کێرڤی زەردەخەنەداریان نەبیستووە، بەڵام پیشەساز و دروستکەرانی چینی بەباشی پێی ئاشنان. ئەم کێرڤە - کە بریتییە لە هێڵێکی چەماوە و لەسەر شێوەی پیتی U لەسەر ڕووخسارێکی زەردەخەنەداری سادەی کارتۆنی کێشراوە و لە هەفتایەکاندا بەدیارکەوتووە (ل) - پێشکەوتن و وەرچەرخانی بەرهەمێک لە قۆناغی وێناندن (تصور)ەوە بۆ قۆناغی فرۆشتن. لە بەشی سەرەوەی لای چەپی چەماوەکەدا بەرهەمێک بە بیرۆکەی دیزاینی ئاست بەرزی پیشەسازییانە دەستپێدەکات؛ بەرهەمەکە چۆن دێتە بەرچاو و چۆن کار دەکات. دوای ئەوە بەرەو خوارەوە پلانێکی چڕوپڕی ئەندازەیی دێت. لە بەشی

خوارەوەی چەماوەی U دا دروستکردنە تەواوەتییەکە و بەستن و بارکردن دێت. دواتریش لە هەلکشانی بەرەو سەرەوەی لای ڕاستدا دابەشکردن و بازاڕدۆزی و فرۆشتن بەشێوەی دانە (التجزئە) و گرێبەستەکانی خزمەتگوزاری و فرۆشەکانی پارچە بەدەگ و گۆڕاوەکان (القطع التبدیل) و پاشکۆیەکانە. فالۆس تێبینیی ئەوەی کردووە کە چین گرنگی بە بەشی خوارەوەی چەماوەکە دەدات، لە کاتێکدا ئەمریکا گرنگی بە بەشی سەرەوە دەدات- هەردوو کۆتایی پیتی U- واتا ئەو شوێنەی کە پارەی تیادایە. " ڕێگەیەکی سانا بۆ گوزارشتکردن لەمە- واتا پارە ڕاستینەکەی کە لە ناوی مارکەکەدا هەیە و هەروەها فرۆشتن بەشێوەی دانە (تجزئە)- لەوانەیە ڕوون بێت، بەلام وێنە ڕوونترەکە خۆی لە وردەکارییە نادیارەکاندا بەدیاردەخات". باشترین نموونە بۆ ئەمە ئامێری iPod: ئەم ئامێرە بەزۆری لە دەرەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتوودا دروست دەکرێ، بەلام زۆرینەی بەهایە زیادکراوەکە (القیمة المضافە) کۆمپانیای ئەپڵ لە کالیفۆرنیادا دەیبات. ئەم کۆمپانیایە قازانجێکی تێکڕایی وەدەستهێناوە کەوا ڕێژەکەی دەگاتە ٨٠ دۆلار بۆ هەر ئامێرێکی iPodی ٢٠ گێگا بایت کە بە فرۆشتنی تاک و بەدانە (تجزئـە) بـە نرخـی ٢٩٩ دۆلار (لـە سـاڵی ٢٠٠٧دا) فرۆشـراوە. هـەروەها قازانجەکەشـی بـە نزیکـەی ٣٦٪ ە لـە نرخـی جوملـە مەزەندەکراوە کـە ٢٢٤ دۆلارە. (هەروەها ئەگەر ئامێرەکە لە کۆگەی سەر بە کۆمپانیـای ئـەپڵ فرۆشـرا، ئەوا قازانجی فرۆش بەدانەشی بخەرە سەر). هەروەها کۆی تێچووی پێکهاتەکان ١٤٤ دۆلارە. لـە بەرانبەریشـدا کۆمپانیـا دروسـتکەرەکانی چـینی تـەنیا چـەند خاڵێکی سەدی لە بەرهەمەکانیاندا قازانج دەکەن.

## باشترین دروستکراو و پیشەسازییەکانی ئەمریکا

ئەوانەی زۆرتر نیگەرانن دەڵێن: " ئاه، ئەمە راستە، بەڵام تەماشای ئەو وێنەیە دەکەیت کە ئەمڕۆ گیراوە. ئەو شتە سەرلیستییانەی کەوا ئەمریکا هەیەتی، لەگەڵ لەدەستدانی بنەمایە زانستی و تەکنۆلۆژییەکەی زۆر بەخێرایی دادەخورێ". بۆ هەندێك كەس لێژبوونەوە و دابەزینی زانست ئاماژەیەكە بۆ هەڵوەشانەوەی فراوانی رۆشنبیری و کەلتووری. ئێمە گرنگی بە بنەمایەکان نادەین- بیرکاری- دروستکردن، بیرنیشاندان و کۆششکاری (اجتهاد) لە کار، پاشکەوت لای ئێمە جێگەی بایەخ نین- هەروەها دەبینە جڤاکێکی پسپۆر لە بەکاربردن و حەسانەوە و رابواردن. لەم بارەیەوە، جیفری ئیملت، بەڕێوەبەری جێبەجێکار لە کۆمپانیای جەنەراڵ ئەلیکتریك دەڵێت: " لە ساڵی ۲۰۰٦دا، لە ئەمریکا ژمارەی ئەو دەرچووانەی کەوا باوەڕنامەی مەشقی وەرزشییان هەیە، لە خاوەن باوەڕنامەکانی ئەندازەی کارەبا زۆرترن. جا ئەگەر بمانەوێ ببینە پایتەختی مەساج لە جیهاندا، ئەوا لە رێگەین بۆ ئەوەی ئەو پێگەیە وەربگرین".

هیچ ئامارێکی دیکەی باشتر لەو ئامارە نییە کەوا پەیوەندیی بە پاشەکشەکردنی ئەندازیارییەوە هەیە. لە ساڵی ۲۰۰٥دا ئەکادیمیای نیشتمانی بۆ زانستەکان راپۆرتێکی بڵاوکردەوە و تیایدا هۆشداری لەمەڕ ئەو ئەگەرە دەدات کە لەوانەیە ویلایەتەکانی یەکگرتوو وەك رێبەری زانست لە جیهاندا بەشێوەیەکی خێرا پێگەی خۆی لە دەست بدات. چوونکە لە ساڵی ۲۰۰٤دا راپۆرتەکە رایدەگەیەنێ کە لە چیندا ٦۰۰.۰۰۰ ئەندازیار و لە هیندیشدا ۳٥۰.۰۰۰ و لە ولایەتەکانی یەکگرتوودا ۷۰.۰۰۰ ئەندازیار دەرچوون. ئەم ژمارانە لە سەدان گوتار و کتێب و پێگەی ئەلیکترۆنیدا بڵاوبوونەوە و بوونە چیرۆکی سەر بەرگی گۆڤاری فۆرتشن و گۆڤاری کۆنگریشیونال ریکورد و لە قسەی کەسانی بەئەزموونی نێو جیهانی تەکنۆلۆژیاشدا - وەك بیل گیتس- ڕەنگی دابەوە. پێدەچی ئەم ژمارانە

بەڕاستی جێگەی نیگەرانی و بێهیوایی بن. چ هیوایەك بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەمێنێتەوە ئەگەر لە بەرانبەر هەر ئەندازیارێکی بڕوانامەداری ئەمریکیدا ١١ ئەندازیاری چینی و هیندی هەبن؟ جگە لەمانەیش، ڕاپۆرتەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە هەر کۆمپانیایەك دەتوانێ ٥ کیمیازانی بەگوێڕتاو و خاوەن مەشقێکی بەرز لە چین و ١١ ئەندازیار لە هیند بە تێچوو و مووچەی یەك کیمیازان یان یەك ئەندازیاری نێو ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دابمەزرێنن.

تاکە گرفت لەو ژمارانەدا ئەوەیە کە زۆر ورد نین. کارل بیالیکی ڕۆژنامەوان لە ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرنال و ژمارەیەك لە ئەکادیمیستەکان لە مەسەلەکەیان کۆڵیەوە و لە ئەنجامدا زۆر بەخێرایی بۆیان ڕوونبوویەوە کە ژمارە نێکراپەکانی ئاسیایی چەند دەرچوویەکی ئەو پەیمانگەیانەی لەخۆی گرتبوو کەوا ماوەی خوێندن تیایاندا دوو یان سێ ساڵە؛ کەسانێکیشن کەوا لە کارە سانا و سادەکانی تەکنیکیدا باوەڕنامە وەردەگرن. هەروەها کۆمەڵێك مامۆستای کۆلیژی برات بۆ ئەندازیاری لە زانکۆی دۆك چوونە چین و هیند لەپێناو ئەوەی زانیاری لە سەرچاوەکانی حکوومی و نا حکوومیدا کۆ بکەنەوە و چاوپێکەوتن لەگەڵ پیاوانی کار و ئەکادیمیستەکاندا بکەن، ئەو دەرئەنجامەیان وەدەستهێنا کە دوورخستنەوەی دەرچووەکان لەو پەیمانگەیانەی کەوا بەرنامەکان فێردەکەن پێویستیان بە دوو یان سێ ساڵ هەیە، ئەوا ژمارە چینییەکە دادەبەزێننە نیوە، واتا نزیکەی ٣٥٠,٠٠٠ دەرچووی خاوەن باوەڕنامە. ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئەم ژمارەیەی دوایش بەهۆی جیاوازیی لە پێناسەکردنی وشەی ئەندازیاردا لەبەرکرابێت، چوونکە زۆرجار کەسە هونەرییە تەکنیکییەکانی بواری چاککردنەوەی میکانیکی ئۆتۆمبێل و تێکچوونی ئامێرەکانی پیشەسازیش دەگرێتەوە. هەروەها بایلیك دەڵێ دەستگەی زانستی نیشتمانی کەوا لە

ویلایەتەکانی یەکگرتوو و وڵاتانی دیکەشدا ئەم ئامارانەی پشکنیوە، ژمارەی دەرچووانی چینی بە نزیکەی ۲۰۰.۰۰۰ دەرچوو لە ساڵێکدا دەخەملێنێ. لە کاتێکدا ڕون هێرای مامۆستای سیاسەتی گشتی لە پەیمانگەی ڕۆچستەر بۆ تەکنۆلۆژیا، ژمارەی دەرچووانی هیندی بە ۱۲۰.۰۰۰ و ۱۳۰,۰۰۰ لە ساڵێکدا دەخەملێنێ. ئەمەیش مانای ئەوەیە کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە بەرانبەر هەر ئاکێك کە چین و هیند ئامادەیان دەکەن، مەشق و ئامادەکاریی بە ژمارەیەکی زۆرتری ئەندازیاران دەکات.

ژمارەکە باس لە پرسی چۆنایەتیش ناکات. من وەك کەسێك کە لە هیند پەروەردە بووم، دەتوانم خەملاندن بۆ چاکە و دەستکەوتەکانی بەناوبانگترین ئەکادیمیا ئەندازەییەکانی و پەیمانگە تەکنۆلۆژییەکانی هیندی بکەم (IIT). گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەوەیە کە سەرپەرشتیی یەکێك لە تاقیکردنەوە هەرە کێبڕکێکارەکان و زەحمەتەکان دەکات، چوونکە لە کۆی ۳۰۰.۰۰۰ کەسی تۆمارکراودا ۵,۰۰۰ کەس وەردەگرێ؛ واتا تێکڕای وەرگرتن یەکسانە بە ۱,۷ ٪ (لە بەرانبەر ۹ بۆ ۱۰٪ لە زانکۆیەکانی هارفارد و یال و برینستۆن). ئەو کەسانەش کەوا لە تاقیکردنەوەدا دەردەچن لەنێو ملیارێك کەسدا باشترین و زیرەکترینن. بەڵام، لە ڕاستیدا، زۆرێك لە پەیمانگەکانیش پلە دوون، ئەمەیش بەهۆی ئامێر و پێداویستییە ئاسایی و مامۆستایە کەمتەرخەمەکانیان و پرۆگرامە خراپەکانی خوێندنەوەیە کەوا هیچ جۆرە داهێنان و خەیاڵێکیان تیادا نییە. ئەمەیش ڕاجیف ساهنی جەختی لەسەر دەکاتەوە کە پێش ئەوەی بچێتە پەیمانگەی کالیفۆرنیا لە یەکێك لەو پەیمانگەیانە خوێندوویەتی، ناوبراو دەڵێ: " تایبەتمەندیی سەرەکی پەیمانگەکانی هیندی بۆ تەکنۆلۆژیا تاقیکردنەوەی داخیلبوونە کە بەشێوەیەکی زۆرباش لەپێناو خوێندکارانی زۆر زیرەکدا

ئامادەکراوە. بەڵام سەبارەت بە وانە خوێندن و پاشکۆیەکانییەوە، ئەوا ناکرێ لەگەڵ هیچ پەیمانگەیەکی بەرێز و دانپێدانراوی تەکنۆلۆژیی ئەمریکی بەراورد بکرێ". تەنانەت دوای پەڕینەوەش لەو پەیمانگە تەکنۆلۆژی و ئەکادیمیایە دەستبژێرەکانی دیکە – کەوا ساڵانە ۱۰,۰۰۰ خوێندکار تیایدا خوێندن تەواو دەکەن و دەردەچن– جۆری خوێندنی باڵا لە چین و هیند بە پلەیەکی زۆر بەرز هەر بە خراپی دەمێننەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە کە زۆرێك لە خوێندکارانی ئەم دوو وڵاتە بۆ مەشق و ڕاهێنان و باشتر فێربوون دەچنە دەرەوەی وڵات.

داتایەکان ئەم بۆچوونە تایبەتانە دووپات دەکەنەوە. لە ساڵی ۲۰۰۵دا دەستگەی ماکنزیی جیهانی بۆ توێژینەوە، سەبارەت بە بازاڕی گەشەسەندووی کاری جیهانی ئەوەی بۆ ڕوونبوویەوە کە نموونەی پێکهاتوو لە بیست و هەشت وڵاتی کرێ هەرزاندا نزیکەی ۳۳ ملیۆن کەسی دانپێدانراوی گەنجی لەژێر دەستدایە*، ئەمەیش بە بەراورد لەگەڵ تەنیا ۱۵ ملیۆن لەو نموونەیەی کەوا لە هەشت وڵاتی کرێ بەرزی وەك (ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا، مەملەکەتی یەکگرتووی بریتانیا، ئەڵمانیا، یابان، ئوستورالیا، کەنەدا، ئێرلەندا، کۆریای باشووردا هەن). بەڵام لەنێو ئەو گەنجە دانپێدانراوانەی وڵاتانی کرێ نزمدا، ژمارەی ئەو کەسانە چەندە کەوا کارامەیی پێویستیان هەیە بۆ ئەوەی لە بازاڕی جیهانیدا کێبڕکێ بکەن؟ " ژمارەیەکی زۆر کەمی پاڵێوراوان بۆ کار دەتوانن لە هەر کۆمپانیایەکی بیانیدا بەسەرکەوتوویی کاربکەن"، بەمشێوەیە توێژینەوەکە شتێك

* ) ژمارەکەی دەستگەی ماکنزیی جیهانی دەرچووانی مەشقکردووی ئەندازیاری، پارەدان (التمویل)، کارگێڕی و دارایی، توێژینەوەکانی زانستەکانی ژیان و تا پسپۆڕەکانی دانپێدانراوی وەك کارگەرانی ناوەندەکانی پەیوەندی (callceenters) لەخۆ دەگرێ. هەروەها پێناسەی دانپێدانراوانی گەنج دەکات کە دەرچوون و شارەزایی حەوت ساڵیان هەیە.

بەدیاردەخات و ئەمە بەچەند لێکدانەوەیەك پاساو بۆ مەسەلەیەك دەهێنێتەوە کە گرنگترینیان خراپیی جۆری پەروەردە و فێرکردنە. هەروەها توێژینەوەکە ئاماژەی بەوە کردووە کەوا چەندایەتی و چۆنایەتیی پەروەردە و فێرکردن لە چین و هیند لە ئاستێکی نزمدان، تەنیا هەندێك ئەکادیمیای ئاست بەرز نەبێت. چوونکە گەرچی داواکارییەکی زۆر لەسەر ئەندازیاران هەیە، بەلام ژمارەی مەشقدیتووەکانیان بەرێژە کەمن، لەبەرئەوە دەبینی کە کرێیەکانیان سالانە بە رێژەی ١٥٪ دادەبەزێ؛ ئەمەیش نیشانە و ئاماژەیەکی دلنیاکەرەوەیە کە خواست لەسەر ئەندازیارانی خاوەن ئەزموون لە هەردوو ولاتدا زۆر لە ژمارەی ئەندازیارانی بەکەلك زۆرترە.

(ئەگەر خاوەنی کار بیت و دەیان هەزار ئەندازیاری بەئەزموون و مەشقدیتوو لە گشت سالێکدا دەردەچن، ئاوا ناچار نابیت سالانە سەرمووچەیەك بدەیتە فەرمانبەرانت کەوا رێژەکەی ١٥٪ یە).

خوێندنی بالا باشترین پیشەسازییەکانی ئەمریکایە. دوو لیست هەن بۆ باشترین زانکۆیەکانی جیهان، لە یەکێکیاندا- ئەمەیش توێژینەوەیەکی تەواو چەندایەتییانەیە کەوا توێژەرانی چینی ئەنجامیان داوە- هەشت لە باشترین دە زانکۆی جیهاندا لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادان، لە ئەوی دیکەشدا- کە توێژینەوەکە لەوەی پێشوو زیاتر گرنگی بە چۆنایەتی داوە و لەلایەن Times Higher Educational supplement لە لەندەن ئەنجام دراوە- حەوت زانکۆیە. دوای ئەمە بەجۆرێك لە جۆرەکان ژمارەکان لەبەکتری دوورکەوتوونەتەوە. چوونکە لەنێو باشترین بیست زانکۆدا، حەڤدە یان پانزە زانکۆ لە ئەمریکادا هەن. هەروەها لە باشترین پەنجاشدا، سی و هەشت یان بیست و یەك زانکۆ لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادان. جا ئەگەر ئەوەش

لەبەرچاو بگرین کە ژمارەی دانیشتووانی ئەمریکا تەنیا ٥٪ی ژمارەی دانیشتووانی جیهان پێکدەهێنێ، ئەوا بەدڵنیاییەوە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا هەژموونی بەسەر خوێندنی باڵادا هەیە، چوونکە ٤٢٪ یان ٦٨٪ی باشترین پەنجا زانکۆ لە جیهاندا موڵکی ئەمریکان و بە پشتبەستن بەو توێژینەوەیەی کەوا دەیخوێنێتەوە، هیچ بوارێکی دیکە نییە کە ئەمریکا بەمشێوەیە هەژموونی بەسەریدا هەبێت*.

راپۆرتێک بەناوی ئایندەی زانکۆیەکانی ئەورووپی– کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا لە مەڵبەندی ریفۆرمی ئەورووپیی دەرچووە و بارەگەیەکەی لە لەندەنە– ئاماژە بەوە دەکات کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو ٢.٦٪ تێکرای داهاتی نێوخۆیی لە خوێندنی باڵادا دەخاتە واری وەبەرهێنانەوە، ئەمەیش لە رێژەی ئەورووپا و ژاپان زۆرترە، چوونکە ئەورووپا ١،٢ ٪ و ژاپان ١.١ ٪ی تێکرای داهاتی نێوخۆیی لەم بوارەدا دەخەنە واری وەبەرهێنانەوە، هەروەها نرخەکە لە بواری زانستەکاندا بە تایبەت جێگەی سەرسامییە. چوونکە لیستێکی ئەو خوێندنگەیانە پیشان دەدات کەوا باشترینی ١،٠٠٠ زانای کۆمپیوتەر لە جیهان وانەی تیادا دەڵێنەوە و دە خوێندنگەکەی سەر لیستەکە هەرهەموویان ئەمریکین. ئێستەیشی لەگەڵدا بێت خەرجیی ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە بواری توێژینەوە و پێشخستندا لە خەرجیی ئەورووپا زۆرترە. هەروەها هاوکاریی نێوان دەستگەکانی فێرکردن و دەستگەکانی بازرگانیی ئەمریکی لە هیچ شوێنێکی دیکەی جیهاندا هاوشێوەی نییە. هەروەها بۆ خوێندکاران– ئەو خوێندکارانەی بۆخوێندن روو لە ئەمریکا دەکەن– ئەمریکا

---

*) بەردەوام هێرشەکانی باڵی راستڕەو بۆ سەر زانکۆیەکانی ئەمریکا سەری منیان سوڕماندووە، چوونکە باڵی راستڕەو بە بیروجە عاجییەکانی گۆشەگیر وەسفی ئەم زانکۆیانەیان کردووە. لە جیهانێکی پڕ لە کێبڕکێدا ئەم دەستگەیانە هەژموونیان بەسەر بواری کارەکانی خۆیاندا هەیە.

هەر بەو شوێنە سەرنجڕاکێشترە دادەندرێ کە ناکرێ لەگەڵ هیچ شوێنێکی دیکە بەراورد بکرێ، چوونکە زۆرترین ڕێژەی خوێندکارانی جیهان لەوێدان و ڕێژەکەش بەشێوەیەکی ورد دەگاتە ٣٠٪ کۆی ژمارەی خوێندکارانی بیانی لە جیهاندا. ئەم سەرلیستییانەش بە ئاسانی ناسڕێنەوە، چوونکە بونیادی زانکۆیەکانی ئەورووپی و یابانی – زۆربەیان لە دەوڵەتەوە بەڕێوە دەبرێن– ناگۆڕێن. هەرچەندە چین و هیند دەستگەی نوێ دەکەنەوە، بەڵام ئاسان نییە لە ماوەی چەند دەیەیەکدا زانکۆی وەها لە هیچەوە دامەزرێنن کە ئاستەکەی جیهانی بێت. فەرموون ئێوە و ئامارێک سەبارەت بە ئەندازیاران کەوا لەوانەیە پێشتر نەتانبیستبێ: لە هیندستاندا زانکۆیەکان ساڵانە ٣٥ بۆ ٥٠ کەسی خاوەن باوەڕنامە بە پلەی دکتۆرا لە زانستی کۆمپیوتەردا دەردەچووێنن؛ بەڵام ژمارەکە لە ئەمریکا ١،٠٠٠ (هەزارە).

## ڕاهێنان و فێرکردنی مرۆڤ بۆ ئەوەی بیربکاتەوە

بەڵام ئەگەر زانکۆیەکانی ئەمریکی وەك پلە پەك پۆلێن کرابن، ئەوا خەڵکانێکی بەژمارە کەم باوەڕیان بەوە هەیە کە خوێندنگەکانی ئەمریکی لە هەمان پێگەدا دابنێن و پۆلینی بکەن. هەمووان دەزانن کە سیستەمی پەروەردە و فێرکردنی ئەمریکی دووچاری قەیران بووەتەوە، هەروەها خوێندکاران لە وانەکانی زانستییەکان و بیرکاریدا ساڵ لە دوای ساڵ ئەنجامی خراپتر وەدەستدێنن بەنابەت لە پۆلینە جیهانییەکاندا. بەڵام لێرەدا ئامارەکان – لەگەڵ ئەوەی ڕاست و دروست نین– مەسەلەیەکی کەمێك جیاواز ئاشکرا دەکەن. گرفتی ڕاستینی ئەمریکا پەیوەندیی بە سەرکەوتن و لەپێشدانەوە و پێشەنگایەتییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە دەرفەتەکانەوە هەیە. توێژینەوەی ئارلستەکانی نێو دەوڵەتی لە زانستەکان و بیرکاریدا TIMSS لە سەرەتای سەرهەڵدانی لە ساڵی

١٩٩٥ وە پێوەری سەرەکین لە بەراوردکردنی بەرنامەکانی پەروەردە و فێرکردن لە ولاتانی جۆراوجۆردا. نوێترین دەرئەنجامێکی کە لە سالی ٢٠٠٣ دا دەری چوواند، ویلایەتەکانی یەکگرتووی لە نێوەراستی ئەو کۆمەلەیە دانا کەوا توێژینەوەکە ڕووماڵی کردبوون و بریتی بوون لە ٢٤ دەولەت، بەلام زۆرێك لەو ولاتانەی کە لەدوای ئەمریکاوە هاتبوون، ولاتانی جیهانی تازە گەشەسەندووی وەك مەغریب و تونس و ئەرمینیان. دەرئەنجامی خوێندکارانی پۆلی هەشتەم لە ئەنجامی خوێندکارانی پۆلی چوارەم باشتر بوو (ئەو دوو پۆلە جیاوازەی کەوا توێژینەوەکەیان لەسەر ئەنجام درا)، بەلام لەگەل هاوپۆلانی خۆیان کە لە ولاتانی وەك یابان و سەنگافوورە و هۆلەندا بوون – واتا خوێندکارانی پۆلی هەشتەم و چوارەمی ئەو ولاتانە– ئەمریکییەکان لە ڕووی نمرەوە لە دواوەی ئەمانەوە بوون. ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بە جۆرە ترسێکی پێشبینیکراو هەواڵەکەیان بلاو کردەوە، بۆ نموونە وول ستریت جۆرنال نووسیبووی: " بۆمبی زەمەنی ئابووری: نەوجەوانانی ویلایەتەکانی یەکگرتوو خراپترین خوێندکاران لە بیرکاریدا".

بەلام، تەنانەت ئەگەر ئەنجامەکانی قوتابیانی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لە زانست و بیرکاریدا لەهی ولاتانی پێشکەوتووی وەك سەنگافوورە و هۆنگ کۆنگ نزمتر بێت، بەلام تێکڕای دەرئەنجامەکان جیاوازییە جوگرافی و نەژادی و ئابووریی – کۆمەلایەتییەکان دەشارێتەوە. چوونکە خوێندکارانی هەژار و خوێندکارانی کەمینەکان ئەنجامێکی زۆر نزمتر لە تێکڕای ئەنجامی ئەمریکی وەدەستدەهێنن، لە کاتێکدا " خوێندکارانی خوێندگە گشتییەکانی ئەمریکا لە دانیشتووانە دەولەمەندەکەی دەووبەری شارەکان ئەنجامی نزیك ئەنجامی خوێندکارانی سەنگافوورە وەدەستدەهێنن – واتا ئەو ولاتەی کە بەپێی توێژینەوەکەی TIMSS بەرێژەیەکی زۆر لە ئەنجامی بیرکاریدا لەپێشترە.

ئەمانەیش ئەو خوێندکارانەن کەوا کێبڕکێ دەکەن بۆ ئەوەی شوێنە بەتاڵە زۆر دەگمەنەکانی بەرزترین زانکۆیەکانی ئەمریکی پڕ بکەنەوە. جیاوازیی لە ئەنجامی پرۆگرامە زانستییەکانی نێوان قوتابخانەکانی ناوچە هەژارەکان و ئەوانەی لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی نێو ویلایەتەکانی یەکگرتوودان بە چوار پێنج جار لە جیاوازیی نێوان تێکڕایە نیشتمانییەکانی ویلایەتەکانی یەکگرتوو و سەنگافوورە گەورەترە. بە واتایەکی دیکە، ئەمریکا وڵاتێکی مەزن و هەمەچەشنە و گرفتی نەبوونی یەکسانییەکی ڕاستەقینەی هەیە. ئەمەیش لەگەڵ گوزەرکردنی ڕۆژەکاندا، دەبێتە گرفتی کێبڕکێ، چوونکە ئێمە نەمانتوانیوە سێیەکی ژمارەی ئەو کارگەرانە فێربکەین و ڕایانبهێنین کەوا لە بواری ئابووریی مەعریفیدا کار دەکەن، ئەمە ئاستی وڵات بەگشتی دادەبەزێنێ. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، کۆمەڵە گەورەکەی خوێندکاران لە پێنجیەکی سەرەوەی خوێندنگەکانی ئەمریکی لە جیهاندا لە پۆلێنی باشترین دادەندرێن. ئەوان زیرەك و بەهەوڵ و کۆششن و لە ژیانێکی سیستماتیکی بەرزی ئەکادیمی و نا ئەکادیمی دەژیەن، هەر کەسێکیش بەدواییانە سەردانی یەکێك لە زانکۆیەکانی رابیتەی لاولاو (ئیڤی لیگ)ی کردبێ، دەتوانێ شایەتی بۆ ئەمە بدات.

من قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیم لە مۆمبای تەواوکردووە، هەر یەکێك لەو خوێندنگە سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندییانەش سەر بە دەستگەیەکی نایاب بوون کە ناوی کاتدرائیە و خوێندنگەی جۆن کانون بوو. شێواز و نۆرمەکەی (لە سی ساڵەوە) ڕەنگدانەوەی شێوازەکانی وانە گوتنەوەی ئاسیاییانە بوو، کەوا جەخت لەسەر ئەزبەرکردن و تاقیکردنەوەی بەردەوام دەکەنەوە. لە ڕاستیدا ئەم شێوازە نۆرمێکی کۆنی پەروەردە و فێرکردنی ئینگلیزی و ئەورووپییە کەوا لە ئێستەدا بە ئاسیایی ناودەبرێ. بیرمە من

ڕێژەیەکی زۆری زانیارییەکانم ئەزبەر دەکرد و لە تاقیکردنەوەکاندا هەموویم دەڕژاندە سەر کاغەز و دواتریش یەکسەر لەبیرم دەچوونەوە. کاتێکیش بۆ خوێندن چوومە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا، جیهانێکی تەواو جیاوازم بینی. چوونکە لەو کاتەی کە سیستمی ئەمریکی لە توندوتیژی و ئەزبەرکردندا زۆر خاووخلیسکە – جا ئەگەر لە بیرکاری بێت یانیش شیعردا– بەلام زۆر لە پێشخستنی توانا جەوهەرییەکانی ئەقلیدا زۆر سوودمەندتر و باشترە، چوونکە مرۆڤ بۆ سەرکەوتن لە ژیاندا پێویستییەکی زۆری بەمجۆرە ڕەوتەی پەروەردە و فێرکردن هەیە. سیستمەکانی دیکەی پەروەردە و فێرکردن فێرت دەکەن چۆن دەچیتە نێو تاقیکردنەوەکان، بەلام سیستمی ئەمریکی فێرت دەکات چۆن بیر بکەیتەوە.

بێگومان ئەم تایبەتمەندییە تا ئاستێك ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بۆچی لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو ئەو ژمارە زەبەلاحەی بەڵێندەر و داهێنەر و کەسانی سەرکێش دەردەچن. لە ئەمریکادا، ڕێگە بە خەلك دەدرێ سەرکێشی و بوێرییان هەبێت و بەرەنگاریی دەستهەلات ببنەوە و شکست بێنن و سەرلەنوێ لەسەر پێیەکانی خۆیان بوەستنەوە. ئەمە ئەمریکایە و ژاپان نییە کەوا دەیان کەس تیایدا دەردەچن و خەلاتی نۆبل وەدەستدێنن. ثارمو شانمۆ گاراتنام– کە ماوەیەك لەمەوبەر و لە سەنگافوورەدا وەزیری فێرکردن بوو– لە ڕەوتی لێکدانەوەی جیاوازیی نێوان سیستمی ولاتەکەی و سیستمی ئەمریکادا دەلێ: " هەردووکمان سیستمێکمان هەیە کەوا پشت بە توانا و شایستەیی دەبەستێ. بەلام سیستمی ئێوە پشت بە بەهرە و توانا دەبەستێ، لە کاتێکدا سیستمی ئێمە پشت بە تاقیکردنەوە دەبەستێ. ئێمە دەزانین چۆن وەها لە خەلکی بکەین بچنە نێو تاقیکردنەوەکانەوە، ئێوەش دەزانن کە چۆن تا ئەوپەڕی سوود لە

بەهرەی خەڵك وەربگرن. هەردوو مەسەلەش گرنگن، بەڵام چەند شوێنێك لە مێشکدا هەن ناتوانین بەباشی تاقییان بکەینەوە، وەك داهێنان و حەزی شتزانین (الفضول) و گیانی سەرکێشیێ و بەرتەمایی (الطموح). لە هەموو ئەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەمریکا ڕۆشنبیری و کەلتوورێکی وەهای فێربوونی هەیە کەوا بەرەنگاریی باوەڕ و هزرەکانی باو دەبێتەوە، جا ئەگەر ئەمە واتای بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتیش بگەیەنێ. ئەمە ئەو بوارانەیە کەوا لەسەر سەنگافوورە پێویستە لە واشنتۆنەوە فێری ببێت".

بەمدواییانە هەندێك بەرپرسی سەنگافووری سەردانی هەندێك خوێندنگەی ئەمریکییان کرد بۆ ئەوەی فێربین چۆن سیستمێك دابمەزرێنن کەوا ڕەچاوی زیرەکی و داهێنان و خێرایی بیرکردنەوە لە چارەسەری گرفتەکان بکات و لەهەمبەر ئەو سیفەتانەدا پاداشتی تاکەکان بکات. لە ئاداری ساڵی ٢٠٠٧ لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا هاتووە کە توێژەرانی باشترین خوێندنگەکانی سەنگافوورە هاتوون و چوونەتە ئەکادیمیای زانست– کە خوێندنگەیەکی گشتییە بەڵام لە هەندێك مادەدا پسپۆڕ و تایبەتمەندن و دەکەوێتە ڤێرجینیا– بۆ ئەوەی لە شێوازەکانی وانەگوتنەوەی ئەمریکی بکۆڵنەوە". لەو کاتەی خوێندکاران " توێژینەوەیان لەسەر ئەو گژوگیایە وردانە دەکرد کەوا بەشێوەیەکی بۆماوەیی دەستکاری کرابوون و وێنەی گەڵاکانیان دەکرد و زانیارییان لە پەڕاوەکانی تێبینییەکانیان دەنووسی، (میوانە سەنگافوورییەکان) ماوەی چاوەڕوانیی مامۆستایان تۆمارکردبوو بۆ ئەوەی خوێندکاران وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە، هەروەها ئەوەشیان نووسیبوو کە ئەوجەوانان چۆن بە دەنگێکی گەورە قسەیان کردووە و چۆن لەسەر ڕا و بۆچوونەکانی خۆیان پێداگربوون". هار هۆی بینگ – ئافرەتێکی سەردانیکاری سەنگافووری بوو– کە بەپێی ڕۆژنامەی واشنتۆن

پۆست زۆر کاریگەر بووە، چوونکە گوتوویەتی:" تەنیا لە میانی چاودێریکردنەوە دەتوانیت ئەو خوێندکارانە ببینیت کەوا لە وانەکاندا زیاتر بەشدار و کاران لە جیات ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژ جاڕس ببن". بۆیێ لە وتارەکەدا هاتووە:" تاقیگەکان لە سەنگافوورەدا – هار وادەڵێت– پڕن بەلاّم توندوتیژن، هەروەها خوێندکاران زیرەکن، بەلاّم دوودڵن لەخۆوە و بەشێوەیەکی خۆویستانە وەلاّم بدەنەوە. بۆیێ هوا چۆنگ لە ئێستەدا بۆ هاندانی لەخۆوەیی (العفویە) ١٠ نمرە دەداتە هەر خوێندکارێك کە بەشێوەیەکی زارەکی بەشداری و چالاکیی هەبێت".

## چەکە نهێنییەکەی ئەمریکا

ڕەنگە شتەکانی سەرلیست (الافضلیات) ی ئەمریکا ڕوون بێت ئەگەر لەگەڵ ئاسیادا بەراورد بکرێ، کەوا هێشتا لە چەند وڵاتێك پێکهاتووە و زۆربەیان تازە گەشەسەندوون. بەلاّم بە بەراورد لەگەڵ ئەورووپا، ئەوا پەرلوێزەکە زۆر لەوە تەنگتر دەبێتەوە کەوا زۆرێك لە ئەمریکییەکان باوەڕەیان پێی هەیە. ئەورووپا گەشەکردنێکی خێرا بەخۆیەوە دەبینێ کە لە سالّی ٢٠٠٠ تا ئێستە لە خێرایی گەشەکردنی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا نزیکبووەتەوە. هەروەها دەستی بەسەر نیوەی وەبەرهێنانە بیانییەکانی جیهاندا گرتووە و شانازی بە هێزی بەرهەمهێنانی خۆی دەکات کەوا لە هەندێك کاتدا وەك ئەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکایە. هەروەها لە سالّی ٢٠٠٧دا زیادەیەکی (فائض) بازرگانیی ڕاگەیاند کە لە کانوونی دووەم بۆ تشرینی یەکەم ڕێژەکەی ٣٠ ملیار دۆلار بوو. هەروەها وڵاتانی ئەورووپی لە کۆی دە پێگەی یەکەمی نێو بەلگەنامەی توانای کێبڕکێکردن کەوا لە لایەن کۆڕبەندی ئابووریی جیهانیدا دەرچووە، حەوت پێگە داگیر دەکەن. ڕاستە کە ئەورووپا گرفتی خۆی هەیە و ڕێژەی بێکارییەکەی بەرزە و بازاڕەکانی کاری توندوتیژن، بەلاّم لەگەڵ ئەمەبشدا تایبەتمەندیی خۆیشی

هەیە، لەوانە سیستمی خانەنشینی و چاودێریکردنی تەندروستی کەوا کارایی و هاوسەنگییەکەیان لەوەی ئەمریکییەکان زۆرترە. بەگورتی، ئەورووپا لە کورتمەودادا لە بواری ئابووری دەبێتە بەرەنگاری و کێبڕکێکارێکی ولایەتەکانی یەکگرتوو.

بەڵام ئەورووپا خاڵێکی لاوازی کرۆکیی هەیە، یان با وردتر بین، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا تایبەتمەندییەکی کرۆکیی هەیە کەوا لە ئەورووپا و زۆربەی وڵاتانی پێشکەوتووی جیا دەکاتەوە، ئەویش زیندوویەتی و چالاکییە دیمۆگرافییەکەیەتی. نیکۆلاس ئیبرستاد کە توێژەرێکی پەیمانگەی پرۆژەکانی ئەمریکایە، مەزەندەی وەهایە کە ژمارەی دانیشتووانی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٣٠دا لە ٦٥ ملیۆن کەس زیاتر دەبێت، لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتووانی ئەورووپا هەر بە جێگیری دەمێنێتەوە. هەروەها ئیبرستاد سەبارەت بە ئەورووپا درێژە بە قسەکانی دەدات و دەڵێت" ژمارەی ئەو گەورەساڵانەی کەوا تەمەنیان لە ٦٥ ساڵ زیاترە، دوو هێندەی ژمارەی ئەو منداڵانەیان لێ دێت کەوا تەمەنیان لە خولی پانزە ساڵییەوەیە، ئەمەیش چەند نێوەرۆکێکی نیگەرانیکاری ئایندەیی لەخۆی دەگرێ. (لە ئێستەدا دابەزینی ژمارەی منداڵان واتا دابەزینی ژمارەی کارگەرانی داهاتوو). بەڵام لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا، زیاتربوونی رێژەی منداڵان لە گەورەساڵان هەر زیاتر دەبێت. بەشی دانیشتووان لە نەتەوەکانی یەکگرتوودا وەها مەزەندە دەکات کە رێژەی ئەو کەسانەی لە تەمەنی کاردان لە بەرانبەر هاووڵاتییانی پیر لە خۆرئاوای ئەورووپادا کە لە ئێستەدا ٣.٨:١یە، لە ساڵی ٢٠٣٠دا دادەبەزێتە ٢.٤:١. بەڵام رێژەکە لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا لە ٥.٤:١ بۆ ٣.١:١ دادەبەزێت و دەکرێ هەندێك لەو گرفتە دیموگرافییانە چاك بکرێن ئەگەر پیرانی ئەورووپا بڕیار

بدەن زیاتر کاربکەن، بەڵام تاکو ئێستە ئەمەیان نەکردووە و زۆر دووریشە ئەم بیاردانە وەرچەرخانیان بەسەردا بێت". تاکە ڕێگەی زانستی بۆ خۆپاراستن لەو لێزبوونەوە دیمۆگرافییە ئەوەیە کە ئەورووپا ڕێژەیەکی زیاتری کۆچبەران وەربگرێ. گەرچی ئەورووپییە ڕەسەنەکان لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧ەوە بەتەواوی لە وەدیهێنانی جێگرەوەکانی خۆیان وەستاون، ئەوە مانای ئەوەیە کە تەنانەت پاراستنی ڕێژەی هەنووکەیی دانیشتووان پێویستی بە وەرگرتنی کۆچبەرێکی بە ڕێژە باش هەیە. بەڵام کەشەکردن پێویستی بە وەرگرتنی کۆچبەرێکی زۆرتر هەیە. بەڵام وەك دێتە بەرچاو جڤاکەکانی ئەورووپا ناتوانن پێشوازی لە خەڵکانێك بکەن و لەخۆیان بگرن کە کەلتوور و ڕۆشنبیرییەکی نامۆ و ناباویان هەیە. پرسی ئەوەی کێ لەسەر هەڵەیە – کۆچبەران یان جڤاکەکان– پەیوەندیی بە بابەتی توێژینەوەکەی ئێمەوە نییە. بەڵام واقیعی سیاسی ئاماژە بەوە دەکات کە لەو کاتەی ئایندە ئابوورییەکەی ئەورووپا پشت بە وەرگرتن و لەخۆگرتنی زۆرێك لە پەنابەران دەبەستێ، بەڵام لە هەمان کاتدا بەرەو ڕێکاری وەرگرتنی ڕێژەیەکی کەمتری کۆچبەران دەچێت. بەڵام ئەمریکا یەکەمین گەلی جیهانی بونیاد دەنێت کەوا لە گشت نەژاد و ڕەنگ و ئاین و باوەڕێك پێکهاتووە و لەگەڵ یەکتریشدا بەشێوەیەکی تەواو گونجاو دەژیەن.

بەڵام ئەوەی بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە زۆرێك لە وڵاتانی ئاسیایی – نەنیا مبند نەبێت– لە دۆخێکی دیمۆگرافییانەی هاوشێوەی ئەورووپا و تەنانەت خراپتریشدا دەژیەن. چوونکە تێکڕا و ڕێژەکانی بەپیتی(الخصوبە) لە یابان و تایوان و کۆریا و هۆنگ کۆنگ و چیندا* لە ئاستی لەجێدانان (الاستعاضە) زۆر

---

* ) لەوانەیە ڕێژەی منداڵبوون لە چیندا ورد نەبێت، ئەمەیش بەهۆی سیاسەتی یەك منداڵەوەیە کە لەلایەن حکوومەتەوە پێڕەو دەکرێ، بەڵام کۆرایی و کۆبەندیی دیموگرافی هەر

نزمترە (٢.١ منداڵبوون بۆ هەر ئافرەتێك)، هەروەها مەزەندەكان ئامارە بەوە دەكەن كە هەندێك وڵاتی سەرەكیی خۆرهەڵاتی ئاسیایی لە نیوەی سەدەی داهاتوودا ڕووبەڕووی دابەزینێكی گەورەی ژمارەی هاووڵاتییە كارگەرەكانیان دەبنەوە. پێش ماوەیەك ژمارەی هاووڵاتیانی كارگەر لە یابان گەیشتە ترۆپك، بەڵام لەگەڵ ساڵی ٢٠١٠ و بەبەراورد لەگەڵ ساڵی ٢٠٠٥دا دەگاتە ڕێژەی سێ ملیۆن كارگەر. چارەڕوانكراویشە كە لە ماوەی دەیەی داهاتوودا ژمارەی كارگەران لە چین و كۆریا بگاتە ترۆپك. هەروەها دەستگەی گۆلدمان ساكس پێشبینیی دەكات كە ڕادەی مامناوەندیی تەمەن لە چیندا لە ٣٢ی ساڵی ٢٠٠٥ەوە بۆ ٤٥ ی ساڵی ٢٠٥٠ بەرز دەبێتەوە (زیادبوونێكی زۆر لە تەمەنی چینییەكان). لەوانەیە لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠٣٠ دا ژمارەی پیرانی تەمەن ٦٥ ساڵ بەسەرەوە لە چیندا وەك ژمارەی منداڵانی تەمەن خوار ١٥ ساڵیی لێبێت. هەروەها ڕەنگە وڵاتانی ئاسیایی بەقەد وڵاتانی ئەورووپی دووچاری گرفتی كۆچبەران ببنەوە و یابانیش دووچاری كەمبوونەوەیەكی شیمانەكراوی ژمارەی كارگەرانی ببێتەوە، چوونكە ناتوانێ پێشوازی لە هاتنی ژمارەیەكی پێویستی كۆچبەران بكات و ڕێگەش نادات ئافرەتانی بەشێوەیەكی تەواو بەشداری لە هێزە كارگەرەكەیدا بكەن.

پیربوونی دانیشتووان كاریگەریی گەورەی هەیە. یەكەم، باری گرانی خانەنشینی هەیە- ژمارەیەكی كەمی كارگەران پاڵپشتی لە ژمارەیەكی گەورەتری پیرانی سەر و ڕیشسپی دەكەن- دووەم، هەروەك بنجامین جۆنزی زانای ئابووری ڕوونی دەكاتەوە كە داهێنەرترین ئافرێنەر- و زۆربەی ئەوانەی خەڵاتی نۆبلیان

---

بە دروستی دەمێننەوە، ئەمیش ئەوەیە كە ڕێژەی تێكرای بەپیتی و منداڵبوون لە چیندا پانزە ساڵ یان زیاتر دەبێت كە لە ئاستی لەجێدانان ( الاستعاضة) كەمترە

وەدەستهێناوە- گرنگترین كار و بەرهەمیان لە تەمەنی سی و چل و چوار ساڵیدا ئـەنجام دەدەن. سـێیەم، لەگـەڵ زۆرتربـوونی تەمـەنی كارگـەران، لـە پاشكەوتكارەوە دەبنە خەرجكار، ئاقیبەتە مەترسیدارەكانی ڕێژەی پاشكەوت و وەبەرهێنانی نیشتمانیش گرفتێكی دیكەیە. سەبارەت بە وڵاتـانی پێشكەوتووی پیشەسـازی- كـەوا لـە حەسـانەوە و ڕەزامەنـدی و حـەزی كـەمتری كـاری مانـدووكاردا دەژیـەن- ئـەوا پێكهاتـە خراپەكـەی دیمۆگرافیـاش نەخۆشـییەكی كوشندەیە.

دانیشتووانە سپیپێستەكانی ئەمریكی - ئەوانەی هـەر لـە ئـەمریكا لـەدایكبوون- وەك هاوتـا ئەورووپییـەكانیان ڕێژەیـەكی دابـەزیوی بـەپیتییان هەیـە. ئەگـەر كۆچبەران نەبوونایە، ئەوا گەشـەكردنی تێكڕای بەرهـەم و داهـاتی نێوخـۆیی لـە ماوەی چارەگە سـەدەی ڕابـردوودا هاوشـێوەی گەشـەكردنی ئـەوەی ئەورووپایـە. هەروەها لەپێشدانەوە و پێشەنگایەتیی (تفوق) ئەمریكا لە داهێنان تـا ئاسـتێكی زۆر دەرئەنجامی مەسەلەی كۆچبەرییە. چوونكە خوێندكارانی بیانی و كۆچبەران ٥٠٪ی نوێژەرە زانسـتییەكانی وڵات پێكدەهێنن، كە لـە سـاڵی ٢٠٠٦دا لـە لقـە زانسـتییەكان و ئەندازیاریـدا ڕێـژەی ٤٠٪ی باوەڕنامـەكانی دكتۆرایـان وەدەستهێنا، هەروەها بە ڕێژەی ٦٥٪ باوەڕنامەكانی دكتۆرایان لـە زانسـتەكانی كۆمپیوتەر وەدەستهێنا. لەگەڵ هاتنی ساڵی ٢٠١٠، خوێندكارانی بیانی زیـاتر لـە ٥٠٪ی ئەو باوەڕنامانەی دكتۆرا وەدەستدێنن كەوا لـە ویلایەتـەكانی یـەكگرتووی ئـەمریكادا لـە گشـت بوارەكانـدا دەبەخشـرێن. هـەروەها لـە لقـەكانی زانسـتیدا ژمارەكـە لـە ٧٥٪ نـزیكتر دەبێتـەوە. گەشـەكردنی شـیمانەكراو لـە توانـای بەرهەمهێنانی ویلایەتەكانی یەكگرتوودا و لەپێشدانەوە و پێشەنگایەتیی (تفـوق) لـە تـەكنۆلۆژیای وورد و تـەكنۆلۆژیای بایۆلۆژیـدا، هـەروەها توانـای بـۆ داڕشـتنی

ئاینده بەنده بە سیاسەتی پەیوەندداو بە کۆچبەرییەوە. جا ئەگەر ئەمریکا توانی ئەو کەسانە بهێڵێتەوە کەوا لەنێو وڵاتدا فێریان دەکات، ئەوا داهێنان و ئافراندنی نیادا بەرپا دەبێت. خۆ ئەگەر گەڕانەوە وڵاتەکەیان ئەوا داهێنان و ئافراندنەکە لەگەڵ خۆیاندا دەبەن.

جگە لەمانەی سەرەوەش، پرسی کۆچبەری لە ئەمریکادا پەروەشی و وزە دەبەخشێتە ویلایەتەکانی یەکگرتوو بەتایبەت ئەگەر بە وڵاتانی دیکەی دەوڵەمەند بەراورد بکرێ. چونکە کاتێک وڵاتان زیاتر دەوڵەمەند دەبن، ئەوا پاڵنەری پێشکەوتن و وەدیهێنانی سەرکەوتن لاواز دەبێت. بەڵام ئەمریکا بۆ پاراستنی وزە و زیندوویەتی بەردەوام نوێبوونەوەی خۆی، ڕێگەیەکی نوێی دۆزیوەتەوە. ڕێگەکەش لە میانی لافاوی ئەو کەسانەیە کەوا تەمای ئەوەیان هەیە لە جیهانێکی نوێدا ژیانێکی نوێ بژیەن. ئەو کەسانە ئەوانەن کەوا چەندان کاتژمێری دووروودرێژ لەبەر تیشکی سووتێنەری خۆردا میوە دەچنن و قاپشۆریی دەکەن و تەلارەکان بونیاد دەنێن و لە نێشتگرییەکانی شەواندا نۆرە دەگرن و شوێنەکانی زبڵ و خاشاك پاك دەکەنەوە. ئەوان لە هەلومەرجی زۆر خراپەوە دێنە ویلایەتەکانی یەکگرتوو و لەدوای خۆیاندا خانەوادە و جڤاکێك بەجێدەهێڵن، تەنیا لەبەرئەوەی لە ژیاندا کار و پێشکەوتنیان دەوێ. ئێستەیش هەمووبان دەبینین کەوا بوونەتە بڕبڕەی پشتی چینی کارگەری ئەمریکی، منداڵ و نەوەکانیشیان بوونەتە بەشێك لە نۆرم و شێوازی ژیانی ئەمریکی. ئەمریکا توانی سوود لەو وزەیە وەربگرێ و هەمەچەشنییەکان بەڕێوەببات و ئەو کەسە نوێیانە لەخۆی بگرێ کەوا هاتوونەتە نێویەوە و لەڕووی ئابووریشەوە پێشبکەوێت. لە کۆتاییشدا هەر خودی ئەو مەسەلەیەیە کە ئەمریکا لەوە بەدوورده‌خاتەوە ئەزموونەکەی بریتانیا و گشت نموونەیەکی دیکەی مێژوویی زلهێزەکانی بواری

ئابووری دووبارە بکاتەوە کەوا زۆر فەڵەر و تەنبەڵ بوون، دواتر لە بەردەم رابوونی گەلانی زۆر لەخۆیان لاوازتر و زیندووتر پاشەکشە بکەن.

## وێنەیەکی سەرتاپاگیر (الشاملة)

زۆرێك لە شارەزایان و لێکۆڵەران و تەنانەت هەندێك لە سیاسییەکان، لە هەمبەر کۆمەڵێك لەو ئامارانەدا هەست بە نیگەرانی دەکەن کەوا هۆشداریی خراپ لەمەڕ ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەدەن. ڕێژەی پارە و داراییە پاشکەوتکراوەکان سفرە، هەروەها کورتهێنان لە حیسابی ڕەوان (الجاري) و کورتهێنانی بازرگانی و گوژمەشدا بەرزە. نیوەڕاستی دەرامەتیش هەر لە شوێنی خۆیدا ماوەتەوە، پابەندبوون بە پێشکەشکردنی یارمەتیی کۆمەڵایەتی هەرگیز نایەتەدی. ئەگەر سیستمی ئابووریی ئەمریکا کرۆکی هێزی ئەمریکا بێت، ئەوا سیستمە سیاسییەکەی کرۆکی لاوازییەکەیەتی. بەڵام دەبێ بشزانین کە ژمارەکان هەموو ئەو شتانەمان پێشکەش ناکەن کەوا پێویستمان بە زانینیان هەیە. چوونکە ئەو ئامارە ئابوورییانەی کەوا پشتیان پێ دەبەستین پێوەرێکی نزیککردنەوەیی (التقريبي) و کۆنی ئابووریمان پێشکەش دەکەن. چوونکە زۆربەیان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا لەپێناو وەسفکردنی ئابوورییەکی وەها داندراون کەوا لە دەرەوەی سنووری دەوڵەتەکانەوە چالاکییەکەیان دیاریکراوە. بەڵام ئێستە ئێمە لە بازاڕێکی وابەستە و پەیوەندداری جیهانیدا دەژین و شۆڕشێکی بەرفراوانیش لە بواری ئامرازەکانی دارایی و تەکنۆلۆژی و بازرگانییدا بوونی هەیە. لەبەرئەوە، ئەگەرێك هەیە لەوەی کە ئێمە بەشێوەیەکی دروست شتەکان هەڵنەسەنگێنین.

بۆنموونە، لە ولاتانی پێشکەوتووی پیشەسازیدا، شتێك هەبوو کە پێی دەگوترا ئەو بێکارییەی هەڵئاوسان خێرا ناکات (NAIRU) و یەکێك بوو لە پاسایە گشتییەکانی زانستی ئابووری. بەشێوەیەکی سەرەکی ئەمە مانای ئەوە بوو کە ناکرێ بێکاری دابەزێتە خوار ئاستێکی دیاریکراو بەبێ ئەوەی هەڵئاوسان بەرزبکاتەوە. بەلام لە دوو دەیەی ڕابردوودا، ڕێژەی بێکاری لە زۆربەی لە ولاتانی خۆرئاواییدا و بەتایبەت لە ویلایەتەکانی یەکگرتوودا، لەژێر ئەو ڕێژەیە بوو کەوا زانایانی ئابووری پێیان وەهابوو شتێکی کردەیی (ممکن)ە. با نموونەیەکی دیکە بهێنینەوە؛ وەها شیمانە دەکرا کە چەقبەستن لە حیسابی ڕەواندا لە ئەمریکا هی ئەوەیە لەلای ڕێژەی ٤٪ی تێکڕای بەرهەمی نێوخۆییدا پالپشتیی لێ بکرێ، لەگەڵ ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٧دا گەیشتە ٨٠٠ ملیار دۆلار، واتا ٧٪ی تێکڕای بەرهەم. ڕاستە کە چەقبەستنەکە لە حیسابی ڕەواند گەیشتە ئاستێکی مەترسیدار، بەلام پێویستە ئەوەشمان لەبیربێت کە زێدەیەکی جیهانی لە پارەکانی پاشەکەوتدا هەیە و ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکاش هەر بە شوێنێکی سەقامگیر و سەرنجڕاکێشی ناناسایی دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی وەبەرهێنانی تیادا بکرێ.

ڕیچارد کووپر لە زانکۆی هارفارد جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕێژەی پارەی پاشکەوتی ئەمریکی بەشێوەیەکی نادروست هەژمار دەکرێ، هەروەها وێنەیەکی نادروست سەبارەت بە بوونی قەرزێکی زەبەلاح لە کارتەکانی متمانە (الائتمان) و بارمتەکانی خانووبەرەدا هەیە کە ناکرێ بەرگەیان بگیرێ. چوونکە هەرچەندە زۆربەی خانەوادە ئەمریکییەکان بەڕاستی لە ژیانێکدا دەژیەن کە زۆر بەرزترە و لەگەڵ توانا مادییەکانیاندا ناگونجێ، ئەوا وێنەکە بەپێی بۆچوونی کووپر لە ڕووی تێکڕاییەوە بە ڕاست دەچێت. چوونکە کۆی پارەی پاشەکەوتی تایبەت بە

ئـەمریکا- کـەوا پاشـەکەوتی خانـەوادەییش دەگرێتـەوە (ژمارەیـەکی نزمـە کـە زۆرجار بەلگـەی پـێ دەهێندرێتـەوە و نزیکـەی تـەنیا ٢٪ دەرامـەتی کەسـییە)- هەروەها پاشەکەوتی کۆمپانیایـەکان لـە سـاڵی ٢٠٠٥دا ١٥٪ بـووە. بـە واتایـەکی دیکـە، دابـەزینی ئاسـتی پاشـەکەوتی کەسـی بەرزبوونـەوەی پاشـەکەوتی کۆمپانیایی پارسەنگی دەداتەوە. لەمەیش گرنگتر ئەوەیە کـە لەوانەیـە بیرۆکـەی تێکـڕا و کـۆی پاشـەکەوتی نیشـتمانی، مـۆدێلی کـۆن بووبێـت و بەڕاسـتی شـێوازەکانی بەرهـەمهێنانی نـوێ پیشـان نـەدات، چـوونکە لـە ئـابووریی نوێـدا، گەشەکردن لە کۆمەڵێك خەڵکەوە دێت کەوا کاڵا و خزمەتگوزاریی نوێ دادەهێـنن نەك کەڵەکەبوونی پارە و دارایی". کەوا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا زۆر گرنگتر بوو. لەگەڵ ئەمەیشدا ئێمە تا ئێستەیش جەخت لەسەر حیسابی سەرمایە دەکەینـەوە. چـوونکە حیسـاباتەکانی نیشـتمانی کـەوا بـەپێی بۆچـوونی کـووبر تێکـڕای بەرهـەمی نێوخـۆیی و پێـوەرە تەقلیدییـەکانی پاشـەکەوتی نیشـتمانی دەگرێتـەوە، " لـە سـییەکانی سـەدەی بیسـتەمدا لـە بریتانیـا و ویلایەتـەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا لە ترۆپکی سەردەمی پیشەسازیدا داڕێژراوە".

ئابووریناسان وەها پێناسەی پاشەکەوت دەکەن؛ دەرامەتێکە و لـەجیات ئـەوەی ڕاستەوخۆ بە ئاراستەی بەکاربردن بڕوات، لەپێناو ئەگەری بەکاربردن لە ئایندەدا وەبـەرهێنان دەکـات. پێـوەرە هەنووکەییـەکانی وەبـەرهێنانیش جـەخت لەسـەر سـەرمایەی مـادی و نیشـتەجێکردن دەکەنـەوە. بـەلام کـووبر جـەخت لـەوە دەکاتەوە کە ئەم پێوەرە سەرلێشێوێنەرە. چوونکە خەرجییەکانی فێرکـردن بـە بەکاربردن دادەنێت، بەلام، لـەو ئابوورییـەی کـەوا پشـت بـە زانیـاری و مەعریفـە دەبەسـتێ، ئـەو خەرجییانـەی کـەوا لـە فێرکردنـدا خـەرج دەکـرێن، ڕۆڵێکـی هاوشێوەی پاشەکەوت دەگێڕن- لەمڕۆدا خەرج دەکرێن بۆ ئەوەی سەرمایە زیاد

بکات و دەرامەت و توانای خەرجکردن لە ئایندەدا بەرزبکاتەوە. هەروەها خەرجییەکانی نوێژینەوە و پێشخستنی تایبەت هەرگیز ناچنە نێو چوارچێوەی حیسابانەکانی نیشتمانییەوە، بەڵکو بە خەرجییەکی مامناوەندیی بازرگانی دادەندرێن، هەرچەندە زۆربەی توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە خەرجکردن بۆ لێکۆڵینەوە و پێشخستن بەشێوەیەکی گشتی قازانجی بەرز ببەخشێت؛ کە زۆر بەرزترە لەو وەبەرهێنانەی کەوا لە بواری بیناسازی -بەپێی گوزارشتی ئەنووکەیی- وەك پاشەکەوتێك دادەندرێ. بەمشێوەیە کووبر ئەو خەرجییانەی کەوا لە کڕینی شتەکاندا - ئەو شتانەی زۆر دەمێننەوە (comsumer -durables) هەروەها لە فێرکردن و لێکۆڵینەوە و پێشخستندا خەرج دەکرێن، بە پارەی پاشەکەوتکراو دادەنێ؛ ئەمەیش ڕێژەی پاشەکەوتکردن لە ولابەتەکانی یەکگرتوودا زۆر بەرز دەکاتەوە. هەرچەندە پێوەرە نوێیەکە ڕێژەی لای گەلانی دیکەش بەرز دەکاتەوە، بەڵام بەشداریکردنی ئەو خەرجییانە (فێرکردن، لێکۆڵینەوە و پێشخستن و ئەو شتانەی زۆر دەمێننەوە) لە پارەی پاشەکەوتکراوی تێکڕاییدا " لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا بەرزترە لە زۆربەی ولاتانی دیکە، لەوانەیە هەندێك ولاتانی ئەسکندنافی نەبێت".

لەگەڵ کۆی ئەمانەشدا، هێشتا ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بەدەست چەندان گرفتی مەترسیدارەوە دەناڵێنێ. چەندان ناراسنەی باو هەن کە ئەگەر بە پوانگەیەکی سەرتاپاگیری ئابووریی لێیان بنوارین مرۆڤ دووچاری نیگەرانی دەکەن، بۆ نموونە ڕێژەی پاشەکەوت بەبێ ڕەچاوکردنی ژمارەکەی لەمڕۆدا، لە سالەی نوو دەبەی ڕابردوودا زۆر بە توندی دابەزیوە. جا بەپێی گشت پێوەرەکان، بەرنامەی دەستەبەری تەندروستی هەڕەشەی ویرانکردنی گوژمەی لیبرالییە. هەروەها وەرچەرخانی خێرا لە زێدەوە (الفائض) بەرەو کورتهێنان

لەنێوان هەردوو ساڵی ٢٠٠٠- ٢٠٠٨ دەرئەنجامی مەترسیداری هەیە. هەروەها دەرامەتەکانیش بۆ گشت خانەوادەکان زۆر بەهێواشی بەرز دەبنەوە. گەشەکردنی نایەکسانیش کەوا بە ڕوخسارە زۆر زەق و بەرچاوەکەی سەردەمی نوێ دادەندرێ و بەهۆی هێزێکی سێ ڕەهەندییەوە پتەو دەکرێ و پاڵپشتیی لێ دەکرێ: ئابووریی مەعریفە، تەکنۆلۆژیای زانیارییەکان، جیهانگەرایی. ئەوەی لە هەمووان زیاتر جێگەی نیگەرانییە ئەوەیە کە ئەمریکییەکان ٨٠٪ ی زیادەی پاشەکەوتی جیهانی قەرز دەکەن و لە بەکاربردندا خەرجی دەکەن. لە کۆتاییشدا، ئەم گرفتانە لە کاتێکی زۆر خراپدا کەڵەکە دەبن، چوونکە ئابووریی ئەمریکا- بە گشت هێزێکییەوە- لە ئێستەدا ڕووبەڕووی گەورەترین و بەهێزترین بەرەنگاری و گرفتی وەها دەبێتەوە کە لە مێژووی خۆیدا هەرگیز نەیبینیوە.

## هەمووان هەمان گەمە دەکەن

با نموونەیەك لە وەرزشە زۆر خۆشەویستەکەی خۆم بهێنمەوە کە ئەویش تێنسە. ئەو ئەمریکییانەی کەوا حەز لە تێنس دەکەن بەمدواییانە دیاردەیەکی نیگەرانیکاریان تێبینی کردووە: دابەزینی ئاستی ئەمریکا لە پاڵەوانییەتییەکانی تێنس. ئارۆن بیلهۆفەر لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمزدا ئەو ژمارانە دەهێنێتەوە کەوا ئەمە دەسەلمێنن. ماوەی سی ساڵە، ئەمریکییەکان لە پاڵەوانیەتیی کراوەی ئەمریکادا نیوەی خشتە پێکدەهێنن (واتا نیوەی یاریزانەکان کەوا ژمارەیان ١٢٨ و بۆ کێبڕکێکردن تیایدا هەڵبژێردراون). بۆنموونە، لە ساڵی ١٩٨٢ دا لە کۆی ١٢٨ یاریزاندا ٧٨ یاریزان ئەمریکی بوون، بەبەراورد لەگەڵ بیست یاریزان کەوا بۆ کێبڕکێکردن لە پاڵەوانیەتیی ساڵی ٢٠٠٧ دا هەڵبژێردراون. زۆر کەس پرسیار لەهۆی دابەزین و لێژبوونەوەی ئاستی ئەمریکا دەکەن و دەڵێن بۆچی ئەمریکا بەمشێوە خێرایە بۆ ئەم ئاستە دابەزیوە. وەڵامەکەش خۆی لە کۆمەڵێك ژمارەی

دیکەدا شاردووەتەوە. ٢٥ دەوڵەت یاریزانەکانی خۆیان هەنارد بۆ ئەوەی لە پاڵەوانیەتیی کراوەی ئەمریکادا بەشداری بکەن. بەلام لە ئێستەدا ژمارەی وڵاتەکان بووەتە ٢٥ دەوڵەت، واتا زیادبوونەکە بە رێژەی ٤٠٪. وڵاتانی وەک رووسیا و کۆریای باشوور و سربیا و ئوسترالیا لە ئێستەدا یاریزانی رێزی یەکەم بەرهەم دەهێنن، هەروەها ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئیسپانیا لە پێشوو زیاتر مەشق بە یاریزانەکانیان دەکەن. لە حەفتایەکانەوە سێ وڵاتی ئەنگلۆساکسۆنی- ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا، بریتانیا، ئوستورالیا- بەتەواوی دەستیان بەسەر تێنسدا گرتووە. لە کاتێکدا ئەو یاریزانانەی کەوا لە ساڵی ٢٠٠٧دا لە شانزە پلەکەی پێشەوە پۆلێنکراون سەر بە دە وڵاتی جۆراوجۆرن، کارکرد (الاداء) ی ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە ماوەی دوو دەیەی رابردوودا خراپ نەبوو؛ تەواوی مەسەلەکە بریتییە لەوەی کە هەمووان - کتوپڕ- لە ئێستەدا ئەم گەمەیە دەکەن.

ئەگەر گەمەی تێنس زۆر پووچیش بێتە بەرچاو، با تەماشای گەمەیەکی سەرکێشانەتر بکەین. لە ساڵی ٢٠٠٥دا شاری نیویۆرک بۆ بێداربوونەوە و ئاگاداری هۆشداریيەکی دا. بیست و چوار دەرچوونی سەرەتایی پشکەکان (IPO) لە کۆی بیست وپێنج لە گەورەترین دەرچووی ئەو ساڵەدا لە وڵاتانی دیکەی جگە لە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکادا پێشنیاز کران. رووداوێکی تەزێنەر و هەژێنەر بوو، چوونکە بەبەردەوامی بازاڕەکانی دراوی ئەمریکی مەزنترین و قووڵترین و زیاترین ڕاپێنەی دراوییان (السیولە) یان لە جیهاندا هەبوو. ویلایەتەکانی یەکگرتوو پارەی بەخشییە ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کەوا لە هەشتایەکاندا بەسەر پیشەسازیدا هات، هەروەها شۆڕشی تەکنۆلۆژی لە نەوەدەکان و قەڵەمبازە بەردەوامەکانی زانستی بایۆلۆژیاش لەلایەن ئەمریکاوە

پشتگیریی لێ کرا. ئەم ڕۆینە (السیولە)ی بازاڕەش بوو کەوا بازرگانیی ئەمریکی بە سڕکراوی هێشتەوە. نیگەرانییەکەی هێندە گەورەبوو کە سەرۆکی شارەوانیی نیویۆرک مایکل بلۆمبێرگ و سیناتۆر لە چاری چاک سکامر دەستگەی ماکنزی ئاند کۆمپانییان ڕاسپارد کە ڕاپۆرتێك ئامادە بکەن بۆ ئەوەی تۆخی توانای کێبڕکاریی دارایی شاری نیویۆرك هەڵسەنگێنێ. ڕاپۆرتەکەش لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٦دا دەرچوو.

بەشێکی زۆری ئەو گفتوگۆیەی کەوا باسی گرفتەکەی دەکرد، جەختی لەسەر زۆریی یاسایەکانی ئەمریکا دەکردەوە؛ بەتایبەت ئەو یاسایانەی کەوا دوای مەسەلەی کۆمپانیای ئەنرۆن دەرچوون وەك یاسای ساربانیس- ئۆکسلی، هەروەها هەڕەشەی بەردەوام بە لێپێچینەوەی یاسایی کەوا بەسەر سەری بازرگانیی ویلایەتەکانی یەکگرتوودا دەسووڕایەوە، تەنگەژەیان دروست دەکرد. ئەو دۆزینەوانە ڕاستن، بەلام بەڕاستی هۆی وەرچەرخان و ئاراستەگرتنی بازرگانی بۆ دەرەوە ئاشکرا ناکەن. چوونکە ئەمریکا وەك جاران و بەشێوەیەکی باو چالاکییە بازرگانییەکانی خۆی ئەنجام دەدا، بەلام خەڵکانی دیکە دەهاتنە نێو گەمەکەوە. لەبەرئەوە، یاسای ساربانیس- ئۆکسلی و چەندان ڕێکاری دیکەی یاسایی، ئەو کاریگەرییەی دروست نەدەکرد ئەگەر ڕاستیی هەبوونی ئەلتەرناتیڤی دیکەی هەنووکەیی نەبوایە. ئەوەی لێرەدا ڕوو دەدات، وەك هەر ناوچەیەکی دیکە، زۆر سانایە: ئەوانی دیکە ڕادەبن. چوونکە کۆی گشتیی پشك و قەواڵە و سپاردە و قەرز و هۆکارەکانی دیکە لە ئەمریکادا- بە واتایەکی دیکە بەدەگە جیهانییەکەی- هێشتا هەر لە پێش کۆی گشتیی ئەو هۆکارانەیە کەوا لە هەر ناوچەیەکی دیکەدا هەن، بەلام ناوچەکانی دیکەش گەشەکردنێکی خێرای ئابووریی و داریی بەخۆیانەوە دەبینن. ئەمەیش بەشێوەیەکی تایبەت بەسەر

ولاتە گەشەسەندووە هەڵکشاوەکانی ئاسیادا پیادە دەبێت- بە ڕێژەی ١٥.٥٪ی ساڵانە لەنێوان ساڵانی ٢٠٠١ و ٢٠٠٥دا- بەڵام بەسەر ئەورووپاشدا پیادە دەبێت کە گەشەکردنێك بەڕێژەی ٦.٠٥٪ وەدەستدێنێت و (لە ڕێژەی گەشەکردنی ئەمریکا نزیکترە). لە ساڵی ٢٠٠١دا، سەدا ٥٧ی دەرچوواندنی پشکەکانی سەرەتایی IPOsی گرانبەها لە بازاڕەکانی دراوی ئەمریکیدا هاتەکایەوە، ئەمەیش لە بەرانبەر١٦ ٪ ساڵی ٢٠٠٥بوو. هەروەها لە ساڵی ٢٠٠٦دا هەر ئەوەتا ویلایەتە یەکگرتووی ئەمریکا سێیەکی ژمارەی نێکرایی دەرچوونە سەرەتاییەکانی پشکەکانی کرد کەوا لە ساڵی ٢٠٠١دا پێشوازیی لێ کرد، لە کاتێکدا بازاڕەکانی دراو و دارایی ئەورووپی، قەبارەی دەرچوونە سەرەتاییەکانی پشکەکان IPOsی تایبەت بەخۆی کرد کە ڕێژەکەی ٣٠٪ بوو، قەبارەکە لە ئاسیا و (بەتەنیا یابان نەبێت) دوو هێندە بوویەوە. هەروەها داهاتەکانی دەرچوونە سەرەتاییەکانی پشکەکان IPOS و لیستە بیانییەکان تەنیا بەشێکی ئەم چیرۆکەن. چوونکە لێ وەرگیراوی ئابووریی (مشتقات مالیە derivitves) نوێ هەن کەوا پشت بە ئامرازی سەرەکیی دارایی دەبەستن، وەك پشکەکان و دانەوەکانی ڕێژەی سوود، کە بەنیسبەت سندووقەکانی دەستەبەرکردن hedge funds و بانکەکان و کۆمپانیایەکانی دەستەبەری و بژێنەی (السیولە) تێکرایی بازاڕەکانی نێو دەوڵەتی، گرنگییەکەی بەشێوەیەکی جێگیر زیاد دەکات. ئەو پاریزانەی کەوا دەستی بەسەر بازاڕەکانی نێودەوڵەتی بۆ لێ وەرگیراوەکانی داراییدا گرتووە لەندەنە، چوونکە بازاڕە داراییەکانی بەرپرسن لە ٤٩٪ی بازاڕی لێ وەرگیراوە داراییەکانی تایبەت بە ئاڵوێرکردنی دراوی و ٣٤٪ لە بازاڕی ڕێژەی سوود. (بەڵام ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بەرپرسی ١٦٪ و ٤٪ی ئەو دوو بازاڕەیە بەشێوەیەکی زنجیرەداری بەدوا یەکدا هاتوو). هەروەها بازاڕەکانی داراییی ئەورووپا

بەشێوەیەکی گشتی ٦٠٪ لێ وەرگیراوە داراییەکانی پەیوەندار بە ڕێژەی سوود و ئاڵۆزیی دراوی و پشکەکان و پارەدانەکان (التمویل) پێکدەهێنێت. چاوپێکەوتنەکانی دەستگەی ماکنزی کە لەگەڵ هەندێك سەرکردەی پیاوانی کار لە جیهاندا ئەنجامی داون ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەوروپا نەك تەنیا ئەزموونی تەواوی بەسەر لێ وەرگیراوە داراییەکاندا هەیە، بەڵکو ئەزموونی بەسەر داهێنانی لێ وەرگیراوە نوێیەکانیشدا هەیە. تەنیا یەك بەرهەم نەبێت کە ئەم مەسەلەیە نەیگرتووەتەوە و تیایدا ئەوروپا دوای ئەمریکا دێت، ئەویش کاڵایەکانە.

لە ڕاستیدا، چەند هۆیەکی دیاریکراوی ئەم دابەزین و لێژبوونەوەیە هەن، بۆنموونە، زۆرێك لە دەرکراوە سەرەتاییە گەورەکان کەوا لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦دا لە ئەوروپا ڕوویان دا بەهۆی تایبەتکردن (خصخصە)ی کۆمپانیایەکانی حکوومیی چین و ئەوروپاوە بوو. بێگومان لەو کاتیشدا دەرکراوە چینییەکان چوونە هۆنگ کۆنگ، هەروەها ئەوەی ڕووسیا و ئەورووپای خۆرئاواییش چووە لەندەن. لە ساڵی ٢٢٠٠٦دا سێ لە گەورەترین دەرچوواندنی سەرەتایی پشکەکان لە بازاڕەکانی گەشەسەندووەوە هاتن. بەڵام کۆی ئەمانە بەشێکن لە دیاردەیەکی فراوانتر، ئەویش ئەوەیە کە ئەو دەوڵەت و کۆمپانیایانەی لە ئێستەدا چەند بژاردنێکیان لەبەر دەستدایە، پێشتر ئەو بژاردانەیان نەبوو، بازاڕەکانی دارایی لە دەرەوەی ئەمریکا– بەتایبەتیش لە هۆنگ کۆنگ و لەندەن– بەشێوەیەکی باش ڕێکخراون، ئەمەیش ڕێگە بە کۆمپانیایەکان دەدات چەند هۆکارێکی دیکە ڕەچاو بکەن، وەك ناوچە زەمەنییەکان و فراوانبوون و سیاسەت.

کاتێك کۆمپانیایەکانی ئەمریکی دەچوونە دەرەوە، ڕاهاتبوون لەسەر ئەوەی سەرمایە و زانیاری لەگەڵ خۆیاندا ببەن. بەڵام کاتێك لە ئێستەدا دەچنە دەرەوە، ئەوەیان بۆ ڕوون دەبێتەوە کەوا دانیشتووانانی نێوخۆیی پێشوەخت

پارە و زانیارییان هەیە. بەڕاستی جیهانێك بەناوی جیهانی سێیەم نەماوە. کەواتە، کۆمپانیایەکانی ئەمریکی چ شتێك لەگەڵ خۆیاندا دەبەنە هیند و بەرازیل؟ هەروەها سەرلیستە کێبڕکێکارییەکەی ئەمریکا چییە؟ ئەم دوو پرسیارە هەرگیز پیاوانی کاری ئەمریکی بەگشتی بە مێشکیاندا نەهاتووە – کەمێکیان نەبێ– بەوەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ناچار دەبن وەڵامیان بدەنەوە. وەڵامەکەش خۆی لە شتێکدا حەشارداوە کەوا زانای ئابووریزان مارتن وۆڵف لە کاتی وەسفکردنی جیهانی گۆڕاودا ئامازەی بۆ کردووە، ناوبراو گوتوویەتی کە پسپۆڕانی ئابووری لەسەر ئەوە ڕاهاتبوون گفتوگۆ لەسەر دوو چەمکی سەرەکی بکەن: سەرمایە و کار، ئەم دووانەش دەبنە دوو کاڵا کە لەبەردەستی هەموواندایە. بەڵام ئەوەی کە تایبەتمەندی بە چالاکیی ئابووری دەبەخشێت هێز و وزەن. لەسەر هەر دەوڵەتێك پێویستە لە ئێستەدا یان سەرچاوەی هێزەکان بێت یانیش وزە (واتا نەوت و گازی سروشتی و خەڵووزی بەردین و هتد). ویلایەتەکانی یەکگرتوو پێشتر و ئێستەیش لەتوانایدایە وەك گرنگترین سەرچاوەی بەردەوامی هێزە نوێیە بچووك و گەورەکان، تەکنیکی و داهێنانییەکان، ئابووری و سیاسییەکان بمێنێتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی بتوانێ ئەمە بکات، دەبێ چەند گۆڕانکارییەکی گرنگ ئەنجام بدات.

## سیاسەتێکی بێ بەرهەم

ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا مێژوویەکە لە نیگەرانیی هەمبەر لەدەستدانی بێشکەوتن و پێشەنگایەتییەکەی. ئەمەیش بەلای کەمەوە شەپۆلی چوارەمە بۆ ئەو نیگەرانییەی کەوا هەر لە ساڵی ١٩٤٥ەوە سەری هەڵداوە. ئەوەی یەکەم لە کۆتاییەکانی پەنجایەکاندا بەهۆی ناردنی مانگی دەستکردی سپوتنیکی یەکێتیی سۆڤییەتەوە سەری هەڵدا. دووەمیش لە سەرەتای حەفتایەکاندا بوو،

کاتێـك نرخـی بـەرزی نـەوت و گەشـەکردنی هێـواش ئـەو بـاوەڕەی لـە لای ئەمریکییەکان دروستکرد بەوەی کە ئەورووپای خۆرئاوایی و سعوودییە دوو هێزی ئایندەن، لەبەرئـەوە سـەرۆك نیکسـۆن گەیشـتنی جیهـانێکی فـرە جەمسـەری ڕاگەیاند. هەروەها شەپۆلی سێیەم لە نێوەڕاستی هەشتایەکاندا گەیشت، ئەویش لەو کاتەدا بوو کە زۆربەی شارەزایان باوەڕیان وەهابوو ژاپان دەبێتـە مـەزنترین هێزی هەژموونداری بەسـەر تـەکنۆلۆژیا و ئابووریـیـەوە. بـەڵام هەرچـەندە لـە هـەر یەکێك لەو دۆخانـەدا هەسـتی نیگـەرانی چـەند بنەمایەکی لۆژیکییانـەی هـەبوو، بەڵام هیچ یەکێك لـەو سـیناریۆیانە وەدینـەهاتن. هۆیەکـەش دەگەڕێتـەوە– هـەر وەك واقیـع سـەلماندی– بۆ نەرمی و توانای خۆگونجێنەرانەی سیسـتمی ئـەمریکی و سروشـتـە داهێنـەرەکـەی و توانـای هەڵمـژینی هێنـمـەکان و چـاککردنەوەی هەڵـەکانی و وەرچـەرخاندنی ئاگاییەکـەی. بیرکـۆیی خسـتنە سـەر دابـەزین و لێژبوونـەوەی ئـابووریی ئـەمریکی لـە کۆتاییـدا بـووە هـۆی ئـەوەی خـۆی لێ بـەدووربگرێ. گرفتەکـەی ئـەمڕۆش خـۆی لـەوەدا دەبینێتـەوە کـە سیسـتمی سیاسیی ئەمریکی بۆ چارەسەرکردنی گرفتـە ئاڵۆزەکـانی توانـای بەرهـەمهێنانی هاوپەیمانییی فراوان و تواناداری لەدەستداوە.

لە ئێستەدا کەموکورتییە ئابوورییەکانی ئـەمریکا ڕاسـتینن، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشتی، دەرئەنجامی خاڵەکانی ئیفلیجبوونی سەختی وەزیفییانەی نێـو ئـابووریی ئەمریکی نین، هەروەها ڕەنگدانەوەی هەڵوەشانەوەی کـەلتووری و ڕۆشـنبیریش نـین؛ بـەڵکو دەرئـەنجامی سیاسـەتە دیاریکراوەکـانی حکوومەتـە. هـەروەها پشتبەستن و گرتنەبەری سیاسەتی جۆراوجۆر دەتوانێ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئـەمریکا بـە خێرایـی و ئاسـانییەکی ڕێـژەیی بباتـە پێگەیـەکی سـەقامگیرتر کـە بەراورد ناکرێ. لەوانەیـە سـبەینێ بڕیـار لەسـەر کۆمـەڵێك ڕیفـۆرمی ئامانجداری

کرداری بدریَ کەوا ئامانجیان کەمکردنەوە و دابەزاندنی خەرجییەکان و بارمەتییە ناپێویستەکان و زیادکردنی پاشەکەوت و فراوانکردنی مەشق لە بوارە کردارییەکان و تەکنۆلۆژییەکان و دەستەبەرکردنی مووچەکانی خانەنشینی و دۆزینەوەی چەند رێکارێکی کردارییانەی تایبەت بە کۆچبەران و گەیشتن بە رێگەی کارا بێت بۆ بەکارهێنانی وزە*. لەمەیشدا ناکۆکییەکی گەورە لەهەمبەر زۆربەی پرسەکاندا لەنێوان پسپۆڕانی سیاسەتەکاندا نییە، هەروەها زۆربەی رێکارە پێشنیازکراوەکانیش پێویستیان بە قوربانیدانی وەها نییە کەوا تەنگوچەڵەمە و شەکەتییەکانی کاتی جەنگمان بیر بێنێتەوە، بەڵکو تەنیا چەند هەموارکردنەوەیەکی کەمی ئەو چارەسازییانەن کەوا لە ئێستەدا هەن. لەگەڵ ئەمەیشدا، بەهۆی سیاسەتەوە بە شتی نەکردەیی دێنەبەرچاو. سیستەمی سیاسیی ئەمریکی توانای چارەسەری لە سنوورێکی بەرفراواندا لەدەستداوە، هەروەها ئەو توانایەشی لە دەستداوە کە لە ئێستەدا بەرگەی کەمە ئازارێك بگرێت بۆ ئەوەی دواتر سوودێکی زۆری پێبگات.

ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەگەڵ چوونی بۆ نێو سەدەی بیست و یەك، ئابوورییەکی بونیاد لاواز یان جڤاکێکی هەڵوەشاوەی نییە، بەڵام ژیانێکی زۆر ئیفلیجکارانەی بێشخستووە. پارەوپوول و بەرژەوەندیی تایبەت و ئامرازە ئابوورییەکانی

---

*) ریفۆرمی چاریێوریکرینی تەندروستیم نەخستووەتە نێو ئەم لیستەوە، چوونکە گرفتێك نییە کە بتواندرێ بە ساناییی چارە بکرێ. زۆربەی گرفتەکان لە واشنتۆندا پێویستیان بە چەند چارەسەرێکی سانا و سادە هەیە کەوا پەیوەندییان بە سیاسەتەوە هەیە، بەڵام لەبەرەوەی ئیفلیجبوونێکی سیاسی دەبینێتەوە. چاودێریکردنی تەندروستی لەسەر ئاستی سیاسەتەکان و لە هەمان کاتیشدا ئاستی سیاسیشەوە گرفتێکی ئاڵۆزە. ئەمەیش مانای ئەوە نییە کە پێویستی بە چارەسەر نییە، بەڵام بەردەوامی لە سایەی هەموو هەلومەرجەکاندا یەك وەك ئەمڕۆ چارەسەرەکەی دژوار بووە.

ڕاگەیاندن و کۆمەڵەکانی دروستکردنی فشار لەسەر سیستمی سیاسی، تووشی کەموکورتییەکی وەزیفی و زۆر توند بووەتەوە و تەمەنیشی نزیکەی ٢٢٥ ساڵ دەبێت. دەرئەنجامەکەش بێزبازییەکی توندی بێ وەستانە سەبارەت بە شتی پووچ- سیاسەت وەك شانۆیە- هەروەها مانا و هەماهەنگی و کردارێکی کەم هەیە. ولاتە پڕ لە گوروناو و باوەڕدارەکە بە کردەیەکی سیاسییانەی بێ بەرهەم شەکەت کراوە و کردەیەکی سیاسییە کە زیاتر بۆ ململانێی حزبی داڕێژراوە نەك بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان. لەگەڵ گەشەکردنی بەرژەوەندیی تایبەت و زیادبوونی کۆمەڵەکانی فشار و خەرجیی سیاسیی (pork-barrel spending)، پرۆسەی سیاسی لە سێ دەیەی ڕابردوودا زیاتر لایەنگرانە و کەمتر کارایە.

زۆرێك لە زانایانی سیاسەت حەزدەکەن کە هەردوو حزبە سیاسییەکە لە ئەمریکادا لە ڕووی بێگەردیی ئایدۆلۆژی و ڕێککاری و سیستماتیکبوونی توندوتیژ، زیاتر بە حزبەکانی ئەورووپی بچن. هەر چۆنێك بێت، ئەمە ڕووی دا. ئێستەیش ژمارەی میانڕۆیەکانی هەردوو لا وردە وردە کەم دەبنەوە، دەرئەنجامەکەش ئەوەیە کە ئێمە گەیشتینە ڕێگەی داخراو. سیستمەکانی پارلەمانی لە ئەورووپا لەگەڵ هەبوونی پارتی دەمارگیریشدا کارەکانیان بەشێوەیەکی زۆرباش بەڕێوەدەبەن، چوونکە دەستەڵاتی سیاسی دەتوانێ بەئاسانی بەرنامەی کارەکانی جێبەجێ بکات. بۆنموونە سەرۆکوەزیرانی بریتانی پێویستی بە هیچ جۆرە پاڵپشتییەکی پارتی ئۆپۆزسیۆن نییە، چوونکە زۆرینەی دەستەڵاتداری هەیە. بەلام سیستمی ئەمریکی لە بەرانبەردا، سیستمی دەستەڵاتێکی هاوبەش و ئەرکی تێکچڕژاو و دابەشکردنی تواناداریییەکانە (صلاحیات). پێشکەوتنیش پێویستی بە هاوپەیمانیی فراوانی نێوان دوو پارتی

سیاسی و نا دەمارگیر هەیە. لەبەر ئەوە بوو کە جیمس مادیسۆن متمانەی بە پارتەکانی سیاسی نەبوو، لەگەڵ گشت دەستە و تاقمە جوداخواز و جیابووەکانی دیکەدا بەیەك چاو تەماشای دەکردن و بە مەترسییەکی مەزنی سەر دەوڵەتی لاوی ئەمریکی دادەنان.

دەزانم کە کۆی ئەم سکالاّ و گلەییانە بە میسالی و ڕۆمانسی دێنەبەرچاو، هەروەها ئەوەش دەزانم کە بەردەوام و تەنانەت لە سەردەمی مادیسۆنیشەوە دەمارگیرییەکی بێزراو و نەگریس لە ئەمریکادا هەبووە. بەڵام، لەگەڵ ئەمانەیشدا هاوکارییەکی زۆر لەنێوان هەردوو حزبدا هەبووە بەتایبەتیش لە سەدەی ڕابردوودا. چوونکە لە ڕەوتی کاردانەوەیان لەهەمبەر ئەو ناکۆکییە سیاسییەی کەوا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمی پێ دەناسرایەوە- دواجار کە تیایدا دوو هەڵبژاردنی کێبڕێکارانە بەدوای یەکدا ئەنجام دران- زۆرێك لە سیاسییەکانی ئەمریکا هەوڵیان دا هێزێك دروست بکەن کەوا ئامانجی دروستکردن و دامەزراندنی دەستەهەڵاتێکی چاکەخواز بێت و چارەسەری گرفتەکان بکات. ڕۆبێرت بروکینگز لە ساڵی ١٩١٦دا پەیمانگەی برۆکینگزی لە واشنتۆندا دامەزراند چوونکە ناوبراو ڕێکخراوێکی " دوور لە بەرژەوەندیی سیاسی یان ئابووری دەویست..... ئەمەیش لەپێناو کۆکردنەوە و شیکردنەوەی ڕاستییە کرۆکییە ئابوورییەکان بوو بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی پتەو و لۆژیکی بیخاتە بەردەم وڵاتەکە". یەکەم سەرنووسەری گۆڤاری فۆرین ئەفێرز- کەوا لە دەستەکەی ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە دەردەچوو و لە ساڵی ١٩٢١ دامەزرا، بە جێگرەکەی خۆی گوت کە ئەگەر یەکێککیان وەك دیموکراسییەك بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ کرا، ئەوا لەسەر ئەوی دیکەیان پێویستە لەپێناو بەرژەوەندیی گۆمارییەکان یەکسەر دەست بە هەڵمەتێك بکات. ئەمە لەگەڵ دەستەیەکی

شرۆڤکاردا بەراورد بکە کەوا هێندە لەمێژ نییە دامەزراوە– دەسنگەی هێریتیگ فاوندەیشنی موحافەزەکار– هەروەها لەگەڵ ئەو قسەیەش بەراوردی بکە کە جێگری پێشووی سەرۆکەکەی بۆرتۆن بایەنز گوتبووی: " ڕۆڵی ئێمە ئەوەیە دروستکاری بڕیاری موحافیزەکاران پێشکەش بکەین و لە هەمان کاتیشدا چەند بەلگەیەك پێشکەش بکەین کەوا پاڵپشتی لە ئێمە دەکەن".

گرفتەکە خۆی لەوەدا حەشارداوە کە پێشکەوتن لە هەر گرفتێکی سەرەکیدا– چاودێریکردنی تەندروستی، دەستەبەری کۆمەلأیەتی، ڕیفۆرمی باجی– پێویستی بە چارەسەر و هەماهەنگیی هەردوو حزبەکە هەیە. هەروەها لە سیاسەتی دەرەوەشدا، دارشتنی سیاسەتێکی ستراتیژی سەبارەت بە عێراق یان ئێران یان کوریای باکور و چین، پێویستی بە پاڵپشتییەکی بەهێزی هەردوو حزب هەیە. مەسەلەکە پێویستی بە نوارینێکی دوورمەودا هەیە. بەلأم ئەمە تا ئاستێکی زۆر دوور شیمانە بۆ نەکراوە. چوونکە ئەوانەی پاڵپشتیی لە چارەسەرە ئەقلأنییەکان و دەرچواندنی یاسایەکانی چارەسەر دەکەن، لە لایەن سەرکردایەتیی حزبەوە پەرلوێز دەخرێن، ئەو پارە و سامانەش لە دەستدەدەن کەوا لە کۆمەڵەکانی خاوەن بەرژەوەندیی تایبەتەوە هاتوون و بەردەوامیش لە تەلەفزیۆن و رادیۆیەکاندا لەلایەن لایەنەکەی خۆیانەوە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا هێرشیان دەکرێتە سەر. چوونکە سیستەمەکە شتی هاندەر و دەم چەورکردنی باش پێشکەشی ئەو کەسانە دەکات کەوا بە پایەداری دەمێننەوە و دەگەڕێنەوە نێو تیمەکەی خۆیان و بە تیمەکە دەڵێن کە ئەوەت ڕەتکردووەتەوە مل بۆ دوژمن کەچ بکەیت. ئەمەیش بۆ کۆکردنەوەی سامان مەسەلەیەکی باشە، بەلأم بۆ دەستهەلأت و حوکمرانی زۆر مەترسیدارە.

بەکورتی، تاقیکردنەوە ڕاستینەکە بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا– لە هەندێك لایەندا– پێچەوانەی ئەو دۆخەیە کەوا بریتانیا لە ساڵی ۱۹۰۰دا ڕووبەڕووی بوویەوە. هێزی ئابووریی بریتانی بەشێوەیەکی پلەبەپلە لاواز دەبوو، لەگەڵ ئەمەیشدا توانی هەژموونە زەبەلاحە سیاسییەکەی لە گشت جیهاندا بپارێزێ. بەڵام ئابووری و جڤاکی ئەمریکی توانایان هەیە ڕووبەڕووی فشار و کێبڕکێیەکانی ئابووری ببنەوە. ئەوان هەردووکیان دەتوانن خۆیان بگونجێنن و بەپایەداری بمێننەوە. بەڵام تاقیکردنەوە ڕاستینەکە بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا تاقیکردنەوەیەکی سیاسییە و بەتایبەت دەکەوێتە سەر شانی واشنتۆنەوە، بەتەنیا و بەشێوەیەکی گشتی لەسەر شانی ئەمریکا نییە. جا ئایا واشنتۆن دەتوانێ لەگەڵ جیهانێکدا خۆی بگونجێنێ کەوا تیایدا خەڵکانی دیکە ڕادەبن و گەشە دەکەن؟ هەروەها ئایا دەتوانێ مامەڵە لەگەڵ وەرچەرخانەکانی نێو هێزە سیاسی و ئابوورییەکان بکات؟ ئایا بەڕاستی دەتوانێ بەرگەی جیهانێکی فرە دەنگ و بیروبۆچوون بگرێت؟ ئایا دەتوانێ لە جیهانێکدا گەشەبکات کەوا خۆی تیایدا هەژموون و کۆنترۆڵی نییە؟

## مەبەست و ئامانجی ئەمریکی

کاتێك مێژوونووسان هەوڵ دەدەن لە جیهانی سەدەی بیست و یەك تێبگەن، دەبێ لەیرانی دوورگەی پارسلی ( Parsley کە واتای کەرەوز دەگەیەنێ) تێبگەن. لە تەمووزی ساڵی ۲۰۰۲دا حکومەتی مەغریبی دوانزە سەربازی ناردە دوورگەیەکی بچووك کە ناوی لەیلا بوو، ئەو دوورگەیە لەنێو گەرووی جەبەل تاریقدایە و چەند سەد پێیەك لە کەنارەکەی دوورە. سەربازەکان لەوێدا ئاڵای خۆیان هەڵدا. هەرچەندە دوورگەکە هیچ دانیشتووانێکی لێ نییە – هەندێك بزن نەبێت– هیچ شتێکیش تیایدا گەشەی نەکردووە تەنیا کەرەوزی کێوی نەبێ

(هەر لێرەشەوە ناوە ئیسپانییەکەی خۆی perejil)ی وەرگرتووە، سەبارەت بەخاوەنداریکردن لەو دوورگەیە لەنێوان مەغریب و ئیسپانیادا ململانێیەکی کۆن هەیە و هەر یەکێك لەو دوو وڵاتە خۆیان بە خاوەنی دەزانن. دوای چەند هەفتەیەك ٧٥ سەربازی ئیسپانی لەسەر دوورگەکە دابەزین و ئاڵایە مەغریبییەکەیان دابەزاند، لە جیاتیدا دوو ئاڵای ئیسپانییان چەقاند و مەغریبییەکانیان ڕەوانەی وڵاتەکەیان کردەوە. حکوومەتی مەغریبی زۆر بەتوندی نارەزایی دژ بەو کرداره جەنگییەی ئیسپانیا دەربڕی و چەندان خۆپیشاندانی گەورەی ڕێکخست و تیایدا گەنجەکان ئەم دروشمەیان دەگوتەوە: " بەگیان، بەخوێن، فیداتین ئەی لەیلا!" ئیسپانیا هێلیکۆپتەرە جەنگییەکانی بەسەر دوورگەکەدا دەسووڕاندەوە و کەشتییە جەنگییەکانیشی لە بەرانبەر کەناری مەغریبیدا جێگیرکردبوو. بۆ چاودێرێکی دوور، کۆی مەسەلەکە بە تۆپیرایەکی کۆمیدی دەهاتە بەرچاو. بەڵام، مەسەلەکە چەندە پووچ و بێمانا بێت، ئەوا کەسێك ناچار دەبوو قسە لەگەڵ هەردوو وڵاتدا بکات و هەوڵ بدات بە خۆگری و ئارامییەوە باوەڕیان پێبهێنێت.

نەتەوەکانی یەکگرتووە یان یەکێتیی ئەورووپا ئەم ڕۆڵەیان نەگرتە ئەستۆ، هەروەها هیچ وڵاتێکی ئەورووپیی هاوڕێ وەك فەرەنسا کە پەیوەندیی باشی لەگەڵ هەردوو وڵاتدا هەبوو، خۆی لێ نەکردنە ساحێب، بەڵکو ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا ئەم ڕۆڵەی گرتە ئەستۆ. لەمبارەیەوە، کۆلن پاوڵی وەزیری دەرەوەی ئەوکات سەبارەت بەم مەسەلەیە بە وردە گاڵتەیەکەوە دەڵێ:" لەگەڵ خۆمدا بیرم دەکردەوە، من چ پەیوەندییەکم بەکۆی ئەم شتانە هەیە؟ بۆچی ئێمە – ویلایەتەکانی یەکگرتوو- لەنێو جەرگەی مەسەلەکەداین؟". کاتێکیش ئەوە ڕوونبوویەوە کە گشت ڕێگەکانی دیکە سەرکەوتنیان وەدەستنەهێنا، بە

گەڕێکی دیبلۆماسییانەی گەرموگوڕی تەلەفۆنی دەستپێکرد، تا کاتێکی درەنگی شەوی هەینی و بەیانیی ڕۆژی هەینی زیاتر لە دوانزە پەیوەندیی تەلەفۆنی لەگەڵ پاشای مەغریب و وەزیری دەرەوەیدا ئەنجام دا. " بڕیارم دا فشار دروست بکەم بۆ ئەوەی بگەینە چارەسەرێکی خێرا، چوونکە ئەگەر من وەهام نەکردبایە، ئەوا هەستی لووتبەرزی و عیزەتی نەفس زاڵدەبوو و هەڵوێستەکان ڕەق دەبوون و کەسەکان زیاتر کەللەڕەق دەبوون. شەو باڵی خۆی بەسەر دەریای نێوەڕاستدا کێشابوو، ئەوەکانیشم بۆ مەلەوانیکردن دەهاتن! "

لەبەرئەوە، پاول ڕەشنووسی ڕێککەوتنەکەی بە کۆمپیوتەرەکەی ماڵەوە نووسی و هەردووکیانی ناچارکرد پێی ڕازی بن، بە قەڵەمی خۆیشی لە جیات هەردوو لایەن واژۆی کرد و دواتر بە فاکس بۆ هەریەکە لە ئیسپانیا و مەغریبی نارد. هەردوو وڵات لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە دوورگەکە بە بەتاڵی و چۆڵی بهێڵنەوە و سەبارەت بە دۆخە ئایندەییەکەی لە ڕیبات دانیشن و دەست بە گفتوگۆ بکەن. هەردوو حکوومەت دوو ڕاگەیاندنیان دەرکرد و تیایدا سوپاسی ئەمریکایان کرد، چوونکە لە چارەسەرکردنی قەیرانەکە یارمەتیی داون. کۆڵن پاوڵیش لەگەڵ ئەوەکانیدا چووە مەلەوانیکردن.

ئەمە نموونەیەکی بچووکە، بەڵام ئاماژەپێدەرە. ویلایەتەکانی یەکگرتوو هیچ بەرژەوەندییەکی لە گەرووی جەبەل تاریقدا نییە. بەپێچەوانەی یەکێتیی ئەوروپاش هیچ هەژموونێکی تایبەتی بەسەر ئیسپانیا و مەغریب نییە. ناشتوانێ وەک نەتەوەکانی یەکگرتوو بەناوی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی قسەبکات. بەڵام تاکە وڵاتیش بوو کە بتوانێ چارەسەری ململانێیەکە بکات، ئەویش لەبەر هۆیەکی کرۆکی و زۆر سادە بوو: لە جیهانێکی تاکجەمسەردا، تاکە زلهێز بوو.

وەها لەساڵی ٢٠٠٢ دەنوارڕدرێ کە ترۆپکی سیستمی ئاکجەمسەرییە. بۆ ئەمریکا سانە رۆمانییەکەیە. دەبەی پێشی دەیەیەکی دڵخۆشکەر و شادیهێن بوو، چوونکە واشنتۆن زیادەیەکی زەبەلاحی بەرهەم دەهێنا و بەهای دۆلاریش زۆر بەرزبوو، هەروەها بەڕێوەبەرانی جێبەجێکاری ئەمریکی ئەستێرەی جیهانی بوون. لە کۆتاییشدا، جیهان بینی کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە ساڵی ٢٠٠١دا زۆر دڕندانە هێرشی دەکرێتە سەر، ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی هاوسۆزییەکی گەورە لە هەمبەریدا دروستببێت. هەندێکیش هەستیان بە بەختەوەری دەکرد کە بینیان زلهێزێك خەریکە ملکەچ و سەرشۆڕ دەبێت. بەلاَم فراوانبوونی سنووری کاردانەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەهەمبەر ئەو هێرشەدا لە توانای وێناندنی هەر دەوڵەتێکی جیهان زۆر بەدووربوو. چوونکە واشنتۆن یەکسەر ٥٠ ملیار دۆلاری خستە سەر گوژمەی بەرگرییەکەی؛ تەنیا زیادەکە لە کۆی گوژمەی ساڵانەی بریتانیا و ئەڵمانیا زۆرتر بوو. هەر بەتەنیاش تیرۆری خستە سەرووی لیستی ئەجیندای جیهانییەوە، ئەمەیش وەهای کرد کە وڵاتانی دیکە بە خۆ گونجاندن لەگەڵ ئەم بەندەدا سەرلەنوێ سیاسەتی دەرەوەی ئاراستە بکەنەوە، بۆنموونە پاکستان کە ماوەی چەند ساڵێك هاوپەیمانی بزووتنەوەی تاڵیبان بوو، لەماوەی هەفتەیەکدا دژی وەستایەوە. دوای یەك مانگیش ویلایەتەکانی یەکگرتوو هێرشی کردە سەر ئەفغانستان کەوا حەوت هەزار میل لێیەوە دوورە– زۆربەی هێرشەکانیش لە ئاسمانەوە بوو– بەخێرایی سیستمە ئەفغانییەکەی ڕووخاند.

لە ئێستەشدا هێشتا ئەمریکا تاکە زلهێزە، بەلاَم چەند خاڵێکی لاوازیشی هەیە. ئابوورییەکەی بەدەست چەند گرفتێکەوە دەناڵێنێ، هەروەها نرخی دراوەکەی لە دابەزین و لێژبوونەوەدایە، چەند گرفتێکی دوور مەوداشی هەیە کەوا ڕووبەڕووی

بووەتەوە و پەیوەندیی بە بەرزبوونەوەیەکی گەورەی ژمارەی ئەو کەسانە هەیە کەوا پشت بە یارمەتییەکانی کۆمەلایەتی دەبەستن، ڕێژەی پارە پاشەکەوتکراوەکانیشی لە نزمبوونەوەدایە. هەروەها هەستەکانی دوژمنایەتیی دژ بە ئەمریکا لە گشت شوێنێکدا- هەر لە بریتانیا تا دەگاتە مالیزیا- بەشێوەیەکی نائاسایی بەرزبووەتەوە. بەلام دەبێ بزانین کە وەرچەرخانە بەرجەستەترەکە و سەرسوڕهێنەرترەکەی نێوان نەوەدەکان و ئێستە هیچ پەیوەندییەکی بە ویلایەتەکانی یەکگرتووەوە نییە، بەلکو پەیوەندیی بە گشت جیهانەوە هەیە. چوونکە لە نەوەدەکاندا ڕووسیا بەتەواوی پشتی بە یارمەتی و قەرزەکانی ئەمریکا بەستبوو، بەلام لە ئێستەدا زیادەی گوژمەی سالانەی خۆی زیادەگەیەنێ کە دەیان ملیار دۆلارە. هەروەها ولاتانی خۆرهەلاتی ئاسیا کە ئەوکات لەپێناو دەرچوونیان لە قەیرانەکانیان پێویستییەکی زۆریان بە سندووقی دراوی نێودەولەتی بوو، ئێستە یەدەکی زەبەلاحی پارەی بیانییان هەیە و بۆ بەخشینی قەرز بە ئەمریکا بەکاری دەهێنن. هەروەها لە نەوەدەکاندا، خواستی ئەمریکی بە تاکە هێزی پالنەری گەشەکردنی چینی دادەنرا. بەلام چین لە سالی ٢٠٠٧دا بەشدارییەکی وەهای لە گەشەکردنی جیهانیدا کرد کەوا زۆر لە بەشدارییەکەی ویلایەتەکانی یەکگرتوو گەورەتربوو- بەلای کەمەوە لە دەیەی سییەکانەوە یەکەم جارە کەوا ولاتێک لە وەدیهێنانی ئەمەدا سەرکەوتن وەدەستبێنێ- هەروەها وەک گەورەترین بازاڕی بەکاربەران لە جیهاندا لە چەند دەستە و بوارێکی گەوهەریدا پێش ئەمریکا کەوتووە.

ئەم دیاردە جیهانییە - ڕابوونی ئەوانی دیکە- لە دووربەودادا هەمیشە لە کەلەکەکردنی هێزی خۆی بەردەوام دەبێت، بەبێ ڕەچاوکردنی بەرزی و نزمییە کانییەکانی. بەلام ئەمریکا هەرچەندە بونیادی سەرتاپاگیری ناکجەمسەری-

لەسەر ئاستی ئابووری و دارایی و رۆشنبیریدا- وردەوردە لاواز دەبێت، بەڵام هەر لە ئاستە هەژموونداره سیاسی و سەربازییەکەی بەسەر جیهاندا دەمێنێتەوە. هێشتاکەش واشنتۆن هیچ کێبڕکێکارێکی ڕاستینی نییە، هەروەها بۆماوەیەکی بەڕێژە درێژیش ئەم کێبڕکێکارەی ئەمریکا پەیدا نابێت، بەڵام ڕووبەڕووی چەندەها کۆتوبەندی جۆراوجۆر دەبێتەوە. بێگومان، جیهانی تاکجەمسەری کە ماوەی چەند دەیەیەکە ماوەتەوە، هەر بەخێرایی و لە شەو و ڕۆژێکدا کتوپڕ نابێتە جیهانێکی دووجەمسەری یان فرەجەمسەر، بەڵکو وەرچەرخانەکە لە سروشتی پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتیدا بەهێواشی ڕوودەدات. تاکجەمسەری وەك ڕاستییەکی دیاریکەری سیستمی نێودەوڵەتی لە ئێستەدا بەردەوام دەبێت، بەڵام لەگەڵ گوزەرکردنی هەر ساڵێکیشدا زیاتر لاوازتر دەبێت، لە هەمان کاتیشدا هێزی وڵاتانی دیکە و یاریزانانی دیکە زیاتر دەبن.

لەوانەیە ئەم وەرچەرخانە لە هێزدا بەشێوەیەکی گشتی بەسوود بێت. چوونکە یەکەم؛ بەهۆی شتی نوێی وەك گەشەکردنێکی بەهێزی ئابوورییەوە هاتووەتە ئاراوە و لە گشت جیهاندا دەبێتە هۆی سەقامگیری. ئەمەیش بۆ ئەمریکا سوودبەخشە ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی گونجاو مامەڵەی لەهەمبەردا بکرێ. چوونکە جیهان لەسەر ڕەوت و ڕێبازی ئەمریکا بەڕێوە دەڕوات، هەروەها وڵاتانیش دیموکراسیتر و کراوەتر دەبن و زیاتر سیستمی بازاڕ پەسند دەکەن. جا مادام ئێمە هێزی نوێگەری و کارلێکی جیهانی و بازرگانی دەپارێزین و پارمەتیی گەشەکردنیان دەدەین، ئەوا دەستهەڵاتی باش و مافی مرۆڤ و دیموکراسیبەت هەر هەموویان بەرەو پێشەوە هەنگاو هەڵدێنن. ئەگەرچی ئەم بزاڤە بەردەوام خێرا نییە، چوونکە بەناچاری ڕووبەڕووی کۆسپونەگەرە دەبێتەوە، بەڵام ئاراستە سەرەکییەکەی ڕوونە. تۆ تەماشای ئەفریقیا بکە کە بەزۆری وەك

کیشوەرێکی وەها لێی دەنواڕدرێ کەوا کەمترین هیوا دەبەخشێ؛ بەشی هەرە زۆری کیشوەرەکە لە ئێستەدا بوونەتە دیموکراسی و لە نرخی گەشەکردنی ئابووریدان.

ئەم دیاردانە دەرفەتێك بە ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەبەخشن بۆ ئەوەی لە جیهانێکی دەوڵەمەندتر و دینامیتر و ووروژێنەرتر ببێتە پاریزانێکی تەوەرەیی و سەنترالی. بەلاَم سوود وەرگرتن لەم دەرفەتە پێویستی بە گۆڕانێکی گەورەی ئەمریکا هەیە بۆ ئەوەی زیاتر لە جیهان نزیکبێتەوە. ئەمریکا بەهێزە رێژەییەکەی خۆی دەتوانێ زۆر شت بکات، هەرچەندە ئەم هێزە لەگەڵ زیادبوونی هێزی وڵاتانی دیکە کەمتر دەبێتەوە، بەلاَم هێشتا شتێکی زۆر بۆ واشنتۆن دەمێنێتەوە کە سەبارەت بە سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی مەبەست و ئامانجی ئەمریکا ئەنجامیان بدات.

## چاکییەکانی ( فضائل ) کێبڕکێکردن

چۆن ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لەوەدا شکستی هێنا سوود لە دەرفەتەکانی خۆی وەربگرێ؟ ئەمریکا کارتی زۆر قازانجهێنی دەگمەنی لەبەردەستدابوو بۆ ئەوەی لە کاروبارەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بەشێوەیەك بەکاریبهێنێ کە تا ئێستە لە مێژووی هیچ وڵاتێکدا بۆ هیچ دەوڵەتێك نەڕەخساوە. بەلاَم لەگەڵ ئەمەیشدا لە گشت ئاستەکاندا بەشێوەیەکی خراپ گەمەی بە کارتەکان کرد. ئەمریکا هەژموونێکی بێوێنەی وەدەستهێنا. ئەدی چی لێکرد؟

ئەوەی جێگەی گاڵتەپێکردنە ئەوەیە کە ئەو مەرجەی وەهای کرد گشت ئەو هەڵە و سەرچیغرۆیشتنانە ببنە شتێکی کردەیی و ڕێتێچوو– بەبێ ڕەچاوکردنی کاریگەریی کەسییەتییەکان و سیاسەتە دیاریکراوەکان (کە بەهەرحاڵ شتی زۆری لەبارەوە نووسراوە) – هێزە زەبەلاحەکەی ئەمریکایە. ئەمریکییەکان متمانەیەکی مەزنیان بە چاکییەکانی کێبڕکێکردن هەیە. ئێمە پێمان وایە کە کاتێك کەشێکی کێبڕکێکارانە دەڕەخسێ، تاك و کۆمەڵە و کۆمپانیایەکان کارێکی باشتر ئەنجام دەدەن. بەڵام لەسەر گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا ئەو ڕاستییەمان لەبیرچوو. چوونکە هەر لەگەڵ داڕووخانی یەکیەتیی سۆڤییەتەوە، ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە جیهاندا وەك پەیکەرێکی بێوێنەی زەبەلاح لووتبەرزیی دەنواند. ڕاستە کە ئەم کارە چەند سوودێکی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا وەهای کرد واشنتۆن لووتبەرز و کەمتەرخەم و تەنبەڵ بێت. هەندێکجار سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا هاوشێوەی ئەو ستراتیژە بوو کە جەنەراڵ مۆنتۆڕز لە کۆتاییەکانی هەفتایەکاندا گرتیەبەر؛ نزیککارییەك بوو کەوا بە چەند هۆکارێکی نێوخۆیی پاڵی پێوەنرابوو، گرنگییەکی کەمیش بەو کەشە فراوانە دەدات کەوا کاری تیادا دەکات. ئەم سیاسەتە لەگەڵ جەنەراڵ مۆنتۆڕزدا سەرکەوتوو نەبوو، تاکو ئێستە لەگەڵ ویلایەتەکانی یەکگرتووشدا سەرکەوتوو نەبووە.

زۆربەی سیاسییەکان و شارەزایانی سیاسی– بە ئەمریکی و بیانییەکانەوە– لە قبووڵکردنی جیهانی ئاکجەمسەردا دواکەوتن. لە ساڵی ١٩٩٠دا، لەو کاتەی یەکیەتیی سۆڤیەت دادەڕووخا، مارگرێت تاتشەر بۆچوونێکی ئاشکراکرد کە لەو کاتیدا باوبوو، ئەویش ئەوەبوو کە جیهان بەرەو سێ ئاراستەی هەرێمیی هەنگاو دەنێ،" یەکێکیان پشت بە دۆلار دەبەستێ، یەکێکیشیان بە یەنی یابانی، یەکێکی دیکەش بە مارکی ئەڵمانی". جۆرج بۆشی باوك خۆی نقوومکردنە نێو

سیستمێکی نوێ جەمسەری و هەرگیز وەك سەرۆکی تاکە هێزێکی مەزن ڕەفتاری نەکرد. هەروەها لە هەمبەر ئەو گۆڕانە مێژووییانەی کەوا بەسەر سیستمی جیهانیدا دەهاتن، بە تەقیبیەوە خۆی نزیك دەکردەوە. چوونکە لەجیات ئەوەی بانگەشەی سەرکەوتنێکی بێوێنە بکات لە جەنگی سارد دا، ئیدارەکەی تەنیا ڕەفتاری ئەوە بوو کە بە شێنەیی دەستکەوتەکانی داڕووخانی یەکیەتیی سۆڤیەتی کۆبکاتەوە، هەروەها بەردەوامیش ئەوەی ڕەچاوکردبوو کەوا لەوانەیە ئەم کردەیە بە دژە ئاراستە وەرچەرخێت یان بەتوندوتیژی کۆتایی پێبێت. کاتێکیش جۆرج بۆش خۆی بۆ جەنگی یەکەمی کەنداو ئامادە دەکرد، زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی هاوپەیمانییەکی نێودەوڵەتی بونیادبنێت و ڕەزامەندیی نەتەوەکانی یەکگرتووی دەستکەوێ و پابەندی ئەو سەرپشککردنە بێت کەوا جەنگ شەرعییەتەکەی بەخشیبوو. کاتێکیش کورتهێنانی ئەمریکی زیادی کرد و ئابووریی ئەمریکی بەرەو کرژبوونەوە و پاشەکشەکردن چوو، جیمس بێکەری وەزیری دەرەوەی ناردە زۆرێك لە وڵاتانی جیهان بۆئەوەی لەپێناو جەنگدا پارە کۆبکاتەوە. هەروەها گەورەترین دەستکەوتی سیاسەتە دەرەکییەکەی – واتا یەکخستنی ئەڵمانیا– بەهۆی بەکارهێنانی هێزێکی تاکلایەنە بەدینەهات بەڵکو بەهۆی دیبلۆماسییەتێکی هاوکارانە بوو– هەرچەندە ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا لەو کاتیدا گشت کارتە قازانجبەخشەکانی لەبەر دەستدابوو. هەروەو ئەڵمانیا لە میانی هاوپەیمانییەکی خۆرئاواییەوە بوونە یەك، ۳٤۰۰۰۰ ڕووسی نێو بەبێدەنگی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیان جێهێشت– لەگەڵ ملکەچی و ملدانێکی تەواوی مۆسکۆدا.

هەندێك وەها دركیان دەکرد کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەگەڵ داڕووخانی یەکیەتیی سۆڤیەتدا تاکە جەمسەرە کە مابێتەوە، بەڵام شیمانەی ئەوەیان کرد

کە تاکجەمسەریی قۆناغێکی ڕاگوزەرە، یان بەپێی یەکێك لە ڕۆژنامەوانەکان چرکە ساتێکە. لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیی ساڵی ١٩٩٢دا قسەکردن لەسەر لاوازی و بێهێزیی ئەمریکا زاڵبوو، پۆل تسۆنگاس لە میانی هەڵمەتی خۆی بۆبردنەوە - ناوبراو کاندیدایەکی پارتی دیموکرات بوو- گوتی:" جەنگی سارد کۆتایی هات، ئەڵمانیا و یابانیش سەرکەوتن". بەڵام هێنری کیسنجەر لە کتێبەکەی بەناوی دیبلۆماسییەت کەوا لە ساڵی ١٩٩٤دا دەرچوو، پێشبینیی هاتنەکایەی جیهانێکی فرە جەمسەری کردووە، گەرچی ئەمە تەنیا ڕای ناوبراو نەبوو بەڵکو ڕا و بۆچوونی زۆربەی شارەزایان بوو. ئەوروپییەکان پێیان وابوو کە بەرەو یەکیەتی و یەکبوون و وەرچەرخان و گۆڕانیان بۆ هێزێکی جیهانی لە ڕێگەدان. ئاسیاییەکانیش بە متمانەوە باسیان لە بەدیارکەوتنی سەدەی باسفیکی دەکرد.

بەڵام، لەگەڵ بوونی ئەم بانگەشانەشدا، گرفتەکانی دەرەکی - هەرچەندە دووریش بن- بەردەوام لەنێو باوەشی واشنتۆنەوە کۆتاییان دەهات. کاتێك لە ساڵی ١٩٩١دا قەیرانی بەلقان هاتە ئاراوە، جاك بووسی سەرۆکی ئەنجوومەنی ئەوروپا لە لۆکسمبۆرگەوە گوتی:" ئەمە کاتی ئەوروپایە. ئەگەر گرفتێك هەبێت کە دەکرێ ئەوروپییەکان چارەسەری بکەن، ئەوا گرفتی یوگسلافییە. ئەم وڵاتە ئەوروپییە و ئەمریکییەکان هیچ پەیوەندییەکیان پێیەوە نییە". ئەمە ڕایەکی نائاسایی و دژ بە ئەمریکا نەبوو، چوونکە زۆربەی سەرانی ئەوروپا بەخودی نائشەر و هێلمۆت کۆڵیشەوە باوەڕیان بەمە هەبوو. بەڵام دوای گوزەرکردنی چەندان ساڵی خوێناوی، بەرپرسیارییەتیی وەستاندنی جەنگەکە بۆ ئەمریکا جێهێڵدرا. کاتێکیش کۆسۆڤۆ لە ماوەیەکی دواتری ئەو دەیەیەدا بەدیارکەوت، ئەوروپییەکان یەکسەر ڕۆڵی سەرکردایەتییەکەیان بۆ واشنتۆن جێهێشت. هەمان

نموونه لە قەیرانی ئابووریی خۆرهەڵاتی ئاسیاشدا دووبارەبوویەوە، هەروەها ئەم نموونەیە لە تێکۆشانی تەیموری خۆرهەلات لەپێناو سەربەخۆیی و ململانێیە بەدوایەکداهاتووەکانی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست، دواکەوتنی وڵاتانی ئەمریکای لاتینی لە دانەوەی قەرزەکانیان دووبارەبوویەوە. هەرچەندە وڵاتانی دیکەش بەزۆری لە چارەسەرکردنەکەدا بەشدار دەبوون، بەڵام ئەگەر ئەمریکا نەهاتبایەتە نێو پرسەکانەوە قەیرانەکان بەردەوام دەبوون. لە هەمان کاتیشدا، ئابووریی ئەمریکی هەر لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە تا ئەوکاتی لە درێژترین گەشەکردنی خۆیدا دەژیا.

کاتێك بیل کلینتۆن لە ساڵی ١٩٩٣دا دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵێنی دا کە نیگەرانیی هەمبەر سیاسەتی دەرەوە بوەستێنێت و وەك تیشکی لێزەر جەخت لەسەر ئابووری بکاتەوە. بەڵام بەکێشکردنە تاکلایەنەکە زۆر بەهێز بوو. چوونکە لەگەڵ هاتنی قۆناغی دووەمی سەرۆکایەتییەکەیدا، ببووە سەرۆکێکی تایبەتمەند و پسپۆڕی سیاسەتی دەرەوە و زۆربەی کات و وزەی خۆی بۆ گرنگیدان بە پرسەکانی دەرەکی تەرخان دەکرد، وەك: ئاشتیی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست و قەیرانی بەلقان. جا وەك وەلامدانەوەیەك بۆ نموونەی ئەو نقومبوونە زێدەڕۆیانە بەنێو کاروباری نێودەوڵەتیدا- لە دەستوەردان لەپێناو ڕزگارکردنی ئابوورییەکان تا دەگاتە بونیادنانی گەلان- جۆرج بۆشی کوڕ لەنێو هەڵمەتی هەڵبژاردندا بەڵێنی دا کە پابەندییەکانی ئەمریکا کەم بکاتەوە. دواتریش ماوەی سەرۆکایەتیی جۆرج بۆشی کوڕ و لەوەش گرنگتر یانزەی سێپتێمبەر هات.

لە ماوەی ساڵەکانی سەرۆکایەتیی کلینتۆندا، هێزی ئەمریکی ڕوونتر بوویەوە، هەروەها واشنتۆنیش زیاتر هەنگاوی بەرەو پێشەوە دەنا، حکومەتەکانی دەرەوەش زیاتر بەرگرییان دەکرد. هەندێك ڕاوێژکاری ئابووریی کلینتۆن وەك

میکی کانتۆر و لۆرێنس سامرز، لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا بە لووتبەرزی تۆمەتبار کران. لە ئەورووپاشدا هەندێك دیبلۆماسیی ئەمریکی وەك مادلین ئۆڵبرایت و ریچارد هۆڵبرووك رەخنەیان لێ گیرا، چوونکە سەبارەت بە ئەمریکا وەها قسەیان کردبوو، کە بەپێی لێدوانەکەی ئۆڵبرایت مانای "ئەو گەلەی کە دەکرێ پشتی تێ بکرێ". دەگەیەنێ. لەوانەیە لێرەوە زاراوەی هێزی زێدەڕۆ هاتبێت کەوا ئیبر ڤێدرینی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا لە نەوەدەکاندا دایهێنا؛ بێگومان مەبەست لە زاراوەکە ستایشکردن نەبوو.

بەڵام سەرلەبەری ئەم سکاڵا و گلەییانە ئەگەر لەگەڵ ئەو دوژمنایەتییە بەراوردبکرێ کەوا جۆرج دەبلیو بۆش رووژاندی، دەتوانین بڵێین زۆربڵێیەکی بەئەدەبانە بوو. چوونکە ئیدارەی بۆش چەندان ساڵ لە شانازیکردن بە سستوسووککردنی پەیماننامە و رێکخراوە هەمە لایەنەکان و رای گشتیی جیهانی و گشت ئەو شتانە بەردەوام بوو کەوا ئاماژەبوون بۆ نزیکبوونەوە لە چارەسەردۆزیی سیاسییانەی جیهانی. تا شکستی ئەم نزیککارییە پڕ لە بەریەککەوتنە لەگەڵ هاتنی ماوەی دووەمی سەرۆکایەتیی بۆشدا بووە شتێکی بیدن، چوونکە لەو کاتیدا ئیدارەکە لە چەندان بەرەی وەك عێراق تا دەگاتە پرۆسەی ئاشتیی ئیسرائیلی- فەڵەستینی و پرسی کوریای باکوور، دەستی بە گۆڕینی رێبازەکەی کرد. بەڵام گرتنەبەری سیاسەتە نوێیەکان زۆر درەنگوەخت و بەشێوەیەکی پڕ لە راڕایی و رق و نووڕەییەکی گەورەوە هاتن، هەروەها لە لایەن ژمارەیەك لە ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتیی ستراتیژی نوێ رەتکرانەوە.

بۆ ئەوەی لە سیاسەتی دەرەوەی ئیدارەی بۆش تێبگەین، هەر تەنیا ئەوەندە بەس نییە بیرکۆیی خۆمان لەسەر پاڵنەرە جاکسۆنییەکانی (مەبەست لە سەرۆك ئەندرۆ جاکسۆنە) دیك چینی و دۆناڵد رامسفێلد یان پاشخانە تکساسییەکەی

بۆش یان کودەتا بەدخوازییەکەی موحافیزەکارە نوێیەکان کۆبکەینەوە. لە ڕاستیدا، هۆکاری یەکلاکەرەوە لە سیاسەتەکانی بۆشدا یانزەی سێپتێمبەر بوو.
لە ماوەی دەیەی پێش هێرشەکەدا، ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا بە ئازادی دەسووڕایەوە. بەڵام هەندێك كۆتوبەندی نێوەخۆیی- پارە و دارایی، کۆنگرێس، ڕای گشتی- وەهایان کرد کە واشنتۆن نەتوانێ سیاسەتێکی ئاکلایەنە یان بەریەککەوتنی دەرەکی بگرێتە بەر. دەستوەردانە سەربازییەکان و یارمەتیدانەکانی دەرەکی لە لایەن ئەمریکییەکانەوە پشتگیرییەکی میللییان لێ نەدەکرا، بەڵکو دەیانویست ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە جیهان بکشێتەوە، چوونکە لە ماوەی جەنگی ساردا دووچاری ناخۆشی و نەهامەتی ببوونەوە. لەبەر ئەم هۆیە، دەستوەردان لە بەڵقان و فراوانکردنی هاوپەیمانیی ناتۆ و پێشکەشکردنی یارمەتییەکان بە ڕووسیا، پێویستی بە هەوڵ و کۆششێکی زۆری ئیدارەی بۆش هەیە، چوونکە لە زۆربەی کاتەکاندا ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی گەورە و بەهێز بوویەوە، هەرچەندە سەرکێشییەکی بەرپێژە بچووك بوون و پێویستیان بە کەمە سەرچاوەیەك هەبوو. بەڵام ڕووداوەکانی یانزەی سێپتێمبەر گشت شتێکی گۆڕی. ئەو هێرشانە کۆتوبەندە نێوخۆییەکانی سەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایان تێکشکاند. هەروەها وڵاتێکی یەکگرتوو و جیهانێکی زۆر هاوسۆزی بەخشییە جۆرج بۆش، هەروەها گیانی بوێریی خستە بەر ئەندامە زۆر توندەکانی ئیدارەی ئەمریکا بۆ ئەوەی سەرکەوتنەکە بکەنە باساوی هێرشکردنە سەر عێراق و ئەنجامدانی هێرشەکە بەشێوەیەکی ئاکلایەنە ڕابکەیەنن. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا پێویستی بە وڵاتانی دیکەی جیهان و میکانیزمە کۆنەکانی پەیوەندیدار بە شەرعییەت و هاوکاری نەبوو. بەڵکو ئیمپراتۆرێکی نوێی جیهانییە و واقیعێکی نوێ دروست دەکات! ئەمە ئەو شتە

بوو کە پاساوەکە بەدیاریخست. هەروەها ئەو هاوکێشەیەی کەوا سیاسەتی دەرەوەی بۆش لێکدەداتەوە زۆر سادەیە:

سیستمێکی تاکجەمسەر+ ئەفغانستان+ ڕووداوەکانی یانزەی سێپتێمبەر= ڕەفتاری تاکلایەنە+ عێراق*

خۆ هەر کرۆک و جەوهەری سیاسەتی ئەمریکی لە قۆناغی تاکجەمسەردا بەتەنیا نەگۆڕا، بەڵکو شێواز و نۆرمەکەشی گۆڕا و بووە ئیمپراتۆر و لووتبەرز. چوونکە لەگەڵ هەبوونی زۆرێك لە پەیوەندی و بەردەوامی لەگەڵ سەرکردەکانی جیهاندا،

---

*) ئەمە بابەتی کتێبەکە نییە، بەڵام من بەردەوام پشتگیریم لە ڕووخاندنی سەدام حوسەین دەکرد. هەروەها لە سەرەتاشەوە هانم دەدان هێزێکی زۆر گەورەتر بەکاربێنن و دەستەوەردانێك بکەن کە لە ڕووی نێو دەوڵەتییەوە پەسندکراوبوو، دواتریش عێراق داگیربکەن. ئەو لۆژیکەش کە پشتم پێی بەستبوو بۆ ڕاستییەك دەگەڕایەوە کە پێی وایە سیاسەتی دەرەوەی خۆرئاوایی لەهەمبەر عێراقدا داڕووخابوو-سزایەکان پێشێل دەکران، ڕێژەیەکی بێشوماری خەڵکی مەدەنیش بەهۆی ئابلۆقەکەوە دەمردن، هەروەها ڕێکخراوی ئەلقاعیدەش بەهۆی بوونی بنکە سەربازییەکانمان لە سعوودیە ڕقیان هەڵگرتبوو، (مەبەستم ئەو بنکە سەربازییانەی نێو سعوودیەیە کەوا بەهۆیەوە بڕیاری ناوچەی دژە فڕینمان دیاری دەکرد)- هەروەها متمانەی تەواویشم هەبوو کە هەبوونی عێراقێکی نوێتر و میانڕەوتر لەنێو جیهانی عەرەبیدا، یارمەتیی لەنێوبردنی هێزە چەقبەستووەکانی نێو جیهانی عەرەبی دەدات. لە هەفتەکانی یەکەمەوە دژی سیاسەتی داگیرکردنی عێراق بووم لەلایەن ئەمریکایەوە. جا بە نواڕین لە ڕووداوەکە لە دوای ڕوودانی، من ئێستە دان بەوەدا دەنێم کە نەك تەنیا لە گرنگیی لووتبەرزی و بێدەستەڵاتی ئیدارەکەم کەمکردەوە، بەڵکو دژوارییە ڕەگداکوتاوی نێو سروشتی کردەکەشم کەم کردەوە. بەڵام ئێستەیشی لەگەڵدا بێت من هەر باوەڕم بەوە هەیە کە عێراقێکی نوێ و میانڕەو گۆڕانێکی گرنگ لە ژیانی سیاسیی نێو خۆرهەڵاتی نێوەڕاست دروست دەکات. هیوادارم لە دوور مەودادا عێراق بگاتە ئەو پێگەیە، بەڵام ئێچووەکە بۆ ئەمریکا و ناوبانگەکەی زۆر زۆر گەورە بوو، بۆ عێراقییەکانیش هەرمەبڕسە. هەرچۆنێك بێت، سیاسەتی دەرەوە وابەستەی نرخ و سوودە.

بەلام تەنیا بە یەك ئاراستە ڕوو دەدات. زۆر بەسادەیی، واشنتۆن تەنیا سیاسەتی نوێی ئەمریکی بە حکوومەتەکانی دیکە ڕادەگەیەنێ و هیچی دیکە. بەرپرسە پایەبەرزەکانی ئەمریکا لە بلقە تایبەتەکانی خۆیاندا دەژیەن، زۆر بەدەگمەنیش گفتوگۆی ڕاستین لەگەڵ هاوشانانی دەرەوەیان دەکەن. یەکێك لە ڕاوێژکارانی سیاسەتی دەرەوە لە یەکێك لە حکومەتە مەزنەکانی ئەورووپا پێمی گوت:" کاتێك چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسانی ئەمریکی دەکەین، ئەوان قسە دەکەن و ئێمەش گوێ دەگرین، زۆر بەدەگمەنیش دژی ڕا و بۆچوونەکانیان دەوەستینەوە، زۆر کەمیش ڕاشکاوانە قسە دەکەین، چوونکە ئەوان ناتوانن لەو شتانە تێبگەن کەوا ئێمە دەیانڵێین. ئەوان زۆر بەڕوونی هەڵویستی ئەمریکی دووبارە دەکەنەوە، وەك ئەو گەشتیارەی کە پێی وایە تەنیا پێویستی بەوەیە بە دەنگێکی بەرز و هێواش قسەبکات بۆ ئەوەی هەموومان تێی بگەین.

کریستۆفەر باتنی، لایەنگری سەرسەختی ئەمریکا وەك مفەوەزی پەیوەندییەکانی دەرەوە لە ئەورووپا باس لە ئەزموونەکەی خۆی دەکات و دەڵێ:" تەنانەت بەنیسبەت بەرپرسێکی پایەبەرزیش کە مامەڵە لەگەڵ ئیدارەی ئەمریکا دەکات، تۆ هەست دەکەیت ڕۆڵت یارمەتیدەر و پاشکۆیەکە: جا هەرچەندە خانەخوێیەکانت بەئەدەب و ئەتەکێت بن، تۆ وەك پاشکۆیەك دێیت کە هەڵگری نیازی باشیت و هیوای ئەوە دەخوازیت لەگەڵ ڕۆیشتنندا سوپاسی هەوڵەکانت بکرێت و ماندووبوونەکانت بەرز بنرخێنێدرێ... ئەویش لە بەرژەوەندیی سەرکردایەتیکردنێکی خاکەڕایانە کەوا سەرۆك بۆش هیوای بۆ دەخوازێت- لەمەیشدا لەسەر هەقە- بۆ هەندێك لە یارمەتیدەرەکانی زۆر بەسوودە کەوا هەوڵ بدەین بچینە نووسینگەکانیانەوە بۆ ئەوەی جارێك کۆببوونەوە لەگەڵ خودی خۆیاندا بکەن!" باتن درێژە بە قسەکانی دەدات و

دەڵێ: " کاتێك بەرپرسانی حکوومەتی ئەمریکی لە کۆنگرەیەکی دەرەوەدا بەشداری دەکەن، بە جۆرە کاروانێك دەگەنە جێ هەر شایستەی داریوشە. هوتێلەکان دەبنە پێگە و سەنگەری سەربازی و جوولەی شارەکان دەوەستن، هەروەها لە لایەن پیاوانی ملەستوورەوە کە چەند پارچە پلاستیکێك بە گوێیەکانیاندا شۆڕبووتەوە پاڵ بە جەماوەرە بەستەزمانەکانەوە دەنرێ و لە گۆشەیەك دەئاخنرێن. ئەمە دیمەنێك نییە دڵ بڕفێنێت و ئەقڵەکان سەرسام بکات".

پێدەچێ گەشتە دەرەکییەکانی سەرۆك بۆش بۆ ئەوە رێکخرابن کە پێویستیی بە کەمترین پەیوەندیی هەبێت لەگەڵ ئەو وڵاتانەی سەردانیان دەکات. بەزۆری دوو هەزار کەس و فڕۆکە و هەلیکۆپتەر و ئۆتومبێل لەگەڵیدا دەبن. هیچ شتێکی ئەوتۆش نابینێ تەنیا تەلار و هۆڵەکانی کۆبوونەوەکان نەبێت. هەروەها گەشتەکانی هیچ جۆرە هەوڵێکیان تیادا نابیندرێ کە رێز و قەدرزانین بەو وڵاتە و کەلتوور و رۆشنبیرییەکەی پیشان بدات، بەزۆریش کەسانی نێو کۆبوونەوەکەی خەڵکانی دەرەوەی حکوومەتەکان لەخۆ دەگرن، وەك: پیاوانی کار، سەرکردەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، کەسانی چالاك. راستە کە دەبێ سەردانەکانی سەرۆك زۆر بەوردی بەرنامەیان بۆ دارێژرابێ، بەڵام تەرخانکردنی چەند لایەنێکی ئەو سەردانانە بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ گەلانی ئەو وڵاتە بیانییانەدا دەبێتە هۆی ئەوەی بەهایەکی بەرزی رەمزییانەی هەبێت. با نموونەیەك لەم بارەیەوە بهێنینەوە کە رووداوێکە و پەیوەندیی بە سەرۆك بێل کلینتۆن و هیندەوە هەیە. لە ئاياری ساڵی ١٩٩٨دا، هیند پێنج بۆمبی ئەتۆمیی لەژێر زەویدا تەقاندەوە. ئیدارەی کلینتۆن بەتوندی نیودەلهی ئیدانەکرد و چەند سزایەکی بەسەردا سەپاند، هەروەها ئەو سەردانە سەرۆکایەتییەشی دواخست

کەوا بڕیاری لەسەر درابوو. سزایەکان زۆر توند و ئازاربەخش بوون، چوونکە بەپێی یەکێك لە خەملاندنەکان، لە گەشەکردنی تێکڕای بەرهەم و داهاتی نێوخۆیی سالی دواتر بە خالێکی سەدی لەسەر هیند کەوت. لە کۆتاییشدا، کلینتۆن نەرم بوو و لە ئاداری سالی ۲۰۰۰دا سەردانی هیندی کرد. پێنج ڕۆژ لەو ولاتەدا مایەوە، لە ماوەی ئەو ڕۆژانەشدا سەردانی چەند شوێنێکی بەناوبانگی کرد و پۆشاکی تەقلیدیی هیندی لەبەرکرد، هەروەها لە سەما و ئاهەنگەکاندا بەشداری کرد. ئەو پەیامەشی گەیاند کە چێژێکی زۆری لە هیند وەرگرتووە و چ وەك کەلتوور و ڕۆشنبیری چ وەك ولاتێك بە هیند سەرسام بووە. دەرئەنجامەکە چی بوو؟ کلینتۆن لە هیند دا بووە ئەستێرەیەکی درەوشاوە. گەرچی جۆرج دەبلیو بۆش لە مێژووی ئەمریکادا نزیکترین سەرۆکی ئەمریکی بوو لە هیند، بەلام هیچ یەکێك لەو گرنگیدان و خۆشەویستی و ڕێزەی پیشان نەدا. سیاسەت گرنگە، ئەمە ڕاستە، بەلام ئەو ڕەمزییەنەی کەوا چوار دەوری تەنیوە ئەویش گرنگە.

دوور لەو ڕق و تووڕەیی و قێزەی کەوا شێواز و نۆرمی ئیمپراتۆریانە دروستی دەکات، ئەوەش دەسەلمێنێ کە بەرپرسانی ئەمریکی سوود لە ئەزموون و شارەزایی بیانییەکان وەرناگرن، بۆنموونە: پشکێنەرانی نەتەوەکانی یەکگرتوو لە عێراقدا سەریان لەو گوێپێنەدانە سوڕمابوو کە لە ئەمریکییەکانیان دەبینی کاتێك پێش جەنگ قسەیان لەگەلدا دەکردن. ئەمریکییەکان لە واشنتۆندا ئاسوودە بوون و هەر لە ئەمریکا نەجوولابوون چەند وانەیەکیان سەبارەت بە بەلگەکانی هەبوونی چەکی کۆکوژ دەدایە ئەو پشکێنەرانەی کەوا چەندان هەفتە بنکەکانی عێراقیان ڕووماڵ کردبوو. یەکێك لەو پشکێنەرانە بەمنی گوت:" پێمخوایە ئەوان زۆر گرنگی بەو ڕاپۆرتە سەرەتاییانەی تایبەت بەو کارگانە دەدەن

کەوا شیمانە دەکرا بەشێوەیەکی دووانەیی بەکارهێنـدرابن. بەلآم، وەها نەبوو، ئەوەیان بۆ خودی خۆم ڕاڤەکرد کە ئەو کارگانە بۆچی بەکاردەهێندران".

ئەمریکییەکان وەها دێنە بەرچاوی بیانییەکان وەك بڵێی هیچ شتێك سەبارەت بەو جیهانە نەزانن کەوا شیمانە دەکرێ ئەوان بەڕێوەی ببەن. لەمبارەوە، کیشۆر مەحبوبانیی وەزیری دەرەوەی پێشووی سەنگافوورە و باڵیۆزی پێشوو لە نەتەوە یەککگرتووەکاندا دەڵێت: " دوو جۆر دایەلۆگ هەن، یەکێك لەگەڵ ئەمریکییەکان لە ژوورەکاندا، یەکێکیش بەبێ ئەوان". جا لەبەر ئەوەی ئەمریکییەکان لەنێو قۆزاخەدا دەژیەن، ئەوا ئەو گۆڕانە وردەوردەیە نابینن کەوا لە گشت شوێنەکانی دونیادا لە هەڵوێستەکانی هەمبەر ئەمریکادا ڕوو دەدات.

**ئەمجارەیان مەسەلەکە جیاوازە**

ئاسانە ئەو ناکۆکی و هەستی دوژمنایەتییە فەرامۆش بکرێ کە لە جەنگی عێراقەوە سەری هەڵدا، بەو پێیەی تەنیا هەستی ڕق و ئیرەیی بوو لە هەمبەر ئەمریکا (گەرچی هەندێکیشی ڕاست و لە جێگەی خۆیشیاندان). موحافیزەکارانی ئەمریکی دەڵێن کە هەر کاتێك ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا کردەیەکی بەهێزی سەربازی ئەنجام بدات، بەرهەڵستییەکی گەورەی میللیی لە ئەوروپادا ڕوو دەدات، بۆنموونە: وەك ئەو کاتەی کە لە سەرەتای هەشتاکاندا مووشەکە ئەتۆمییەکانی بیرشینگ لە ئەورووپا بڵاوکرانەوە. بەلآم دۆسیە مێژووییەکە تەواو پێچەوانەی ئەمە بەدیاردەخات. چوونکە خۆپیشاندان و ناڕەزاییەکانی میللی دژ بە بڵاوکردنەوەی مووشەکەکانی بیرشینگ لەپێناو پڕوپاگەندەی تەلەفزیۆنی ئامادەکران. بەلآم واقیع شتێکی جیاواز بوو، چوونکە زۆربەی ڕاپرسییەکانی ئەو کات ئەوەیان دەرخست کە ٣٠-٤٠٪ی ئەورووپییەکان و لەوەش زیاتر زۆر بەهێز

پاڵپشتیی سیاسەتەکانی ئەمریکایان دەکرد. تەنانەت لە ئەڵمانیاشدا- کە تیایدا هەستوسۆزی ئاشتییانە لە گشت شوێنێکی دیکە بەرزتر بوو- بەپێی راپرسییەك کەوا رۆژنامەی دیر شپیگڵ لە ساڵی ۱۹۸۱دا ئەنجامی دابوو، ئەوە ڕوونبوویەوە کە ٥٣٪ی دانیشتووانی ئەڵمانی پشتگیرییان لە بڵاوکردنەوەی مووشەکەکان دەکرد. هەروەها زۆرینەی فەرەنسییەکان لە زۆرترین ساڵەکانی سەرۆکایەتیی ریگاندا پشتگیرییان لە سیاسەتەکانی ئەمریکا دەکرد، تەنانەت وۆڵتەر مۆنیلی کاندیدای دیموکراتەکانی نێو هەڵبژاردنی ساڵی ۱۹۸٤ یان بە باشترین دەزانی. بەڵام لە ئێستەدا زۆرینەی هەرە زۆری خەڵك لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپی کە رێژەیان دەگاتە ۸۰٪، دژی سیاسەتی ئەمریکان، نەك هەر ئەمە، دەشڵێن کە ویلاتەکانی یەکگرتوو مەزنترین هەڕەشەی سەر ئاشتیی جیهانییە.

جۆزیف جۆف- کە یەکێکە لە بەرجەستەترین شرۆڤەکارانی کاروبارەکانی نێو دەوڵەتی لە ئەڵمانیا- تێبینیی ئەوەی کردووە کە هەستکردن بە رق و دوژمنایەتی لە هەمبەر ئەمریکادا لە میانی جەنگی سارد دا بریتیبوو لە دیاردەیەکی چەپڕەوانە." لە بەرانبەریدا، بەردەوام راستڕەوییەکی میانڕۆی دژ بە کۆمۆنیزم و هەروەها لایەنگری ئەمریکا هەبوو..... ڕاستە کە ژمارەکان زیاد و کەم دەبوونەوە، بەڵام بۆ پشتگیریکردن لە ولایەنەکانی یەکگرتوو بەردەوام بنەمایەکی پتەوت هەبوو ". بەکورتی، جەنگی سارد ئەورووپای بە پاڵپشتیکاری ئەمریکا هێشتەوە. ساڵی ۱۹٦۸ لە ڤێتنام بە نموونە، چەندان خۆپیشاندانی میللی دژ بە سیاسەتەکانی ئەمریکا بەڕێوەچوون، بەڵام لە هەمان کاتیشدا هێرشی سۆڤییەتی بۆ سەر چیکوسلۆڤاکیا لە هەمان ساڵدا بوو. بەو واتایەی کە ئەورووپییەکان (و ئاسیاییەکان) دژی ئەمریکا بوون، بەڵام را و بۆچوونیان بە نیگەرانبوون لە هەمبەر هەڕەشەی سۆڤییەتیدا هاوسەنگ دەبوویەوە. جارێکی

دیکـە ڕاپرسـییەکان ئەمـەیان سـەلماند. چـوونکە بەرهەڵسـتیکردنی ئـەورووپی تەنانەت بۆ جەنگی ڤیتنام هەرگیز نەگەیشتە ئاستی ئـەو بەرهەڵستییەی کە دژ بە جەنگی سـەر عێـراق لـە گۆڕێدا بـوو. ئەمـە لـە دەرەوەی ئەورووپاشـدا ڕاست دەردەچێت. لە ئوسترالیادا زۆرینەی گەل تا سالی ١٩٧١ هـاوڕابوو لـەوەی کـە وڵاتەکـە لـە جـەنگی ڤیتنامـدا بەشداری بکات، لـەو کاتـەی سـوپایەکەی لەوێدا کێشایەوە.

سەبارەت بە زۆرینەی جیهان، جەنگی عێـراق هیـچ پەیوەندییـەکی بـە عێراقـەوە نەبوو. جۆرج کاستانیدای وەزیری دەرەوەی پێشووی مەکسیك پێمی ڕاگەیاند:" هەرگیز بەلای مەکسیك و چیلییەوە گـرنگ نییـە کـێ حـوکمی بەغدا دەکـات.... ئەمـە پەیوەنـدیی بـە چۆنییەتیی مومارەسـەکردنی دەسـتهەلاتی زلهێزەکانـەوە هەیە بەسەر جیهاندا. ئەمەیش شتێکە و هـەموومان گرنگییـەکی گـەلێ زۆری پـێ دەدەین". جا ئەگەر تەنانەت هێرشەکەی سەر عێراق لە کۆتاییـدا سـەرکەوتنیش وەدەسـتبێنێت، ئـەوا تـەنیا گرفتـی عێـراق چارەسـەر دەکـات، بـەلام گرفتـە ئەمریکییەکە هەر دەمێنێتـەوە. چوونکە گشـت خـەلکی سـەر گـۆی زەوی لـەوە نیگەرانن و ترسیان هەیە لە جیهانێکدا بژیەن کەوا تیایدا یـەك دەوڵـەت هێزێکـی زۆری هەبێت. جا ئەگـەر نەشـتوانن دژی ئـەم هێـزە بوەسـتنەوە، خـۆ دەتـوانن کۆتوبەندی بکەن، بۆ نموونە: لە پرسی عێراقدا هیچ وڵاتێـك نەیتوانی ڕێگـری لـە ئـەمریکا بکـات ئـەو جەنگـەی دژ بـە عێـراق هەڵنەگیرسـێنێ، گەرچـی لـە هەلگیرسـاندنی ئـەو جەنگـەدا بەشـێوەیەکی نێودەوڵـەتیش ڕێگـەی پێنـەدرابوو، بـەلام وڵاتـانی دیکـەی جیهـان بـە وەسـتانیان لەسـەر کـەنار و پـەراوێزەکانی کێشەکەدا لە دوای کۆتاییهاتنی جەنگەکە هەوڵەکەیان قورستر کرد. چوونکە هیچ وڵاتێکی عەرەبی – تا نووسینی ئەم چەند دێرەش– بـاڵیۆز خانـەی خۆیـان لـە

بەغدا نەکردەوە. هەروەها هاوپەیمانانی تا عەرەبی ویلایەتەکانی یەکگرتووش بەسوودتر نەبوون.

نیکۆلا سارکۆزی زۆر دڵی بەوە خۆش دەبێت کاتێك لە فەرەنسا بە ئەمریکی و تەنانەت بە موحافیزەکاری نوێ بانگ دەکرێ. ناوبراو لایەنگرێکی ڕاشکاو و ڕوونی ئەمریکایە و بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنێ کە دەیەوێ لە زۆر بواراندا لاسایی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بکاتەوە. کاتێك کۆندۆلیزا ڕایس لە دوای هەڵبژاردنی سەرۆکی فەرەنسا لە ئایاری ساڵی ۲۰۰۷دا چاوی بەو سەرۆکە کەوت، پرسیاری لێ کرد:" دەتوانم چیت بۆ بکەم؟" وەڵامی دایەوە:" وێنەتان لە جیهاندا جوان بکەن. زۆر زەحمەتە بەهێزترین و سەرکەوتوترین وڵات، یەکێك بێت لەو وڵاتانەی کەوا لە جیهاندا کەمترین جەماوەریان هەیە. ئەم مەسەلەیە گرفتی گەورە بۆ ئێوە و هاوپەیمانەکانتان دروست دەکات. لەبەرئەوە، بۆ چاکترکردنی ئەو ڕوانگەیەی کەوا بەهۆیەوە دەنواڕنە ئێوە، چیت پێ دەکرێ بیکە ؛ ئەمە ئەو شتەیە کە دەتوانیت بۆمی بکەیت".

نووسەرێکی موحافیزە نوێیەکان بەناوی ڕۆبێرت کاگان بێزیاری لەسەر ئەوە دەکات کە ناکۆکییە ئەورووپی- ئەمریکییەکانی تایبەت بە هاوکاریی نێودەوڵەتی بەهۆی جیاوازیی هێزەکانیانەوە دروست بووە. چوونکە کاتێك وڵاتانی مەزنی ئەورووپی لە جیهاندا زلهێزبوون، ئەوا سیاسەتی واقیعییان بەرز دەنرخاند و گرنگییەکی کەمیان بە هاوکاریی نێودەوڵەتی دەدا. جا لەبەرئەوەی -بەپێی گوزارشتەکەی کاگان- ئەورووپا لە ئێستەدا لاواز و بێهێزە، ئەوا یاسا و کۆتوبەندەکانی پێ باشترە. بەڵام ئەمریکا دەیەوێ لە ڕەفتارکردندا ئازادیی تەواوی هەبێت:" جا لەبەرئەوەی ئێستە ویلایەتەکانی یەکگرتوو بەهێزە، ئەوا ڕێك وەك گەلانی بەهێز ڕەفتار دەکات". بەڵام ئەم ڕا و بۆچوونە لێکدانەوەیەکی

خراپ بۆ مێژوو دەکات و بەخراپ لەو پێگە بێهاوتایە تێدەگات کەوا ئەمریکا لە دیبلۆماسییەتی سەدەی بیستەمدا داگیری کردووە. چوونکە ئەمریکا بەهێزترین دەوڵەتی جیهان بوو کاتێك پێشنیازی کرد کۆمەڵەی گەلان لەپێناو ئیدارەدانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی دابمەزرێ. هەروەها کاتێك نەتەوەکانی یەکگرتوو دامەزرا و لە پێناو هاوکاریی ئابوورییانەی نێو دەوڵەتیدا سیستمی بریتۆن وودسی داهێنا و گرنگترین دەستگەکانی نێودەوڵەتی لە جیهاندا دامەزراند، ئەوا ئەمریکا لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیشدا هێزە هەژموونداره‌کەی سەر جیهان بوو. جیهان لەژێر پێیەکانی ئەمریکادا بوو، بەلام فرانکلین دیلانۆ رۆزفلت و هاری ترۆمان نەیانویست ئیمپراتۆرییەتی ئەمریکی دروست ببێت، بەڵکو سیستمی هاوپەیمانییەکانی نێودەوڵەتی و دەستگەی فرەلایەنیان دامەزراند و یارمەتیی ولاتانی دیکەی جیهانیان دا سەرلەنوێ لەمیانی هەناردنی شەپۆلی گەورەی یارمەتی و وەبەرهێنانەکانی تایبەت سەرلەنوێ لەسەر پێیەکانی خۆیان بوەستنەوە؛ پلانی مارشال (بەشێکی مەڵبەندیی ئەم هەوڵەبوو) کە بەپێی بەهای ئێستەی دۆلار بە نزیکەی ١٠٠ ملیار دۆلار دەخەملێندرێ. بە واتایەکی دیکە، ئەمریکا لە زۆربەی قۆناغەکانی سەدەی بیستدا پلانی هاوکاریی نێودەوڵەتی گرتەبەر، ئەمەیش بەهۆی ترس و بێهێزی و بێدەستهەلاتی نەبوو، بەڵکو لە سەرگەی هێز و متمانەبەخۆبوونەوە بوو.

گرنگیدانی تایبەت بە دیبلۆماسییەت لە جەرگەی ئەم نزیککارییەدا بوو. دەنا چی وەهای لە فرانکلین رۆزفلت کرد- لەو کاتەی ئەمریکا لە ترۆپکی هێزی خۆیدا بوو- لە هەردوو ساڵی ١٩٤٣ و ١٩٤٥ئەم هەموو مەودایە ببڕێت و بچێتە تاران و یالتا بۆ ئەوەی لەگەڵ چەرچل و ستالین کۆببێتەوە. رۆزفلت نەخۆش بوو و لە کەمەرییەوە تا خوارەوە دووچاری نیوە ئیفلیجی ببوو، هەروەها دە رەتل

پاڵپشتیکاری پۆلاینی بە پێیبەکانییەوە کرابوو. سەفەرکردنی ئاسمانی و دەریایی بۆ ماوەی چل کاتژمێر جەستەی شەکەت کردبوو. ئەو ناچار نەبوو ئەو سەفەرە بکات، چوونکە زۆر نوێنەری هەبوو– جۆرج مارشاڵ، دوایت ئایزنهاوەر– دەیانتوانی ئەرکەکە ئەنجام بدەن. یانیش دەیتوانی سەرکردەکانی دیکە دلوەت بکات بچنە ئەمریکا. بەڵام فرانکلین رۆزفلت لەوە تێگەیشتبوو کە هێزی ئەمریکی دەبێ چاوتێرانە و جوانمەردانە بێت. بۆیێ سووربوو لەسەر ئەوەی لە جەنگدا پشکێکی دادپەروەرانەی شکۆمەندی ببەخشێتە سەرکردە سەربازییەکانی وەك مۆنتگومریی بریتانی. هەروەها چینی هێنایە نێو ئەنجومەنی ئاسایش هەرچەندە ولاتێکی هەژاری کشتوکاڵیش بوو، چوونکە باوەڕی وەهابوو کە زۆر گرنگە ولاتێکی مەزنی ئاسیایی لە دەستەی نێودەوڵەتیدا نوێنەرایەتی و ئەندامییەتیی هەبێت.

رۆزفلت نموونەکەی پتەوکرد و نەوەکانیشی پاراستیان. کاتێك جۆرج مارشاڵی وەزیری دەرەوە ئەو پلانەی داهێنا کەوا ناوی ئەوی هەڵگرتبوو، سووربوو لەسەر ئەوەی کە دەستپێشخەری و هەژموونەکە لە دەستی ئەوروپییەکاندا بێت. چەند دەیەیەك دوای ئەمە، پردەکانی بونیادنا و بوارەکانی پارەدار کرد و زانیاریی تەکنیکی بە ولاتانی دیکە بەخشی. هەروەها توێژەران و خوێندکارانی خۆی ناردە دەرەوە بۆئەوەی جیهان ئەمریکا و ئەمریکییەکان بناسێ. گرنگییەکی زۆریشی بە هاوپەیمانانی خۆی دا، جا ئەگەر بچووکیش بن. مەشقی هاوبەشی سەربازیشی لەگەڵ ولاتانی بچووکدا کرد، جا ئەگەر ئەمە شتێکیشی نەخستبایەتە سەر ئامادەگیی ئەمریکیش ئەوا بەلایەوە گرنگ نەبوو. هەروەها سەرۆکان و وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا لە ماوەی نیو سەدەدا بەگشت شوێنێکی

دیکەدا گەڕان و هاوتا و هاوشانەکانی خۆیان لە بازنەیەکی بێکۆتایی کاری دیبلۆماسیدا بانگهێشتکرد و پێشوازییان لێیان کرد.

بێگومان کۆی ئەم هەوڵ و کۆششانە بۆ بەرژەوەندییەکانی ئێمە سوودبەخش بوون. چوونکە جیهانێکی دەوڵەمەند و پڕ لە ئاسایش و سەقامگیری و لە هەمان کاتیشدا پاڵپشتیی بۆ ئەمریکا وەدەستهێنا. هەروەها بنەمایە بەهێزەکانی ئابووریی جیهانی تەولو ڕەگیان داکوتا کە خەڵکانی دیکەش بەشدارییان تیایدا کرد و ئەمریکاش تیایدا گەشەی کرد. سیاسەتێکی زۆر ڕۆشنگەرانە بوو؛ گرنگی بە بەرژەوەندیی تایبەت دەدا، لە هەمان کاتیشدا بەرژەوەندیی خەڵکانی دیکەشی ڕەچاو دەکرد. جگە لەمانەیش، ئەم سیاسەتە بە قسە و کردار بووە هۆی دڵنیاکردنەوەی وڵاتانی دیکە و شێوەیەکی دەستەبەرکراویشی وەدەستهێنا بەوەی کە هیچ پێویست بەوە ناکات لە هێزە زەبەلاحەکەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بترسن.

## بنەما و ڕێبازە نوێیەکانی چاخی نوێ

هەندێك ئەمریکی پێیان وایە کە پێویست ناکات لە مێژوو فێربین، بەڵکو تەنیا بە کۆپیکردنەوەی دەستهەڵگرن. ئەگەر تەنیا بتوانین کۆپییەکی دیکەی ئیدارەی ترۆمان بدۆزینەوە– پێدەچێ زۆرێك لە لیبراڵی و دیموکراتەکان پەرۆشی بن– ئەوا دەتوانین کۆمەڵێك دەسنگەی نوێ بۆ سەردەمی نوێ دابمەزرێنین. بەڵام ئەمە پێی دەگوترێ سۆز و غەریبی کردن، نەك بیرکردنەوەیەکی ستراتیژی.

کاتێك ترۆمان و ئەشیسۆن و مارشاڵ سیستەمی دوای جەنگیان دامەزراند، ئەوا شوێنەکانی دیکەی جیهان لە دۆخی لاوازی و بێهێزییەکی گەورەدا بوون، هەروەها جیهان شوێنەوارە وێرانکارەکان و دەمارگیری نەتەوەیی و جەنگ و سیستەمی پارێزگەریی ئابووریی پێوە دیاربوو. لە ئەنجامی ئەمەدا، لە گشت شوێنێکدا پشتگیرییەکی مەزن هەبوو- بەتایبەتیش لە ویلایەتەکانی یەکگرتوودا- بۆ ئەڤلیبوون بە جیهان و دەرهێنانی لە هەژاری و دروستکردنی دەستگە و دامەزراوەی جیهانی و پەرەکردنی هاوکاریی نێودەوڵەتی؛ بۆ ئەوەی جارێکی دیکە جەنگ بەرپا نەبێتەوە. جا لەگەڵ ئەوەی ئەمریکا بەهۆی شکستپێهێنان بە فاشیزم چاکە و فەزڵی ئاکارییانەی وەدەستهێنا، بەڵام هێزێکی بێهاوتاشی هەبوو. نێکرای بەرهەمی نێوەخۆیی ئەمریکی ٥٠٪ ی ئابووریی جیهانی پێکدەهێنا. هەروەها لە دەرەوەی بولرە سۆڤییەتییەکەشدا، سەبارەت بە رۆڵی رێبەرانەی واشنتۆنیش لە دروستکردنی دەستگە و دامەزراوەی نوێدا هیچ ململانێیەك نەبوو. بەڵام ئێستە جیهان گۆڕاوە، پێگەی ئەمریکاش لە جیهاندا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. خۆ ئەگەر ترۆمان و مارشاڵ و ئەشیسۆنیش زیندووبوونایە، ئەوا رووبەرووی کۆمەڵێك بەرەنگاری و ئاستەنگی جۆربەجۆر دەبوونەوە. ئەرکی ئێستە بریتییە لە داڕشتن و پێکهێنانی نزیککارییەکی نوێ بۆ سەردەمی نوێ، نزیککارییەك مامەڵە لەگەڵ سیستەمێکی جیهانیدا بکات کە تیایدا هێزێکی بەربڵاو لە زۆربەی شوێنەکانی دونیادا سەریانهەڵداوە، ئەمەیش دیاردەیەکە کە پێشتر بوونی نەبووە و هەمووان هەست بە هەژموون و دەستهەڵات دەکەن.

ئەمریکا لە ئێستەدا ئەو کارتانەی لە دەست نییە کەوا لە ساڵی ١٩٤٥دا یان تەنانەت تاکوو ساڵی ٢٠٠٠ لەبەردەستیدا بوون. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا هێشتا

کارتەکانی لە هی گشت ولاتانی دیکە بەهێزترن- کۆمەڵێکی نیمچە تەولوی هێزی ئابووری و سیاسی و سەربازی و رۆشنبیری- هەروەها لە ئایندەیەکی نزیکیشدا هەروەها دەمێنێتەوە. رەنگە لەوانەش گرنگتر ئەوە بێت کە ئێمە پێویستمان بە شـکلگیرکردن و دارشـتنی جیهـانێکی نـویێ نـەبێت. چـوونکە ئـەو سیسـتمە نێودەوڵەتییەی کە دوای جەنگی دووەمی جیهـانی لەسـەر دەسـتی ویلایەتـەکانی یەکگرتوودا دروسـتبوو، پێویسـتییەکی بێچەندوچۆنی بـە فراوانکـردن و ریفـۆرم هـەبێت، نـەك سـەرلەنویێ دارشـتنەوەی. چـوونکە جـۆن ئیکنبیریـی توێـژەر لـە زانکۆی برینستۆن، تێبینیی کردووە کە ئەو سیستمە ئاراستەکارەی خۆرئاوا کەوا لە چلەکان و پەنجایەکاندا دامەزراوە رێگە بـە فراوانکردنـی بازرگـانیی جیهـانی و سـەرهەڵدانی هێـز و میکـانیزمی هاوکـاری و ئیـدارەدانی ململانێیـەکان دەدات. بەبـەردەوامی و ئاسـانیش ناتوانێـت بەرپەرچـی گرفتـە دیاریکراوەکـانی وەك ململانێی هێزە گەورەکان و ترلژیدیا نێوخۆییەکانی مـافی مـرۆڤ بداتـەوە، بـەلام ئەمـە رێـك سـنووری پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتییـە نـەك سـنووری هەیکلییاتـە ئاییەتەکان. لە هەمان کاتیشدا، بوونی چەکی ئەتۆمی و بەرپەرچی ئەتۆمی وەها دەکات ئەگەری هەوڵدانی هێزە گەشەسـەندووەکان بـۆ خەسـپاندنی سـەربازییانە دژ نەیارەکانیان ببێتە پرسێك کە زۆر بەگران لەسەریان دەوەستێ! ئەگەر نەڵێین جـۆرە خۆکوشتنێکیشـە. یـان بـە گوزارشـتی ئیکنبیری:"سیسـتمی هەنووکـەیی خۆرئاوایی، بـەکورتی رووخانـدنی زەحمەتـە و تـەقلیبوونیش بەنێو سیسـتمەکە سانایە". هەر بەم لێنوارە، ئەڵمانیا و یابان بژارەکانی خۆیان بینی و پێشدەچێ چـین و هینـدیش بەهـەمان لێنـوارِ (منظـار) ئاینـدەی خۆیـان ببیـنن. ئـەوان هەردووکیان بەدڵنیاییەوە دەیانەوێ هێز و پێگـە و رێزێکـی زیـاتر وەدەسـتبێنن، بەلام ئەویش لەنێو چوارچێوەی سیستمی نێودەوڵەتیدا نـەك بـەهۆی رووخانـدنی سیسـتمەکەوە. جـا مـادام بـەردەوام ئـەم دوو ولاتـە نوێیـە هەسـت دەکـەن کـە

دەتوانن پێگەیەك بۆ خۆیان وەدەستبێنن، ئەوا گشت ئەو پاڵنەرانەیان هەیە بۆ ئەوەی لەم سیستەمەدا ببنە دوو هاوبەشی بەرپرس.

رابوونی ئەوانی دیکە کردەیەکی دوورودرێژ و هێواشە. کردەیەکە و رۆڵێکی سەنترالی و کرۆکیی بۆ ئەمریکا دەستەبەردەکات، جا ئەگەر لە رۆڵی پێشووش جیاواز بێت. راستە کە چین و بەرازیل و هیند و رووسیا و باشووری ئەفریقیا و کۆمەڵەیەکی مەزنی وڵاتانی قەبارە بچووکتر، لە ساڵەکانی داهاتوودا رادەبن و گەشە دەکەن، بەڵام لەنێوانیاندا خاڵی نوێی گرژی دروست دەبێت. زۆرێك لەو وڵاتە گەشەسەندووانە دوژمنایەتی و رکابەری و ململانێی سنووری و ناکۆکیی نوێیان لەنێواندا هەیە، لە زۆربەی کاتەکانیشدا، هەست و سۆزی نەتەوەیی لەگەڵ گەشەکردنی پێگەی ئابووری و جیۆسیاسیدا گەشە دەکات. لێرەوە، ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکا بۆ ئەوە دەشێت ببێتە هاوبەشێکی گونجاو- چوونکە دوورە- لە زۆربەی ئەو وڵاتە هەرێمییانە دوورە کە لە رابوونی دەوڵەتێکی هەژموونداری هاوسێ و هاوکێشوەر نیگەرانن. بەپێی بیروڕایەکانی ویلیام وولفۆرس، هەژموونی ئەمریکی لەگەڵ سەرهەڵدان و رابوونی هێزە هەرێمییەکانی هەژموونـدار و دەستهەڵانخوازدا زیاتر دەبێت. (زۆرجار لەکاتی قسەکردن سەبارەت بە ئاسیا ئاماژە بەم هۆکارانە دەکرێ، گەرچی بەسەر زۆربەی شوێنەکانی دیکەی جیهانیشدا پیادە دەبێت). بەڵام کردەکە میکانیکی نابێت. چوونکە کاتێك یەکێك لەو وڵاتانە بەرجەستە دەبن و رادەبن (وڵاتی چین)، ئەوا جوولەیەکی دینامیییانەی هاوسەنگکار و پێشبینیکراو دروست نابێت، لەوانەشە هاوسێیەکەی (هیند) هاوپەیمانییەکی فەرمی لەگەڵ ویلایەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکادا ببەستێ. چوونکە جیهانی ئەمڕۆ لەمە زۆر ئاڵۆزترە. بەڵام ئەم دەوڵەتە رکابەرانە لەنێو جەرگەی سیستەمی جیهانیدا بەرلەسنی دەرفەتی

ئەوە بۆ ئەمریکا دەرەخسێنن رۆڵێکی گەورە و بونیادنەرانە بگێڕێت. ویلایەتەکانی یەکگرتوو ئەو توانایەی هەیە کە لە ماوەیەکی کورتدا وەك ئەڵمانیای کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمی لێ بێت، ئەو ئەڵمانیایەی کەوا بەهۆی بسمارکەوە؛ دەلالە بەشەرەفەکە لە ئەوروپادا گۆڕانی بەسەردا هات، چوونکە پەیوەندیی پتەوی لەگەڵ گشت ولاتە مەزنەکاندا دروست دەکرد، پەیوەندیی پتەوتر لەو پەیوەندییانەی کە لەنێوان خودی ئەو دەولەتانەدا هەیە. ئەڵمانیا لەو قۆناغیدا تەوەری سیستمی ئەوروپی بوو. بەلام لە ئێستەدا، بۆ ئەوەی ببێتە دەلالێکی جیهانی، کارێکە و پەیوەندیی نەك هەر بە حکوومەتی ئەمریکییەوە هەیە، بەڵکو پەیوەندیی بە خودی جڤاکی ئەمریکیشەوە هەیە، لەگەڵ کۆی ئەو وزە و خەونانەی کە ئەم مەسەلەیە بۆ بەرەنگاربوونەوە دەیانهێنێ. ئەمە رۆڵێکە کەوا توانا بە ئەمریکا دەبەخشێ- بە بەرژەوەندییە جیهانییەکانی و ئامادەبییەکەی لە سەرجەم شوێنەکانی جیهان و ئەو هێزەی هەیەتی و هەروەها جڤاکە هەمەچەشنە کۆچبەرەکەیەوە- فێربێت چۆن بە کارامییەکی لەرادەبەدەر رۆڵی خۆی بگێڕێ.

ئەم رۆڵە نوێیەش لە رۆڵی مەزنترین هێزی تەقلیدی تەواو جیاوازترە. چوونکە راوێژکردن و هاوکاری و تەنانەت سازشیش لەخۆی دەگرێ. هەروەها هێزی خۆی لە دلنانی ئەجێندا و دیاریکردنی گرفتەکان و بەستنی هاوپەیمانییەکاندا وەردەگرێ. راستە کە بریتی نییە لە دەستپەلاتێکی سەروو بۆ خوارووی قووچەکی کەوا ئەمریکا تیایدا بڕیارەکانی خۆی بدات و دواتر بە ولاتانی دیکەی سوپاسگوزار (یان بێدەنگ)ی رابگەیەنێ، بەلام لە هەمان کاتیشدا رۆڵێکی کرۆکییە، چوونکە دانانی ئەجێندا و رێکخستنی هاوپەیمانییەکان لەو جیهانەدا بە دوو شێوەی دەستپەلاتی سەرەکی دادەندرێن کەوا لە چەند باریزانێك زیاتر

پێکهاتووە. سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنێك کە بە قسەی خۆش و خۆشخووییەوە دەتوانێ کۆمەڵێك بەڕێوەبەری سەربەخۆ ئاراستە بکات، هێشتا لە جیهانەکەی ئێمەدا هەر کەسێکی هەژموونداره.

لە ڕاستیدا، کۆمپانیایەکانی فرە ڕەگەز لە ئەمریکا باشترین ڕێگەیان بۆ وەدیهێنانی سەرکەوتنی نێو جیهانی دوای ئەمریکادا دۆزییەوە. چوونکە ئەو کۆمپانیایانە بەهۆی گۆڕینی شێواز و ڕێگەی کۆنیانەوە توانیویانە دەست بەسەر بازاڕە نوێیەکاندا بگرن. باشترین نموونە بۆ ئەمە کۆمپانیای جەنەڕاڵ ئەلیکتریکە کە پێشتر متمانەی بە پرۆژە هاوبەشەکانی دەرەوە نەدەکرد، بەڵکو ڕێژەی سەداسەدی لە هەر پرۆژەیەکی بیانیدا دەویست کە موڵکی خۆی بوو. بەڵام لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا ترکی بەوەکرد – لەوکاتەی کە چاودێریی کارامەیی و دامێنان و متمانە گەشەسەندووەکەی کۆمپانیا نێوخۆییەکانی نێو بازاڕە گەشەسەندووەکانی وەك چین و هیند و ڕووسیا و بەرازیل و باشووری ئەفریقیای کرد– ستراتیژەکەی لەو شوێنانە زۆر دووری دەخاتەوە کەوا لەگشت شوێنێکی دیکەی جیهان خێراتر گەشە دەکەن. جا لەبەرئەوە جەنەڕال ئەلیکتریك ستراتیژی خۆی گۆڕی. جیفری ئیمیلتی بەڕێوەبەری جێبەجێکاری جەنەڕاڵ ئەلیکتریك ئەم مەسەلەیە بەمشێوەیە پوخت دەکاتەوە:" بێگومان، هێشتا دەتوانین لە کڕینی کۆمپانیا بچووکەکان بەردەوام بین و بیانکەینە کۆمپانیای جەنەڕال ئەلیکتریك، بەڵام فێربووین کە وەها باشترە لەگەڵ کۆمپانیای ژمارە ٢ هاوبەش بین کەوا دەیەوێ ببێتە کۆمپانیای ژمارە ١، لەوەی کە کۆمپانیایەکی بچووك بکڕین یان بەتەنیا کاربکەین". نیویۆرك تایمز ئەم وەرچەرخانەی وەها لەقەڵەم دا کە دوورکەوتنەوەیە لە ئیمپریالیزمی کارگێڕی کەوا بووەتە دەستبڵاویەك و جەنەڕاڵ ئەلیکتریك ناتوانێ بەرگەی باری تێچووەکەی بگرێت.

بەلام واشنتۆن کەوا لە بازاڕدا ڕووبەڕووی کێبڕکێ نابێتەوە، هێشتا ئەوەی بۆ ڕوون نەبووەتەوە کە ئیمپراتۆریەتی دیبلۆماسی کردەیەکی دەستبلاوانەیە و ویلایەتەکانی یەکگرتوو ناتوانێ لەمە زیاتر بەرگەی خەرجییەکەی بگرێت.

هێشتاش بۆ هەژموونی ئەمریکی بازاڕی بەهێز هەن، ئەمەیش بۆ چەند هۆیەکی جیۆسیاسی و ئابووری دەگەڕێتەوە. هەروەها هێشتا خواستێکی بەهێزی ئایدۆلۆژیشی لەسەرە. سیمۆن تای تویژەری سەنگافووری دەڵێ:" هیچ کەسێك لە ئاسیادا نایەوێ لە جیهانێکدا بژیەت کەوا چین بەسەریدا زاڵ و هەژموونـدار بێت. هیچ خەون و نموونەیەکی چینی نییە کە خەڵك بەرەو پیلی بچن". هەروەها فێرناندۆ ئەنریکیە کاردۆسۆی سەرۆکی پێشووی بەرازیل جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەوەی جیهان بەڕاستی لە ئەمریکای دەوێت ئەوەیە سەبارەت بە بازرگانی هیچ سازشێك لێرە و لەوێ نەکات، بەڵکو بنەما و ڕێبازەکانی پتەو بکات. کەسیش ناتوانێ ئەم ڕۆڵە بگێڕێ ئەمریکا نەبێ. بە واتایەکی دیکە هێزە نەرمەکانی ئەمریکا پەیوەندییەکی پتەویان بە هێزە توند و پتەوەکەیەوە هەیە، بەلام ئەو مۆنتاژەی کەوا هەردوو هێز بەیەکەوە دەلکێنێ، لە هەمبەر کاروبار و پرسەکانی جیهانیدا ڕۆڵە بێهاوتاکە بە ئەمریکا دەبەخشێت.

جا بۆ وەسفێکی واقعیانەتری ڕێگە و شێوازی کاری ئەم جیهانە نوێیە، شەش بنەمای سادە دانراون:

١.هەڵبژێرە: هێزە زەبەلاحەکەی ئەمریکا وەهای کردووە واشنتۆن پێی وابێت کەوا لە پێداویستیی هەبوونی سەرلیستەکان (الاولويات) بووردراوە، چوونکە هەموو شتێکی دەویست. زۆر گرنگە ویلایەتەکانی یەکگرتوو سەبارەت بەم مەسەلەیە زیاتر ڕێککارانەتر (انضباط) بێت. چوونکە بۆنموونە ئیدارەی بۆش لە

هەمبەر کۆریای باکوور و عێراقدا نەیتوانی بڕیاربدات ئاخۆ دەیەوێ سیستم و دەستهەڵاتەکانی ئەم دوو وڵاتە بگۆڕێ یان سیاسەتەکانیان (واتا وەستاندنی پرۆژەی ئەتۆمی). ئەم دوو مەبەستەش تەواو پێچەوانەن. ئەگەر هەڕەشە لە وڵاتێك بکەیت بەوەی کە سیستم و دەستهەڵاتەکەی دەگۆڕیت، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی حەزی ئەو سیستم و دەستهەڵاتە بۆ پەیداکردنی چەکی ئەتۆمی زیاتر پێداگرانەتر بێت، چوونکە چەکی ئەتۆمی لە جیهانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا واتای سیاسەتی دەستەبەرکردن دەگەیەنێت.

بزانە جیهان چۆن دێتە بەرچاوی ئێران. هەر چوار دەوری بە هێزی ناوەکی تەنراوە (ڕۆسیا، چین، هیند، پاکستان، ئیسرائیل)، هەروەها لەسەر سنوورەکانیشیدا دەیان هەزار سەربازی ئەمریکی هەن (لە عێراق و ئەفغانستان). هەروەها سەرۆکی ویلایەتەکانی یەکگرتوو چەندان جار ئەوەی ڕاگەیاندووە کە سیستم و دەستهەڵاتی تاران بە ناشەرعی دەزانێ و هیوای ڕووخانی بۆ دەخوازێ. پارمەتیی داراییش پێشکەش بەو کۆمەڵە هەمەچەشنانە دەکات کەوا هەمان ئامانجی ئەویان هەیە. ئەگەر تۆ لە تاران بیت ئەم دۆخە وەهات لێ دەکات دەستبەرداری بەرنامە ئەتۆمییەکەت بیت؟ سووربوون لەسەر هەردوو مەبەست- گۆڕینی سیستم و دەستهەڵات و گۆڕینی سیاسەت- وەهای کردووە نەتوانین هیچ کامێکیان وەدەستبێنین.

بان تەماشای سیاسەتی ئەمریکیی هەمبەر ڕووسیا بکە! ئێمە هەرگیز نەمانتوانی سەبارەت بە مۆسکۆ ئەوە دیاری بکەین کە ئاخۆ بەرژەوەندییەکانمان یان نیگەرانییەکانمان چین. ئایا مەترسیی چەکە ئەتۆمییە تا سەلامەتەکانیەتی کە ناکرێ دەستەبەر بکرێ تەنیا بە پارمەتیی ئەمریکا نەبێت؟ ئایا پارمەتیی مۆسکۆیە بۆ دابڕینی ئێران؟ یانیش سیاسەتی تایبەت بە نەوت و گازی

سروشتییە؟ یان هەلومەرجەکانی مافی مرۆڤە لە ڕووسیا؟ سیاسەتی ئەمریکی لەهەمبەر ڕووسیادا لە گشت ئەو شتانە پێکهاتبوو کەوا " پێشتر باسکران". بەلآم حوکم واتا هەڵبژاردن. ئەگەر بەڕاستی باوەڕمان ئەوەبێ کە بلآبوونەوەی ئەتۆمی و تیرۆر مەترسیدارترین پرسن کەوا لە ئێستەدا ڕووبەڕوویان دەبینەوە- هەروەك سەرۆك بۆش گوتی- ئەوا دەستەبەرکردن و بێ مەترسییکردنی بارخانەی (الترسانە) ئەتۆمیی ڕووسی و ڕێگەگرتن لە ئێران بۆئەوەی نەتوانێ چەکە ئەتۆمییەکانی پێشبخات، دوو پرسن کە دەبێ هەوڵ بدەین هاوکاریی مۆسکۆ - نەك کەسی دیکەی- لەهەمبەردا وەدەستبێنین.

هەروەها ویلایەتەکانی یەکگرتوو سەبارەت بەو پرسانەی کەوا بەشێوەیەکی تایبەت پەیوەندییان بە وڵاتی چینەوە هەیە، پێویستی بە هەڵبژاردن هەیە. چوونکە چین گەشەکردن و پێشکەوتنێکی گەورەتر و خێراتری هێز و هەژموون لەمێژوودا وەدەستدێنێت؛ تەنانەت لە گەشەکردنەکەی ڕابردووی ویلایەتەکانی یەکگرتووش گەورەتر و خێراترە. هەروەها دەبێ پانتاییەکی سیاسیی گەورەتر و تەنانەت سەربازیش ببەخشرێت بەشێوەیەك لەگەڵ ئەو هێزەدا بگونجێت. لەهەمان کاتیشدا دەبێ گەشەکردن و هەڵکشانەکەی نەبێتە پەردەیەك بۆ فراوانخوازی و دوژمنایەتیی پەکخستن. وەدەستهێنانی ئەم هاوسەنگییە- لە لایەك ترساندن و بەرپەرچدانەوەی چین؛ و لەلایەکی دیکەوە لەخۆگرتن و گرنگیدان بە گەشەکردنەکەشی - کۆسپ و بەرەنگارییە مەرکەزییەکەی بەردەم دیبلۆماسییەتی ئەمریکییە. لەسەر ویلایەتەکانی یەکگرتوو پێویستە سنوورێك بۆ چین دابنێت، بەلآم دەبێ درك بەوەش بکات کە ناتوانێ لەگشت شوێنێکدا ئەم سنوورەی بۆ دابنێت. بەداخەوەش، گەورەترین و مەترسیدارترین کۆسپونەگەرە کەوا ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە کاتی داڕشتنی سیاسەتێکی وەهادا ڕووبەڕووی

دەبێتەوە، کەشە سیاسییە نێوخۆییەکەیەتی کەوا هەر حەز بەوە دەکات کە هەر چارەسەرێك وەك سازشکردن و ڕازیکردن لەقەڵەم بدات.

لێرەوە ولایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا دەتوانێ شتێك لە بریتانیای مەزن فێربێت. ئەویش پێداویستییە بۆ دیاریکردنی بژارە مەزنەکانی ستراتیژی سەبارەت بە ئاراستەکردنی وزە و گرنگیدانەکانی. کاتێك بریتانیا ڕووبەڕووی هەڵکشان و پێشکەوتنی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بوویەوە، زۆر بەداناییەوە ئەو هەنگاوەی هەڵێنا، بەڵام سەبارەت بە خودی ئیمپراتۆرییەکەی داناییەکەی کەمتر بوو. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بریتانیا ڕووبەڕووی گرفتێك بوویەوە کەوا زۆر بە گرفتە هەنووکەییەکەی ئەمریکا دەچێت. چوونکە کاتێك قەیرانێك لە شوێنێکی ئەم جیهانەدا دەتەقییەوە، جا هەرچەندە دووریش بووایە، خەڵك تەماشای لەندەنی دەکرد و دەیپرسی: " سەبارەت بەو قەیرانە چی دەکەیت؟" هەڵە گەورە ستراتیژییەکەی بریتانیاش ئەوە بوو کە چەندان دەیەی درێژ وزە و پارە و کات و گرنگیدانی لە هەوڵی بێهوودەی هەمبەر دەستەبەرکردنی سەقامگیری لە شوێنە دوور و لاوەکییەکانی سەر نەخشەی جیهاندا خەرج دەکرد. بۆ نموونە دەبووایە لە ڕێکخستنی ڕێکارە دەستوورییەکانی هەمبەر جووتیارانی ناوچەی ترانسفالدا هەوڵێکی کەمتری بدابووایە کەوا بووە هۆی بەرپابوونی جەنگی بۆیرس و پشتی ئیمپراتۆریەتی شکاند، لە هەمان کاتیشدا دەبووایە هەوڵ و کۆششێکی زۆرتری لە بەرپەرچدانەوەی توانای ئەو بەرهەمەدا بخستبایەتەگەڕ کەوا بەرەو لێژبوونەوە گرێل دەبوویەوە، چوونکە ئەڵمانیا خەریکبوو لەنێو جەرگەی ئەورووپادا ڕادەبوو.

چەند دەستەبژێریکی بریتانی زۆر بەوردی مێژووی ڕۆمانیایان خوێندەوە، نەك هەر تەنیا لەبەرئەوەی سەرسامی ئیمپراتۆریەتی مەزنی پێشوو بوون، بەڵکو

لەبەرئــەوەی لــەپێناو چــۆنییەتیی بــەڕێوەبردنی زەوییــە پانوپۆڕەکــانی کیشوەرەکانی جۆراوجۆردا بەدوای چەند پەند و وانەیەکدا دەگەڕان. خواست لەسەر کەســانی لێهــاتووی بــواری زمــان و مێــژوو و کــردەی بــەڕێوەبردنی ئیمپراتۆریەتــدا هــەبوو. بــەڵام ئــەم مەســەلەیە بــووە هــۆی پشتگوێخســتنی زەرووەتی پێشخستنی ئەندازیاریی ئایندە. هەروەها هێز و هــەژموونی بریتانیا وەهــای لێکــرد بــەو هەســتە قەدەربیوونــە مێژوویــە سەرمەســت بێــت کــەوا سەرهەڵدانەوەی نوێی پرۆتستانییەت خۆراکی پێدەبەخشی. کوریللی بارنێتی مێژوونووس لە حەفتایەکاندا نووسیبووی کە شۆڕشی ئەخلاقی لە نێوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا بەسەر ئینگلتەرادا زاڵبوو، ئەمەیش لەو جڤاکە کردارییەی دوورخستەوە کەوا پشتی بە ئەقڵی بەرپاکەری شۆڕشی پیشەسازی دەبەست و لەهەمان کاتیشدا بەرەو ئاراستەی جڤاکێک پاڵی پێوەنا کەوا باوەڕی وشکی ئاینی و بنەمای توندڕەوانەی ئاکاری و ڕۆمانسی بەسەریدا زاڵبوو.

هــەروەها ئەگــەری ئــەوە هەیــە کــە ویلایەتــەکانی یــەکگرتووش زۆر بــە ســانایی بکەوێتە نێو تەڵەیەکی هاوشێوەی ئیمپراتۆرییەتەوە. چوونکە هەر قەیرانێك لەم جیهانــەدا دروســتببێت پێویســتی بــە گرنگیــدان و ڕەفتــارکردنی ئــەمریکا هەیــە. هــەروەها بەرژەوەنــدی و چــاودێری و سانســۆرە بڵاوەکــانی ئــەمریکی بەهــەمان شێوەی بەرژەوەندی و چاودێری و سانسۆرەکانی بریتانیا فراوانە لەو کاتــەی لــە ترۆپکی مەزنایەتیی ئیمپراتۆرییەتەکەی بوو. ئەوجا بۆ ئەوانەی باوەڕیان وەهایە کە پێگەی ئەمریکا لە جیهاندا لە پێگەی ئیمپراتۆریەتی بریتانی تــەواو جیــاوازە، زۆر بەســوودە کــە ڕاپــۆرتی بونیــادی ســەرەکی Base structure reportســـالی دارایــی ٢٠٠٦ بخوێننــەوە. چــوونکە لــەم ڕاپۆرتــەدا، وەزارەتــی بەرگری شانازی بەوە کردووە بەوەی کە یەکێکــە لــە گــەورەترین خاوەنزەوییــانی

جیهان، ئەویش بە تێکڕایەکی مادیی کە لە ٥٧١.٢٠٠ یەکە زیاترە لە (تەلار، دامەزراوەکان، شوێنگە و پاشکۆیەکان) پێکدێت و بەسەر زیاتر لە ٣.٧٠٠ شوێن دابەشبووە لەسەر ڕووبەری نزیکەی ٣٠ ملیۆن هێکتار. ڕاپۆرتەکە باس لە تۆڕێکی کشاو دەکات کە لە پێکهاتوو ٧٦٦ بنکە دەکات کە لە چل وڵاتی بیانیدا مەن، لە ئەنتگوا تا دەگاتە میرنشینی یەکگرتوو دەبیندرێن. ئەم بنکانە لە ساڵی ٢٠٠٥دا بەلای کەمەوە یەکسانن بە ١٢٧ ملیار دۆلار و ١٩٧,٠٠٠ سەرباز و هەمان ڕێژەی فەرمانبەرانی سەربەخۆ و مەدەنیشیان تیادایە، جگە لە ٨١,٠٠٠ بەکارهاتووی نێوخۆیی. هەروەها ڕووبەری ٦٨٧,٠٠٠ هێکتار (یان نزیکەی ١,١٠٠میلی چوارگۆشە) زەویی بیانی دادەپۆشێت و ١٣ ملیار دۆلار لەسەر ئەو کەسانە دەوەستێ کەوا تەنیا لەپێناو کاری چاککردنەوە (صیانە) باج دەدەن.

لەوانەیە ئەمریکا لە بریتانیای کۆن بەهێزتر بێت، بەڵام ناتوانێ ئەو پەند و وانەیە پشتگوێ بخات کەوا پەیوەندیی بە زەرورەتی دیاریکردنی بژارەکانیەوە هەیە. ناکرێ لە گشت شتێك خۆی تێوە بگلێنێ. گرژییەکانی خۆرهەڵاتی نێوەڕاست گرنگن، بەڵام گشت سەرچاوە و وزە و گرنگیدانێکی هەڵمژیوە و لە ماوەی حەوت ساڵی ڕابردوودا لە گشت پرسێکی دیکەی نێو سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا زیاتر گرنگی پێدەدرێ. لەسەر واشنتۆن پێویستە لە سەدەی هەشتەمی کۆچی و حوکمدان لەسەر داواکارییەکانی سوونە و شیعە لە بەغدا، بچێتە نێو سەدەی بیست و یەك- بەرەو چین و هیند و بەرازیل بڕوات- کە تیایاندا ئایندە دروست دەکرێت. بە جەختکردنمان لەسەر ئەو شتەی کەوا بە پرسێکی پێداگر دێتەبەرچاو، وەهامان لێ دێت شتە گرنگە ڕاستینەکە لەبیر بکەین.

٢. بنەمای پانوپۆڕ پتەوبکە، نەك بەرژەوەندیی تەسك. لەنێو سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا دژبوونێکی گرنگی هەیە. ئایا ئەمریکا دەیەوێ

بەگوێرەتاوەوە بەرەو وەدیهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی بڕوات یان دەیەوێ کۆمەڵێك بنەما و بناغە و دابونەریت و بەها دابمەزرێنێ بۆ ئەوەی جیهان پیادەیان بکات؟ لە سەردەمی هێزە گەشەسەندووە نوێیەکاندا دەبێ ئامانجی سەرەکیی ویلایەتەکانی یەکگرتوو ئەوەی دووەم بێت؛ ئەمەیش بۆ ئەوەیە ئەو دەوڵەتە گەشەسەندووانە ئەنانەن لەو کاتەی هێز و هەژموونیشیان زیاد دەبێت هەر بەردەوام بن، ئەمەیش بە زیانکردنێك دەبێت کە بەپێی بنەمابەکانی سیستمی هەنووکەیی نێودەوڵەتییە. ئەمە ئەو هۆکارە کۆتوبەندکارە سەرەکییەیە کەوا دەتوانن بونیادی بنێن، ئەمەیش بۆئەوەیە کردەی ڕابوونی ئەوانی دیکە نەبێتە کردەیەکی بەردەوامی کێبڕکێکارانە کەوا هێزە مەزنەکان لەپێناو بەرژەوەندی و ئیمتیازە تایبەتەکانیان هیوای بۆ بخوازن و کاتێکیش وەدەستیان هێنا سەرلەبەری سەقامگیریی سیستمەکەی پێ تێکوپێك بدەن. ئەوجا بۆ ئەوەی ئەم سیستمە سەرکەوێ، لەسەرمان پێویستە کە ئێمەیش پابەندی ئەو بنەمایانە ببین. چوونکە ئەگەر ویلایەتەکانی یەکگرتوو بەشێوەیەکی سەربەخۆیانە ڕەفتاربکات و بەپێی بەرژەوەندییەکانی هەنگاو هەڵێنێت و لە ڕەفتارەکانیشیدا تەنیا ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات، ئەدی وڵاتی چین بەهەمانشێوەی بەرژەوەندخوازانە و سەربەخۆیانە لە هەمبەر تایواندا ئەو ڕەفتارانەی ئەمریکا دووبارە ناکاتەوە؟ یان بۆچی هیند لەگەڵ پاکستان هەمان ڕەفتار ناکات؟ ئەگەر ئێمە خۆمان پابەندی بنەمایەکان نەبین، بۆچی وڵاتانی دیکە پێوەی پابەندبن؟

یەکەم، ئەمە ئەو واتایە دەگەیەنێ کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو سەرلەنوێ خۆی پابەندی ئەو دەستگە و میکانیزمانە بکات کەوا لە میانی پێنج دەیەکەی ڕابردوودا (بە ئاستێکی زۆر بەرز) دروستی کردوون. بەڵام، ئەمە واتای ئەوە نییە

کە لە زۆر کۆبوونەوەی نەتەوەکانی یەکگرتوو ئامادە بێت و پەیماننامەیەکی زۆر واژۆ بکات. کاتێک ویلایەتەکانی یەکگرتوو بانگەشەی هەبوون و لەخۆگرتنی بەهای جیهانی دەکات، ئەوا دەبێ زۆر بە وردی و گرنگیدانەوە هەڵوێستەکانی خۆی دابڕێژێت، بۆ نموونە: جۆرج دەبلیو بۆش لە ئاهەنگی دووبارە دامەزراندنەوەی بەسەرۆک رایگەیاند کە " سیاسەتی ویلایەتەکانی یەکگرتووە کە خوازیار و پاڵپشتبی گەشەکردنی بزووتنەوە و دەستگە دیموکراتییەکانی گشت وڵاتان و کەلتوورەکان بکات، ئەمەیش بە ئامانجی کۆتاییهانانە بە شاکرەوی و داپڵۆسین و سەرکوتکاری". لەگەڵ ئەمەیشدا، کاتێك دیموکراتخوازەکانی تایوان و پاکستان سەرکوت دەکرێن، ئەوا نەتەوەکانی یەکگرتوو لە جێگەی خۆیان ناجوولێن و نقەیان لێوە نایەت، بە پاساوی ئەوەی – لەوانەیە بەشێوەیەکی دەمامکدارانە– چەند دۆخێکی تایبەتن. لەگەڵ ئەمەیشدا، واشنتۆن وڵاتی چین سەرکوتە دەکات و ئیدانەی هیند دەکات لەسەر ئەوەی لەهەمبەر کۆریای باکوور و بۆرما سیاسەتێکی توندتر ناگرنەبەر. دیپلۆماسییەکانی هەردوو وڵات پێت دەڵێن کە کۆریا و بۆرما دوو دۆخی تایبەتن. لە ڕاستیشدا ئەمە ڕاستە، چوونکە ناسەقامگیری لە بۆرما گرفتێکە و زۆر لە ویلایەتەکانی یەکگرتووەوە دوورە، بەڵام بۆرما سنوورێکی دووردرێژی لەگەڵ چین و هیند هەیە، ناسەقامگیریش لە بۆرما بۆ هیند و چین واتا پەیدابوونی ملیۆنان پەناخواز لەسەر سنوورەکانیان. لەسەر واشنتۆن پێویستە لەوە بگات کە ئەگەر ئەو دەرهاوێشتەکانی خۆی هەیە، ئەوا خەڵکانی دیکەش دەرهاوێشتەیان هەیە. دەنا دەبێ واز لە دەرهاوێشتەکانی خۆی بهێنێ. بەڵام ئەگەر هیچ کام لەم دوو کردارەی ئەنجام نەدا، واتا قسە و کرداری یەك نەبێت و بەشێك ئامۆژگاریی خەڵك بکات و شتێکی دیکە ئەنجام بدات، ئەوا دەبێتە جۆرێك لە فرنسیەتی (نفاق)، ئەمەیش بەسوود نییە و ڕاستگۆیی ئەمریکا دادەبەزێنێتە خوارەوە.

سەبارەت بە تیرۆریش، ئەوا ویلایەتەکانی یەکگرتوو ئاستێکی تەنگی پێشان دا. نموونەییترین پارێزگەریی بەرنامەدار دژی مەترسیی تیرۆر، دەبێ لەمیانی کۆمەڵێک ڕێکاری جیهانییانەی گومرگی و ڕێکار و کۆتوبەندی تایبەت بە دیاردەی پەنابەری بێت کە بە پێوەرێکی یەکسان لە شوناسی خەڵك و کاڵاکانی گشت شوێنەکانی جیهان وردبێتەوە و بەشداری لە ئاڵوێرکردنی زانیارییەکاندا بکات. بەڵام نزیکبوونەوە ناکلاییەنەکانی ئەمریکا، وڵاتان و هێڵەکانی ئاسمانی ناچار دەکات تەنیا لەسەر سنوورەکانیدا بچنە ژێرباری ڕێکار و کۆتوبەندەکانی؛ بەمەیش چەند خاڵێکی خنکان دروست دەبێت، ئەمەیش کارێکە و لە دەرەوەدا دەرئەنجامی نەرێنیی لەسەر ئابوورییەکەی و وێنەی وڵاتەکەدا دەبێت. لەبەر ئەم هۆیە، لە دوای ڕووداوەکانی یانزەی سێپتێمبەرەوە ڕێژەی سەفەرکردن بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا کەمبووەتەوە، لە بەرانبەریشدا گەشتیاری لە گشت جیهاندا گەشەی کردووە.

گرنگترین و بەردەوامترین نموونە بۆ ئەم دژیوونەی نێو سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا پەیوەندیی بە بڵاوبوونەوەی ئەتۆمییەوە هەیە. ویلایەتەکانی یەکگرتوو داوا لە وڵاتانی دیکەی جیهان دەکات زۆر بەتوندی پابەندی پەیماننامەی قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی چەکی ئەتۆمی بن. پەیماننامەکە سیستمێکی دوو ئاستیی بەرهەمهێناوە: ئەو دەوڵەتانەی کەوا پێش ساڵی ١٩٦٨ چەکی ئەتۆمییان پێشخستووە، ڕێگەیان پێ دەدرێ چەکی ئەتۆمییان هەبێت، ئەو وڵاتانەش کە دوای ئەم ساڵە ئەو کارەیان نەکردووە، ڕێگەیان پێ نادرێ ئەو چەکەیان هەبێت (جا بەپێی ئەمە دەبێ ئەو وڵاتانە لەپێناو پێشخستنی وزەی ئەتۆمیدا چەند ڕێنماییەکی دیاریکراو پیادە بکەن). بەڵام لەو کاتەی ویلایەتەکانی یەکگرتوو و هێزە ئەتۆمییەکانی دیکە هێشتا سوورن لەسەر ئەوەی

ولاتانی بێ ئەتۆمی مل بۆ بڕیارەکە بدەن، ئەوا خودی خۆیان هیچ هەنگاوێك بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکی دیکەی نێو پەیماننامەکە هەڵناهێنن: " مەبەستمان هەوڵدانە بۆ ئەنجامدانی دانوستان -بە نیازی باشەوە- سەبارەت بە ڕێکارە کارایەکانی پەیوەندیدار بە کۆتاییهێنان بە کێبڕکێی وەدەستهێنانی چەکی ئەتۆمی... و داماڵینی ئەو چەکانە". لەسەر ئەو بنەمایەوە، کاتێك ویلایەتەکانی یەکگرتوو بە دەوڵەتانی دیکە دەڵێ کە پێشخستنی تەنیا یەك تاکە چەکی ئەتۆمی لە ڕووی ئاکاری و سیاسی و ستراتیژییەوە کارێکی قێزەونە و خۆیشی بارخانەیەك بۆ خۆی دەپارێزێ کە لە هەزاران مووشەك پێکهاتووە و لە هەمان کاتیشدا مووشەکی نوێ پێشدەخات و تاقییان دەکاتەوە، ئەوا ئیدانەکەی پووچ و بێمانا دێتە بەرچاو. ئەوجا لە لای خاڵی هەستکردن بەو نیگەرانییە، هەر یەکە لە هێنری کیسنجەر و جۆرج شوڵتز و ویلیام بیری و سام نان پێشنیازیان کرد کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو ڕێبەرایەتیی هەوڵێکی تەمادار بکات لەنێوان هێزەکانی ئەتۆمی - بەتایبەتیش ڕووسیا کەوا لەگەڵ ئەمریکا ٨٥٪ کۆی چەکە ئەتۆمییەکانی جیهانییان هەیە- لەپێناو کەمکردنەوەی ژمارەی ئەو چەکانە و گواستنەوەی لە نرخی ئامادەگییەوە، لە کۆتاییشدا کارکردن بە ئاراستەی جیهانێکی بەتاڵ لە چەکی ئەتۆمی. جا ئەگەر ئەمە بکەین یان نا، هەروەها ئەگەر بیرۆکەی گۆڕینی جیهان بۆ شوێنێکی بێ ترس و بەرپەرچی ئەتۆمی بیرۆکەیەکی باش بێت یان، ئەوا ویلایەتەکانی یەکگرتوو ڕاستگۆیی و متمانەیەکی نوێی وەدەستدەهێنا ئەگەر بەو ئاراستەیە هەندێك هەوڵی جدییانەی بدابوولیە، دەنا جارێکی دیکە وەها دێتە بەرچاو وەك ئەوەی بە جیهان بڵێ: " بە قسەم بکەن، بە عەمەلم مەکەن".

٣.بسمارکبە نەك بریتانیا: جۆزیف جۆف ئاماژەی بە هەبوونی دوو نموونەی مێژوویی کرد کە دەکرێ ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەکاتی داڕشتنی ستراتیژە گەورەکەیدا ڕەچاویان بکات، ئەوانیش: بریتانیا و بسمارك بوون. بریتانیا هەوڵی دا دژی هێزە مەزنە گەشەسەندوو و هەڕەشەلێکەرەکان هاوسەنگییەك دروست بکات، کەچی بێجگە لەمە، کاری بۆ ئەوە نەکرد خۆی بەسەر کێشەوەری ئەوروپادا بسەپێنێ. بەڵام بسمارك، لە بەرانبەردا، ئەوەی هەڵبژارد کە ئەڵقی گشت هێزە مەزنەکان ببێت. ئامانجیشی دروستکردنی پەیوەندی بوو لەگەڵ هەموویاندا بەشێوەیەك پەیوەندیی خۆی لەگەڵ ئەو هێزانەدا لە پەیوەندییەکانی نێوان خودی ئەو هێزانەدا بەهێزتر و پتەوتربکات؛ بۆئەوەی ئەڵمانیا ببێتە تەوەری سیستمی نێو دەوڵەتی لە ئەوروپادا.

بۆ ویلایەتەکانی یەکگرتوو، بژار و مۆدێلی بریتانی بژارێکی دروست نییە. ئەمریکا لە ڕابردوودا دژ بە ئەڵمانیای نازی و ڕووسیای سۆڤییەتی ئەم ڕۆڵەی گێڕاوە، بەڵام ئەم ستراتیژە لە سایەی هەلومەرجەکانی ئێستەدا دانایانە نییە. چوونکە جیهان بەسەر چەند بەرە و سەربازگەیەکدا دابەش نەبووە، هەروەها لەپێشتر پەیوەنددارتر و متمانەدارترە. لەوانەیە هەوڵدان بۆ بەرهەمهێنانی هاوسەنگییەك دژ بە هێزە گەشەسەندووەکان، سیاسەتێکی مەترسیدار و لەڕزێنەری سەقامگیری بێت. چوونکە ئەگەر واشنتۆن دژ بە وڵاتی چین ئەمە بکات- پێش ئەوەی چین هیچ جۆرە حەزێکی مکوڕانە بۆ لاوازکردنی سیستمی نێو دەوڵەتی پیشان بدات- ئەوا خۆی بە گوشەگیری و ئەنیایی دەبینێتەوە؛ هەروەها باجێکی گرانیش دەدات چوونکە هێزێك بووە و بووەتە هۆی نێکوپێکدان و لێکترازان. ئەوجا بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئەمریکا زلهێزێکە، دەبێ زندەڕۆیی نەکردن لە گێڕانی ڕۆڵەکەیدا پایەیەکی سەرەکیی هەر ستراتیژێکی مەزن بێت. دەنا،

خەڵکانی دیکە بەچەندان ڕێگەی هەمەچەشن هەوڵ دەدەن لەگەڵیدا بگەنە دۆخی هاوسەنگی.

بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە واشنتۆن تەواو گونجاوە بۆئەوەی لە سیستمی هەنووکەیی جیهانیدا ڕۆڵێکی وەك ئەوەی بسمارك بگێڕێت. ئیدارەی بۆش لەمیانی بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یابان و ئوسترالیا و هیند، لە ئاسیاشدا کارێکی مەزنی ئەنجام دا. هەروەها دەبێ هەمان کاریش لەگەڵ ڕووسیا و چینیشدا بکات. هەرچەندە ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەگەڵ مۆسکۆ و پەکیندا چەندان ناکۆکیی هەیە، بەلام لە بەرژەوەندیی واشنتۆندا نییە بیانکاتە دوو نەیاری بەردەوام. خۆنزیککردنەوە لە ڕەوتەکەی بسمارك بەوە دەناسرێتەوە کە سەرلیستی و باشتربوون (الافضلیە) دەداتە ویلایەتەکانی یەکگرتوو، توانای ئەمریکا بۆ دامەزراندنی جیهانێکی نوێ و سەقامگیر تا ئەوپەڕی زیاد دەکات. جا ئەگەر سەرکەوتنیش وەدەست نەهێنێ، بەلام ڕەوایبوون و بوار بە ئەمریکا دەبەخشێ ڕۆڵی پارسەنگ و هاوسەنگکارێك بگێڕێ.

٤. سیستمی دابڕاو و جیابۆوە. لە نێوەندی شرۆڤەکاران و توێژەران و کەسانی بواری پەیوەندییەکانی نێودەوڵەتیدا، سەبارەت بە چۆنییەتیی پاراستنی بەردەوامکاری (الدیمومە)ی ئاشتیی جیهانی، بیرۆزێکی هەژموونداری و زاڵ هەیە. ئەم بیرۆزە ئەوە بەدیاردەخات سەقامگیرترین سیستم ئەوەیە کەوا هێزێکی تاکانەی بێهاوتای هەژموونداری هەبێت کەوا پارێزگەری لە سیستمەکە بکات. بریتانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتوو بۆ ماوەی دووسەد ساڵ ئەم ڕۆڵەیان گێڕا. لە هەردوو دۆخیشدا، دەوڵەتی هەژموونداری و زاڵ لە ڕووی ئابووری و سەربازییەوە زاڵبوو، هەروەها ببووە تاکە پەناگەی بازاڕ و قەرز و مەڵبەندی دلرایی جیهانی و پارێزەری دراوی یەدەگ. هەروەها بریتانیا و ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە هەردوو

ئاستی سیاسی و سەربازیشدا، هەریەکە لە ڕێڕەوە دەریاییەکانیان دەستەبەر دەکرد و لە هەمبەر هەڕەشەکانی گەشەسەندووش کاریان بۆ هاوسەنگی دروستکردن دەکرد، کاتێکیش بیانزانیبووایە زۆر پێویستە بۆ ڕێگەگرتن لە دروستبوونی هەراوزەنا و پاشاگەردانی دەستوەردان بکەن، ئەوا نەدەسلەمینەوە. هەرچەندە هەردووکیان هەڵەی زۆریان کرد، بەڵام سەقامگیری سیستمەکە و سەرکەوتنی ئابووری جیهانی و جڤاکە کراوەکان، هەر هەموویان بریتیبوون لە کەلتوور و میراتێکی دەگمەنی هەژموونی ئەنگلۆ- ئەمریکی.

بەڵام ئەدی ئەگەر هەژموونەکە لاوازبێت، چی دەبێت؟ ئەمریکا ئیدی وەك جاران تاکە بازاڕی مەزنی جیهانی نییە، چاوەڕوانیش دەکرێ دۆلار تا هەتایە پێگە سیمبولیەکەی خۆی وەك دراوی یەدەگ بپارێزێ. هەروەها لە چەند شوێنێکی دیاریکراویشدا- وەك دەریای باشووری چین- چاوەڕێ دەکرێ هێزی سەربازیی ئەمریکی لە هێزی چینی کەمبایەختر بێت. هەروەها ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە دانوستانەکانی نێودەوڵەتیشدا، ناچار دەبێت لەهەمبەر خەڵکانی دیکەدا سازش و هەماهەنگی بکات. ئایا کۆی ئەمانە دەبنە هۆی ناسەقامگیری و پاشاگەردانی؟

لە ڕاستیدا مەرج نییە هەژموونی ئەنگلۆ- ئەمریکی کەوا دووسەد ساڵ بەردەوام بوو، سیستمێکی تا فشۆڵی دروستکردبێ وەك لە بیستەکان و سییەکاندا دەبیندرا. (کاتێك هێزی بریتانی کەمبوویەوە، ولایەتەکانی یەکگرتوو حەزی نەکرد جێگەی بگرێتەوە، بۆیێ ئەورووپا بۆشاییەکەی پڕکردەوە). چوونکە چەمکی سەرەکیی سیستمی هەنووکەیی- ئابوورییەکی کراوەی جیهانی، دانوستانی نێودەوڵەتی- پێشوازییەکی فراوانی لێ دەکرێ. جگە لەمانەیش، چەند شێوەیەکی نوێی دیکەی هاوکاری و هەماهەنگی نوێ هەن کەوا بەشێوەیەکی پلەبەپلە پێشدەکەون. ئان ماری سلوتر ئەوەی وەسفکردووە کە

چۆن سیستەمەکانی یاسایی کۆمەڵێك پێوەری نێودەوڵەتی بەرهەم دێنن و پێڕەوی دەکەن بەبێ ئەوەی کەس ناچار بکەن، هەروەها سیستمێکی تێکچڕلو پێکدەهێنن کەوا لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەچێت. ڕاستە کە سەقامگیری گشت پرسێك چارە ناکات، بەڵام هەر هیچ نەبێ نقربەیان چارەسەر دەکات. بە واتایەکی دیکە، لەوانەیە گەڕان بەدوای چارەسەرەکانی هەر زلهێزێك بۆ گشت گرفتەکان بێهوودە و ناپێویست بێت.

لەسەر ویلایەتەکانی یەکگرتوو پێویستە ئەم سیستەمە تایبەتە پێڕەو بکات. ریچارد هاس، سەرۆکی پێشووی پلاندانانی سیاسەتەکان لە وەزارەتی دەرەوە بەشێوەیەکی داهێنەرانە دلوای " هاوکارییەکی جیاواز و سەربەخۆی نێودەوڵەتیی کردووە". ئەم پێشنیازە پشت بەو بیرۆکەیە دەبەستێ کە هیچ دەستگە و دامەزراوە و ڕێکخراوێك نییە بەردەوام لەسەر هەق بێت، هەروەها هیچ بنەما و ڕێبازێکی میسالییانە بوونی نییە. لەسەر ئەم بنەمایە، لەوانەیە نەتەوەکانی یەکگرتوو کار بۆ چارەسەری گرفتێك بکات، ناتۆش گرفتێکی دیکە، هەروەها ڕێکخراوی دەوڵەتانی ئەمریکی OAS گرفتێکی دیکە چارەسەر بکات. جا لەوانەیە سەبارەت بە پرسە نوێیەکانی وەك گۆڕانی کەشوهەوا، دروستکردنی هاوپەیمانییەکی نوێ کەوا لە کۆمپانیاکانی تایبەت و ڕێکخراوەکانی ناحکومی پێکهاتبێت، بە چارەسەرێکی لۆژیکی دابندرێ. هەرلوزەنا و پاشاگەردانیی نێودەوڵەتی زیاتر دەبێت، جا لەو کاتەی نەرم و گونجاو و سازشکار دەبیت، ئەوا دەرئەنجامی باشتری دەبێت لەوەی کە بەتەنیا لەو پرسە نزیکبیتەوە و بۆ چارەکردنی گرفتەکانی نێودەوڵەتی پشت بە یەك بیرۆکە یان یەك ڕێگە ببەستیت؛ ئەو دۆخەی باسی دەکەین ڕێگەیەك بوو کەوا لە ڕابردوودا گرفتەکانی نێودەوڵەتیمان پێ چارە دەکرد. هەبوونی سیستمێکی نێودەوڵەتی کەوا لە

میانیدا کۆمەڵێکی هەمەچەشنی بونیاد و چارەسەردا چارەسەری گرفتەکان بکرێ، دەتوانێ سەقامگیرییە تایبەتەکەی دروست بکات. ڕاستە کە وەک ئەو سیستمی فەرمییە هەنووکەییە سەرنجراکێش نابێت کەوا بەهۆی یەک دوو ڕێکخراو لە نیویۆرک و جنێڤدا بەڕێوە دەبرێ، بەڵام لەوانەیە واقیعیتر و بەردەوامتر بێت.

٥. لە چەند ئاستێکدا بیربکەرەوە. ئەمریکا بەدرێژایی مێژوو و تاکو ئێستە بەهێزترین سوپای هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، لە وەدیهێنانی سەرکەوتن لە عێراقدا دووچاری چەندان گرفت بوویەوە. هەروەها سوپای ئیسرائیلیش لەڕووی هێز و پێشکەوتنەوە هەرگیز لەگەڵ هێزی حیزبوڵڵای لوبنانیدا بەراورد ناکرێ، بەڵام ئەو سوپایەش نەیتوانی لە بەرانبەر حیزبوڵڵادا سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە وەدەستبێنێ. بۆچی؟ چوونکە لە سەدەی ئێستە بەرپەرچدانەوەی یەکسەری دەستەوتاقمەکانی چەکدار ئاسانە، بەڵام سەرکەوتنی زەحمەتە. ئەمە تەنیا هەر بەسەر جەنگدا پیادە نابێت. ئێوە تەماشای پەیدابوونی هاوپەیمانیی ڕێکخراوەکانی مادەکانی هۆشبەر و کۆمەڵەکانی شۆردنەوەی پارە و کرێکارانی پەناهەندە و تیرۆرستان بکەن، هەر هەموویان لە حکوومەتەکان بچووکتر و هەژارترن؛ مەبەست ئەو حکوومەتانەیە کەوا دژیان وەستاونەتەوە. لەو سەردەمەدا کە بە چالاکییەکی بەردەوام و سنووربڕ دەناسرێتەوە، ئەو کۆمەڵە و دەستە و تاقمە بچووکانەی کەوا گیانی داهێنان و بەرۆشی و بڕیاریان هەیە، سەرلیبیننی و گرنگییەکی گەورەیان هەیە.

ئەوجا یەکەمین و گرنگترین وانەی ژێر باری ئەو هەلومەرجانە ئەوەیە کارێکی وەها نەکەیت ڕاکێشرێینە نێو تەڵە و داوەکانەوە. لە پەیامێکی ڤیدیۆییدا کەوا لە ساڵی ٢٠٠٤دا پەخش کرا، ئوسامە بن لادن بە ڕوونی و ڕاشکاوییەکی

سەرسوڕهێنەرەوە ستراتیژێکی باسکرد کە ناوی لێنابوو " تەشقەڵەکردن و وروژاندن و دانانەوەی تەڵە" و گوتی:" ئەوەی لەسەرمان پێویستە بیکەین ئەوەیە دوو موجاهید بنێرین..... بۆئەوەی پارچە قوماشێك بەرزبکەنەوە کەوا لەسەری نووسرابێت ئەلقاعیدە، بۆ ئەوەی جەنەڕاڵەکان بۆ ئەوێ ڕابکەن و زیانی مرۆڤی و ئابووری و سیاسی بە ئەمریکا بگەیەنین". پەیامەکە گەیشتە گشت کۆمەڵە تیرۆرستییەکانی جیهان. ئێستەیش بەبێ هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ڕوون یان هاوکاری و ڕێنمایی زیاتر لە لایەن بن لادنەوە، ڕێکخراوە بچووکەکانی باشووری خۆرهەلاتی ئاسیا تا دەگاتە باکووری ئەفریقیا و لەوێشەوە ئەورووپا، ڕایدەگەیەنن کەوا بەشێکن لە ئەلقاعیدە، بەمە گرنگیی ئەم ڕێکخراوە قەبەتر دەکەن و گرنگیدانێکی نێودەوڵەتی بۆ پرسەکەیان ڕادەکێشن؛ بێگومان پاڵ بە ئەمریکاشەوە دەنێ بەخێرایی بێت بۆ ئەوەی دژی بوەستێتەوە. ئەم جۆرە کاردانەوە زێدەڕۆیانە وەها دەکەن سیاسەتەکانی ئەمریکا و بوونی سەربازییانەی ئەمریکی ببنە دوو پرسی سەرەکی، ئەوسا گفتوگۆیە نێوخۆییەکەی تایبەت بە تیرۆر و تۆقاندن بەرەو ئیمپریالیزمی ئەمریکی دەڕوات.

تۆ تەماشای شێوازی ڕەفتار و نزیکبوونەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا بکە سەبارەت بە بیرۆکەی فراوانکردنی بوون و ئامادەیی خۆی لە ئەفریقیادا. ئەو زمانەی کەوا ئیدارەی بۆش بەکاری هێنا شایانی ڕێزلێگرتنە، چوونکە تیریزا ویلانی یارمەتیدەری وەزیری بەرگری بۆ کاروباری ئەفریقیا لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیی ساڵی ۲۰۰۷دا دەڵێ:" دەمانەوێ ڕێگە لە گرفتەکان بگرین بۆ ئەوەی نەبنە قەیران، قەیرانەکانیش نەبنە مەرگەسات و تراژیدیا". ئەو چارەسەرەی کەوا ئیدارەکە پشتی پێ بەستابوو پێکهێنانی تیپێکی نوێی سەربازیی تایبەت بە کیشوەرەکە بوو AFRICOM لەگەڵ سەرکردە و

دەستەی ئەرکانی تایبەت بەخۆی. بەڵام، بەپێی گوزارشتی دەیڤید ئیگناتیۆسی نووسەر لە واشنتۆن پۆست: " ئایا سوپای ئەمریکی بۆ هەوڵدان لەپێناو بونیادنانی ئەو گەلەی وەك دیارە ئەفریکۆم وێنای دەکات، ئامرازێکی گونجاوە؟ ئایا بوون و ئامادەبیە دوور هێندەکەی ئەمریکا دەتوانێ تیرۆر و ناسەقامگیریی لە کیشوەرەکەدا بوەستێنێ، یان لە جیات ئەمە دەبێتە موگناتیسێکی نوێ و کەسانی دژ بە ئەمریکا بەکێش دەکات؟". ویلایەتەکانی یەکگرتوو لە ئەفریقیادا بەرژەوەندیی بێشوماری هەیە؛ بەرژەوەندییەکانیش هەر لە پاراستنی سەقامگیریی دەوڵەتەکانییەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە دانانی ئاستێك بۆ هەژموونی چین و ڕێگەگرتن لە ترازیدیایەکانی مرۆڤی. بەڵام ئایا تیپی سەربازی بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە ڕێگەیەکی گونجاوە؟ یان ئایا ئەوە زۆر بەسادەیی وەڵامدانەوەیەکی ئاسان و هەموارە؟ لێرەدا مەترسییەکە پەیوەندیی بە فەوتانی سەرچارەکانەوە هەیە، بەهۆی ئیمپریالیزمی وێناکراوی ئەمریکی. بەڵام گرفتە قووڵترەکە گرفتی وێناندنکارییەکەیە (التصوری)؛ دەستنیشانکردنی نادروستی گرفتەکەیە. مارك توین دەڵێ: " ئەو کەسەی چەکوشێکی هەیە، گشت گرفتێك بە بزمار دەزانێت".

لەسەر ولایەتەکانی یەکگرتوو پێویستە بەشێوەیەکی داهێنەرانە و لەسەر چەند ئاستێکی جیاوازدا بیربکاتەوە. ئەمەیش ڕێگەی بۆ خۆش دەکات پشت بە یەکێك لە سەرلیستییە سەرەکییەکانی ببەستێت، ئەویش ئەوەیە کە پێکهاتە (تشکیلە)یەکی فراوانتر و قووڵتری ئامرازەکانی هەیە، نەك هەر تەنیا سوپایەکەی. بۆنموونە: ئەگەر سیاسەتی ئەمریکی لە هەمبەر ئەفریقیادا پێداگری لەسەر بونیادنانی کۆمەڵە دیبلۆماسییەکەمان و توانامان بۆ بونیادنانی گەلان و تیپە تەکنیکییەکانی یارمەتیدان بکردبایەوە، لەوانەیە بەبەراورد لەگەڵ

ئەفریکۆمدا بە بێزارکەر بھانبایەتە پێشچاو، بەلآم لە دوورمەودادا کاراتر دەبوو. ئەم قسەیە بەسەر دەرەوەی ئەمریکاشدا پیادە دەبێت. ئەوەی لە پاکستاندا وەك کەموکورتییەکی ویلایەتەکانی یەکگرتوو دێتەبەرچاو، وەکەرخستنی هەوڵێکی گەورەترە بۆ یارمەتیدانی ئەو وڵاتە بۆ نوێگەرایی، هەروەها دەبێ ئەوەش ڕوونبکرێتەوە کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو هاوپەیمانییەکی لەگەڵ گەلدا دەوێت نەك تەنیا لەگەڵ سوپادا. کاتێك لە هیند دەژیام، خزمەتگوزارییەکانی زانیاریی ئەمریکی (U.S Information Services) ڕۆڵی بلاوکەرەوەی ڕۆشنبیری و هزر و بەهایەکانی دەگێڕا، بەلآم ئەم نزیککارییە دیبلۆماسییە لە دوای جەنگی ساردەوە بەتەواوی داخرا و لە دوای یانزەی سێپتێمبەریش تەواو جۆلبوو. چوونکە هەوڵەکانی سەربازیی ئەمریکی بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندڕۆیی ئیسلامی نزیکەی تریلیۆنێك دۆلاری وەدەستهێنا، لە کاتێکدا چالاکییەکانی دیبلۆماسی و مەدەنی لە ١٠ ملیار کەمتری وەرگرت.

سەرەڕای ئەمانەیش، ئەمریکا زۆر لە حکوومەتەکەی گەورەترە. هەروەها چەندان دەستگە و زانکۆ و ڕێکخراوەکانی خێرخوازی و مرۆڤ هەن بە قووڵی و کاراییەکی گەورەتر لە حکوومەت لە دەرەوە کار دەکەن. لەسەر واشنتۆنیش پێویستە زیاتر لەو کۆمەڵە و ڕێکخراوانە فێرببێت، زیاتریش کاریان لەگەڵدا بکات و ئەمریکییەکانی دیکەش هان بدات ئەقلی چالاکی و هەوڵەکانیان بن. هەروەها لە جیات ئەوەی موسڵمانانی ئەمریکی لێپرسینەوەی پۆلیسیانەیان لەگەڵدا بکرێت و بێزار و دەستبەسەر بکرێن، بۆ ئەوەی لەپێناو تێگەیشتن لە هێزی بەکێشکردنی بنەوانگرانەدا (الاصولیە) بانگهێشت بکرێن. بەکورتی، جڤاکی ئەمریکی کە یەکێکە لە هێزە سەرەکییەکانی ئەمریکا لە جەنگی دژ بە تیرۆردا زۆر پشتگوێ خراوە.

٦.شەرعییەتی هێز. ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا گشت جۆرە هێزەکانی بەرێژەی گەورە هەیە، تەنیا یەك هێز نەبێت، ئەویش شەرعییەتە. لە جیهانی ئەمرۆشدا ئەمە بە کەموکورتییەکی کرۆکی دادەندرێ. چوونکە شەرعییەت رێگە بە مرۆڤ دەدات ئەجێندا دابنێت و قەیرانەکان دەستنیشان بکات و پشتگیری و هاودەنگی لەنێوان دەوڵەتان و هێزەکانی ناحکومیدا کۆبکاتەوە. هەر شەرعییەتیش بوو کە رێگەی بۆ بۆنەی گۆرانیبێژی رۆك خۆشکرد سیاسەتی حکومەت لەهەمبەر پرسێکی هەستیاردا بگۆرێت، ئەویش هەڵوەشاندنەوەی قەرزەکان بوو. هێزەکەیشی لە توانای بەرجەستەکردنی نموونەکانی ئاکاری و هزریدا خۆی نواند.

شەرعییەت چەندان شێوەی هەیە. ئیدارەی کلینتۆن لە سێ دۆخی گرنگدا هێزی بەکارهێنا: لە بۆسنە و هایتی و کۆسۆڤۆدا. هەرچەندە ئیدارەکە دۆسییەی ئەم پرسانەی نەبردە ئەنجومەنی ئاسایش، بەڵام هیچ ئاماژەیەك بۆ پێویستبوونی ئەو هەنگاوە لەگۆرێدا نەبوو. بەڵکو کۆفی ئەنانی ئەمینداری گشتی چەند راگەیەندراوێکی دەرکرد کەوا پاساوی بۆ دەستوەردان لە کۆسۆڤۆ دەهێنایەوە، ناوبراو لەمبارەیەوە گوتی:" نابێ سەروەریی دەوڵەتان وەك پەردە و پۆشەرێك بۆ پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ بەکاربێت". ئیدارەی کلینتۆنیش بەهۆی هەبوونی هەستێکی سەرەکی بە متمانە و باوەڕ، توانی بەشێوەیەکی بەشۆکی خۆی لەمە دەرباز بکات. چوونکە هەرچەندە ئیدارەی کلینتۆن- یان ئیدارەی جۆرج بۆشی باوك- لە زۆر دۆخدا یەکلاکەرەوە بوو، بەڵام جیهان سەبارەت بە نیازەکانیان پێویستی بە بەڵێن و دەستەبەرییەکان نەبوو. سەبارەت بە ئیدارەی هەنووکەیی بۆش، هەرچەندە کۆی سەرزەنشتەکە- بەجیاوازییەکی گەورە لەنێوان خۆی و هەردوو ئیدارەی پێشوو- ناگەرێتە ئەستۆی ئیدارەکەوە، چوونکە هێرشەکانی

یانزەی سێپتێمبەر هیچ بوارێکی دیکەی بۆ ئەهێشتەوە تەنیا سەپاندنی هەژموونی ئەمریکی و ڕەفتارکردن بەهێز نەبێت لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا، بەلام دەبووایە ئەمە بووبووایە هۆیەك و وەهای لێ بکردبایە لەمەڕ ئەو کارانەی کەوا لەسەری پێویستبوو ئەنجامیان بدات، ڕاوێژ و هاوکاری و هەماهەنگی وەگەڕبخات، ئەمەیش لەبەر دوو هۆی گرنگ: یەکەمیان بۆ ترساندنی دوژمنەکانی، دووەمیش بۆ ترساندنی شوێنەکانی دیکەی جیهان.

ئیدارەی بۆشی کوڕ لە قۆناغی خۆئامادەکردن بۆ جەنگی عێراق وەها دەهاتە بەرچاو کە هەرگیز لە بەهای کردەی شەرعییەت نەگەیشتبێ. لەولایە بەرپرسانی ئەمریکی ئەو ڕایە ڕەت بکەنەوە کە پێی وایە ئەوان لەگەڵ هاوپەیمانانیان لە ئەورووپای نوێ و ئاسیا و ئەفریقیادا دابڕاو بوون، بەلام زۆربەیان یان بە بەرتیل یانیش بە ماستاوکردن بۆ چوونە نێو هاوپەیمانی بارەریان پێ هێندرا. هەرچەندە حکوومەتەکانی ئەورووپای نێوەڕاست پاڵپشتیی واشنتۆنیان کرد، بەلام گەلانیان بەهەمان ژمارەی کەسانی نێو ئەورووپای کۆن — کە دژبوون— دژی ئەو مەسەلەیە وەستانەوە. جا واشنتۆن بەهۆی بێئاگایی و ناگادارنەبوونی لەهەمبەر ئەو جیاوازییەدا، بەخراپ لە تورکیا گەیشت، هەمووشمان دەزانین کە تورکیا هاوپەیمانێکی کۆن و دڵسۆزە، بەلام لە نەوەدەکاندا زیاتر دیموکراتیتر ببوو. چوونکە حکوومەت دەیویست پاڵپشتیی لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو بکات، بەلام ٩٠٪ گەلی تورکی دژی ئەمە بوون، دەرئەنجامەکەش — دوای دەنگدانێکی داخراوی پارلەمانی— ئەوە بوو کە تورکیا نەیتوانی پشتیوانی لە ئەمریکا بکات؛ ئەمەیش واتای ئەوەیە کە جەنگ لە دوو بارەی دژ بە سەدامەوە بووەتە جەنگێکی ناکۆبەرەیی و ناکەسەنگەری بە گشت ئەو دەرئەنجامە جیییانەی کەوا بەدوای خۆیدا دەیانهێنێ. بەمشێوەیە، کاتێک

جەنگ هەڵگیرسا، ویلایەتەکانی یەکگرتوو پاڵپشتیی زۆرینەی گەلی یەک دەوڵەتی جیهانی وەدەستهێنابوو کە ئەویش ئیسرائیله. لەوانەیە مرۆڤ سەری لە دڵسۆزییەکەی تۆنی بلێر سوڕبمێنێ، بەلاّم پێشبینیی ئەوە ناکات کەوا سیاسییە زۆر دیموکراسییەکان لە جیهاندا حەزەکانی زۆرینەی هەرە زۆری گەلانیان پشتگوێ بخەن.

میکافیلی دەڵێ: " وەها باشترە خەڵك لێت بترسن لەوەی کە تۆیان خۆشبوێت". پێدەچی دیك چینی ئەم دروشمەی بە جیدی وەرگرتبێ. چوونکە لە وتارێکدا کەوا لە ساڵی ۲۰۰۷دا خوێندییەوە، وتەیەکی بێرنارد لویسی هێنابوویەوە کە هەمان مانای وتەکەی میکافیلی دەگەیەنێ، ئەویش ئەوەیە کە دەستهەلاّتدارانی تاکڕەو و خوێنمژ لە خۆرهەلاّتی ناوەڕاستدا لە قۆناغی جەنگی سارد دا، فێربوون کە لە یەکیەتیی سۆڤییەت بترسن نەك ئەمریکا. بەلاّم میکافیلی و دیك چینی هەڵەن. بەڵێ ڕاستە کە هاوپەیمانانی یەکیەتیی سۆڤییەت لە سۆڤییەت دەترسان، بەلاّم ویلایەتەکانی یەکگرتوو خۆشەویستبوو، یان هیچ نەبێ جێگەی سەرسامی بوو. تەماشابکەن کامەیان تاکو ئێستە ماون. شتێکی سەیر و نامۆ و جێگەی نیگەرانییە کەوا دیك چینیی جێگری سەرۆك ستایشی ئەو ستراتیژە دڕندانە و شکستخواردووانەی سیستمێکی دیکتاتۆرییانەی سەرکوتکار بکات. ڕاستە کە ویلایەتەکانی یەکگرتوو بەهێزی خۆی جیهانی گۆڕی، بەلاّم بە ڕێباز و بیروباوەڕەکانیشی ئەم گۆڕانەی دروستکرد. چوونکە کاتێك خۆپیشاندەرانی لایەنگری دیموکراسی لە چیندا لە گۆڕەپانی تیانانمێندا گردبوونەوە، پەیکەرۆکەیەکی بچووککراوەی پەیکەری ئازادییان دروستکرد، نەك فڕۆکەی جۆری F-16. ڕەنگە وێنەی ئەمریکا هێندە خۆشخووانە و جوان نەبێت وەك ئەمریکییەکان تێبگەیشتوون، بەلاّم لە کۆتاییدا لە ئەلتەرناتیڤی دیکە

باشترە. هەر ئەمەیشە کە وایکرد جیهان بۆ ماوەیەکی زۆر دوورودرێژ بەرگەی هێزەکەی بگرن.

## ترس و دوودڵی

بەڵام، پێش ئەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتوو بتوانێ هەر کامێك لەو ستراتیژانە جێبەجێ بکات، هەردەبێ هەموارکردنەوە و دەستکارییەکی زۆر لەوە فراوانتر بکات. پێویستە ترس لە خۆی دووربخاتەوە. ئەو ترسەی کەوا لە ویلایەتەکانی یەکگرتوودا کەشێکی پڕ لە گومان و تۆقینی دروستکردووە، مەبەستم ئەو ترسەیە کە وەهای لە ئێمە کردووە هەڵەی ستراتیژی بکەین. دوای ئەوەی باوەڕمان بەخۆمان هێنا کە لەسەرمان پێویستە بەخێرایی و بەتەنیا و بەشێوەیەکی پێشدەستانە (استباقی) و بەکلایەنە ڕەفتاربکەین، سەرکەوتنمان لەوە وەدەستهێنا نیازە پاکەکانی نێو دەوڵەتی لەنێو ببەین و هاوپەیمانەکانمان لەخۆمان زویر کرد و دوژمنانمان بۆ خۆمان زیاتر کرد، تاکە دەستکەوتیشمان ئەوەبوو تەنیا کەمێك لەو گرفتە مەزنە نێودەوڵەتیانەمان چارەسەرکرد کەوا ڕووبەڕوویان دەبینەوە. ئەوجا بۆ ئەوەی ویلایەتەکانی یەکگرتوو پێگەی خۆی لە جیهاندا وەربگرێتەوە، لەسەری پێویستە یەکەمجار متمانەبەخۆکردن وەدەستبێنێتەوە.

بەبێ گشت پێوەرەکانی بابەتی، ویلایەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکا تا ئێستەیش پێگەیەکی مەزنی هەیە. ڕاستە کە ڕووبەڕووی ئەبرلن و گرفتەکان و بەرهەڵستیش بووەتەوە، بەڵام هەلومەرجی ئەنووکەیی- بە بەراورد لەگەڵ هەر هەڕەشەیەکی دیکەی ڕابردوو (ئەڵمانیای نازی، دوژمنایەتییەکەی ستالین، جەنگی ئەتۆمی)- زۆر بەگونجاو و لەبار دێتەبەرچاو، جیهانیش

بەپێی ڕێگە و نۆرمی نوێ ڕەفتار دەکات. لە ساڵی ١٩٢٣دا فرانکلین دیلانۆ ڕۆزفلێت ئەو مەترسییە ڕاستینەی دیاری کرد کەوا هەڕەشە لە ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەکات و گوتی: " تاکە شتێك کەوا لەسەرمان پێویستە لێی بترسین، ترس خۆیەتی.... تۆقینێکی نادیاریکراو و نا لۆژیکی و بێ پاساوە". ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە لەوکاتەی سیستمی ئابووری و سیاسییانەی ئەمریکی لەسەر لێواری داڕووخان بوو و نیوەی هێزی کارگەر بێکاربوو و فاشیزم بەرەو جیهان دەچووە پێشەوە، ئەو هۆیەکانی ترسی ڕەت دەکردەوە. بەلام ئێمە لە زەمەنی گەشەسەندن و پشکووتن و ئاشتیدا توانیمان بە شێوازێك لە شێوازەکان تۆقین بخەینە نێو دڵی خۆمانەوە. وەبیرهێنانەوەی ئەم پرسە زۆر پێویستە بۆ ئەوەی دڵنیابینەوە کە لە حیسابات و داوەرییەکان و تێگەیشتندا هەڵە ناکەین.

ئەمریکا بووە میللەتێکی بارگاویکراو بە نیگەرانی. ئەو لە هەمبەر تیرۆرستان و وڵاتانی نەیار و ناحەز و موسڵمانان و مەکسیکییەکان و کۆمپانیایەکانی بیانی و بازرگانیی ئازاد و پەناهەندەکان و ڕێکخراوەکانی نێودەوڵەتیدا نیگەرانە. بەهێزترین گەل لە مێژوودا دەبینێ چواردەوری بەهێزی دەرەوەی بەرزەفتی خۆی تەنراوە. هەرچەندە ئیدارەی بۆش بەشێوەیەکی زۆر بەهێز بەشداریی لەو دۆخەدا کرد، بەلام دیاردەکە لە تاکە سەرۆکێك زۆر گەورەترە.

دەکرا هەڵمەتی سەرۆکایەتیی ساڵی ٢٠٠٨ بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆیەکی نیشتمانیی تایبەت بەو جیهانە نوێیەی کەوا تیایدا دەژین، دەرفەتێك دروستبکات. بەلام لەلای کۆمارییەکانەوە مەشقێکبوو لەسەر هیستریای سینگکوتان و شین و شەپۆر. گەرچی هەندێك سیاسی لە شانۆی سیاسی دەرچوون، بەلام وشە و گوفتارەکانیان کاریگەرییان بەسەر هۆشیاریی

نەتەوەییەوە هەیە، بۆ نموونە: ڕۆدی گولیانی لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردندا چەندان جار هاواری دەکرد و ئامادەبووانی لە هەبوونی نەتەوەیەکی بەدخواز ئاگادار دەکردەوە: " ئەوان نایەنەوێ ئێوە لەو زانکۆیەدابن! " هەروەها دەگێڕنەوە کە بە ئەنگوستی ئاماژەی بە خوێندکاران دەکرد و دەیگوت:" یان تۆ، یان تۆ، یان تۆ". گولیانی ئەمریکای هان دا کە هەر تەنیا لە دۆخی هێرشکردندا نەمێنێتەوە، بەڵکو لە چەند سەنگەرێکی نوێشدا هێرش دەستپێبکات.

جۆن مەکین لە کتێبەکەی خۆیدا کە لە ساڵی ٢٠٠٣دا دەرچوو، نزیککارییەکی کرداریتری گرتووەتەبەر، ناوبراو دەنووسێت:" سواری بالآڕۆیە (المصعد) نەفرەتییەکە ببە! سواری فڕۆکە نەفرەتییەکە ببە! دەبێ حیسابی ئەوەش بکەیت کە لەسەر دەستی تیرۆرستێکەوە دووچاری ئازار دەبیتەوە، دەبینیت زۆر نزیکە لەو ئەگەرانەی کەوا بەهۆی شەپۆلێکی فراوانەوە بەرەو دەریا ڕابماڵدرێیت". دواتر شتێکی دیکەی بۆ زیادکردووە کە وەک بنەمایەکی تاقیکراوەی کردارییە:" چاودێریی پێوەری مەترسیی تیرۆرستییانە بکە، کاتێکیش دابەزێتە ژێر سفرەکانەوە، دووبارە وەرە دەرەوە". بەڵام، بۆ بەدبەختی، لە یانزەی سێپتێمبەرەوە پێوەری مەترسییەکە هەرگیز دانەبەزیوەتە ژێر ڕەنگی زەرد (واتا ئاستێکی بەرزی مەترسیدار سەبارەت بە ئەگەری بەرپابوونی هێرشێکی تیرۆرستی). لە فڕۆکەخانەکانیشدا، بەردەوام ڕەنگەکە پرتەقاڵی بوو! واتا مەترسییەکی گەورە و ئاست بەرز هەیە، ئەمەیش دووەم ئاستی بەرزیی مەترسیدارییە. لەگەڵ ئەمەیشدا، ئیدارەی ئاسایشی نیشتمانی دانیەوەدا دەنێ کە تا ئێستەیش هیچ زانیارییەکی باوەڕپێکراو نییە کەوا هۆشداری لە هەبوونی هەڕەشەیەکی وەکاتانەی سەر

نیشتمان بدات. هەر بەڕاستی، لە پانزەی سێپتێمبەرەوە لە سەرتاپای ولآتدا تەنیا دوو سێ پیلانگێڕی لاوەکییانەی تیرۆرستی ئاشکراکراون، هەروەها هیچ خانەیەکی نووستووی ئەلقاعیدە لە ئەمریکا نەدۆزراوەتەوە.

لەگەڵ ئەمانەیشدا، دوژمنەکە- هەروەك زۆرێك لە سیاسییەکانی ئەمریکی وەسفی دەکەن- گەورە و جیهانی و بێبەزەییە. گۆلیانی بەوپەڕی ئەعساب ساردییەوە ئێران و ئەلقاعیدەی دەخستە نێو یەك لیستەوە. بەلآم میت ڕۆمنی لەوە دوورتر ڕۆیشتووە و دەڵێ بەدخوازە شیمانەکراوەکان هەر هەموویان کۆبوونەتەوە. بەلآم ئێران، لە ڕاستیدا، هێزێکی شیعییە و بەشێوەیەکی کرداری یارمەتیی ویلایەتەکانی یەکگرتووی داوە ڕژێمی تالیبان بڕووخێنێ کەوا لە لایەن ئەلقاعیدەوە لە ئەفغانستان پشتگیریی لێ دەکرێ. هەروەها سوننە توندڕۆیەکانی سەر بە قاعیدە شیعەی عێراقیان دەکوشت، میلیشیا شیعییەکانی سەر بە ئێرانیش لە تۆڵەدا سوننەی عێراقییان دەکوشت. کەواتە، ئێمە لە ئێستەدا یەکێك لەو هەڵە کرۆکییانەی سەرەتای جەنگی سارد دووبارە دەکەینەوە کاتێك گشت دژبەرە شیمانەکراوەکانمان دەخستە نێو یەك زەمبیلەوە و هەرگیز پۆلینمان نەدەکردن و لەیەکترمان جیا نەدەکردنەوە، بۆنموونە: ماوتسی تۆنگ و ستالین دوو پیاوی شەڕخواز بوون، بەلآم دوو شەڕخواز بوون کەوا ڕقیان لە یەکتری دەبوویەوە، ئەمە ڕاستییەك بوو و ئەگەر بەشێوەیەکی گونجاو سوودی لێ وەربگیرابووایە، دەکرا سوودێکی مەزنی بۆ جیهانی ئازاد هەبووایە. خۆ دوورگرتنیش لە ئەنجامدانی ئەمەدا هیچ جۆرە هێزێکی تیادا نابیندرێ، بەڵکو دەبەنگییە.

کێبڕکێکردن لەسەر وەدەستهێنانی نازناوی کەسی بەهێز چەند هزرێکی نوێی وەدیهێنا کەوا پەیوەندیی بە سیاسەتەوە هەیە و ؛ خۆی لەنێوان باش و

خراپدا دەبیننێتەوە. بۆنموونە ڕۆمنی کە خۆی بە بەرپوەبەرە زیرەکە جیهانییەکە دەناسێنێ، بەمدواییانە گوتی کە هەرچەندە" هەندێك کەس گوتیان لەسەرمان پێویستە گوانتانامۆ دابخەین، بەلام من پێم وایە کە دەبێ ئەبارەی گوانتانامۆ دوو هێندە لێ بکەین".

هەندێك کەس ستایشی سیاسەتی هێرشبەرانەی ئیدارەی بوش دەکەن، چوونکە ئەبهێشت لە دوای یانزەی سێپتێمبەرەوە دووبارە هێرش بکرێتەوە سەر خاکی ئەمریکا، بێگومان ئیدارەکە شایستەی سوپاسە، چوونکە ژێرخانی قاعیدەی لە ئەفغانستان و چەندان ولاتی دیکەدا هەلوەشاند کەوا لق و لایەنگری قاعیدەیان تیادا بوو؛ هەرچەندە سەرکەوتنەکەی لە وەدیهێنانی ئەمەدا زۆر لەوە دیاریکراوتر بوو کەوا هەندێك کەس باوەڕیان پێی هەیە، بەلام لە یانزەی سێپتێمبەرەوە هێرشی تیرۆرستی لە ولاتانی دیکەی وەك بریتانیا و ئیسپانیا و مەغریب و تورکیا و ئەندۆنیسیا و سعوودیەشدا ئەنجام دران کە زۆربەیان زۆر بەتوندی دژی تیرۆر وەستابوونەوە. خالی هاوبەشی نێوان ئەو هێرشانە ئەوەبوو کە بەهۆی چەند کۆمەلەیەکی نێوخۆیی ئەو ولاتانەوە ئەنجام درابوون. واتا دۆزینەوە و وەستاندنی ڕەگەزە بیانییەکان زۆر لە دۆزینەوەی کۆمەلە نێوخۆییەکان ساناترە.

جا ئەو خالە سەرلیستە (الافضلیة) گرنگەی کەوا ویلایەتەکانی یەکگرتوو لەمبارەیەوە هەیەتی ئەوەیە کۆمەلەی توندڕۆی نێوەخۆیی نییە. چوونکە موسلمانەکانی ئەمریکی بەگشتی سەر بە چینی نێوەڕاستن، هەروەها میانڕۆن و بەشێوەیەکی نوێ ناوێتەی جڤاکە نوێیەکە بوون و باوەڕیان بە ئەمریکا و خەونی ئەمریکی هەیە. یەکێك لە گشتپرسییە سەراپاگیرەکان کەوا لە لایەن مەلبەندی Pew بۆ توێژینەوەکان لە سالی ۲۰۰۷دا سەبارەت بە ڕا و

بۆچوونی موسڵمانانی ئەمریکی ئەنجام درا، ئەوەی دەرخست کە زیاتر لە ٧٠٪ ئەو خەڵکە باوەڕیان وەهایە کە ئەگەر مرۆڤ لە ئەمریکا لە کاروبارەکانی خۆی هەوڵ و دامێنانی هەبێت، سەردەکەوێ (بەڵام ژمارەکە بۆ ئەمریکییەکانی ئاسایی ٦٤٪ پێکدەهێنێ). هەروەها گشت وەڵامەکانیان سەبارەت بە زۆربەی پرسیارەکان لەگەڵ هزر و باوەڕدارییە باوەکانی ئەمریکا دەگونجا و و لە هەمان کاتیشدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەگەڵ وەڵامەکانی موسڵمانانی وڵاتانی دیکە جیاواز بوو، بۆنموونە: ڕێژەی ١٣٪ موسڵمانانی ئەمریکی باوەڕیان وەهایە کە دەکرێ پاساو بۆ هێرشەکانی خۆکوژی بهێندرێتەوە. ڕاستە کە ڕێژەکە بەرزە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ ڕێژەی ٤٢٪ی موسڵمانانی فەرەنسا و ٨٨٪ی ئوردنییەکان ڕێژەیەکی زۆر کەمە.

بەڵام ئەم تایبەتمەندە ڕوونەی ئەمریکی کە نیشانەی توانای وڵاتەکەیە بۆ لەخۆگرتنی کۆچبەرانی نوێ، بە ئەمان هەڕەشەی لێ دەکرێ. چوونکە ئەگەر سەرکردەکانی ئەمریکی ئاماژە بەوە بکەن کە پێویستە بە چاوی گومانەوە تەماشای سەرلەبەری جڤاکی موسڵمان بکرێ، ئەوا ئەم مەسەلەیە پەیوەندیی ئەو جڤاکە بە جڤاکی ویلایەتەکانی یەکگرتوو دەگۆڕێ.

هەرچەندە دیموکراتەکان لە زۆربەی پرسەکاندا لە کۆمارییەکان ئەقڵانیترن، بەڵام حزبەکە هەر لەوە دەترسێ بۆچوون و وێنەیەك دروست بکات کە پارتێکی بەهێز و توندوتیژ نییە (صارم)، لەبەر ئەم هۆیە پاڵێورلوانی سەرۆکایەتییەکەی لەگەڵ یەکتری لە کێبڕکێدان بۆ ئەوەی بیسەلمێنن لە نێرایەتی و هەستی دوژمنایەتیدا لە توندوتیژترین کەسانی کۆماری کەمتر نین. چوونکە لە دیبەیتێکی سەرۆکایەتیدا لە کارۆلینای باشووردا لە ساڵی ٢٠٠٧

کاتێك سەبارەت بە ئەگەری کاردانەوە لەهەمبەر هێرشێکی دیکەی تیرۆرستی پرسیار لە کاندیدایەکان دەکرا، یەکسەر بەڵێنیان دەدا کە هێرش بکەن و تۆڵە بکەنەوە و بۆ گواستنەوەی کەسێك زەوی لەژێر پێیاندا بلەرزێنن. تەنانەت باراك ئۆباما کە تاکەکەس بوو لە سەرەتادا بەشێوەیەکی جیاواز وەڵامی دایەوە، یەکسەر درکی بە فشۆڵیی هەڵوێستە سیاسییەکەی خۆی کرد و ئەویش بە تۆڵەکردنەوە هەڕەشەی کرد. دوای دیبەیتەکەش ڕکابەرەکانی ئاماژەیان بەوەکرد کە وەڵامدانەوە ڕاستێن و تەواوەکەی ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەو هێز و عەزمی پێویستی نییە بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆك. (لە ڕاستیدا، وەڵامەکانی سەرەتای دروست بوون. چوونکە گونی یەکەم شتێك کە بیکات دڵنیابوونەوەیە لەوەی ئاخۆ کاردانەوەی کتوپڕ کارایە، دواتریش دڵنیایی لەوە پەیدا دەکات کە ئاخۆ لەپێناو دۆزینەوەی ئەنجامدەرانی هێرشەکە باشترین زانیاریی هەواڵگریی ڕێتێچوومان هەیە، دوای ئەمەیش لەگەڵ هاوپەیمانان دەجووڵێین بۆ ئەوەی تۆڕە بەرپرسەکە هەڵبوەشێنینەوە).

هەرگیز ناتوانین ڕێگری لە کۆمەڵێکی بچووکی کەسانی ناباو بکەین و لەمپەریان بۆ دروست بکەین بۆ ئەوەی نەتوانن کارێکی تیرۆرستییانە نەکەن. جا ئەگەر بەرپرسانی هەواڵگریمان و ئۆرگانەکانی ئاسیشمان زۆر لێهاتوو و دووربینیشبن، چوونکە هەندێك کەس بەردەوام توانای ئەوەیان دەبێت بەنێو کەلێنەکانی وڵاتێکی گەورە و کراوە و هەمەچەشنی وەك وڵاتی ئێمەدا خۆیان بخزێنن. تاقیکردنەوەی ڕاستێن بۆ سەرکردەکانمان پەیوەندیی بەوەوە نییە کە ئاخۆ دەتوانین سەد لە سەد ڕێگە لە ڕوودانی هێرشەکان بگرین، بەڵکو چۆنییەتیی کاردانەوەمانە. ستیڤن فلینی شارەزا لە ئاسایشی نیشتمانی لە ئەنجوومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوەدا جەخت لەسەر هەمان مەسەلە

دەکاتەوە و دەڵێت کە دەبێ نەرمی و توانای خۆ گونجاندنەوەمان وەک ئامانجێکی خۆمان ڕەچاو بکەین؛ واتا ئاستی خێراییمان لە گەڕانەوەمان بۆ دۆخی پێش ڕوودانی کۆسپوتەگەرەیەک. لە زانستەکانی مادیدا، نەرمی وەها پێناسە دەکرێ کە توانای مادەیەکە بۆ وەرگرتنەوەی شێوە بنەڕەتییەکەی خۆی لە دوای گۆڕانیدا. ئەوجا ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆمبێک تەقییەوە، دەبێ لەوە دڵنیابینەوە و ئەوە دەستەبەر بکەین کە کەمترین پاشاگەردانیی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی لێ بکەوێتەوە. ئەمەیش ڕێگە لە تیرۆرستەکە دەگرێ ئامانجە سەرەکییەکەی وەدیبهێنێت. بە واتایەکی دیکە، ئەگەر نەتۆقین، ئەوە لەڕووی لۆژیکییەوە واتای ئەوەیە کە ئێمە شکستمان بە تیرۆر و تۆقاندن هێناوە.

ئەو کەشە پڕ لە ترس و تۆقینەی کە هەنووکە بەرهەمی دەهێنین، لەوانەیە کاریگەرییەکی پێچەوانەی لێ بکەوێتەوە. هەر چۆنێك بێت، دوو مەسەلە هەن کە دەکرێ بە جۆرە دڵنیایی و یەقینێکەوە پێشبینییان بکەیت. شوێنەوار و کاریگەرییەکانی ڕاستینی هێرشەکە زۆر کەم و دیاریکراو دەبێت. ئەمەیش ڕێگە بە وڵاتەکە دەدات زۆر بەخێرایی بچێتەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆیەوە. خوێنیش لە شادەمارەکانی واشنتۆندا دەجۆشێ. هەروەها سیاسییەکانیش هێرشی کتوپڕ و گورجوگۆڵ دەکەنە سەر کەسێك یان کۆمەڵەیەکی دیاریکراو بۆ ئەوەی بیپلیشێننەوە و وێرانی بکەن و لەنێوی ببەن..... هەروەها هێرشی تۆڵەکردنەوەش گونجاو و گرنگ دەبێت ئەگەر توانی ئامانجە دروستەکانی خۆی بپێکێت. بەڵام، ئەدی ئەگەر تاوانکاران لەنێو هامبۆرگ و مەدرید و ترینتۆن بوون؟ لە ڕاستیدا، ئەگەرێکی گەورە هەیە- لە ڕاستیدا گەورەترین ئەگەرە- کە هێرشی ئایندەیی لەو وڵاتانەوە بێن کەوا بەبێ مەبەست و

بێئاگایانە تیرۆرستان دالدە دەدەن. جا ئایا دەکرێ بریتانیا و ئیسپانیا بۆردومان بکەین هەر لەبەر ئەوەی خانەیەکی تیرۆرستییان تیادایە؟

دەرئەنجامێکی دیکەی پێشبینیکراوی هێرشێکی تیرۆرستی بریتییە لە زۆرێک لەو کۆتوبەندانەی کەوا دەخرێنە سەر جوولە و تایبەتمەندی و ئەو ئازادییانەی مەدەنی کەوا تێچووی زۆر گەورەی ئابووری و سیاسی و ئاکاری دەخانە سەر ئەمریکا. کردەی چاودێریکردنی خەڵک لە فرۆکەخانەکان کەوا ساڵانە نزیکەی پێنج ملیار دۆلاری تێدەچێت، ساڵانە لەگەڵ دۆزینەوەی مەترسییەکانی نوێ و شیمانەکراودا ئاڵۆزتر دەبێت. هەروەها سیستمی پێدانی ڤیزا کەوا بووەتە شتێکی قێزەون و پڕ لە کۆتوبەند، لە گشت ئەو جارانەی کەوا یەکێک لە تاوانکاران لە دزەکردندا سەرکەوتن وەدەستدەهێنێ، زیاتر و زیاتر قێزەونتر و بەکۆتوبەندتر دەبێت. بێگومان، لەکاتی دانانی ئەم رێکارانەدا، هیچ کەسێك رەچاوی وەدیهێنانی هاوسەنگیی نێوان پێداویستی بۆ ئاسایش و پێداویستی بۆ کرانەوە و میواندۆستی ناکات.

بەڵام ترسەکانمان هەر تەنیا بەند نییە بە تیرۆرەوە. لوو دوبس لە کەناڵی سی ئێن ئێن و قسەکەر بەناوی توێژی تووڕە و دووچاربوو بە نەخۆشیی گومانکردن لە جڤاك، هەڵمەتی بەردەوام دەکاتە سەر ئەو هێزە بەدخوازانەی کە بەردەوام وەك لافاو رامان دەماڵن. هەروەها بۆ زۆرێك لە راستڕەوەکانیش پەنابەندەکانی ناشەرعی بوونەتە نەخۆشی و وەسواسێك کەوا ئەقڵیانی داگیرکردووە. پارتی ئازادیی بازرگانیش خۆی بۆ ئەوە تەرخان دەکات توانایەکانی دەوڵەت زیاتر بکات بۆئەوەی لەپێناو قەدەغەکردنی خەڵك لە کارکردن چاودێرییەکی بەردەوامی هەبێت. دیموکراسییەکانیش لە کرێی فەرمانبەرانی ویلایەتەکانی یەکگرتوو نیگەرانن، بەڵام ئەو ترسانە لە ئێستەدا

لەهەمبەر بازرگانیی ئازادە. چوونکە لەگەڵ پاراستنی دەستگەکانی ئەمریکی لە کێبڕکێکردن بێگومان دەبێتە هۆی لاوازکردنی توانای بەرهەمهێنانی وڵات، سیاسەتەکانی ئابووریی کراوەش لەنێو حزبدا بەخێرایی پشتگیریی خۆی لەدەست دەدات. سەرکەوتنە مێژووییەکەی کلینتۆن لە دووبارە ئاراستەکردنەوە و چاککردنەوەی هەڵەکانی پارتەکەی (بەرەو ئابندە و بازاڕەکان و بازرگانی و کارایی)، لە ئێستەدا لە هەوڵی دوای جەماوەرییبوونێکی کاتیدا بەفیڕۆ دەدرێ.

بەشێك لە سیاسەتی دەرەوە پەیوەندیی بە کردارەکانمانەوە هەیە، بەڵام بەشێکی دیکەش هەیە پەیوەندیی بە کەسییەتیمانەوە هەیە. باوەڕەکان وەهان کە هۆبێرت هامفری گوتوویەتی کە یاسای مافەکانی مەدەنیی ساڵی ١٩٤٦ یەکێك بووە لە گرنگترین سیاسەتەکانی دەرەوەی ئەو دەیەیە. بەزۆری ئەمریکا شوێنی ئەو تریافە مەزنەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی بووە. چوونکە کاتێك ڕەفتارەکانی ئەمریکا سەبارەت بە جیهان توندوتیژ و هەڕەمەکی و ستەمکارانە بووە، ئەوا خودی ئەمریکا بەردەوام کراوە و پێشوازیکار و لێبوردە بووە. بیرمە کە لە حەفتایەکاندا سەردانی ئەمریکام کرد منداڵ بووم، ئەوکات هیند بە فەرمی دژی ئەمریکا بوو. بەڵام ڕاستیی ئەمریکا وەك خۆم تاقیم کردەوە وەك بەدرۆخستنەوەیەکی بەهێزی ئەو پروپاگەندەیە بوو کەوا دژی دەکرا، هەروەها ئەو وێنە کاریکاتێرییەشی سڕییەوە کەوا لە لایەن دوژمنەکانیەوە دەکێشرا. بەڵام ئەم وێنە کاریکاتێرییە بەهۆی بێئاگایی و سەرنج نەدان و ترس و ترسنۆکیی بیرۆکراتیانەوە هەڕەشەی ئەوە دەکات ببێتە ڕاستی.

لە کۆتاییدا، کرانەوە مەزنترین هێزی ئەمریکایە. زۆرێك لە شارەزایانی لێهاتوو لە سیاسەتەکاندا هێزی زیرەکانەیان هەیە و پێیان وەهایە کە توانای بەرهەمهێنان و پارەی پاشەکەوتکراو سیستمی چاودێریی تەندروستی لە ئەمریکا و هەژموونیشیان باشتر دەبێت. بەڵام ئەمریکا لە ڕووی مێژووییەوە بەهۆی کارامەیی و لێهاتوویی سیستمی چاودێریی تەندروستییەوە سەرنەکەوتووە، بەڵکو بەهۆی هێز و کارایی و زیندوویەتیی جڤاکەکەیەوە بووە. ئەمریکا بۆیێ سەرکەوتنی وەدەستهێنا چوونکە خۆی بەڕووی دونیادا کردەوە؛ دەرگەی بەڕووی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان و هزر و داهێنانەکاندا کردەوە، لە کۆی ئەمانەیش گرنگتر دەروازەکانی خۆی بەڕووی خەڵك و ڕۆشنبیری و کەلتوورەکانی هەمەچەشندا کردەوە. ئەم کرانەوەیەش ڕێگەی بە ئێمە داوە لەهەمبەر قۆناغەکانی نوێی ئابووریدا زۆر بەخێرایی و نەرمییەوە کاردانەوەمان هەبێت و مامەڵە لەگەڵ گۆڕان و هەمەچەشنیدا بکەینەوە و سنوورەکانی ئازادی و سەربەخۆیی تاك فراوانتر بکەین. ڕێگە بۆ ئەمریکا خۆشبوو یەکەمین گەلی جیهانی بونیاد بنێت، شوێنێك کە خەڵکی گشت جیهان دەتوانن کاری تیادا بکەن و تەقلی بن و ئاوێتەی ببن و بەشداری لە یەك خەون و یەك چارەنووسدا بکەن.

لە پایزی ساڵی ١٩٨٢دا وەك خوێندکارێکی تەمەن هەژدە ساڵی لە هیندەوە گەیشتمە ئەمریکا، ئەو هیندەی کەوا هەشت هەزار میل لێیەوە دوورە. ئەوکات ئەمریکا لە قۆناغێکی زۆر سەخت و توندوتیژدا دەژیا. چوونکە لە کانونی یەکەمی ئەو ساڵدا بێکاری گەیشتبووە ١٠.٨٪. هەروەها بەهۆی چەند قەیرانێکی مەزنی وەك ؛ جەنگی ڤێتنام، پرسی ۆتەرگیت، قەیرانی وزە، قەیرانی بارمتەکان لە ئێران، متمانەی ئەمریکا بەخودی خۆی کەم ببوویەوە.

وێنەی هەلیکۆپتەرەکان لەسەر باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە سایگۆن بوو، نیکسۆن دەستی لە کار کێشایەوە، ریزی دووروودرێژی ئۆتومبێل لەبەردەم وێستگەکانی بەنزیندا نۆرەی گرتبوو، هەروەها بارمتەکانی چاوبەستراو هەر لەبەرچاو و مێشکی ئەمریکییەکان لانەدەچوو. یەکێتیی سۆڤییەتیش بە قۆناغێکی شادومانانەدا گوزەری دەکرد، چوونکە لە ولاتە زۆر دوورەکانی دەرەوەی سنووری خۆی؛ لە ئەفغانستانەوە تا دەگاتە ئەنگۆلا و ئەمریکای نێوەڕاست هەژموونی زیاتر دەبوو. لە حوزەیرانی هەمان ساڵیشدا، ئیسرائیل هێرشی کردە سەر لوبنان و لە خۆرهەلاتی نێوەڕاستدا دۆخی نیگەرانیی کردە شتێکی سەرەکی؛ ئەو خۆرهەلاتەی کە بەردەوام لە گشت شوێنێکی دیکەی جیهان زیاتر بارودۆخی گرژتر بوو.

سەرەرای ئەمانەیش، بەلام ئەمریکا تا ئاستێکی سەرسوڕهێنەر ولاتێکی کراوە و چاوتێربوو. رێگەکان ئەم سیفەتانەی بەرجەستە دەکرد. هەرچەندە ناوبراو لەنێو جەرگەی ڕەشەبایەکەدا بەلام بەردەوام گەشبینیی لێ دەتکا. لە بەرانبەر هەڵکشانی هێزی مۆسکۆدا، بەوپەڕی متمانەوە باسی لە قەیرانێکی کوشندەی نێو سیستمی سۆڤییەتی کرد و پێشبینیی کرد کە چارەنووسەکەی ئەوەیە دەکەوێتە سەر قومەتێک خۆڵەمێشی مێژوو. لە لایەکی دیکەوە لەو رێڕەوە (ممر) سیاسییەی کەوا هەردوو پارتی سەرەکیی لەیەک جیا دەکردەوە (political aisle)، تۆماس (تیپ) ئۆنێلی ئەمریکی -ئێرلەندی و وتەبێژ بە ناوی ئەنجومەن، راوەستابوو کەوا پیاوێکی زۆر دڵسۆز بوو و چاوتێری و لێبوردەیی قوتابخانەی کۆنی لیبراڵی بەرجەستە دەکرد. بۆ هەر شوێنێک چووبایەم، کەشەکە گەرموگوڕ و پێشبینیی لازبکارانە بوو. هەستێک بوو کە من پێشتر هەستم پێی نەکردبوو. ولاتێکە و ئامێزی بۆ جیهان، بۆ هەر کەسێک

کردووەتەوە کەوا خۆشی بروێت. هەروەها بۆمنی میوانی گەنج، وەهام هاتە بەرچاو کەوا هیوا و دەست و دڵگراوەییەکی بێسنوورم پێدەبەخشێ.

جا بۆ ئەوەی ئەمریکا لەم سەردەمە نوێیە پڕ لە بەرەنگارییەدا گەشەبکات و بپشکوێ، هەروەها بۆ ئەوەی لەنێو دۆخی ڕابوونی ئەوانی دیکەدا سەرکەوتن وەدەستبێنێ، پێویستی بەوە هەیە تەنیا لە یەک تاقیکردنەوەدا سەرکەوتن وەدەستبێنێ. لەسەر ئەمریکا پێویستە چۆن بۆ خوێندکارێکی گەنجی دەبەنگی هەژدەساڵی- کە ئەرەیەک لەمەوبەر چووەتە نێویەوە- شوێنێکی سەرنجڕاکێش بوو، دەبێ بەهەمانشێوە بۆ ئەو گەنجەش سەرنجڕاکێش بێت کەوا ئەمڕۆ دەچێتە نێویەوە.

کۆتایی

# پێرست

فەرید زەکەریبیا کێیە؟ .......... ٥
پێشەکی .......... ٩
خێراترین ئوتومبێلی پێشبڕکێ لە جیهاندا .......... ٩
گرفتی قەرز .......... ١٥
ئەورووپا بەرەو جیهانی دوای ئەمریکا .......... ٢٢
هاوکاری یەکتر بکەن .......... ٣١
١- ڕابوونی ئەوانی دیکە .......... ٣٧
٢-تۆپی کریستاڵیی پێشبینیکردن .......... ٤٢
هەڕەشەی ئیسلامییانە .......... ٤٩
فراوانبوونە مەزنەکە .......... ٦١
هەرسێ هێزەکە: سیاسی، ئابووری، تەکنۆلۆژی .......... ٦٧
گرفتەکانی زۆری و مشەیی (الوفرە) .......... ٧٤
گەشەکردنی هەستی نەتەوایەتی .......... ٨٢
زلهێزەکانی دوایی .......... ٩٤
دەستکەوت و ئاڵانییەکان (غنائم)ی جەنگ .......... ١٣٠
بەخۆرئاواییکردن Westernization .......... ١٣٦
نوێگەرایی .......... ١٤٢
مردنی سیستمی کۆن .......... ١٤٦
ئایندەیەکی تێکەڵاو .......... ١٥٢
پلانی سەرکەوتووانەی مەرکەزی؟ .......... ١٦٩
شارنەوەی ڕووناکییەکەی .......... ١٨٥

ئاین و سیاسەتی دەرەوە ........................ ١٩١
لەوە گەورەتره بشاردرێتەوە ........................ ١٩٨
ئەژدیها و هەڵۆ ........................ ٢١١
پێویستبوونی حکوومەت ........................ ٢٣٣
کوێر و بێ ددان ........................ ٢٤١
بۆچوون و ڕوانگەی هیندۆسی لە هەمبەر جیهاندا ........................ ٢٤٩
وزەی ئەتۆمی ........................ ٢٥٥
هەژموونی ئەمریکی ........................ ٢٦٨
کاریگەریی بریتانیا ........................ ٢٧١
هەڵکشانە سەیر و دەگمەنەکەی هێزی بریتانی ........................ ٢٧٨
سیاسەتێکی باش، ئابوورییەکی خراپ ........................ ٢٨٢
پێشەنگبوونی ئەمریکا لە دوورمەودادا ........................ ٢٨٧
باشترین دروستکراو و پیشەسازییەکانی ئەمریکا ........................ ٢٩٧
ڕاهێنان و فێرکردنی مرۆڤ بۆ ئەوەی بیربکاتەوە ........................ ٣٠٣
چەکە نهێنییەکەی ئەمریکا ........................ ٣٠٨
سیاسەتێکی بێ بەرهەم ........................ ٣٢٢
مەبەست و ئامانجی ئەمریکی ........................ ٣٢٩
ئەمجارەیان مەسەلەکە جیاوازە ........................ ٣٤٦
ترس و دوودڵی ........................ ٣٧٩
کۆتایی ........................ ٣٩١